# داستانی ژیانەوە



Abdullah OCALAN

گفتوگۆیەکە مامۆستا یالچین کوچووك
لەگەڵ عەبدوڵلا ئۆجەلانی
سەرکردەدا کردوویەتی

# داستانی ژیانەوە

گفتوگۆیەکە مامۆستا یاڵچین کوچورک
لەگەڵ عەبدوڵڵا ئۆجەلانی
سەرکردەدا کردوویەتی

## پێشکەشە بە:

- گیانی شەهیدە نەمرەکانمان.

- خۆڕاگرانی سەر لوتکەی چیاکانی کوردستان.

- گەلە کۆڵنەدەرەکەمان.

- عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرکردەی نیشتیمانیمان.

# دەستپێك

داستانی ژیانەوە ( ئەژین) فراوانترین چاوپێکەوتنە تا ئێستا لەگەڵ مەحموللا ئوجەلانی سەرکردەدا کرابێ کە سەرکردە وەڵامی تێکڕای پرسیارەکانی مامۆستای دکتۆر (یالچین کوچووك)ی تێدا داوەتەوە، ئەم پرسیارانە پەیوەندییان بە بابەتە بنچینەییەکانەوە هەیە. وەڵامەکانیش هەمەلایەنن و لەگشت ڕوویەکەوە مانایەکی قووڵیان هەیە تا ڕاستییەکان بە شێوەیەکی یەکجار ڕاشکاو دەربخەن.

بە شێوازێکی ڕەوان باسی ئەوە دەکات چۆن مرۆڤی کورد سەرلەنوێ ژیایەوە پاش ئەوەی گەیشتە ئێواری کۆتایی پێهاتن و، چۆن ئەوە هەنگاو بە هەنگاو بە کۆشش و سیاسەت بەدیهات. باسی ئافرەت و ئەدەب و هونەر و سینەما و مۆسیقا دەکات و گەلێك بابەتی دیکەش ڕۆشن دەکاتەوە. کاتێکیش چەند شێوەیەك بۆ سیاسەتی ئێستای جیهان و ڕژێمە دامەزراوەکان و بارودۆخیان دادەنێت، بەشێوەی کۆمەڵە ڕاستییەکی داماڵراو دەستیان بۆ دەبات.

ئەم کتێبە وەڵامی ئەو هەموو پرسیارانە دەداتەوە کە دەوڵەتی فاشی تورکیا و لایەنگرانی ورووژاندوویانن و بە جۆرێکی تەواو پێچەوانەی ڕاستی کردوویانن بە بابەتی جێی مشتومڕ، وەك: ئاپۆ کێیە؟ چۆن هاتە دنیاوە و چۆن گەشەی کرد و چی دەوێ؟ کتێبەکە وەڵامی سەرپاکی ئەم پرسیارانە دەداتەوە، بە شێوەیەك ئەو هەموو درۆ و قسە هەڵبەستراوانە بە درۆ دەخاتەوە کە دەزگا قین لەدڵەکانی ڕاگەیاندن بڵاویان کردوونەوە و بە جەرگانە ئەم ڕاستیانە لەبەردەم ڕای گشتیدا ڕوون دەکاتەوە.

ئەوانەی کە بە بڵاوکراوە و قسەی ڕەسمی نەبێ تا ئێستا (PKK) و ئاپۆ ناناسن، یان ئەوانەی کە لە دەرەوەی چوارچێوەی کاری ڕەسمی شتێکی کەمیان لە بارەوە دەزانن، گەلێك زانیاری لەم کتێبەدا دەبیننەوە کە وەڵامی ئەو کۆمەڵە پرسیارە دەداتەوە کە مێشکی ڕای گشتییان جەنجاڵ کردووە.

کاتێك مامۆستا یالچین کوچووك پاش ئەم گفتوگۆیە بۆ تورکیا گەڕایەوە، دەوڵەتی فاشی گرتی و کەرەستەی گفتوگۆکەی زەوت کرد و کردی بە کەرەستەیەکی خاو بۆ دەزگا قین لەدڵەکانی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەی خۆی، دوای ئەوەی کە چەند ڕستەیەکی لەو گێڕانەوە گشتییە وەرگرت و بە شێوەیەکی دیکە دایڕشتەوە و هێندێك وشەی لێهەڵگرت و لە ڕستەی دیکەدا بەکاری هێنان تا مانایەکی پێچەوانە و بەرەواژ بە دەستەوە بدەن. ئەم کتێبە تێکڕای ئەم لاف و گەزافانە بەدرۆ دەخاتەوە و وشە و ڕستە ڕاستەکان لەجێی خۆیاندا پیشان دەدات و، بگرە بەشێوەیەکی وا تەواو ئەو بابەتانە لێکدەداتەوە خوێنەران تێر دەکات.

ئایا ئەوەی کە لە خوێن تینو نابێ (PKK)یە یان دەوڵەتی تورکیایە؟! کێ لەدەست پێکردنی شەڕ و درێژەپێدانی بەرپرسە، سکرتێری گشتی (PKK) یان دەوڵەتی تورکیا و سەرکردەکانی؟ کێ داکۆکی لە بەهای مرۆڤانە دەکات و کێش دوژمنی مرۆڤایەتییە؟ گەلێك پرسیاری دیکەی لەم شێوەیە، کە کتێبەکە لەشێوەی راپۆرتێکدا بۆ گەلی کورد و گەلی تورك و تەنانەت بۆ سەرجەمی گەلانی جیهان رۆشنیان دەکاتەوە. کتێبەکە ئەو باڵادەستانەی رژێم ئاگادار دەکاتەوە کە هەردوو گەلی کورد و تورك هەڵدەسوورێنن و هەموو جۆرە گوشار و توانەوەیەکیان دەرهەق دەکەن.

کتێبەکە قووڵترین شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی لەلەیەنی لەسەر چەند بنچینەیەکی راستەقینەی کێشەی کوردستان دەخاتە بەرچاوی خوێنەران. هەروەها بە چەند لەئەنجامێك دەگات و سەرەداوی گەلێك کێشەی گرنگ و شێوازی داهێنراو بۆ لێتێگەیشتنی بەدەستەوە دەدات.

تا ئەمڕۆ چی کراوە و چی بۆ قۆناخەکانی داهاتوو پێویستە و خەباتی تا ئێستا چ ئاکامێکی لێکەوتووەتەوە و ئەنجامەکانی پاشەڕۆژ چی دەبن؟ وەلامی ئەم هەموو پرسیارانە گرنگە و (داستانی ڤەژین) بە تێروتەسەلی وەلامیان دەداتەوە و یارمەتی لێتێگەیشتنی گەلێك مەسەلەی ناڕۆشن دەدات و خاڵە نادیارەکان روون دەکاتەوە.

درادوایەکانی ١٩٩٤

# بەشی یەکەم

## سیاسەت بەلای منەوە هونەری وەدەستهێنانی جوانییە.

پالچین کوچووک: سەربارى ئەم هەراوهۆریا و شەڕوشۆڕە، وا دیارە تەندروستیت باشە و جوانخاسترى. ئەمەش ماناى وایە ئێوە ماندوونەناسن. ئەوەى ڕاستی بێ بینەم ئێوە چۆن بووبەستری وەمان.

سەرۆکایەتی پارتی: سوپاستان دەکەم کە بۆ ئێرە هاتوون. ئێمە بە هاتنتان بەختیارین و ئەمەش لوتف نواندنێکی ئێوەیە. ئەو جوانی و متمانەیەش کە دەیانبینن شتێکی شەخسی نین، بەڵکو لە ڕاستی گەلەکەمانەوە هەڵقوڵاون، چونکە گەلەکەمان لەم بارودۆخەدا دەژی و متمانەشی لەم ساڵانەدا لە هەرکاتێکی ڕابردوو زیاترە و خەریکە جوان دەبێ.

ی.ك: منیش دەبینم کاروبارەکانتان بە شێوەیەکی باش هەڵدەسووڕێن.

س.پ: کەچی وەك ئەوە نین کەوا خۆمان دەمانەوێ، بەڵام هیوا لە هەرکاتێکی ڕابردوو پتر گەورە دەبێ و بەرەو بەدیهاتن دەڕوات.

ی.ك: کاتێك دەڵێم سەرەڕای ئەوەی کە ڕێگاکانمان سەخت و درێژە، ئایا لە ناخی خۆتاندا وا هەست ناکەن وەك بڵێی بە هەورازێکدا هەڵکشاون و گەیشتوونە دوسەری؟

س.پ: بەڵێ دەڵێی بە هەورازی چیای ئاگریدا هەڵکشاوم.

ی.ك: سەرکەوتوون، وانییە؟

س.پ: بەڵێ. بێگومان سەرکەوتووم.

ی.ك: ئەوە شتێکی شایستەی بایەخێکی زۆرە. هەر لە یەکەم ساتەوە هەستم پێ کردبوو.

س.پ: ئەم توانایەم هەیە. من چاروبار بە هەستم سیاسەت دەگێڕم و ئەم هەستەشم دەڵێت: بە شاخدا هەڵگەڕانت سەرکەوتووە.

ی.ك: باشە بە هەست و نەستتان لە سیاسەت گێڕاندا، ئایا هەست دەکەن ئێوە بە شێوەیەکی تەواو لەگەڵ ئەو خەباتەدا کە دەیکەن گونجاون؟

س.پ: لە ڕاستیدا من سیاسەتێکی جیاواز ڕادەپەڕێنم و پەیوەندی ئەوەدا مەبدەئیەکانم و دەسووڕێمەوە بە چوار دەوریدا و ئەمجا دێمەوە سەر پرنسیپەکە. هەر لە ڕێگای پراکتیکی سیاسەت کردنیشمەوە بۆم دەرکەوتووە وەك هەستی بۆن کردن یان سەرەداو بە دەستەوەگرتن وەهایە... ئەوە هونەری هەست کردنە. شێوازێکی دەست نیشانکراوم دیاری کردووە و لەسەری دەڕۆم.

ی.ك: سەرزکی ئازیزم، لە بارەی ئەو مەسەلانەشەوە پرسیارتان لێدەکەم. بەڵام حەزدەکەم لابکەمەوە سەر لایەنی شەخسی چونکە هەمووان پەرۆشی ناسینی ئەو لایەنانەن. خۆ خەبات و شەڕوشۆڕ بەردەوامن. هاوڕێی ڕابردوو لە سەروبەندی بەشداربوونمدا لە ئیستفالی جیهانیدا لە بونخن گوتم: لە (حەمڕان) چەندین جۆگەی ئاویان کردەوە. ئیتر گشت شوێنێك سەوز دەبن. ئەمە جوانە، بەڵام (PKK) و بەتایبەتیش سەرۆك ئاپۆ سەری مرۆڤی کورد دەکاتە باخی گوڵ. ئایا ئەو قسەیەی منتان بیستووە؟

س.پ: بەڵێ، ئەم ڕستەیەتان مانای گەورەی تێدایە. هەروەهاش ئێوە نووسیووتان ئاپۆی برام وەك بلدۆزەر دەچێتە ئەو مێشکی کوردەوە و باخی وای تێدا بنیات دەنێ کە هەزاران گوڵی کراوەی لەنێودابن.

ی.ك: چۆن هەست بەوە دەکەن؟

س.پ: سیاسەت بەلای منەوە هونەری وەدەسهێنانی جوانییە. منیش لە ڕێگای جوانیدا، واتە لە پێناوی جوانکردنی مرۆڤدا سیاسەت دەگێڕم.

ی.ك: باشە ئاپۆی برام، کە جاری پێشوو لە (بیقاع)دا چاوم پێتان کەوت گوتتان: مامۆستا... مەروام بە هاتنتان بۆ ئێرە نەدەکرد، منیش چەندەها جار ئەمەم دووپات کردەوە، چونکە ئەوە شتێکی بێوێنە بوو. ئەگەر بۆ منداڵیتان و بۆ ڕابردووتان بگەڕێینەوە، ئایا واتان چاوەڕوان دەکرد تا ئەم ڕادەیە بە مرۆڤی کوردەوە سەرقاڵ بن؟ یان ئاخۆ یەکێکی دیکە وای لێ کردی بیر لەوە بکەیەوە؟

س.پ: ئەمڕۆ بۆ ئەوەی بابەتەکە بە شێوەیەکی باشتر وەربگری، هێندێك یادگاری قۆناغی منداڵیت بە هەموو ئومێد و بەسەرهاتەکانیەوە بۆ دەگێڕمەوە، چونکە وایدەبینم بە هەرجۆرێك بووە بەسوود بێ.

ی.ك: بێگومان، من باوەڕم بەوە هەیە. ئایا دەتوانن بیر لەوە بکەنەوە؟ واتە ئەمڕۆوە دەست پێبکەی و بڕوانیتە دواوە و بڵێی: مامۆستام دەڕوانێتە منداڵی و باوکم و دایکم و ئەوانی دیکە و، ئەوەی وا دەبێکەم ئێستێ چاوەڕوان دەکات. ئایا وایە؟ ئایا کەسی وا لە ئارادا هەبوو ئەم کارەت لێ چاوەڕوان بکات؟

س.پ: بەڵێ، هێندێك چاوەڕوانکردن لە ئارادابوون. هەوڵیش دەدەم باسی چەند نموونەیەك بکەم کە وەك سەرەداو وەهان و پرسوودیان دەبینم، چونکە (ئاپۆ) و (PKK) بوونەتە دوو بابەتی گرنگ و بوونەتە کێرمەسە و بابەتێ بۆ گەلێك کتێب و ڕای گشتیش. گەلانمان ئارەزوو دەکەن ئەوە بزانن. هەستیش دەکەم من لەم بابەتەدا قەرزاریانم. من کێم و دەمە چی و خەونی و کەم و کورییم چین و لایەنە باشەکانی کەسایەتیم کامانەن؟ پێویستە هەمووان بیزانن. جەخت دەکەم کە من وا هەست بە خۆم ناکەم گەورە یا مەزنم. ئەوی ڕاست بێ لەو ئاوەندە کە تێیدا بووم واتە گوندەکەم گەلێك کەس لە خەڵکانی ئەو دێیە کە هێشتا زیندوون لە بارەمەوە دەیانگوت من ئەوەم «کە بەتی خۆی پچڕاندووە». ئەمەش مانای وایە دەتوانی لە سیستەم و پەیوەندیە باوەکان دوور بکەوێتەوە و چەرمەیەك ڕاستیش لەو قسانەیاندا

هەبوو. هەروەها زۆربەیان دەیانگوت: «ئێکامان لە خوا ئەوەیە کوڕی ئێمە وەك کوڕی ئەوان لێنەکات». مەبەستیان خێزانەکەم بوو.

ی.ك: ئەو کاتە تەمەنتان چەند بوو؟

س.پ: ساڵانی منداڵیم بوون و لە حەوت ساڵانم تێنەپەڕاندبوو. ئەوسا دەیانگوت: «لە خوا دەپاڕێینەوە منداڵی هیچ کەسێك وەك منداڵی ئەوان لێنەکات، چونکە ئەوە ژیانیان ویران دەکات». ئەمەش پڕ ئێش بوو. ئەو وەختە هۆگری هاوڕێکانم بووم. بەڵام خێزانی منداڵەکان هەولیان دەدا منداڵەکانیان دووربخەنەوە و لێمیان بشارنەوە و پێیان دەگووتم: تۆ سەری خۆت بە فەتارە دەدەی و خەریکی ئیشی بێماناى، بۆیە واز لە منداڵەکانمان بێنە.

ی.ك: ئایا مەبەستت ئەوەیە تۆ لەو کاتە منداڵەکانت هان دەدا؟ ئاخۆ لەو کاتەوە دەستت بە سەرکردایەتی کرد؟

س.پ: دەتوانم بۆتانی لێك بدەمەوە کە ئەم مەسەلەیە تاوکردن یا خولیایەکی ئاشکرا بوو مەیلم بەلایەوە هەبوو. خولیای منداڵ خڕکردنەوە لەلای من بە شێوەیەکی باوەڕ پێنەکراو بەهێز بوو. تا ئێستاش بیرمە ڕاوی هێندێك چۆلەکەم دەکرد و بە منداڵەکانم دەگوت: باخەکم پڕە. وەرن دەرخواردەتانی بدەم. ئیتر منداڵان لە دەورم خڕ دەبوونەوە و بۆ چیام دەبردن. ئەوەش کە بە هەریەکەیانم دەدا لە ڕانی چۆلەکەیەك یا باڵێك تێنەدەپەڕی. دیارە ئەمە شتێکی زۆر خۆشە. واتە من توانیم منداڵان لە دوای خۆم کۆبکەمەوە و بیانبەم بۆ شاخ. تا ئێستاش ئەوەم لە یادە. هەروەها زۆرباش لەگەڵ کچە چکۆلەکاندا لێك حاڵی دەبووین. هەرگیز فەرامۆشم نەدەکردن. هێشتا نموونەیەکم لە بیرە هەڤاڵ حەمزە بۆی دەگێڕامەوە، دەیگوت: پێش ئەوەی بۆ ئێرە بێم بوکەکەمانم بینی پێی گووتم: «پاش بەسەرچوونی حەوت ڕۆژ بەسەر گواستنەوەمدا، عەبدوڵڵا ـ مەبەستی ئاپۆ بوو ـ سەری لێدایین و قسەی بۆ کردم و گوتی: وەرە با ئەو یارییە تەواو بکەین کە ڕۆژانی منداڵی دەمانکرد». کارێکی سەرسوڕهێنەرە، ئەو هێشتا باسی ئەو بیرەوەریانە دەکات. ئەمەش خستنیە سەر کەڵکەڵە و ئەوەی وا دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە: من تا ئێستاش بە برادەرانی منداڵییەوە گرێ دراوم.

هەر لەسەر ئەم بابەتە، بێڵە با باسی چەند بیرەوەرییەکی خۆمت لەگەڵ باوکمدا بۆ بکەم. باوکم کابرایەکی داماو و خاوەن کەسایەتییەکی شێوێندراو بوو. لەوانەیە بێهێزترین پیاوی دێ بوو بێ. هەژار بوو، لە گوزەرانیدا پشتی بە هەوڵوکۆششی خۆی دەبەست. بە کورتی بە هەزار حاڵ ژیانی خۆمانمان دابین دەکرد. دووعایەکی هەبوو لە کاتی تووڕەییدا دووپاتی دەکردەوە و دەیگوت: «خوا نان بکات بە کەروێشك و ئێوەش بکات بە تانجی». واتە بەدوای نانەکە بکەون و بیگرنەدەست. مەبەستی ئەوە بوو نان پەیداکردن کارێکی یەکجار دژوارە. ئەگەر لەتە نانێك بکەوتبایە سەر زەوی، ڕاستەوخۆ هەڵیدەگرتەوە. ئەوە دەڵێم تا تەماع و بەتەنگەوەهاتنی لە ڕادەبەدەری دەربخەم و منیش پەیبەندی ئەو

پرسیبهانم. دهیگوت: «ڕۆژێکیان میوانێك لایدابە ماڵێکی ئەرمەنی. بۆکی ئەرمەنیەکە بە پەلە جگەرەی میوانەکەی بە چەرخ داگیرساند. ئەوە بووە هۆی تەڵاق دانی. جا کە کابرای میوان لە خانە خوێی پرسی بۆچی ژنەکەی تەڵاق داوە؟ ئامازەی بۆ مەقەلیەکەی پەنای خۆی کرد و گوتی: ئەوە ئاگرە، ژنە دەیتوانی جگەرەکە بەو ئاگرە دابگیرسێنێ. بەڵام کە چەرخەکەی بەکارهێنا دەست بڵاوی کرد». ئەمە نموونەیەکی ئاشکرایە لەسەر چۆنیەتی سەرمایە دروست بوون لەلای ئەرمەن.

ی.ك: خۆی باسی ئەوەی دەکرد؟

س.پ: هەمیشە باسی ئەوەی دەکرد. وە کابرایەکی شەرمن بوو، ترووسکەیەکی هیوای لە تێکۆشاندا نەدەبینی.

ی.ك: خۆ بەدەستەوەدەر بوو.

س.پ: هەر بە جارێك خۆبەدەستەوەدەر بوو، هیچ هیوایەکی بە سەرکەوتن نەبوو. کابرایەکی دەست بەستەی ئەو دنیا بوو. سەرباری ئەوەی من حەزم بە چوونە قوتابخانە دەکرد و سیاسەتم نەدەزانی. بەڵام لە ساڵانی سەرەتای تەمەنمدا هەردەم لە ژێر دار فەلەقەدا دادەنیشتین. بە تەواوی نازانم ئەوەی کە لە نێوانماندا ڕووی دەدا، مشتومڕ بوو یا ڕێنوێنی بوو بۆ من. بیرمە جارێکیان بە ڕوونی گوتی: «هێنای دەرووکردنەوە: وا بە تەختی تەوێلی مەعبولڵاوە. بۆ هەر کوێیەك بڕوات دەرگای دەخرێتە سەر پشت».

ی.ك: زۆر دەگمەنە، بەڵام چۆن هەستی بەوە کردبوو؟ ئایا ئەو هێزەی کە ئەمڕۆ کۆتانکردووەتەوە بەرپەرچدانەوەی بێهێزی باوکتان نییە؟

س.پ: بەڵێ، پێموایە پەیوەندی بەوەوە هەیە، واتە ناچاری ئاڵوگۆڕکردن لەوپەڕی بێهێزییەوە بۆ هێز. لام وایە من لە منداڵییەوە ئەوە کاری تێکردم.

ی.ك: بێهێزی باوکتان بینی، بۆیە هەستتان بە پێویستی پێکەوەنانی هێز کرد.

س.پ: باوکم تا ئەوڕادەیە بێهێز بوو کە ئەگەر تووشی دەستدرێژی ببوایە، یەکەم کارێك بیکردایە ئەوە بوو تا لوتکەی چیا ڕای دەکرد و لەوێ پڕ بەدەم هاواری دەکرد.

ی.ك: ئەم هاوارە چۆن بوو؟

س.پ: هێندێك لەو جنێوانەی هەڵدەبژارد کە بەدڵی بوون و ڕووەو گوند دەیپرشتن. بەڵام خەڵکی گوند پێدەکەنین. جنێودان گەورەترین کار بوو کە دەیتوانی بیکات.

ی.ك: ئەمە باشە! گوندنشینان پێیان وابوو شێتە، یا شتێکی لەم چەشنەیە.

س.پ: پێدەچێ پێیان وابوو بێ. ڕووی تێدەکردم و دەیگوت: « هەستە، تۆش جنێو بدە». بەڵام دانی پێدادەنێم کە من تەنانەت لەو ڕۆژانەی منداڵیشدا شێوازی جنێوم بە ڕاست نەدەزانی و زۆر تەریق دەبوومەوە و جنێودانم پێ کارێکی گران

بوو. چوونە تەرزەیەکی چیاو جنێوەکانم بە شێوازێکی خراپ دەبیستی، بۆیە قووت نەدەچوون. بە کورتی هەرگیز لەوەم نەدەکرد. لەبەر ئەوەش کە لەوەم لەدەکرد، شان و شکۆم بەوەوە لەکەدار دەبوو.

ی.ك: بۆچی شان و شکۆتان لەکەدار دەبوو؟

س.پ: چونکە من لەوەم نەدەکرد کە باوکم دەیکرد.

ی.ك: گوتەیەکی بەڵاو هەیە دەڵێت: «لەو پیاوەی جنێو نەدات، ناتوانێ ژن بهێنێ».

س.پ: بەڵێ، ئەوە کارێکە لە ژنهێنان دەچێ. دەشمەوێ باسی ڕەفتاری دایکم بکەم سەبارەت بەم بابەتە.

ی.ك: ئایا دایکتان ئافرەتێکی بەهێز بوو؟

س.پ: بێ لەمەلاو لەولا، وابوو. لەو ماڵەوەی هەڵدەسووڕاند و ملی لە بەردەم پیاودا دانەدەنواند و باوکمی سەرکوت دەکرد و دەیخستە ژێر باڵی خۆی. دیارە ئەوەش چەند هۆیەکی هەبوون.

ی.ك: ئەمە ماناى وایە ئێوە سەرکوت کردن و بێهێزبوونتان بینی و ئاواش ئەم ڕێگایەتان هەڵبژارد.

س.پ: من کابرایەکم لەلەف و بێ سیاسەت هەم لە باوکێکی بێدەسەڵات و دایکێکەوە کە هەولی دەدا بە هێزبێ و هەم لەو هاوسەنگی هێزەی کە لە نێوانیاندا پەیدابووبوو و لە کەڵك وەرگرتن لە بۆشایی دەرەنجامی ئەم ململانێیەوە فێربووم.

ی.ك: لە ڕاستیدا من لەوەم بێسەبر نییە، چونکە من لە کۆنگرەی (HEP)دا لە تەنیشت دایکتەوە دانیشتم. ئافرەتێکی تەواوبوو و لەو ناوەندەدا هەستی بە نامۆیی نەدەکرد.

س.پ: دایکم نەخوێندەوارە و خوێندن و نووسین نازانێ، بەڵام دەزانێ بە عەرەبی و فیزەوە بژی. ئەمە قەناعەتی منە.

ی.ك: ئەمە کارێکی ئاساییە.

س.پ: مەبەستێکی هەیە بەسەرمیدا سەپاند و تا ئێستاش لە بیرمە. جارێکیان لە کێشەکێشێکدا لەگەڵ منداڵانی گوندا سەرم شکا. بە گریان هاتمە ماڵەوە و لای دایکم شکاتم کرد و گوتم: لێیاندام، بێگومان بەم گریانە داوای پارێزگاریم لە دایکم دەکرد و وام چاوەڕێ دەکرد داکۆکیم لێبکات. بەڵام دایکم لەبری ئەوەی کە بمپارێزێ و داکۆکیم لێبکات پێی گوتم: «یا دەچی تۆڵەی خۆت دەستێنیتەوە، یا جارێکی دیکە پێنانێیتە ناو ئەم ماڵە». ئەمەی گوت و دووری خستمەوە. ئەم هەڵوێستەی دایکم مەبەستی و مایەی تەنگەتاوکردن بوو. پاشتر ئەم پرنسیپە کاری تێکردم و لە هەموو کاروبارێکدا جێبەجێم دەکرد. واتە من سەرەتا بە هێرش دەستم پێدەکرد. توانیم بەسەری زۆر منداڵ بشکێنم.

ی.ك: ئایا سەرتان زۆر شوێنەواری شکاوی پێوەیە؟

س.پ: لام وایە سەرم چەندین جار شکاوە.

ی.ك: ئەوەی ڕاستی بێ من ئەم خەسڵەتەم لە دایکتاندا بینی. لە کۆنگرەکەدا کە گەلێك عەملە و لێپرسراوانی پەرلەمان لەوێ بوون، خاتوو (ئەمیلارانا) لێی نزیك بووەوە و دەستەکانی ماچ کرد. لە وەزعێکدا بوو وەك بڵێی سەدان ساڵە ئەوە دەکات و هەرگیز هەستی بە وەڕزی نەکرد.

س.پ: ئەمە شیاوە، دەمەوێ بڵێم ئەو زۆری بۆ هێنام تا ئەو کارە بکەم و پێی گوتم: «لە باتی ئەوەی بە گریانەوە بنیشیتەوە، بچۆ تۆڵەی خۆت بسێنەوە و تەنانەت ئەگەر ئەوە ببێتە هۆی مردنیشت!». بەوە پاڵی پێوەنام کێشەکێش بکەم.

ی.ك: ئایا دایکتان گەلەکەی خۆش دەویست؟

س.پ: زۆر نا.

ی.ك: ئایا گیانی تێکۆشانی هەبوو؟

س.پ: بەڵێ. زۆر خەباتگێڕ و لاساریش بوو. لە ڕاستیدا زیاتر لە باوکم بەرگری لە ماڵەکەمان دەکرد. بەڵام حەزی لە کێشەکێش دەکرد. ئەگەر یەکێك مریشکەکەی بێزار بکردبایە، ئەوی دەکردە هۆیەك بۆ کێشەکێش.

ی.ك: ئایا لەگەڵ باوکتاندا زۆر دەمەقرەی دەکرد؟

س.پ: هەموو ڕۆژێك. زۆر حەزی لە دەمەقرە دەکرد. دەمەوێ ڕووداوێك لەسەر باوکم باس بکەم: ئەم کابرا ماملوە کە دەهاتەوە ماڵ و داوای ئەنە کاتێکی دەکرد، دایکم ئەنە تالەکەی دەهێنا و چەند قسەیەکی بە پلەمپلم تێدەگرت، ئەویش هەر ئەوخەنەی دەکرد ئاوڕی لێدەدایەوە و دەیگوت: «کوڕم عەبدوڵڵا ئەم ژنە جارێکی دیکە دەستی پێکردەوە هانێ تۆ بیخۆ، من ناتوانم بیخۆم».

ئەمەی دەگوت و فڕێی دەدایە سەر ئەرز. واتە وەزعەکە بەم شێوەیە پڕکێشە بوو و بریتی بوو لە ملمڵانێیەکی هەمیشەیی. دایکم خواردنی دەدایێ، بەڵام بە قسە زۆری بۆ دەهێنا. باوکیشم ئەو خواردنەی تووڕ دەدایە سەر ئەرز. ڕۆژانە ئەم دەمەقرێیەمان هەبوو.

ی.ك: ئەمە زۆر باشە، چونکە کەسایەتی ئێوەی دروست کرد.

س.پ: شەو و ڕۆژ بە ئەرچاوەوە بگرە و بەرچیمان بوون. منیش بەرهەمی ناوەندێکی بەکجار ئاڵۆزم. ڕۆژانیش دەمەقرەی لەگەڵ دەوروودراوسێ و لەگەڵ باوکم و لەگەڵ منیشدا هەبوو.

ی.ك: باشە، وا بووە تەنگەتاو بوویت و چوویتە شاخ و لەوێ بە تەنیا مایتەوە؟

س.پ: وابزانم ئەوە دەکەم ڕەنگە پەیوەند بوونم بە شاخ لەوەوە هەڵقوڵابێ. سەرەداسەرییم بۆ شاخ لەو کاتەوە گەشەی کرد. پێدەچێ هەست کردنم بە بێزاری لەو ئاوەندە ئاڵۆزە پاڵی پێوەنام بۆ شاخ. ئەو یادگاریی دیکەش کە هێشتا بە زەینمەوە ماوەتەوە ئەوەیە کە من ڕقم لەم سیستەمە بوو.

ی.ك: کام سیستەم؟

س.پ: سیستەمی ئەم کێشەکێشە و ئەو شێوازی جێنێوەی کە باوکم پەنای بۆ دەبرد و دەمەبۆڵەی دایکم و ئەرکی لەگەڵ دراوسێکاندا و کێشەکێشی من لەگەڵ

خەڵکی گوندەدا کە دایکم لە زووییەکەوە بەسەرمیدا سەپاند و گەلێك مەسەلەی دیکەش. دەتوانم بڵێم من لە تەمەنێکی منداڵییەوە کەوتمە دوورکەوتنەوە لەم ناوچەیە. هەموو ئەم مەسەلانە سیستەمێکی ترسناك بۆ خێزان دایسەپاندبوو. لەبەر ئەم هۆیە دەستم کرد بە گومان کردن لە بەهاکانی لای خێزان. ئەمەش زۆر گرنگە. ئەگەر هەستم بەو گومانانە سەبارەت بە بەهاکانی خێزان نەکردبایە، ئەوا ئەو دابونەریتە خێزانیانە هەر کاریان تێدەکردم و ئەوساش پێگەیوو بەر لەوەی بگەمە تەمەنی (١٠) یا (١٥) ساڵی تاوانێك یا خوێنڕێژییەکم بکردبایە، یان لەوانەبوو لە کێشمەکێشێکی ئەو خێزانەدا سەرم تێدا بچووایە. بەم پێیە دووچاری گوشاری توند دەبووم و پێیان دەگووتم: «تۆ بیر لە کەرەمی خێزانەکەت ناکەیتەوە و دەست لێدەوەشێنێری و وەڵام نادەیتەوە»، «ناکرێت بەو جۆرە کوڕە عاسییە قایل ببین». هەمیشە هانیان دەدام ململانێ بکەم و دەیانگوت: «ئێمە دوژمنمان هەیە. کە گەورەبووی شەرەفی خۆت دەکڕیتەوە و بەرپەرچیان دەدەیتەوە». ئەمەش سەرچاوەی دڵەڕاوکەیەکی بەردەوام بوو لەلایان، چونکە وایان لە ئەقڵم دابووم تۆڵە دەستێنمەوە. لە دڵی خۆمدا دەمگوت چی بکەم. دەکەوتمە داوی کێشمەکێشی وا ترسناکەوە سەرمی تێدا دەشکا و تووشی بریندار دەبووم. بەرد پێدا کێشانم لە بیرە. لە دڵی خۆمدا دەمگوت من هێشتا کە چکۆلەم، چۆن خۆ بخەمە داوی ململانێی گەورە گەورەوە.

ی.ك: بەڵام ئایەوی بیرام ئایا گومان کردن لە خێزانەکەت هۆی پشت گەڕانی تۆ بوو بە دوای سۆشیالیزمدا یا دەرگایەك بوو لە دەرگاکانی؟

س.پ: نازانم. من باسی یادگاری منداڵی دەکەم. ئەم بیرەوەریانە تا ئێستا لە مێشکمدا زیندوون. جا لەبەر ئەوەی کە براگەورەی خێزانەکە بووم ئەوە هانیان دەدان تەنگەتاوم بکەن تا وردەوردە ببمە جەنگاوەر و بەرگریکەری بەهاو شەرەفی خێزان. لە کاتێکدا خەیاڵی منداڵانم لەبار نەبوو ئەوە دەربهات. من پێبەندی ژیان بووم و بە ئاواتی چەند کارێکی جیاوازەوە بووم. خەیاڵم فراوان بوو و ئەمدەویست لە ژێر باری ئەو نەریتانەدا بخنکێم. هەر ئەو لوغمە نیگایەمەوە دەیانگوت: «ئەمە خاوەنی شەرەفێکی گەورە نییە». ئەوە حوکمی ئەوان بوو بەسەر مندا.

ی.ك: ئەوە چی دەگەیەنێ؟ ئەگەر بە کورتی خەیاڵی هەمووایە و بیری لێبکردبایەوە ئایا دەبووە مرۆڤێکی کەم شەرەف؟

س.پ: ئەگەر بە توندی و بە پێی چەمکی گوند بۆ شەرەف پێبەستی دابونەریتی خێزان نەبوویتایە. دەیانگوت: «ئەوە پەتی خۆی پچڕاندووە». گوندی دیکەش هەبوون ئەم ماناییانە جەختیان دەکردەوە، وەکوو «بە ئەتێ بە چیادا هەڵگەڕا» و «پەتی خۆی پچڕاند» و «بەختی دایەوە» و «دوورە پەرێز بوو» یا «هەڵگەڕابوەوە» ئەنقەست ئەتکێشم دەیگوت: «وەك چیوە وایە» و گەلێك خەسڵەتی دیکەی لەم چەشنە.

ی.ك: ئایا ئەمە مانای وایە: یا دەبێتە پێغەمبەر و تۆ سڵاوی لێدەکەی، یان پەت پچڕێنی خۆی و دەمێ پشت گوێی بخەی؟

س.پ: بە کورتی دەتوانی بڵێی من لەو سێـــیەمە هەڵگەڕابوومەوە. لەوەش گرنگتر ئەوەیە هێندێك قسە و قسەڵۆك هەبوون جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە من زۆر کێشەی گەورەم لەو ڕەفتارانەوە بۆ خۆم خولقاندووە چونکە ناکرێت منداڵێك بە بێ‌پشت بەستن بە خێزان گەشە بکات، لە کاتێکدا من خێزانم ڕووبەڕووی خۆم دانا. بەڵام ئەم دەست لێشانکردنە باشم بووە هۆی ئەوەی کە من ڕێگای ڕوو بە گورەپانی ئازادی بگرمە بەر. ئەوە سەرەتا بوو و ئەم لایەنەش زۆر گرنگە، چونکە کەشی تاقەت پڕووکێنی ئەو خێزان و کاریگەری ئەرێنی دەرەبەگانە ڕەنگە پێ‌دەمانەوە بەم پێیە من لەو باروودۆخە هەڵگەڕامەوە. ئەوە دژایەتی دەرەبەگایەتی دەگەیاند و بواری لە بەردەم ئازادیدا دەکردەوە. من تا ئێستا زۆر پەیبەندی ئەوەم و دواتر هەر ئەوە لە کەسایەتییەمدا پەنجەی بەست و بەرجەستە بوو. کێشەی بێ‌هێزییەکی لە ڕادەبەدەر و سووربوونێکی زۆر و سەپاندنی چەند کارێکی چەوت لە ئارادابوون و منداڵێکیش بە گوماتێکی ئووڵەوە دەستی بۆ ئەوە دەبرد و کەمێك هەوای لە چیادا دەبینی.

## من لە پێناوی کورددا تێناکۆشم لەبەر ئەوەی کە تەنیا کوردم بەڵکو ئەم خەباتە دەکەم لەبەر ئەوەی سۆشیالیستم.

پێم وایە کتێبێك هەیە ئەحمەد قەهرەمان نووسیویەتی، باسی منی تێدا کردووە و گوتوویەتی یەکەم هەڵگەڕانەوەی ئاپۆیە و لای لە بیرەوەرییەکی ڕاستەقینە کردووەتەوە کە من تا ئێستا لەبیرمە و ئەمەیە: لەنێو ڕەزدا کێشەکێشێك کەوتە نێوان من و برا بچووکەکەم. هەڵسی و کەوتیم بەڵا نەبوو، بۆیە ڕقم لێبوو. کەوتمە شوێنی و بەرد بارانم کرد تا گەیشتینە ئەو جێگایەی کە گوندنشینان ئاسایی داوولەیان لەسەر هەڵدەخست. ئەوە بوو هەڵگەڕایە سەر سەری تاوێرێك. براکەم پەنای بردە بەر ماڵەوە تا باوکم لێمان بدات کە ئەویش بێ‌دوودڵی ڕاوی نام و بە جنێو دایگرتمەوە. ئەوە پالی پێوەنام ڕووە و گوند لە دەستی هەڵبێم. ئەو کێشەکێشە درێژەی کێشا تا خەڵکی دێ بۆ تەماشاکردن گردبوونەوە. لە جەنگەی ئەوەدا تووشی ماندوویی و شەکەتی هاتم و یەکجار تووڕە بووم و کەوتمە دۆخێکەوە کەس بەحاڵم نەبێ. ناوا پەنام بردە بەر ئەو شێوازە کێشەکێشەی کە پڕ بە پێستی من بوو. هەر بە کارئێکردنی ئەو تووڕەییەش چوومە ماڵ. جانتایەکی شاردراوەی باوکمی لێبوو بە دزییەوە پارەکانی تێدا دادەنا. جانتاکەم برد و (١٠) لیرەم لێ‌دەرهێنا.

ی.ك: (١٠) لیره، ئەو ڕۆژانە پارەیەكی زۆر بووا

س.پ: بە پێی پارەی ئەو ڕۆژگارە دەیگەیاندە (نزیب) و بگرە (٥) لیرەشی لێزیاد بوو. مەبەستم ئەوەیە دەمتوانی بگەمە (نزیب) و(٥) لیرەشم پێدەمایەوە. هەركە پارەكەم پچڕی، لە گوند هاتمەدەر. یەكەمجار بوو منداڵێك بە تاقی تەنیا لە گەرمای مرۆڤسووتێنی ڕۆژدا بێتە دەرێ و گوند بەجێبهێڵێ. بێگومان ئەمە پێویستی بە لەخۆڕادیتنێكی زۆر هەبوو. لام وابێ من لە تەمەنی (١٠) یا (١٢) ساڵاندا بووم، بەتایبەتی كە منداڵی ئەو ڕۆژانە پەرەسەندنی پێوە دیار نەبوو. لایەنی بایەخداری ئەم مەسەلەیە ئەوە بوو منداڵێك هەستێ و تا شار بڕوات. ئەوە زاتێكی زۆری گەرەك بوو. ئەوی ڕاستی بێ ئەوە هەڵگەڕانەوەیەك دەگەیەنێ و نیشانەی توورەبییەكی بێئەندازە و زاتكردنی هەڵگەڕانەوە و مەزنایەتییە. بەم پێیە هەر كاتێك سێ هەنگاوم بنابایە، ئاوڕم لە دواوە دەدایەوە و دەمڕوانییە گوند و لە دڵی خۆمدا دەمگوت «جارێكی دیكە ناگەڕێمەوە بۆ لات». ئەمە گرنگە

یەكەم گردم تێدەپەڕاند و دەهاتمەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «زاتی ئەوەم كرد لێت دابڕێم. جارێكی دیكە نایەمەوە بۆ لات». توورەییەكی لە ڕادەبەدەر دایدەگرتم. بەرمە لە ژێر دارێكدا دانیشتم و جارێكی دیكە ئاوڕم لە گوند دایەوە. جۆش بوونەوە هەستی دەبزواندم و ژێروژووری دەكرد. من پێبەندی گوند بووم و بڕیاری یەكجارەكیمدا لێی جوێ ببمەوە. ئەمجا چوومە دێیەكی دیكەی دراوسێمان. بەڵام بەو پێی زەحمەتەوە ڕێم دەكرد. تێپەڕبوون بەو دێیەدا لە ڕووی گرانییەوە لە سەركەوتنە سەر چیای بڵند دەچێ. دێم تێپەڕاند، چونكە ئۆتۆمبێل لە دێیەكەی دیكەدا ـ لە دێی «قەرەمەزرا» ـ بوو. ئەو دێیەم تێپەڕاند و گەیشتمە «قەرەمەزرا». حەز دەكەم لەم بوارەدا ئەوە بڵێم كەمن منداڵێكی زۆر پەشۆكاو بووم.

ی.ك: كەواتە ئاوابوو؟

س.پ: بێگومان، كە لە دووری (١٠) مەترەوە بەلای خەڵكدا ڕەت دەبووم، شەرمم دەكرد.

ی.ك: پەشۆكاو و شەرمن بووی!

س.پ: پەشۆكاو و شەرمن، چۆنت دەوێ وا ناوی بنێ. بەم حاڵە گەیشتمە گوندی دووەم. ناوچەكەمان (خالفەتی) بوو و ئۆتۆمبێلی پۆستە لەوێوە بۆ ئەو گوندە دەهات. لە ژێر دارەكەدا دانیشتم چاوەڕێی ئۆتۆمبێلم دەكرد. ئەوە بوو ئۆتۆمبێلەكە هات و لە تەرچەی گەرمای نیوەڕۆدا سواربووم، واتە سەركەوتنم بە دەست هێنا. پێم وایە (٥ر٢) لیرەم دا و گەیاندمیە (بەرەجێك) كە بە پردەكەی ناسیمەوە و لەسەرەتای پردەكەدا دابەزیم و لەوێوە چووم بۆ «نزیب». خوشكە گەورەكەم لەوێ دادەنیشت. ئاوا كارەكەم بە سەركەوتوویی تەواو بوو. ڕۆژی دووەمی گوند بەجێهێشتنم دەستم كرد بە درەوی گەنم لە دەشتی «باراق». دوو ڕۆژ ئەوەم كرد و ڕۆژی دوایی دەستم هەڵشاوسا. كرێی كرێكار ڕۆژی (٥) لیرە بوو. كرێیەكەم دەست كەوت كە (١٠) لیرە بوو، هەرچی خواردنی نیوە ڕۆژە و

شەوبەشمان بوو ماست بوو. بەوە بەکەم ڕۆژانی ڕەنج کێشانی خۆم لەو دێیەدا
بەسەربرد. بە (١٠) لیرەوە ڕۆیشتم و (١٠) لیرەشم پەیدا کرد. بە ووردی بیرم
نایەت دوای ئەوە چی ڕوویدا. ئەوەی مەبەستمە ئەوە هەڵگەڕانەوەیەکی گرنگی دژی
دەسەڵاتێکی باڵاتر بوو کە خۆی لە ماڵ بەسەرداکێشانی باوکدا دەنواند و ئەمەش
پارە دەست خستن و هەوڵدان بۆ نان پەیدا کردنی بەرانبەر دەوەستایەوە.

ی.ك: کەینێ بە تەواوی جوێ بوونەوە؟ ئایا لە قۆناغی ئامادەییدا بوو؟

س.پ: ئەمە دوورکەوتنەوەیەکی تەواوەتی نەبوو. بەڵام ئەو دێیەی کە بۆی
چووم سەعاتە ڕێیەك لە دێیەکەمانەوە دوور بوو و دێیەکی کۆنی ئەرمەنی بوو.
چوون بۆ ئەو دێیە و گەڕانەوە لێی جۆرە جوێ بوونەوەیەك بوو. لێتر ئاکۆکی
کورد و تورك بەرەبەرە دەکەوتە ڕوو. ئاکۆکی ئەرمەنیش لەگۆڕێدا بوو، چونکە
کڵێسەی ئەو گوندە ئەرمەنییان کردبوو بە مزگەوت. هێندێك برادەری ئەرمەنی
لەوێ بوون. دەمەوێ ڕوونی بکەمەوە کە باوکم پەیوەندییەکی دۆستایەتی چاکی
لەگەڵ هێندێك ئەرمەنیدا هەبوو. ئەو دێیە «جیبین» هەر چەند کەسێکی کەمی
ئەرمەنی تێدا بوو. جا بەم بۆنەیەوە ئەو لاف و گەزافەی ئاشی‌یە تورکەکان کە من
بە بنەچە ئەرمەنیم ڕاست نییە.

ئەمە یەکەمجارە ئەم خاڵە گرنگەی تێدا ڕوون دەکەمەوە. هەروەها زۆربەی
برادەرانی باوکم ئەرمەنی بوون، دووکانیان هەبوو. نازانم هێشتا لە ژیاندا ماون
یان نا. لە ناوەندی دێی «جیبین»دا کابرایەکی «ئیحسان» ناوی ئەرمەنی هەبوو،
شترمەکمان لای ئەو دەکڕی. دۆستایەتی‌یەکی گەرموگوڕ پێکەوەی دەبەستین. بەو
ئەرزە کۆنە تێم نەدەڕوانین کە گوایە: «کافرو نامسولمانن»، بەڵکو بە ئەرزێکی
تازە بەو پێیەی کە خەڵکانێکی زەحمەتکێش و خاوەن پیشەن. بەم شێوەیە تێیان
گەیشتووم.

ی.ك: ئەم شێوە خۆشەویستییەی باوکت بۆ ئەرمەن وەزعێکی زۆر گرنگە.
وانییە؟

س.پ: باوکم برادەری هێندێك ئەرمەنی دراوسێ دێیمان بوو. ئێمەش لەسەر
دەستی ئەو پەروەردە بووین. لەبەر ئەم هۆیە ئەم یادگارەم لەلا مایەوە.

ی.ك: مەبەستت خۆشەویستی مرۆڤی گەلێکی دیکەیە، بە بێ‌ئەوەی جیاوازی‌یان
لە نێواندا بکەی. ئەمە هەستێکی جوانە.

س.پ: لێرەدا دەمەوێ ئەمە ڕوون بکەمەوە: ئەو تورکانەی کە لەو ناوچانەدان لە
هی ناوچەکانی دیکەی تورکیا جیاوازن. لێرە بە ناو یەکدا چوونێکی زۆری
تێدایە. سەبارەت بە من بنەچە و ڕەگوڕیشە گرنگ نین. بەڵام نەنکم (لە دایکمەوە)
تورك بوو. بەڵێ خەڵکی دێی (ئەراك) بوو کە دێیەکی تورك نشینە. نەنکم هی
ئەوێیە و خزمەکانی تا ئێستاش لەوێ دادەنیشن. مەبەستم ئەوەیە هی وا هەیە
دەڵێت ئاپۆ بە بنەچە ئەرمەنییە. تۆزێ فوت مەبەرەوە و مەڵێ «تورکە». ئەمە
گرنگ نییە. بەڵام دایکم لەلایەنی دایکەوە خەڵکی دێیەکی تورکییە. نەنکم کە

جاران بە تورکی قسەی دەکرد، پاشان فێری زمانی کوردی بوو. بارودۆخی باو ئەمەیە. دەمەوێ بە ڕوونی بڵێم: ئێمە شانازی بەم پەیوەندیانەوە ناکەین و بە کەم و کورتیشیان دانانێین بۆ خۆمان، چونکە من لە ڕێگای کوردەوە تێناگۆشم هەر لەبەر ئەوەی کە کوردم، بەڵکو ئەم خەباتە دەکەم لەبەر ئەوەی سۆشیالیستم. بەو پێیەی کەمن دەیبینم پێویستە لەسەر هەر کەسێکی سۆشیالیستی لە پێشەنگی کێشەی زۆرلێکراواندا بێ.

ی.ك: بەڵام ئەوەی کە دایکتان لەلایەکەوە سەر بە نەتەوەی تورکە، دڵی تورکە شۆڤێنیەکان خۆش دەکات. هەرچی تورکەکانی دیکەشن جیاوازی ناکەن.

س.پ: ئەو بارودۆخەی کە باسم کرد بەلای ئێمەوە هیچ گیروگرفتێك پێك ناهێنێ.

ی.ك: دەتوانین بڵێین نە باشە و نە خراپ.

س.پ: شتێکە نە مایەی شانازی پێوە کردنە نە شەرمیش.

ی.ك: من تورکم چونکە بە تورکی لە دایك بووم. بەڵام کوردم زۆر خۆش دەوێ. ئەگەر بە کوردی لە دایك ببوومایە دەبووم بە کورد. ئەوساش تورکم خۆش دەویست. بەڵام ئێستا کورد و تورکم خۆش دەوێ. ئەم زانیاریانە تورکەکان سەرسام دەکات. هەرچی بەرهەڵستە کوردەکانیشتانن ئەوا زیاتر سەرسام دەبن.

س.پ: نەخێر، پێویستە وا حاڵی نەبین، چونکە دایکم هەر هێجگار بوو بوو بە کورد.

ی.ك: باوابێ، ئەمە شتێکی گرنگ نییە. ئەمە بۆ ئێوە دەگەڕێتەوە و جۆرێکەرەوەیەکی ئەم ناوچەیەیە.

س.پ: ئەرمەن و تورك و کورد هەتا عەرەبیش لە ناوچەکەماندا بە شێوەیەکی فراوان تێکەڵکێشی یەکدی بوون. بۆیە ئەم جۆرە مەسەلانەمان پێ سەیر نین، هەیانە کچی ئەرمەنی هێناوە و منداڵیان هەیە و، منداڵەکانیان کورد یا تورکن. هەیە کچی عەرەبی هێناوە و بووە بە زنە کورد و هەشیانە کچی تورکی هێناوە و بووە بە ژنە کورد. ئەم دابونەریتەمان لەلا هەیە و زۆر ئاساییە.

ی.ك: لە ڕاستیدا دەرس خوێندنتان لە دێیەکی کۆنی ئەرمەنی و ئاخاوتنی دەنگتان بە زمانی تورکی، ئەمانە هەر دەبنە مایەی دەوڵەمەندی و نابێ بە شێوەیەکی دیکە لێکبدرێنەوە. بە پێی قەناعەتی خۆم ئەم بارودۆخە بۆ ئەوەی کە دەیکەن بەجێیە، باشە ئایۆی بۆم دەتوانین بگەینە مامۆستاکانتان؟

**بەدرێژایی پێنج ساڵ و بەبێ ئەوەی باران و بەفر پەکمان بخەن، ڕۆژانە سەعاتێك بۆ ڕۆیشتن و سەعاتێکیش بۆ هاتنەوە بەڕێوەبووین. ئەمە بە تەنیا وامان لێدەکات فێری دان بەخۆداگرتن و بەهای زانست ببین.**

س.پ: بێگومان، بۆ نموونە مامۆستایەکم لە قۆناغی سەرەتاییدا هەبوو. پێم وایە هێشتا ماوە و ناوی (محەمەد مەیدان تاش)ـە خەڵکی ناوچەی ئاجورمالە. مادامێکی ناویمان برد سڵاوی منی پێبگەیەنن.

ی.ك: ئەوە چەند جوانە.

س.پ: بەڵێ لە پۆلی یەکەم و دووەمی قۆناغی سەرەتاییدا مامۆستا بوو و، منیش قوتابییەکی خۆشەویست بووم لەلای.

ی.ك: ئەمە لە ئۆرفە؟

س.پ: بەڵێ لە ئۆرفەو قەزای (خالفەتی) و دێی (جبین). ئەم جبینە دێیەکی کۆنی ئەرمەنییە. ئەم دێیە لە سەروبەندی یەکەم شەڕی جیهانیدا و کاتێك ئەرمەنەکانیان دوورخستەوە، کرا بە دێیەکی تورکی. پێنج ساڵم تێدا خوێند و بەپێ دەچووم و دەهاتمەوە. بە درێژایی پێنج ساڵ و بە بێئەوەی باران و بەفر پەکمان بخەن ڕۆژانە سەعاتێك بۆ ڕۆیشتن و سەعاتێکیش بۆ هاتنەوە ڕێمان دەکرد. هەر ئەمە بە تەنیا وامان لێدەکات فێری دان بەخۆداگرتن و بەهای زانست ببین. مامۆستاکەم دەیبردمە ماڵەوەیان و دەیناردم ماست و هێلکەی بۆ بکڕم. ئەو خولیای مامۆستایەتی لە دەروونمدا چاند. من خۆشم دەویست و ئەویش خۆشی دەویستم. تا ئێستا ڕووداوێکم لەگەڵ مامۆستای زمانی تورکیمدا لەبیرە، بۆتانی دەگێڕمەوە. مامۆستاکەم سەرەتا فێری کردم چۆن ناوی خۆم بنووسم. دیارە وشەکانم هەر بە تەماشا کردن هەڵدەبژارد. جا کە پیتەکانم بە پێی ڕیزبەندی پیتەکانی ئەلف و بێ ڕادەگواستە، هەستم بەقورسی دەکرد. لەبەر ئەمە هێندێك وشەی کوردیم تێکەڵی پیتەکان دەکرد.

ی.ك: ئایا مامۆستاکەت هەرگیز کوردی نەدەزانی؟

س.پ: نەخێر، نەیدەزانی، منیش تورکیم نەدەزانی.

ی.ك: ئەمە زۆر باشە.

س.پ: بەکورتی بەم شێوەیە دەستم بە خوێندن کرد. کە چەند وشەیەکیش فێربووم، پێم وایە سەرنجی مامۆستاکەمم ڕاکێشا و بەختیار بوو. ئەوە لە جموجووڵەکانی تێگەیشتم. لەوە دەچوو دڵشاد بێ، چونکە کوڕە کوردەکەی ئەم ڕێبازەی گرتەبەر، یا لەبەر ئەوەی بینیمی بەسەر دژواریەکاندا زاڵ بووم.

ی.ك: ژمارەی ئەو قوتابیانەی کە لە پۆلدا لەگەڵتدا بوون چەند بوو؟ دەوری پەنجا دەبوون؟

س.پ: زۆر بوون، مەبەستم ئەوەیە من تەنانەت لەو قۆناغەشدا چالاکی‌یەکی بێ‌ئەندازەم هەبوو و بەرزترین نمرەم لە مامۆستاکانم وەردەگرت، هەر لە پۆلی یەکەوە تا دوا پۆل کە قوتابخانەم تێدا بەجێ‌هێشت. مامۆستاکان چەپڕەو و ڕاستڕەویان تێدا هەبوو. هەمووشیان بێ‌وێنە ڕێزیان لێ‌دەنام. من لەوە بۆ خۆمەڵکێشان نالێم. تا ئێستاش لە بیرمن، لەوانە «ئایدین یالچین» کە هێشتا ماوەو ئەویش مامۆستام بوو و پاشتر لە کۆلێژی زانستە سیاسیەکانیشدا دەرسی پێ‌دەگوتم و نمرەی تەواوی دەدامێ. ڕاستڕەوەکان دووم دەکەوتن و ئەوەم لەیادە. ئەوەی کەوای لە ڕاستڕەوەکان دەکرد وریابنەوە و سەرراخم بکەن هەڵوێستەکانم بوو. ئەوەی مەبەستمە، زۆر هۆگری مامۆستاکانم بووم و ڕێزلێنانی گشتیانم هەبوو. مامۆستایەکمان بە پلەی مەیجور هەبوو، مامۆستای ئەدەب بوو لە کۆلێژی جەنگ و یەکجار دڵبەندم بوو و دەیناسیم. لەدوا قۆناغدا بە قوتابیەکانی دەگوت: «بابەتی ئەو باسەی کە عەبدوڵلا نوسیویەتی ناومەتە گیرفانم و دەیبەم بۆ کۆلێژ و لەگەڵ مامۆستایانی زانکۆدا مشتومڕی لەسەر دەکەم».

نەمدەزانی چیم نووسیوە، پێم وانی‌یە بابەتێکی بە پێز بووبێ. بەڵام کابرا بالی هەڵبدەسەنگاند. ئەوەی مەبەستمە من نرخی مامۆستاکانم دەزانی. پێویستە مرۆڤ ڕێزی مامۆستاکانی بگرێ، جا ڕاستڕەو بن یان چەپڕەو. ڕێزگرتن گەرکە. دەیانزانی من سەرقاڵی هێندێك کاروباری دیکەم و سەرەڕای ئەوەش خۆشیان دەویستم. گەلێك ڕەفتار و هەڵوێستی سەیرم لێ‌دەردەکەوت. هەموو ئەوانە بانگەوازی شۆڕشگێری بوون. ئاخر کورد یا هەر مرۆڤێك ئەگەر ویستی ڕابپەڕێت چی ناکات؟ من بەرخودانێکی زۆرم هەیە. وەختێك لەوە دەڵێم ئەمە مانای وایە من پەرەم بە سیستەمێك داوە و پێوەندیەکی بەتینم بە سیستەمەوە پێشانداوە، ئەگەر پێچەوانەی ئەوە بووایە، تاقە ڕۆژێك دەرمان نەدەبرد. ئێمە بە شێوەیەکی لە پەسان نەهاتوو گرێدراوی مرۆڤین. خۆشەویستی و ڕێز لای ئێمە جێی سەرسوڕمانن.

ی.ك: قۆناغی ئامادەییتان لە کوێ خوێند؟

س.پ: لە «نزیب» خوێندم.

ی.ك: ئایا قوتابخانەیەکی ناوخۆیی بوو؟

س.پ: نەخێر، لای خزمەکانم نیشتەجێ‌بووبووم. بەگەلێك دژواری گەورەدا تێپەڕ دەبووم. ئەو تەنگەی کە باسیم بۆ کردن مانای خەباتی لە پێناوی ژیاندا دەزانی. لەبەر ئەوە چاودێری دەکردم و بەتەنگمەوە دەهات وەك باڵێی لەلەیە.

ی.ك: ئایا زۆر بەتەنگ خوێندنەوە دەهات؟

س.پ: نەخێر.

ی.ك: تا ئێستاش خوێندن و دەرس گوتنەوەتان زۆر خۆش دەوێ و ماندوویی و نارەحەتی لەپێناوی نەك هەر پێ‌خوێندنی مرۆڤەکانتاندا بەڵکو بۆ هەرکەسێك بێتە ڕێگاتان نازانن. بەکورتی تۆ لەم بابەتەدا مامۆستای گەلەکەتانی. باشە ئەم ئارەزووە لە کوێوە دێت؟

## هێندەی قوتابییەکی چالاك بووم،
## هەمان کات لاوێکی بەشعوور بووم بۆ ئایین و نوێژەکانم.

س.پ: هەر لەلایەنی قوتابخانەوە نا، لەلایەنی ئاینیشەوە هەروا بووم. دووعا ئاینییەکانم بەزۆری لەبەر بوون. بالی لەبیرمە تا سوورەتی (٣٣)م لەبەرکرد. مادامێکی باسی ئاین دەکەین، بێڵە با باسی ڕای مەلای گوندت سەبارەت بە کەسایەتی خۆم بۆ بکەم.

ی.ك: باشە، تۆ دەچوویتە دیی ئەرمەنی بۆ خوێندن، چۆن دەچوویتە لای مەلا؟

س.پ: پێم وایە ئەوە لەو هەمان ساڵانەدا بوو کە تێیاندا دەچوومە قوتابخانەی سەرەتایی. نوێژەکانیشم دەکرد. کەس لە دێ ڕێی چوونەلای مەلای لێنەدەمە نەدەکردم، چونکە دەچوومە مزگەوت.

ی.ك: باشە، بەڵام کێ پێی دەخوێندی؟ دایکت؟

س.پ: نەخێر، خۆم بەتەنێ دووعام لەبەر دەکرد، چەند کتێبێکی دووعام لەبەر دەستدا بوون.

ی.ك: ئایا بە لەطف و بێی لاتینی بوون؟

س.پ: بەڵێ بە لەطف و بێی لاتینی بوون. ئەو کتێبانەشم دەخوێندەوە کە پێوەندییان بە داستانەکانی «عەلی» ی سەردارمانەوە ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ هەبوو. لەوبارەیەوە بیرەوەرییەکم هەیە. مەلایەکی عەلی ناو لە دێدا هەبوو، لە داستانەکانی «عەلی»ی سەردارماندا پسپۆڕ بوو. باوکم شەوانی درێژی زستان دەیبردم بۆ لەوێ. منیش ئەو ئارەزووەم هەبوو ئامادەی لەم جۆرە کۆڕ و مەجلیسانە بم. لەوێ گوێم لە داستانەکانی «غازی بەتاڵ» و «عەلی»ی سەردارمان دەگرت. شێوازێکی بەتامی لە خوێندنەوەی ئەم داستانانەدا هەبوو و دەستی دەجوولاند و دەیگوت: «عەلی وا شمشێرەکەی هەڵکێشا و وا وەشاندی و وا دەرگای خەیبەری کردەوە و بەو شێوەیە پردێکی دروست کرد و وای بەسەر ئەمرووددا زاڵ بوو». بەم شێوە کاریگەرە ئەم داستانانەی دەگێڕایەوە.

ی.ك: ئایا لە مزگەوت دەیخوێندنەوە؟

س.پ: نەخێر، شەوانی درێژی زستان لە کۆڕ و مەجلیسەکاندا بە چەند ڕۆژێك دەیخوێندنەوە. ئەو خوێندنەوانە زۆر کاریان تێدەکردم و خەیاڵێکی «عەلی»ی سەردارمانیان لەلا خولقاندم کە لە کادێری سەرکردە دەچوو.

ی.ك: واتە پاڵەوانێك بوو.

س.پ: بێگومان پاڵەوان بوو، غازی بەتاڵ و خەیاڵەکەشی هەروا بوون.

ی.ك: لە هەزارانەوە نزیك و لە بەرانبەری زۆرداراندا بوو. ئاوا هەڵیدەسەنگێنن، وانییە؟

س.پ: با بڵێین «عەلی» سەردارمان ڕووبەڕووی زۆرداری و زۆرداران کەسێکی دەرووکەرەوەی وڵاتان بوو و شمشێرەکەی لەپێناوی گەلدا ڕادەوەشاند. لەوە

باریدەی نەشونماکردنی ئارەزووەمیدا و ئەم ئارەزووە لەلام دەستی پێ‌کرد.
ی.ك: ئایا دایکتان زۆری بۆ نەدەهێنان لێری سوورەتەکانی قورئان ببن؟
س.پ: نەخێر، دایکم ئەوەی نەدەزانی، من بەویستی خۆم دەستم بەخوێندن کرد. سەبارەت بە بابەخدانیشم بە ئاین و قوتابخانە، ئەوە بە هاندانی خودی خۆم بوو، چی بۆ خوێندن پێویست بوو کردم. هێندەی قوتابییەکی باش بووم، هەمان کات مشووری ئاین و نوێژەکانیم دەخوارد. مەلای دێ بەم شێوەیەی خوارەوە هەڵیسەنگاند بووم: «ئەمەدوڵلا ئەگەر بەم خێراییە بڕۆی، دەفڕی». مەلای دێ هێشتا ماوەو دەتوانن ئەوەی لێ‌بپرسن. ئەو بوو هێز و ئارەزووی تێدا بینیم و زانی چۆن لەلام دروست دەبێ.
ی.ك: ئایا مەبەستی ئەوە بوو دەبیتە فریشتە؟
س.پ: بێ‌گومان زۆر، مەبەستی ئەوەبوو من دەبمە پیاوچاکێك یا فریشتەیەك. ئەمە ڕاستگۆیی و ئارەزوو و پەیبەندبوون دەردەبڕێ. بەم پێیە هەڵیدەسەنگاندم. لێرەدا گرنگ ئەوەیە هەڵسەنگاندنەکانی لەگەڵ هی مامۆستاکانیدا هاوجووت بوون. من باسی بیرەوەرییەکانی ئەم دواییەم ناکەم، بەڵکو باسی بیرەوەرییەکانی منداڵیم دەکەم. ئەو گۆڕانکاریانەش کە پاشتر ڕوویاندا سەرەتاوەکانی لێرەدا بە نهێنی شاردرانەوە. وەك پێشتر گوتم گرنگترینیان بێ‌هێزی لە ڕادەبەدەر و ئەوپەڕی هەژاری کە منی منداڵی تێدا دەژیام و لەلایەکی دیکەوە ئەو ئانەی کە پەیدا دەکرا و ئەو هەوڵەش کە بۆی دەدرا، هەموو ئەمانە بەلای منەوە چەند کێشەیەکی گەورە بوون.
منیش مەترسی دابونەریتم دەبینی و نەمدەویست بە ئاسانی لە ژێر باری گرانیدا بخنکێم. هێندێك خەیاڵم هەبوون، بەڵام بەدیهێنانیان گران بوو بەڵکو مەحاڵیش بوون، لاموایە هەر ئەم خەیاڵە بوو دەیخستمە سەر ڕێی نوێژ و قوتابخانە. ئەم نوێژ و قوتابخانەیە وایان لێ‌دەکردم هەست بکەم باشترین ڕێگان بۆ بەدیهێنانی خەیاڵم و بۆ هەڵگەڕانەوە لە دابونەریتەکان و ئەزموون و ئارەزاییان پێ‌دەبەخشیم. لە هەموو ئەوانەشدا دەستەپاچەییم دەبینی. گەلێك دژواری گەورەم دەبینی، بەڵام ملم دانەدەنەواند. بەگوێرەی توانای منداڵیم یەکجار ناکۆك و پرخەڵەت بوو.
ی.ك: باشە، ئەو کاتە بەپێی خەیاڵی ساوات دەتویست بچیتە چ قوتابخانەیەك؟
س.پ: دەمویست بێ‌ئەملاوئەولا بچمە قوتابخانەی سەربازی. پێش ئەوەش بە خۆمم دەگوت دەبێ بچمە زانکۆی (الازهر) تا زانستی ئاینی وەربگرم. ئەو خولیایەم هەبوو. کە ئەوە بەشێوەیەکی ئاسایی بەدی نەهات، زانیم ناتوانم بەرەو پێش بڕۆم و خەونەکانم تەفروتوونا بوون، بۆیە دەستم لێ‌هەڵگرتن. دیارە ئارەزووی یەکەمم درێژەدان بوو بە خوێندن لە قوتابخانە ئاینیەکاندا. دوای ئەوە کەڵکەڵەی قوتابخانە سەربازیەکان کەوتە سەرم.
ی.ك: لێرەدا دەتوانین بڵێین ئێوە هەر لە منداڵییەوە خولیای گۆڕینی ڕژێمتان

هەبوو سا یا بە ئاین یا بە ئامرازی سەربازی.

## مستەفا کەمال هەموو شتێکی بەهێزی دەوڵەتەوە دەکرد، بەڵام من هەموو شتێك بەهێزی گەلەوە دەکەم

س.پ: بەڵێ، ئەمە بە ڕوونی دەبینرا. لەم بابەتەشدا بیرەوەرییەکتان بۆ دەگێڕمەوە: هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتایی بووم و ئێمە خەریك بوو دوایمان پێدەهێنا. هاوڕێیەکم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو و لەسەر دار دانیشتبووین و باسی نەخشەی یەکەم کوردەتام بۆ دەکرد و پێیم دەگوت: «دەتکەم بە سەرکردەی هێزەکانی وشکانی و خۆشم سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی بەدەستەوە دەگرم و هەردوو یەکدەگرین بۆ سەرکردایەتی کردنی کودەتاکە».

ی.ك.: ئەمە لە قۆناغی سەرەتاییدا بوو؟

س.پ: بێ گومان، لە قۆناغی سەرەتاییدا خەیاڵی وام دەکرد. ئەمە بیرێکی شێتانە بوو، بەڵام لە ئارادابوو. من ئێستاکە بیر لەوە دەکەمەوە کە چۆن ئەو شێوازە شێتگیرانەم لەو تەمەنەدا بەخەیاڵدا هاتوون بۆ گۆڕینی ڕژێم. ناشزانم ئەو خەیاڵانەم لەکوێوە بۆ دەهاتن. تا ئێستاش ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم...

ی.ك: ئەوە لەچ ساڵێکدا بوو؟ ساڵانی شەست بوو؟

س.پ: بەڵێ زۆر ڕێی تێدەچێ. لەوانەیە ئەم بیرانە بەکاریگەری کودەتای ٢٧ ی ئایاری ١٩٦٠ بووبێ، چونکە من لەو کودەتایەم لە بیرە.

ی.ك: پێم وایە ئەوە کاریگەری هەبووە. باشە ئاپۆی برام سەرنجی شتێکی دیکەت داوە. با کوردستان بخەینە لاوە، لە تورکیا کە فەرمانبەران لە بەڕێوەبەرەکەیان ناڕەحەت دەبن بە چاوپۆشین لەوەی کە (PKK) و ئاپۆیان خۆش بوێ یان نا، دەڵێن دەتوانین چی بکەین، ئایا بچینە لای ئاپۆ دەردە دڵی لەلا بکەین؟ وا دەڵێن. لەوەی مەبەستمە ئاپۆ و (PKK) بوونەتە بابەتێکی جێی مشتومڕ بەڕادەیەك چوونەتە نێو باس و خواسی ڕۆژانە.

س.پ: تا ئێستا من ناڵێم « من شتێکم بە گەل داوە ». بەڵام گەل دەزانێ من شتێکی دەدەمێ. بە ئاسانیش چاوەڕوانی ئەوە دەکات. ئەوان هەوڵدەدەن هەر لە ئێستاوە لەو شتانە بەهرەمەند بن کە خەویان پێوە دەبینن. لەوەتا دەڵێن «ئاپۆ فلان شت دەدا» و ئەمە پاداشتی ئاپۆیە و ئێوەش لەم مەسەلەیە بە ئاگان، چونکە لە ڕۆژنامەکانیشدا ڕەنگی داوەتەوە. ئەو مووچەیەی کە دراوە بە گوندپارێزان(*)، مووچەیەکە لەئەندازەبەدەر و کەسانی دیکەش وەری ناگرن، ئەوان چەك و پاداشتی زۆریان دەدەنێ، لەهەمان مووچە و پاداشتی ئەو فەرمانبەرانەدا کە لە کوردستان کاردەکەن. بەڵام کە باروودۆخەکە دەگاتە ئەم ڕادەیە، ئەم فەرمانبەرە هەڵدەستێ و بە

(*) دەوڵەتی تورکیا بە جاشەکانی باکوری کوردستان دەڵێت گوندپارێزان

بەرپێوەبەرەکەی دەڵێت سکاڵای خۆم ببەمە لای ئاپۆ؟ ئەمە کارێکی زۆر ئاساییە، چونکە گەل دەبینێ ئەو حاڵەی کە دەوڵەت پێی گەیشتووە ـ واتە حاڵی بێچارەسەری ـ لە(PKK) و ئاپۆ بەدەر هیچ هێزێکی دیکە لەبەردەم هێزی دەوڵەتدانین چارەسەری بکەن. هەموویان ئەمە دەبینن.

ی.ك: باسی مەسەلەیەکی دیکەت بۆ دەکەم. لەخاوەندی کاری ژنەکەمدا چەند بەرپێوەبەرێکی گشتی هەن. ڕۆژێکیان دانیشتبووین، یەکێکیان گوتی: وەك چۆن پەندەکە دەڵێت: «هەموو ڕێیەك دەچێتەوە سەر ڕۆما»، ئێستاش هەموو باس و خواستێك بە(PKK) و ئاپۆ کۆتاییان دێت. ئەو کاتە ژنەکەم گوتی ئەوە چی دەڵێی، ئەگەر ئەتاتورك بەلای تورکانەوە شتێك بگەیەنێ، ئەوا ئاپۆش بەلای کوردانەوە هەمان شت دەگەیەنێ. چی لەسەر ئەم بیرکردنەوەیە دەڵێی؟

س.پ: ئەم قسەیە محەممەد عەلی بیرەندیش گوتوویەتی.

ی.ك: ئەمە خۆم ڕێکم نەخستووە، ژنەکەم گوتوویەتی.

س.پ: وەزعی ئێستام کەمێك جیاوازە. من لەوانەم کە باش لە مستەفا کەمال حاڵیبوون. ئەو دەسەڵاتەی کە هەمە و ئەو قۆناغە سیاسییەش کە پێیدا ڕەت دەبم هێزی شیکردنەوەی سەرکردایەتیم پێدەبەخشن. جا کاتێك تێدەکۆشم لەژیانی مستەفا کەمال حاڵی ببم، دەتوانم هەڵسەنگاندنێکی باش بکەم و بزانم مستەفا کەمال سەبارەت بە نیشانێك کە تێی گەیشتووم چی دەگەیەنێ. ناشڵێم لە هەندێك حاڵەدا هیچ لێکچوونێك لە نێوان شێوازی هەردووکماندا نییە.

ی.ك: بۆ نموونە، بە ڕاشکاوی دەڵێم من دەتبینم لەو زیاتر باوەڕت هەیە.

س.پ: مستەفا کەمال هەموو شتێکی بەهۆی دەوڵەتەوە دەکرد، بەڵام من هەموو شتێك بەهۆی گەلەوە دەکەم. لەم حاڵەدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوانماندا هەیە. خۆ مستەفاکەمال هەموو هێزی خۆی لە دەسەڵاتی دەوڵەت و بەرێوەبردنی کاروبارەکانیەوە وەردەگرت. هەرچی منم تەواو پێچەوانەی ئەومم، پشت بەگەلێکی هەژاری کەم ڕێکخراوەوە دەبەستم و هەوڵدەدەم لە ڕێگای ئەوەوە هەموو شتێك بەدی بهێنم. ئەم گەلەش حاڵی حازر پێدەخێتە نێو دۆخێکی دژ بە دەوڵەت و پشت ئەستوور بە توانای خۆی ئامراز و هێزی هەن. بەڵام مستەفاکەمال لەو دەوڵەتەدا نوقم بوو بوو کە هەموو شتێکی بۆ کرد و کوێی ویست لەوێی دانا و دەوڵەتی پەرست. سەرەنجام ئەو دەوڵەتەی وا مستەفاکەمال دایمەزراند، بوو بە دەوڵەتێکی پێبەندکراو. مانای وایە تۆ ئەگەر دەوڵەت بپەرستی و ببیە کابرایەکی سەرپەرگری دەوڵەت، ئەوە هیچ سەروساختێکی لەگەڵ سەربەخۆییدا نییە، تەنانەت ڕەنگە دژی ئەوەش بێ. پیاوی یەکجار سەرپەرگری دەوڵەت هەموو شتێك لە دەوڵەتدا دەبینێتەوە، واتە دەبێ بە دەرگەوان و ئەمەش دەکێشێتەوە بۆ پێبەند بوون و نموونەی ئەمەش دەوڵەتی تورکیایە. مانای وایە بەر لە هەموو شتێك گەل لە ڕووی مەعنەوی و زەینییەوە لەسەر سەربەخۆیی ڕابهێنی و بیکەیە گەلێکی جەنگاوەر و خەباتگێڕ. بەم مانایە گەلەکەمان لە ڕووی ئایدۆلۆژی و مەعنەوییەوە لە گەلی

تورکی تێهەڕاندووە و بووە بە گەلێکی جەنگاوەر. ئێمە ئێستاکە ئەم خاڵە تاوتوێ دەکەین و هەوڵەکانمان لەم ڕێگایەدا چڕ دەکەینەوە. هەروەها لای بەهای شۆڕشگێڕی و بەهای مەعنەویش هەڵوێستە دەکەین و بەکردەوە بەجێیان دەهێنین.

ی.ك: مستەفا کەمال کە نوێنەرایەتی «دەوڵەت» دەکات لەسەر ڕێکخستنێکی حازر بەدەست دانیشتووە،

س.پ: بێ لەملاوئەولا وەهایە، چونکە مستەفا کەمال شەڕی ڕزگاری بە سوپا و حوکمدارانی ویلایەتەکانەوە دەست پێ کرد. بەڵام من قەرزار بووم.

ی.ك: ئێوە لە سفرەوە دەستتان پێ کرد.

س.پ: نەخێر، وەك گوتم قەرزار بووم، چونکە خاڵی سەرەتا لەخوار سفرێشەوەیە. کە دەستم بەم کارە کرد، نە یەك گوللە و نە هەڤاڵێکیشم هەبوو. ڕەنگە باش بووبێ کە خاڵی سەرەتا بەم شێوەیە بێ. ئەگەر لەگەڵ مستەفا کەمالدا بەراوردیان بکەین دەبینین پشتی بە دەوڵەت بەستووە و نیشتمانپەروەرییەکەشی زۆر پشتی بە دەوڵەت بەستووە. لە کاتێکدا لای من وا کەوتووەتەوە: من بە گەل پشت ئەستوورم و هێز و هەیبەتم لەگەڵەوە هەڵدەهێنجم. پێویستە باش ئەوە بەراورد بکرێت.

ی.ك: باشە، بەڵام نیشتمانپەروەری مستەفا کەمال چۆن دەبینن؟ قسەیەك هەیە بە زمانی (مستەفا کەمال)ەوە کراوە دەڵێت: «کورد بە تورکی لە دایك بووە».

س.پ: بەڵێ تێدەگەم، ڕەنگە گەورەبوونی وەك وردەبۆرژوایەك خستبێتیە خانەی ئەم بارودۆخەوە. ئەوە بوو ساڵی ١٩١٧ وەختێك لە دیاربەکر و سیلوان بوو، جلی کوردی لەبەر دەکرد و لە کچانی کورد نزیك دەبووەوە. بەسەرهاتێکی ئەو هەیە لەسەر خواستنی کچی پیاو ماقووڵێك. لێرەوە ئەم دۆخەی خوارەوە بەئەنجام دەهێنین: ئەو کاتە مەترسی ئەوە لە گۆڕێدابوو سەرتاسەری تورکیا دووچاری داگیرکردن بێ. ئەگەر هەموو تورکیا لەدەست بچووبایە، مستەفاکەمال دەبووە مەلیك یا موڵکدارێکی کورد. تا ئێستاش چەند وێنەیەکی ئەو لەوێ هەن دەستی چەند مەلایەك و سەرۆك خێڵێکیان تێدا ماچ دەکات. لەوێ چەندەها کۆبوونەوە و کۆنگرەی لە سیواس و ئەرزەڕۆم سازدا. سەربارێ ئەو نامە و بانگەواز و ڕاگەیاندنانەی کە ئاڕاستەی پێشەوایان و پیاو ماقووڵانی کوردی کردن و تێیاندا دەڵێت: «با ئێمەی کورد و تورك پێکەوە دژی دوژمنی هاوبەش بکەوینەخۆ». ڕاگەیاندنی گشتی «ئەماسیا»ش هەیە.

گرنگ ئەوەیە مستەفا کەمال ئەم نەریتە مێژوویە و ئەم ئارەزووەی هەیە بۆ ڕزگارکردنی ڕاستی تورك و ڕێبەری کردن و ڕێنوێنی کردنی. ئەمەش نەریتێکی یەکجار ترسناکە. جارێکی دیکەش بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە و سوور بووە لەسەر هاوپەیمانەتی کردن لەوێ. لەوەدا لەو سوڵتان سەلجوقە دەچێ کە سووربوو لەسەر گەیشتنە دەرگاکانی بەغدا و، لە سوڵتان سەلیم یاوزیش دەچێ کە ویستی بکاتە ناوەڕاستی ئەنادۆڵ و گەلەکەی تێدا جێنشین بکات. ئەمەش بەڵگەی

دەستبەستەیی و سەرنەکەوتنە و لایەنێکی گرنگیشە. ئەم ئەزمونە سێ کەڕەت لە
مێژووی تورکیادا دووپات دەبێتەوە و نێوانی هەر دوو کەڕەتێکیش نزیکەی
(٥٠٠) ساڵە. لە هەر سێ کەڕەتەکاندا پشت بە کورد دەبەستن و بەو ڕێککەوتن و
پەیمانانەی کە لەگەڵ پێشەوایانی کورددا موریان دەکەن دەگەنە ڕێگا چارەیەك بۆ
کێشەکانیان و کردنەوەی گرێ کوێرەکانیان تا مەترسیەکەیان لەسەر لادەچێ و بە
پشت ئەستوور بوون بە کورد ڕێگایەك بۆ دەرچوون لە مەینەتییان دەدۆزنەوە. لە
سەردەمی مستەفاکەمالدا ئەمە ڕوویدا. هەموو بەڵگەنامەکان هەن و لەبەر دەستدان
و ئەمە مەسەلەیەکی ئاشکرایە و نکوولی لێناکرێت.

ی.ك: دەمەوێ باسی ئەم لایەنەش بکەم: مستەفاکەمال هەمیشە بیری لە
دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ کچانی پیاوماقوڵان و دەوڵەمەندان و چینی باڵادا
دەکردەوە.

س.پ: بەڵێ، ئەو لایەنە هەر بە ناتەواوی مایەوە، بۆیە پەرم کردەوە. ئەو وا
تەماشای دەوڵەتی دەکرد وەك بلێی هەموو شتێکە. لەبەر ئەمە بایەخی بەو چینانە
دەدا کە دەوڵەت پشتی پێدەبەستن و هێزی خۆی لێهەڵدەهێنجان و پەیوەندیەکانی
لەو چینانەدا چڕ دەکردەوە. ئەو ئیشتمانپەروەریەکەی ئیشتمانپەروەری چینە
باڵادەستەکان بوو لە دەرەبەگەکان و کۆمپرادۆرەکان. واتە ئیشتمانپەروەریەکەی
ئیشتمانپەروەری گەل نەبوو. بەڵام ئەگەر بلێی چۆن بە ئاسانی بە باروودۆخێکی وا
گەیشت، ڕاستیەکەی دەوڵەت لە قۆناغی سەرەتاییەوە ـ لەو قوتابخانانەش کە لە
سلانیك بوون هی دەوڵەت بوون ـ تا دەگات بە کۆلێژی سەربازی جەنگ خستیە
ژێر باڵی خۆی. ئەو لە هەموو شتێکدا قەرزاری دەوڵەت بوو. منیش ئارەزووم بوو
بچمە کۆلێژی سەربازی. لەوانەیە لەم خاڵەدا لێك بچین. بەڵام من ئەو دەرفەتەم بۆ
نەڕەخسا، چونکە ئەو خولیا کوردیانەی کە لە زوویەکەوە دەستیان پێکرد لەلام
تێیانگەیاندم هیچ ئومێدێکم لە چوونە نێو سوپادا نییە. جا لەبەر ئەوەش کە
گەلی کورد بێهێز بوو، ئەوە وەك کەسێك زۆر نارەحەتی کردبووم. لەم ڕووەوە
میللەتی کورد کۆسپێکی گەورە بوو لەبەردەممدا و ڕێی نەدەدام پێش بکەوم،
چونکە بەو پێیە دادگاییان دەکردم، هەر لە یەکەم هەنگاوی گەورەبوونمەوە ئەم
هەست و دڵەڕاوکەیەم هەبوو، واتە خولیای سەرکەوتنم لەلا هەیە. بەڵام مەسەلەی
کورد تەگەرەی تێدەخست. سەبارەت بە چوونە کۆلێژی سەربازی، کورد بوونم
کۆسپی بنچینەیی بوو. من ئەوەشم زانی و بەرەنگاری بوومەوە. کە هەوڵیشمدا،
سەیرم کرد دەرگاکانم لە ڕوودا داخراون. ئەوسا زانیم دووبەرەکی نێوان گەلان و
چینەکان شتێکی حاشاهەڵنەگرە. ئەگەر سەرنج بدەن ئەمە کێشەیەکی گرنگە. هەر
لە منداڵییەوە خولیای سەرکەوتن لە دروست بوونمدا هەیە و خەیاڵ دەورێکی
گرنگ دەبینێ. کورد بوونم تەگەرەی خستە نێو هەموو ئەوانە و وای لێکردم لە
تەمەنێکی کەمەوە ببمە کەسێکی نەتەوەیی و بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی بژیم. ئەمەش
کارێکی گەورەی کردە سەر کەسایەتیم، هیچ نەبێ وەك کاریگەری ئاین.

ی.ك: لەلایەكی دیكەوە، مستەفا كەمال تا پێش شۆڕشی شێخ سەعید بە شێوەیەكی شێلگیرانە هەستی نەتەوەیی توركی نەبوو. كە لەوێ لێشی كرد ئەمجا ئەم هەستانە لەلای دەستیان پێ‌كرد.

س.پ: لەوانەیە وابێ، بەڵام من ویستم بەراورد لەنێوان گەورەبوونی مستەفا كەمال و هی خۆمدا بكەم و خاڵەكانی لێكچوون دەربخەم.

ی.ك: ئەو قسەیەتان: «لەو بە دەوڵەت دەستی پێ‌كرد... منیش بەگەل دەستم پێ‌كرد» قسەیەكی شایەنی بایەخ پێدانە.

س.پ: بێ‌لەملاولەولا وەهایە.

## لە منداڵیمدا تەنانەت كاتێكیش كە ململانێم لەگەڵ ماردا دەكرد، پلانی باشم بۆ ئەوە دادەڕشت.

ی.ك: خاڵی دووەمیش كە تۆمارم كرد قسەكەتانە «لەبەر ئەوەی ڕێگایەكی دیكەم بۆ ڕزگاركردنی گەلی كوردستان و سەرخستنی نەدۆزییەوە، بۆیە ڕوومكردە سۆشیالیزم».

س.پ: ئەو سەرەداوە سۆشیالیستیانەتان بۆ ڕوون دەكەمەوە كە لە منداڵیمدا لێرە و لەوێ كۆمكردنەوە. دەبوو خۆتان لە گێڕانەوەی قسەكانمدا دەریان بهێنن. من بە تەبیعەت شەیدای گەلەكۆمەكردنم، بە تایبەتی گەلەكۆمەی بێ‌سەرموت. كاتێك لەنێو تاقمی منداڵاندا نەبوومایە، هەستم بەدوەرزی دەكرد. هەمیشە بیرم لەوە دەكردەوە چۆن منداڵان لە نێو چوار دیواری بۆگەندا بهێنمە دەرێ. گەورەترین ئارەزووی ڕۆژانەم ئەوەبوو منداڵێك لەگەڵ خۆمدا ببەم و ڕوو بكەینە چیا بە بیانووی مار كوشتن یا چۆلەكە گرتن یان گەیشتنە هێلانەی هەڵۆ، بە تایبەتی كە من دڵبەندی هێلانەی هەڵۆ بووم. ململانێ كردن لەگەڵ ماردا بەلای منەوە مایەی سەرسامی بوو و لەوەدا بەناوبانگ بووم. هەر ماریان بدیبایە، بانگیان دەكردم.

ی.ك: چ جۆرە مارێك؟ ڕەش مار؟

س.پ: نەخێر، هەموو جۆرە مارێك هەبوون. تەنانەت لە منداڵیشمدا كە ململانێی مارم دەكرد، باش پلانم بۆ دادەنا.

ی.ك: ئەمە مانای وایە تۆ هەتا لەو كاتەیشدا فێر بووی چۆن ململانێی دوژمنی خراپ و ناپاك بكەی.

س.پ: بەڵێ، مار ناپاك و فێڵاوییە.

ی.ك: دوایی دێینەوە سەر ئەوە. بەڵام من دەمەوێ باسی بەراوردێك بكەم، ئەویش ئەوەیە من كاتێك بەراوردم لە نێوان مستەفا كەمال و عەبدوڵلا ئۆجەلاندا دەكرد، دەبینین لە مستەفا كەمال و گەلێك سەركردەی دیكە بەجەرگترن.

س.پ: هەڵە نیت؟

ی.ك: نەخێر، نموونەکانیشم ئەمانەن: کە لە لەندەن بووم و ئەو نامەیەم خوێندەوە کە بە بۆنەی «نەورۆز»ەوە ناردبووتان، ئێوە لە قورسترین کاتدا بە بێگانان دەڵێن «PKK مارکسی-لینینییە». لە هەموو گفتوگۆیەکیشتاندا باسی سۆشیالیزم دەکەن، سەرباری هەبوونی چەندەها خەیاڵ لە واقیعی کوردەوارییدا. هەروەها هەڵوێستتان لە سەروبەندی کۆنفرانسی بەندیخانانەدا، بۆیە من ئەم هەڵوێستانەتان زۆر بە بەجەرگانە دەبینم.

س.پ: نەخێر، من ناڵێم نائارام یا دوودڵ، ترسنۆکم یان نا، ئەوی ڕاستی بێ من مرۆڤێکی یەکجار بە خابڕووم و لێبستاو وام، بەڵام ئەمە بەجەرگییەکی بێئەندازەشی تێدایە و تا حاڵی حازر لێی تێنەگەیشتووم. مرۆڤێك وێنا ناکەم هەمان کات ترس و بەجەرگیشی هەبێ. لای من ئەم دوانە هەن و تێکەڵبوون. باسی ململانێی منداڵی خۆمم لەگەڵ ماردا بۆ کردن. من لەبەر ئەوەی زۆر لە مار دەترسام، زۆریش ململانێم دەکرد. زۆر لە خێزانەکەم دەترسام و زۆریش کێشمەکێشم لەگەڵدا دەکرد. واتە من مرۆڤێکم بەترس و گومانێکی قووڵەوە دەژیم. ئەم بارودۆخە لەگەڵ ئاین و ترس لەخوا و دۆزەخدا دووپات دەبێتەوە. سەرباری ترسم لە خوا، بەزاتێکی گەورەوە ڕوو دەکەمە ماتریالیزمی مێژوویی و دیالەکتیك. ئەمەش یەکجار تێکەڵبوو و هێشتاکە وەهام.

نموونەش منداڵییمە. وەختێك بەو عەقڵیەتەوە بیرم لە کودەتا دەکردەوە و هەمان کات ڕووم دەکردە ڕێکخستنی سادەی نێو منداڵان. جا لەبەر ئەوەی مرۆڤ نازانێ ئاوا دژی یان پەیوەندی وای لەگەڵ دنیادا بۆ پەیدا دەبێ کە بەم شێوەیە بە خەیاڵدا نایەت، بۆیە دەیانگوت: «ئەم کورە ڕێگای خۆی ون کردووە». بەڵام ئەم کارە دواتر کەڵکی پێبەخشیم.

## من پێبەستی گۆورانی گەلی کوردم
## کە لە گۆورانی من دەچێ لە منداڵیدا.

ی.ك: ئایا بە ئارامی دەخەوی؟

س.پ: خەو لای من وەزیفەیە. هەموو شتێك لە ژیانمدا وەك وەزیفە بەسەرمدا سەپێندراون. گوزەرانیش بەلای منەوە وەکو وەزیفە وایە.

ی.ك: ئێوە ژیانتان خۆش دەوێ، وانییە؟

س.پ: من ئێستا لە تەمەنی (٤٤) ساڵیدام، بەڵام هێشتاکە بە سەرگەرمی منداڵێکی تەمەن حەوت یا دە ساڵانەوە دەژیم.

ی.ك: زۆر جوانە.

س.پ: منیش بێلەملاولەولا وەهام، ئومێد و سەرگەرمی ئەو تەمەنە هێزی ئەژنۆمن.

ی.ك: ئەمە لەوە دەگەیەنێ تۆ هەستونەستی منداڵانت هەیە. لەمەش هەستێکی زۆر جوانە.

س.پ: من قبوولی ناکەم بە شێوەیەکی دیکە گەورە ببم. بۆتان هەیە چۆنتان دەوێ وا هەڵیسەنگێنن. من بەدرێژایی رۆژگار شعر دەکەم. دیارە لەوە گەلێك هۆی هەن. تەمەن گەورەیی لە تێگەیشتنی مندا رەنگی داوەتەوە. لەلایەکی دیکەوە گەلێك هەیە هێشتا لە قۆناغی منداڵیدایە. گەورەییم توندوتۆڵ گرێدراوی گەورەیی ئەم گەلەیە. حەزدەکەم بڵێم سەبارەت بەم بابەتە سەرسەختییەکی کەم وێنەم هەیە. کە لام لە کێشەی کورد و پەیوەندی بە سۆشیالیزمەوە کردووە، گوتم: «دەبێ لەو دوو کێشەیە لەگەڵمدا بڕێینەوە و نووشی بەزین نەبن. بەڵکو دەبێ لەگەڵمدا پەرەبستێنن». من لەم مەسەلەیەدا زۆر سەرسەختم. کورد لەگەڵمدا گەورە دەبێ.

ی.ك: ئەوە چەند جوانە، منیش لە کتێبەکەمدا نووسیومە: «هەڵگەڕانەوەی کورد بە میرێك دەستی پێکرد ناوی بەدرخان بوو و پاشتر چووە ژێر فەرمانی منداڵێکی هەژاری کورد و ئێستاش بە رێبەری زەحمەتکێشانی کورد رێدەکات و گەورە دەبێ».

س.پ: کورد بوونی من لەمەی بەدرخانییەکان یا بارزانییەکان ناچێ و جیاوازییەکی گەورەش هەیە. لە راستیدا لەوەش من کاتێك سەری هەڵدا کە کوردبوون دوایی پێهات. تەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە. سەبارەت بە من خەلومەرجی ئێو خێزانم نیشانەی ئەوە بوو کە کوردبوون کۆتایی پێهاتووە. من لەم کۆتایی پێهاتنە دەبینم. لەو خاڵەوە، واتە خاڵی کۆتایی پێهاتنی گەلی کورد، دەست پێدەکەم. لەمەش راستییەکی رۆشنە.

من بە یەکێکی لەو «کرمانج»انە دادەنرێم کە «مارکیت»ی نووسەری هۆڵەندی باسی کردوون و گەیشتووەتە خاڵێکی راستەقینە و روون، وەختێك لە بارەی «کرمانج»ەوە گوتوویەتی: کرمانج لەو کوردانەن کە پەیوەندی هۆزایەتییان لە بەریەکهەڵوەشاوە و هەمان کات هۆیەکانی بەهێزی خۆیانیان لە دەست داوە. باوەڕم وایە دەتوانین بڵێین لەوەی وا ئەم قسەیە مەبەستییەتی لەو کوردانەن کە لە پەیوەندی خێڵەکی لوتار بوون و رووبەڕووبوونەتە قۆناغی هەوڵدان و زۆربەیان دێنشینی هەژارن تەنانەت لە ئاستی خێزانیشدا. بەم پێیە کورد بوونی من پشت بەم جۆرە پێناسینە دەبەستێ.

ی.ك: ئەمە مانای وایە ئێوە کورد و نەتەوایەتی و گەوهەری زەحمەتکێشەکان بەدەستەوەگرت و لەو خاڵەوە کە تێیدا وەستابوو بەرێتان خست.

س.پ: بە کورتی کێشەی من کێشەی ئەو کەرتە بوو کە باسم کرد و، لە کورد بوونی لە بەدرخانییەکان و بارزانییەکان و تە هی تالەبانی ناچێ. واتە کورد بوونی خەڵکانی خۆدامالیون لە پەیوەندی خێڵەکی.

ی.ك: واتە کورد بوونی بەرزکراتییە کوردەکان نییە کە پاشماوەی

موسهلمانییهکانه.

س.پ: بێگومان نا. من ههر لهسهرهتاوه لهگهڵیاندا ناکۆکم. پێویسته جۆری کورد بوونی من باش تێبگهن. من ئهم کوردبوونه رێکلامخهم و دهیخهمه پێشی پێشهوه. پێم وایه دهبێ به شێوهیهکی باشتر گهشه بهم شیکردنهوهیه بدهین.

ی.ك: دیاره پێویسته زۆر بیر لهو قسانهی تۆ بکرێتهوه.

س.پ: تێڕوانینی ئهم نووسهره هۆڵهندیه له جێی خۆیدایه. ئهو بوو باسی ههوڵی بهرخۆدانی کرد له ناوچهی «بۆتان»دا ساڵی ۱۹۷۵ و لهم بارهیهوه گوتی: «رهنگه ئهوانه له پاشهڕۆژدا ببنه بلیمه». به کردهوهش ئهوه له بۆتان بهدی هات و ئێمه یهکهم بلیمهمان تێدا ههڵگیرساند.

ی.ك: پاشان بوو به زانای ئهنترۆپۆلۆجیا.

س.پ: مهسهلهکهمان بریتییه له چهشنێکی تازه و پهیوهندی به ئاغا و شێخ و ئهو توێژانهوه نییه که گرێدراوی دهوڵهتن. له کاتێکدا ئهو کهرتهی که لێوهی کهوتوومهوه دهروویهکی بۆ من دۆزییهوه. دهمهوێ بڵێم: له راستیدا کرمانج بێهێزترین کهرتن و له ههموو کوردێك زیاتر قابیلی لێكههڵوهشاندنن و به ئاغا و شێخ و دهوڵهتهوه نهبهستراونهتهوه. کرمانج کهرتێکه له زهلکاودایه و دووچاری گهلێك دژواری دهبێ. ههرچی گوند و خێزانهکهشمن له بهشهکانی دیکهی ئهم کهرته زیاتر لێكههڵوهشێن و له لێتوارێ برانهوهدان. بهگشتی من سهر بهو کۆمهڵه خێڵهکیه ههڵوهشاوهیهم که ناوی خێڵی «بهرازی»یه. بهرازییهکان له ناوچهکانی «سروج و بوز ئۆڤه و دهوروبهریاندا» دهژین. ئهوانه له قۆناغێکدا خهسڵهتی خێڵهکی خۆیان به تهواوی له دهست دهدهن. ئێمهش لهو بهری ئهوانهوهین. واته ئێمه لهوان پتر دابڕاوین. ههتا هۆزهکهشمان بڵاوهی لێکرد و ههر باوکمی لێماوهتهوه. بێدهسهڵاتی باوکم لهم دۆخهوه سهرچاوه دهگرێ. تهنانهت خزمهکانیشی بایهخی پێنادهن و نرخی بۆ دانانێن. تووشی ئازاربوو بههۆیانهوه. واته له حاڵی نهبوواندایه و براوهتهوه. کوردبوون لهم حاڵهدا کۆتایی پێدێت.

من لهم حاڵهوه دهست پێدهکهم که کوردبوونی تێدا دهبڕێتهوه. ههوڵیش دهدهم لهم بێهێزی و بێکهڵکییهوه رابوهستم و بژێمهوه. لهبهر ئهم هۆیه ههردهم ئهمه بۆ ههڤاڵانم دووپات دهکهمهوه «ئێوه مانای هێز و مانای بێهێزی نازانن». ئهم قسهیه دهکهم چونکه وهزعی ههموویان زۆر له هی من جیاوازتره و زۆربهیان بهناز و ئارامی و بێناکۆکی دهژیان و له ژیانیان دڵنیا بوون. له کاتێکدا من تهواو پێچهوانهی ئهوه بووم.

ی.ك: ئایهوی بزام ئایا غهریزهی خۆپاراستنتان ههیه؟ ئایا ئهو غهریزهیهتان لهلا بهرزه؟ ئایا چهمکی واتان لهلا گهڵاڵه بووه؟

س.پ: من وای دهبینم خۆپاراستن له هۆشیاری و ههوڵداندایه.

ی.ك: بۆ نموونه، دهرچوونی ناخاڵتان له نیشتمان رووداوێکی گهوره بوو، وانییه؟

س.پ: پەرینەوە بۆ ئەولای نیشتمان بڕیارێك بوو بۆ قۆناغێكی كورت خایەن. قۆناغی بڕیاردانیش لای من پشت بە هەست و پێشبینی و خاڵگیری دەبەستێ، بەڵام لە نەخشەوالانێكی گشتیش خالی نییە. نەخشەدانانی گشتی كۆسپی بەردەم بڕیاردانی كت و پڕ نییە. بۆیە وای دەبینم پێویستە ئەم بابەتە شیبكەنەوە.

## ئەگەر منداڵ لە خەیاڵەكانی خیانەت نەكات، كە گەورە بوو خراپ نابێ.

ی.ك: دەبێتە ئاوێنەی منداڵیمان.

س.پ: ڕاستە.

ی.ك: بۆ زۆر كەس شایستەی بایەخ پێدانە. گومانم لەوە نییە سەبارەت بە بڕیاریش هەروا دەبێ.

س.پ: پێم وایە ئەم ڕوونكردنەوەیەی خوارەوە لە جێی خۆیدایە: «ئەگەر منداڵ ناپاكی لە خەیاڵەكانی نەكات، لە گەورەییدا خراپ نابێ». واتە ئەگەر منداڵێك‌زانی چۆن ڕێزی خەیاڵەكانی دەگرێ، ئەوا دەبێتە باشترین مرۆڤ. ئەگەر منداڵێكیش لە قۆناغی منداڵیدا بەرهەڵستی خەونەكانی نەكات، ئەوا بەرێگای ئاشتی و هەقدا دەڕوات. من منداڵێكم لە تەمەنی (٤٤) ساڵیدام. كە ئەمە دەڵێم، مەبەستم ئەوەیە من گەورە بووم و ڕێزی خەیاڵ و ئومێدەكانم دەگرم و خیانەتیان لێناكەم.

ی.ك: هێشتا لایەنگری بێ‌دەسەڵاتن.

س.پ: هەر ئەوە نا، هەست و نەستێكی وام نییە هەست بكەم گەورە بووم و بوومەتە لاو و دەبێ ژن بهێنم و تێكەڵی منداڵان ببم و ببمە باوك. لێم مەگرە من مەبەستم لەوە نییە. ڕەنگە ببمە باوك و ببمە غەریبێت لەلا پەیدا ببێ. بەڵام من تەنگەتاو دەبم. هەروەها تكاشم وایە باوكان لێم نەگرن، چونكە من هێشتا منداڵێكی (٤٤) ساڵانم. جا وەك چۆن لە منداڵیمدا بەرامبەرایەتیم دەكرد و هەستم بە سەرگەرمی دەكرد، ئێستاش وام. شوێنێك لە بیركردنەوە و ژیانمدا نییە كە مرۆڤی بە شێوەیەكی ساختە تێیدا بكرێت بە من بان نێر و لە ژیانی شەخسیمدا بواری ئەوە نادەم. بە باوەڕی من ژنخوازی شتێكی خراپ نییە، بەڵام چۆنیەتی گەشەكردنی ئەم ژن و ژنخوازییە دەرفەتێك بۆ شەڕی من پێكدەهێنێ. ئەو ڕێگایەش كە دەچێتەوە سەر ئەم بابەتە پێویستی بە شەڕ و كۆششێكی زۆر و گرنگ هەیە. ئەگەر ژن بابەتی باس بێ، ئەوا ناتوانین بەدەر لە ژیان وەری بگرین. وشەی «ژن»یش لە كوردیدا ژین دەگەیەنێ، هەمان كات ئافرەتیش دەگەیەنێ. ئەمە هەڵسەنگاندنێكی باشە، بەڵام بە چ بارێكدا وەرچەرخا؟ ژیان لای ئێمە

زەهری کوشندە و مرۆ و برین و کونراوی و ویرانە وە سەرچاوەی ئەو پەتایەیە کە هەموو کەم شەرەفێك دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی. ئافرەتیش گەورەترین هاندەرە بۆ ئەوە یا بەم شێوەیە بەکار دەهێنرێت. هەموو ئامانجم ئەوەیە ئەو ژیانە بەشێوەیەك بگۆڕم گۆزمرانی تێدا هەبێ.

ی.ك: بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ببێ بە باوك، وا نی‌یە؟

س.پ: ئەوەیان کێشە نی‌یە، بەڵام ناتوانم خیانەت لە منداڵیم بکەم.

ی.ك: ئایا منداڵت خۆش دەوێ؟

س.پ: خۆشەویستی منداڵ بخەرە لاوە. من خۆم هێشتا منداڵم و گەورە نیم. ئایا ئەوەم لێ‌دەپرسرێت. وای دەبینم کە گەورەکان وا خۆ دەردەخەن بچووکەکانیان خۆش دەوێ، سووکایەتی بەرانبەر بە خودی بچووکەکان دەکەن، چونکە ئەوەی وا دەکات پێدەچێ وەك بڵێی زۆر گەورە بووبێ و لە منداڵ خۆشویستندا بەجەرگی‌یەکی لە رادەبەدەر پیشان دەدات. دنیای منداڵان بە بێ‌گومان دنیایەکی زۆر جوانە، ئازادی و دۆستایەتیشی تێداهەن و زۆرداری‌یەکی بێ‌ئەندازەش لە ئارادانی‌یە.

ی.ك: باشە، ئایا هەڤاڵانی پارتیشتان هەست بەوە دەکەن؟

س.پ: ها ئەوەتا دنیای منداڵیم و دنیای دۆستایەتیم بۆ گواستەوە.

ی.ك: جاری پێشوو گەلێك خەفەتم بۆ شەهیدبوونی «حەمزە» خوارد. کە دەمبینین لەپێنا یەکترەوەن، حەمزە هەستی بە ئۆقرەگرتنێکی زۆر دەکرد. تۆش لەپێنایدا هەستت بەئۆقرە بوون دەکرد.

س.پ: بۆ من هاوڕێی منداڵی بوو. لەم باسەدا دەمەوێ ئەم راستی‌یەی خوارەوەتان بۆ رابگوازم: حەمزە ـ مەبەستم «حەسەن بیندال» ـ بە تەمری لە یادەوەریماندا دەمێنێتەوە. حەسەن بیندال منداڵی خێزانێکی گوند بوو کە دۆستی خێزانەکەمان نەبوو. کێشەکێش و دژایەتی‌یەکی زۆر لەنێوان هەردوو خێزاندا هەبوو. بەپێی نەریت و لەباتی ئەوەی ببمە برادەری حەسەن بیندال، دەبوو دوژمنایەتی و ململانێی لەتەکدا بکەم. من هێشتا ئەوەم لە بیرە وەك بڵێی ئەمڕۆیە. هاوتەمەن بووین، پاڵنەراو بوو ببێتە هاوڕێم. گەورەترین کێشەش کە ئەوسا بەرەو ڕووم دەبووەوە ئەوە بوو کە بە حەمزە گەیشتم، کێشەکێش یا برادەرایەتی لەگەڵدا بکەم؟ پێم وایە حەوت ساڵان بووین. ئەمەش کێشەی سەرەکی هەردووکمان بوو، برادەرایەتی بکەین؟ ئەگەر ئەوە بکەم، واتە ڕووبەڕووی خێزان راوەستاوم و رەنگە لە ماڵ دەرم بکەن. هەمان باروودۆخ خێزانەکەی ئەو دەگرێتەوە. بەڵام من بەربەرەکانێی هەموو شتێکم کرد و یەکەم ڕێکخراوی نهێنیم لەگەڵ «حەسەن بیندال»دا دامەزراند.

ی.ك: ئاوا؟

س.پ: بێ‌گومان، ئەوە یەکەم پێوەندی نهێنیم بوو لەگەڵیدا. واتە پێوەندی‌یەکی نایاسایی و یەکەم ڕێکخستنی سیاسی لە دینا، چونکە ئەوە دژی حوکمدارە

ڕەسمییەکانی گوند بوو و ئەمە ڕێکخستنێکی نهێنی دژ بەوان بوو. ئەرکم کە ئەمەی بیست پەلاماری دام، چونکە ئەوە ڕێکخستنێکی نهێنی دژ بە سیستەمی خێزان بوو. لەو ڕۆژەوە برادەرایەتی خۆمانمان هەڵگرت و هێنامانە ئێرە. گرنگ ئەوە بوو لە یەکەم چەمکی یەکێتییەوە دژ بە ناکۆکییەکانی گوند سەرچاوەی گرت. ئەم یەکێتییە دواتر بۆ یەکێتی گەل بەکێشم دەکات. تۆیەك کە هێشتا منداڵێکی حەوت ساڵانی و چارەسەری ناکۆکییەکانی نێو گەل دەکەی لە دیدا، ئەوە کارێکی ئاسان نییە و پێچەوانەی سیستەمی بنچینەیی خێزانە، بە تایبەتی ئەگەر پێداگری، ئەوە دەگێشێتەوە بۆ یەکێتی گەل. ئەوە بە قەناعەتی خۆم ئامرازێکی گرنگ بوو بۆ تێکۆشان و هەتاسەر پێبەندی بووم. ئەویش هەروا مایەوە و هەڵوێستەکەی لەبەرچاو گرت . بەم پێیە پێوەندی نێوانمان پڕ بەها بوو. پاشان ئەم پرنسیپەم بەسەر گەلدا جێبەجێ کرد. دەتوانم بڵێم من یەکێتی خوازێکی گەورەم و یەکێتی خوازیەکەشم بەم شێوەیە دەستی پێ کرد.

## چوونە پاڵ گەریلا لە لایەنی ئافرەتەوە پێوەندی بە بەشداری یاری کردنیانەوە هەیە لە منداڵیدا.

ی.ك: باشە ئاپۆی برام، لە منداڵیتدا هەوڵت دەدا خۆشەویست بی؟ لێرەدا بێلە با شتێك بڵێم. تۆ ئێستا سەرکردەیەکی زۆر خۆشەویستی. کەم سەرکردایەتی هەبووە پێش جڵەوی دەسەڵات بە دەستەوە گرتن ئەم جۆرە خۆشەویستییەی بە نسیب بووبێ.

س.پ: با ئەوە بکەینە دەروازەیەك بۆ بابەتی خۆشەویستی. لە بابەتی زانستیشدا چەند لایەنێکتان ڕووناك کردەوە. شتێکتان گوت لەم سیانەیە دەچوو: «مەعریفەت و خاوەن ئیرادە بوون و جوانی خۆش ویستن».

ی.ك: ئەمە سێ خەسڵەتی مرۆڤن و هیچ خەسڵەتێکی دیکەی لێ‌بەدی ناکەین. مرۆڤ هەوڵ بۆ مەعریفەت دەدات و بڕیار دەدات. ئەمە مانای وایە خاوەن ئیرادەیە. مرۆڤ گیاندارێکە خۆشەویستی دەکات. ئێمەش ئەم سێ مەسەلانە گەورە دەکەین تا خۆمان بکەین بە ئامراز بۆیان.

س.پ: باسی بابەتی مەعریفەتم بۆ کردن. من لە ئاین و قوتابخانە و ژینگەدا زۆر بەشوێن مەعریفەتدا دەگەڕێم. وەك دەبینن هێزی ئیرادەم لەلا زۆر مەزنە. من بەرانبەر بە ئیرادەی سەیری خۆم ڕاوەستام و ڕەفتاری بە شێوە هەڵگەڕانەوەم دەرهەق بە مەسەلەکان دیمەنێکی، ئیرادەیە. بیرکردنەوە لە بابەتی خۆشەویستی دەمێنێتەوە. وەك باسم کرد لای دایکم کەمێك بەدووایدا گەڕام. ڕەنگە بەرهەمی ئەو بارودۆخە تێکەڵوپێکەڵە بێ. لەبەر ئەوەی من زۆر بەدیم نەکرد. بەرانبەر بەو

خۆشەویستییەی کە بەدووایدا دەگەڕام. دەبوو بچمە لەو قالبەوە کە ئەو بۆ منی دەویست. جا لەبەر ئەوەی ئەوەم نەکرد خۆشەویستی داواکراوم بۆ بەدی نەهات. بەلام لەو خۆشەویستییەی کە دەمویست ـ واتە دۆستایەتی ـ لای من گەورە بوو. سەبارەت بە کچە چکۆلەکانی هاوڕێشم هەروا بوو.

ی.ك: باشە کە گەیشتیتە زانکۆ، بەخێرایی دڵخوازیت دەکرد.

س.پ: با ئێستا باسی عەشق و ژنهێنان لە کۆمەڵگای کوردیدا بکەین بزانین چۆنن. جا بۆ ئەوەی کەمێك ئەوەت بۆ ڕوون بکەمەوە، دەتوانم باسی بەرەوەرییەکی خۆمت بۆ بکەم. کاتێك ویستیان خوشکە گەورەکەم بە شوو بدەن، کەس و کاری زاوا لە دێیەکی دوور یا سێ ڕۆژەرێ بە پێ دوور لە ئێمەوە هاتن و بردیان بۆ کابرایەك نەیدەناسی و چەند فەردە گەنم و بڕێك پارەیان دایێ. «حەوا»ی خوشکم لەگەڵیاندا ڕۆیشت و لەو ڕۆژەوە پەیم بەوەبرد کە «ئەم ماستە موویەکی تێدایە». ئەگەر تەرزێکی شۆڕشگێڕانە هەبووایە، دەکرا «حەوا» ببێتە ئافرەتێکی زۆر باش. بەلام ڕۆیشت و چەند منداڵێکی خستەوە. پێویست بوو خوشکەکەی دیکەم ڕزگار بکەم. بێگومان گفتی ئەوەم دابێ. پاش ئەوەی لە نیشتمان هاتمە دەر، نازانم چی لێبەسەرهات. لەوە دەچێ ئەویش ڕۆیشتبێ و نەیتوانیبێ خۆی ڕزگار بکات. واتە فرۆشرا. ئەوان ئێستاکە لە جاران پاشکەوتووترن. ئامانجی ئەم قسانەم ئەمەیە. مەسەلەکان هەروا ئاسان نین. من لە منداڵیمەوە شەڕ لە پێناوی ئازادیدا دەکەم. هەبوونی ئافرەتیش لە ڕیزەکانی ئەم شەڕەدا مانایەکی گەورەی هەیە.

ئەگەر هاتینەوە سەر باسی ئافرەت، ناتوانم لەگەڵ ئافرەتی خزمەتکاردا شۆڕش بکەم. هەروەها لەگەڵ نە وردەبۆرژوا فێڵبازەکان و نە ئافرەتی سەربۆزیشدا ناکرێت. شۆڕش لەگەڵ ئافرەتی بەشان و شکۆدا دەکرێت. ئەمەش لایەنێکی زۆر گرنگە، کێشەکە ئێستا دیاریکردنی ئەوەیە کە کێ ئافرەتی بەشان و شکۆیە و چۆن پێی‌دەگەین؟ شۆڕش بۆ جوانی و باشی و ڕێکییە. چۆن دەتوانم ئەوانە لە شۆڕشدا قبووڵ بکەم کە بوون بە بەلا بەسەر گەلەوە؟ وەك ئەوانەی کە هەلمەتی ئازادییان نییە. چی لەوە بکەم کە ناتوانن پێبەپێی شەڕی ئازادی بڕوات.

من بە دڵی منداڵانەمەوە لەو هەلومەرجە نالەبارەدا چوومە نێو شەڕی نائاساییەوە و توانیم لە واقیع دەرباز ببم و شەڕم لە پێناوی ئەوەدا کرد. وە ووتم گوێ بە مەسەلەی من مەدەن. بۆ ئەوە کارم کردووە کە لە ڕاستی وڵاتپارێزی و ڕاستی ئافرەت و گەل دوورنەکەومەوە و، وە لە ڕاستی سۆشیالیستیش نزیك بوومەوە، بەڵکو پێوەندیم پێوە کردووە و سوور بووم لەسەر ئەوەی کە لێی جوێ نەبمەوە. هەوڵێکی لە ڕادەبەدەرم لە پێناوی ئەوەدا دا تا بەم ڕۆژەمان گەیشتین. ئێستاکە با بەدووی شیکردنەوەی خۆماندا بۆ قۆناغی منداڵی بچین تا تێی نەپەڕێنین. لەبەر ئەوەی من باوەڕم وایە ئێمە تا ئەمڕۆ بەشوێن هاوسانیدا عەودالین. بابەتی خۆشەویستی هەر لە منداڵیمەوە هەبوو. دەمگوت پێویستە کچان بێنە نێو ئەم

گەمەیەمانەوە. بە قەناعەتی من ئەمە پرنسیپێکی گرنگە، چونکە چوونەپاڵ گەریلا لەلایەن ئافرەتەوە لە دوایەیدا پەیوەندی بە بەشداریکردنیانەوە لە گەمەدا هەیە. گەلێك گەمەی جوراوجور بو منداڵان هەن. پێداگریم لەسەر ئەوە دەکرد کە کەس رێ لە بەشدارییان نەگرێ. هەروەها رێ لە بەشداری منداڵی ئەو خێزانانە نەگرێ کە هاورێکانم خوشیان نەدەویستن. سووربوونم لەسەر بەشدارییان رادەی ئەو خوشەویستییە دەردەخات کە پاشتر گەشە دەکات. ئەمە وەك سەرەداوی کەسایەتی من وایە. من پەیبەندی ئەم بابەتەم و سوورم لەسەری. منداڵێکی بەم شێوەیە نییە. ئەگەر خێزان بە یەکێکیانی بگوتبایە: برادەرایەتی فلان کەس مەکە، ملی دەدا. بەڵام من ملم نەدەدا و لە دڵی خومدا دەمگوت بە پێچەوانەی قسەکانیانەوە دەجوڵێمەوە. هەتا کە دەشبوون بە بووك، دوویان دەکەوتم و پێیدەگوتن: دەبێ یاریەکەمان بەردەوام بێ. دیارە لەسەر بنچینەی پرنسیپەکانی دۆستایەتی کە پەیوەندی هەڤاڵانەی بەدووودا دەهات. ئێستا پرنسیپی هەڤاڵایەتیم لەلا زور گەورەیە و منیش لەوەم لەسەر چەند بنچینەیەکی بەهێز و پتەو بنیات ناوە، چونکە من لەخوم پتر نرخیان دەدەمێ و ژیانیان بە قوربان دەکەم و پرنسیپە باوەکە ناهێڵم.

ی.ك: لەوە دەچێ هەڤاڵانتان لەم ماوەیەی دوایەیدا هەست بەمە بکەن. ئایا ئەمە راستە؟ من هەستم بەوە کرد. واتە جیاوازی نێوان ئێستا و سێ ساڵ لەمەوبەرم بینی و ئەوان زیاتر خوشیان دەوێی و زیاتر متمانەت پێدەکەن.

س.پ: دەڵێم من بە یەك وشە خوشەویستیم خوڵقاند. من لە رێگای بابەتی خوشەویستیدا شەرێکی گەورە دەکەم.

ی.ك: بەڵام ئاپوی برام من دەمەوێ بڵێم بە تێپەڕینی روزگار ئەم پەرەسەندنەم بینی. ئایا لەم ماوەیەی دوایەیدا ئەمە رووی لەزیادی کرد؟

س.پ: بەڵێ ئێستاکە گوڵی کرد.

ی.ك: مەبەستم ئەوەیە گوڵەکان پشکووتن.

س.پ: دەتوانم بڵێم ئەو قوناخەی کە(PKK) لەم ساڵانەی دوایەیدا لە ئاستی ناوخو و لە چوارچێوەی کوردستاندا پێی گەیشت قوناخی گەشەکردنە. ئەمە خوشەویستی دەگەیەنێ و پەیوەندی بە بیست ساڵ خەباتەوە هەیە. ئێمە بیست ساڵە دروست دەبین و پەرە دەستێنین. چواردەمین ساڵرۆژی راگەیاندنی حیزبمان بە سەردا تێپەڕی. بە گوتەیەکی دیکە کردمانە ئەرزێك بو ژیان و گەورەترین بڕیار و پرۆسە و رێکخستنمان خوڵقاند و سەلماندمان ئەو تاکە رێگاچارەی ژیانە. توانیشمان سنوورێك بو درندەیی ئەو دوژمنە دابنێین کە شەڕێکی بێسەروبەر دەکات. جارێکی دیکە بە ژیان و بووژانەوە دەستمان پێکرد. من لەوە وا دەشووبهێنم وەك بڵێی کەوتووینە نێو دانەکانی تێهماخەوە کە دادڕ دادڕی کردین و ویستی توونمان بدات. بەڵام توانیمانُ بمێنینەوە و جارێکی دیکە هەناسە بدەینەوە. دووبارە نیشانەکانی ژیانمان پێوە دەرکەوتنەوە. وەزعی ئێمە لە هی ئەو ژنە دەچێ کە مێردە چەپەڵەکەی پێنجا جار لێی دەدا. خەریك بوو لەم وەزعە

قوتاربین و توانیمان بلێین: «لە ماڵەوە هەڵدێم و دەچمە سەر ڕێگای ئازادی».
دواجار کۆنگرەی سێ لایەنە بەستراو وەڵامی من ئەمە بوو: وەزعی ئێمە لە هی ئەو ئافرەتە داوێن پیسە دەچێت کە دەکەوێتە چنگی سێ خراپەکارەوە و هەڵدێت و دەڵێت هەوڵ دەدەم شەرەفم بپارێزم. ئەمانە کاروبارێکی سادەبن. توانیمان مانای ژیان فێری ئەوانە بکەین کە بە ژیانی نێو گەورِ ڕاهاتوون و بەلای خۆیانەوە بەژیانێکی جوانی دەبینن و پێی ڕازین. با بزانن ژیان دەبێ چۆن بێ. لەم ڕووەوە گەلێك دەسکەوتی گرنگمان بەدی هێنا. وەختێکیش دەڵێم( PKK) گوڵی کرد و گوڵە ڕەنگاوڕەنگەکانی بە هەزار ڕەنگ کرانەوە و مرۆڤی کورد دەرمانی دەردی خۆی لە بۆنی ئەم گوڵانەدا دۆزییەوە، من ئەم قسەیە بە خۆڕایی ناکەم. ساڵی ۱۹۹۲ بەدیهێنانی ئەوە و سەلماندنی قسەکەم بوو.
گەلێك شت هەن دەبێ لە بارەی ساڵی (۱۹۹۲)ەوە بگوترێن. بەکەمیان ساڵی ۱۹۹۲ ساڵی شەڕی سەرسوڕهێنەر بوو. ئەو ساڵە بوو کە شەڕی تێدا بە باری ئاسۆیی و ئەستوونی گەشەی کرد و گەیشتە چەند ئاستێکی پێشکەوتوو، بووە هۆی یەکێتی نیشتمان و، گەل بەشێوەیەکی سەرتاسەری هاتە پاڵ شۆڕش و ئیمەش شایەتی ئەوەین. ئەو ساڵەیە کە گەریلای تێدا تەقییەوە. هاتنە پاڵ شۆڕش لە ساڵانی پێشوو زیاتر بوو. ڕەنگە ساڵی داهاتووش ئەمە ببێ. ئەگەر ڕێژەی بوون بە گەریلا لە ساڵی ۱۹۹۱ دا یەك بووبێ، ئەوا لەگەڵ کۆتایی ۱۹۹۲ بوو بە سێ، واتە سێ هێندەی ساڵی پێشوو.
ئەم پەرەسەندنە سەرهەڵدانەکانیش دەگرێتەوە. لە کاتێکدا سەرهەڵدان لە ناوچەکانی جزیرە و نوسەیبین و شەرناخ کە هێڵ و شوێنی ئاسایی خۆی بوون، تەقییەوە و گەیشتە هێڵی (ئامەد) و بە توندی و سەرتاسەری ڕوو بە باکور لێیان ڕەت بوو و لەم هێڵە تەنییەوە تا هێڵێکی لە باشوریشدا پێکهێنا و ئیرادە و خەباتی گەلی لە ئاستی گشتی نیشتماندا یەکخست.
جەماوەر تەنانەت لە میتروپۆلە تورکیەکانیشدا بە چڕوپڕی چوونە پاڵ سەرهەڵدانەکان. هەرچی ئەوروپاشە جەماوەرمان لەوێ خۆپیشاندان و ڕێپێوانی گەورە گەورەی کرد و ساڵی ۱۹۹۲ بوو بە ساڵی سەرهەڵدان و ژمارەی بەشداربووانی هێندێکیان گەیشتە (٦٠) هەزار و چەندین ڕێپێوان کران دەوری (٢٠- ٣٠) هەزار ڕۆڵەیەکی گەل بەشدارییان تێداکردن. بەڵام لە شارە گەورەکانی تورکیادا وەك ئەدەنە و ئەستەمبوڵ و ئەزمیر گەلێك ڕێپێوان کران و پتر لە(١٠) هەزار کەس چوونەپاڵ هەریەکەیان، سەرباری ئەوەی کە دێنشینەکان خۆپیشاندانی بەرفراوانیان کرد و پشتگیری مادی و مەعنەوییان خستە بەردەست. ئەمە تا ئێستاش درێژەی هەیە.
هەوڵیاندا لە ڕووی یاساییەوە هێندێك لێکهەڵبڕان لە بنیاتی(HEP)دا بخەوەمێنن و حیزبی کوردی ساختە دابمەزرێنن، بە تایبەتی ئەوانەی وا نۆکەرانی باشور پاڵپشتیان دەکەن. بەڵام ئەم ئارەزووەیان بەهۆی هۆشیاری گەلەوە بەدی

نەهات، چونکە ئەوانە هیچ بنکەیەکیان نییەو هەموو هەوڵەکانیان ـ کە لە بنەڕەتدا بە مرۆڤدۆستی و جیاوازی چینایەتی بوون ـ سەریان نەگرت.

چەند گفتوگۆیەکی بەربڵاوی ڕاگەیاندن کرا و چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێکی دیموکراتیش دانران کە بڵاوبوونەوە و سەرکەوتنێکی بەرچاویان بەدەست هێنا. لە هەموو ئەوانەش گرنگتر، ئەو پلانانە سەریان نەگرت کە حکومەتی «دیمیرل ـ ئینەنۆ» ساڵی ١٩٩٢ ڕەنگی بۆ ڕشتن و ئامانجیان لەنێو بردنمان و نەهێشتنمان بوو بە یەك شاڵاو، سەرەڕای ئەوەی کە گشت شێوەیەکی شەڕی تایبەتی خستەکار. پێویستە بیرمان نەچێ کە حکومەتی (دیمیرل ـ ئینەنۆ) بوو لە ناوەوە و دەرەوەدا پشتگیرییەکی زۆری پێ گەیشت و هەموو شتێکی بەرمەیدا و خستیە ژێر دەستی شەڕی تایبەتەوە. دەتوانین بڵێین ئەوە حکومەتی شەڕە. ئەوەتی ئەم حکومەتە دامەزراوە جۆر و قەوارەی ئەو هێرشانەمان دەزانی کە دووچارمان دەبوون.

بەهیوا بوون ئەنجامی خێرا بە دەست بێنن و بۆ ئەوەش دوایین تەکنیکی نوێیان بەکارهێنا و هەردوو حیزبی (DYP) و (SHP)ش پەکیانگرت کە بەناوی تەبایی نەتەوەییەوە نوێنەرایەتی ڕاست و چەپی دەوڵەتی تورکیا دەکەن. هەروەها حیزبە بەرهەڵستەکان هەر لەسەرەتای ساڵەوە ڕایانگەیاند ئەوان هەنگاوی سیاسی خۆیان لەگەڵ حکومەت دەنێن و ئەم سیاسەتەش بە ڕیفۆرمی نیشتمانی یان تەبایی نەتەوەیی ناودێر کرا. شاڵاوێکی دیبلۆماتی گەورەشیان دەست پێکرد و ئەوە بوو دیمیرل دەست بەجێ چوو بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان و پاڵپشتی ئەویشی مسۆگەر کرد، پاش ئەوەی پێشتر پاڵپشتی ئینگلیز و فەرەنسییەکان و ئەڵمانەکانی بۆ خۆی زامن کرد بوو. هەر ئەوەیان لەسەر مابوەوە هێندێك دەرووی دیکە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دابخەن. بۆیە ڕوویان کردە ئێران و سوریا تا (PKK) سوودیان لێوەرنەگرێ و هەموو قورسایی و هێزی خۆیانیان خستە سەر ئەم دوو دەوڵەتە.

بەهاری ساڵی ١٩٩٢ سەریان لە سوریادا و پاشان بۆ ئێران چوون و هەوڵیاندا ڕێی بەکارهێنانی ئەو دوو گۆرەپانەمان لێبگرن و لەگەڵ هێزە بەکرێگیراوەکانی باشووریشدا هاودەنگ بوون و ئەمەش لایەنێکی گرنگە. بەمە جۆرێك دابڕانی نێوان باکور و باشووریان پەدی هێنا یان ئامانجیان ئەوە بوو. دوا شەڕی باشووریش بەڵگەی ئەو پلانە بەربڵاوە بوو کە پێی هەستان.

ئەو شەڕە تایبەتە ئۆزال بۆی بەجێهێشتن و حکومەتی (دیمیرل ـ ئینەنۆ)ش لەسەری ڕۆیشت. پاش پێداچوونەوەی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شەڕی تایبەت و کۆنتەرگەریلاوە و بە فەرمانی ئەوان و بە هەوڵدان بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕیانەی کە هەیانبوو بە هێنانە ناوەوەی کەسانی تازە، بەتایبەتی کە ناتەواوییەك لە نێو ئۆپۆزیسیۆندا ڕوویداو وای لێهات لایەنگری لە حکومەت دەکرد و بەوە دەستی لە بەرهەڵستی خۆی هەڵگرت و کەوتە پاڵپشت کردنی دەوڵەت. ئەوەی وا فەرمانی ئەوە، ... بەڕێوەبەرایەتی شەڕی تایبەت بوو ک

هەولیدا بیسەلمینێ هیچ ناکۆکییەك لە سەرەوەدا نییە و وای لێهات دیمیرل و ئۆزال لە بەردەم خەلکدا دەست لە نێو دەستی یەکدیدا دەرۆیشتن.

ی.ك: دیمیریل دەیگوت: دنیا ژێرەوژوور ببێ ناچم بۆ «چان قایا» و نامەوێ چارەی ئۆزال ببینم. بەلام دوای ئەوە و لە کۆبوونەوەی دیاریەکردا لە بەردەم کوردەکاندا دەست لە دەستدا دەرکەوتن و بۆ رۆژنامەنووسان خەنینەوە.

س.پ: ئەو خەندەیە ساختە بوو. ئەگەر بابەتەکە(PKK) بێ، دەبینین ناکۆکیەکانی نێوانیان دەخرێنە لاوە و یەکدەگرن و راست دەبێ بەچەپ و بگرە لیبیشی رەت دەبێ و چەپیش لە راست تێدەپەرێنێ و ئاوا یەکدەگرن. هەموو ئەوانەش بە مەنتیقی شەری تایبەت دەجولێنەوە و بەبێ پەلپ گرتن رێنوێنیەکانی بە جێدەهێنن. تەنانەت حالی حازر تێدەکۆشن هاوپەیمانەتی تازە بکەن، وەك یەکێتی کۆمارە تورکیەکان و رێککەوتنی بالکان. هەروەها لە خۆرهەلاتی ناوەراستیشدا ئەوە لەگەل هێزە ئەقلیدیەکاندا دەکەن کە کوردستانیان دابەش کردووە. ئەوان وای دەبینن کە ئەم جۆرە هاوپەیمانەتیانە زۆر پێویستن. ئامانجی هەموو ئەوانە خەفەکردنی ئاگری ناوەوەیە.

دیپلۆماسی بەوپەری سنوورەکانیەوە جێبەجێدەکرێت و تەنازوولی یەك لە دوای یەك پێشکەش دەکەن بۆ سەرخستنی کاری دیپلۆماسیان و بە ئەلەمانیا دەلێن ئەمە بە. ئەگەر ئینگلیزیش تەنگەتاو ببێ، دەلێن ئەوەش بۆ ئێوە و ئەگەر فەرەنسەش دەم هەلبهێنێتەوە هەروای پێدەلێن. واتە ئەوانە تەنازوولی بەردەوام پێشکەش دەکەن بۆ رازیکردنی هەمووان. هەرچی ئەمەریکاشە، ئەوان بە توندی پێوەی بەستراون. هەمان سیاسەتیشیان لەگەل ئێراندا پەیرەوکرد و پێیانگوت ئەمەش بۆ تۆ. سەبارەت بە سووریاش گوتیان: ئەگەر ئەوە بکەی کە ئێمە دەمانەوێ، چیت بوێ دەتدەینێ. هەولیش دەدەن مەبەستەکانیان لە ژێر پەردەی شوێنی جیوپولەتیکی گرنگی تورکیا و زیادبوونی دەوریدا تێپەر بکەن و ئەگەر پێویستیشی کرد دەلێن: ئەمە دوورگەی ئارامییە و لە جێگایەکی دیکەشدا دەلێن بەهێزترین دەولەتە لە خۆرهەلاتی ناوەراستدا.

بێگومان ئێمە بەهێزێکی گەورە و بەرخۆدانێکی ئەخشە بۆ کێشراوەوە بەرەنگاری خۆ ئامادەکردنی هەمەلایەنەی دەولەتی تورکیا و گەرانی بە دوای پالپشتدا و پلان دانانی بۆ هێرشکردنە سەرمان بووینەوە و سەرەنجام بە ئاسانی و بە بێئەوەی هیچ لە خێرایی پەرەسەندنمان لە دەست بدەین رابردوومان تێپەراند. وەك بینیشان هەولماندا سالی ١٩٩٢ ببینەوە کە بووە سالی دەسکەوتی گەورە، چونکە کوردستان لە مێژوویدا تووشی ئەم چەشنە کەلەکۆمە گەورەیە نەبووە لەلایەن شەری تایبەتەوە و لەم چەشنە شەرە شۆرشگێرانەیەشی لە دژی نەکردووە. سەرەتا کۆماری تورکیا لەم سالەدا گەیشتە دوا سنووری تەکتیکەکانی و هەموو هێزێکی تا سەر لە پێناوی شەری تایبەتدا بەکارهێنا. بەلام نەگەیشتە

سەرکەوتنی یەکجارەکی، چی دەڵێن با بیڵێن. گەورەترین هێزا و لەم شەڕەدا خۆیانن. وەك دەبینین لەم شێوە دەسکەوتەی (PKK) لەم ساڵانەدا نیشانەی ئەوەیە کە سەرکەوتنی یەکجارەکی بە نسیبی حیزب دەبێ. ئەو ڕاستییەی (PKK) کە بەم جۆرە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ، ئەوە دەگەیەنێ بووەتە سەرچاوەی سەربەخۆیی نیشتمانی و ئازادیی کۆمەڵایەتی. ئەو بەرخودانانەی کە دژی گشت جۆرە زەبروزەنگ و ئەشکەنجەدانێك هەن، بوونەتە نەریتێکی ڕۆژانە و شەڕیش لە هەموو بەرەکانیدا بە سەرکەوتن گەیاندنی (PKK)یە. لەم گۆشەنیگایەوە چواردەهەمین ساڵڕۆژی دامەزراندنی (PKK) و پێنانە ساڵی پازدەهەمینی بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو هەوڵانەی وا دراون بە فیڕۆ نەچوون. تین و توانەکانی سەرکەوتنیش کە لەم دوایییەدا وێرای هەموو کۆسپەکان سەرکەوتن نیشانەی ئەوەن کە (PKK) دەتوانێ زۆر بەئاسانی بە سەرکەوتن بگات. مانای وایە (PKK) لەم ساڵەدا گەشەی کرد. بێ گومان هەموو ئەمانە پێوەندییان بە خۆشەویستییەکی گەورەوە هەیە و ئێستاکە مەحکوومم پێی. واشی دەبینم کە هەر شتێکی دیکەی جگە لەم خۆشەویستییە زۆر سادەیە و شایانی بایەخپێدان نییە.

ی.ك: ئایا دەکرێت زیان بە بێ خۆشەویستی بێت؟

س.پ: من نارەزایی دژی هەموو ئەو پێوەندییانە دەردەبڕم کە لەم مەسەلەیەدا پەرە دەستێنن.

ی.ك: خەڵکی دووروون، ئایا هەڵوێستتان لەوەوە سەرچاوە دەگری؟

س.پ: نارەزایی دژی هەموویان دەردەبڕم، چونکە بە ئاین و خێزانەوە نەبەستراونەوە. ئەمە بەسترانەوە نییە و من پەلپ لە هەموویان دەگرم. بەو پێیە من بۆ هەموویان داخراوم و وا هەست بەخۆ دەکەم لە بڕگەیەکی گەورەی زەماندام و دونیام لە «خۆشەویستی» دادەخەم. بە واتایەکی دیکە بەرەو گۆشەگیری و دوورەپەرێزی دەکشێمەوە.

ی.ك: خۆت دادەنەی چونکە دوورە پەرێز نیت، بەڵکو دوورە پەرێزی لەناخەتدایە.

س.پ: بیرەوەرییەکی خۆشمت بۆ دەگێڕمەوە، مادامێکی باسی خۆشەویستی دەکەین. دەیڵێم تا لەڕوونی باسەکەدا بێ. دایکم تاوانباری دەکردم و دەیگوت: ئەگەر ئەم عەقلیەتەت هەبێ، کەسێکت دەست ناکەوێ کچەکەیت بداتێ. ئێستا وا تێدەگەم هەڵسەنگاندنەکەی ڕاست بووە. مەسەلەی ئەوەش کە کەس کچی خۆیم ناداتێ تا ئێستا بیرکردنەوەمی جەنجاڵ کردووە. ئایا ئەم ژنە لەبەرئەوەی کە ژنە ئەم قسەیەی کردووە، یا لە ڕاستی خێزانەوە؟ باوابێ. ڕستەی «پیاوێك ئەمە عەقلی بێ و کەس کچی خۆی ناداتێ». ڕستەیەکی سەیرە من بەدووی کچێکدا ناگەڕێم و باوەڕم وایە ئێستاکە کردنی کارێکی وەها ڕەفتارێکی بێجێیە. دەتا کچ دۆزینەوە چی دەگەیەنێ؟ من لەو کاتەوە هێز و گەورەییم ئەمە قبووڵ ناکەن، چونکە مەترسییەکانی ئەوەم دەست نیشان کرد و تەنگەتاو بووم و زۆرم بە دەستییەوە چێشت. بە دوای کچدا گەڕان کارێکی بەرخەوشە و پێویستە شەرمی لێبکەین.

لەبەر ئەمە جارێکی دیکەش لەناخمدا بەسەر خۆمدا داخرامەوە و تەریق بوومەوە و
بەم پێیە بوومە کابرایەکی خۆپارێز.

ی.ك: مەبەستت لە خۆپارێز چییە؟

س.پ: ئەوەیە کە مرۆڤ بەسەر خۆیدا دابخرێت و لەگەڵ خێزان و لە ژنهێناندا گراوە نەبێ و تەنانەت لە نەدیویشیدا پێی لێوە ناکاتەوە. هەمیشە لە دڵی خۆمدا دەمگوت دەبێ رێگایەك یا دەروویەکی دیکە هەبێ بۆ گەیشتن بە کچان، نەك رێگای رێ و رەسم و دابونەریت. ساڵانێك بوو لە دڵی خۆمدا نەخشەم بۆ ئەوە دەکێشاو هەوڵم دەدا ئەم نەخشەیە زیندوو بکەمەوە. سەرئەنجام وەك دەبینن ئێستا کچان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەسەر پێی خۆیان رادەوەستن.

ی.ك: ئەمە چی دەگەیەنێ؟

س.پ: هەزارانیان لە ریزەکانی گەریلادان. چۆن ئەمە چی‌دەگەیەنێ؟ ئەم مەسەلەیە بۆ یەکەم جار لە مێژووی گەلانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا پەرەدەستێنێ. بەلام ئەمە چۆن پەرەی سەند؟ کچی کورد نەیدەتوانی لە دەرەوەی دەرگای ماڵەکەی دوو هەنگاو بنێ. ئێستاش هەزارانیان گیانفیدان! ئەمە چی‌دەگەیەنێ؟ لە کوردستان شتەکان خۆیان راناچلەکێنن، بەتایبەتی خێزان و مەسەلەی شەرەف و ئەم جۆرە بەهایانە. ئەمانە هەرگیز راناچلەکێنن.

ی.ك: بەڵێ، با هێڵێك بەژێر ئەوەیشدا بێنین. من چی دەنووسن دەیخوێنمەوە. من بەوە بەختیارم. باوەڕ مەکەن هیچ پەرەسەندنێك لە خۆوە ببێ.

س.پ: لە باسی ئافرەتدا هەرگیز باوەڕ ناکەم.

ی.ك: هەر لە باسی ئافرەتدا نا... بەلام باوەڕ مەکە هیچ شتێك لە خۆوە رووبدات.

س.پ: بێ‌گومان... هەرگیز شتێکی سەپێنراو قبوول ناکەم.

ی.ك: جا سەبارەت بە ئافرەت بێ یان پیاو.. قبوولی ناکەن . وانییە؟

س.پ: بەڵێ، من لەو مەسەلانە خانە بە گومان دەبم کە وەك گریمانە بەردەست دەخرێن. لە ساڵانی خوێندندا سەبارەت بە ئافرەت زۆر دوورە پەرێز و خۆپارێز بووم و بەخۆمیدا رانەدەهەرموو دوو قسە بکەم. دادوبێدادم بوو بە دەست گەلێك دژواری گەورەوە. هەمروان هێندێك پەیوەندییان هەبوو. بەلام من رووەکردبووە دوورە پەرێزی.

ی.ك: لە ئەنقەرە بوون؟

س.پ: بەڵێ، ئەوەم لە یادە. لە نێزیك مزگەوتی «ماڵ تەپە» بووم. جاروبار بۆ نوێژ دەچوومە مزگەوت. حەزدەکەم بڵێم دوورە پەرێزیم لەو ماوەیەدا قوول بوومەوە و هەوام کزدەبوو. کە گەیشتینە ساڵانی حەفتا، یەکەم رێبێوانی سۆشیالیستەکان رایانکێشام و وام لێ‌دەهات بایەخم پێدەدا.

## خەڵکی گوند دەیانگوت «مێرووڵەیەك ناپلیشێنێتەوە».
## کە مێرووڵەیەکم دەبینی پێمم بەرزدەکردەوە تا پانی نەکەمەوە.

ی.ك: مامۆستاکانت لە قۆناغی دواناوەندیدا چۆن تێیان دەڕوانیت؟

س.پ: بەوەم باسکردن. لێرەشدا ئەو مامۆستایەمانم بیردەکەوێتەوە کە لە کۆلێژی جەنگ دەرسی دەگوتەوە، چونکە بەلای منەوە بە ڕاستی سەرچاوەی متمانە بوو و پێویستە لەسەرم هەمیشە لە بیرمدا بیهێڵمەوە. ناوی «فاروق جاغلیان» و مەیجور بوو لەو کۆلێژە دەرسی ئەدەبی دەگوتەوە. لەوانەی وا لەو قۆناغەدا ـ واتە ساڵانی(١٩٦٦ـ١٩٦٩) ـ لە کۆلێژی جەنگ خوێندوویانە. باش دەیناسن. دەهاتە قوتابخانەکەمان و لەبابەتی ئەدەبیدا دەرسی پێدەگوتین. بە جۆرێکی سەرسوڕهێنەر بایەخی پێدەدام. کە لێشم دەپرسن چ شوێنێکی لەلای من هەبوو، دەڵێم لەو ساڵە تووڕانەی تەمەنمدا سەرچاوەی متمانەیەکی زۆر بوو. کەسێکی سەرسەخت و دۆست و سۆفی و پێچەوانەی هەمووان بوو. گەلێکی پێبەخشیم و فێرکردم. پێی دەگوت: تۆ زۆر بڕوات بەخۆت هەیە. تۆ مرۆڤێکی زۆر گەورەی تا ئێستاش پێم سەیرە کە بۆچی ڕەفتاری بەم شێوەیە بوو؟ تا ئێستاش نازانم. بە هاوڕێکانی دەگوت: قوتابیان، وا من ئەو باسەم بۆ کۆلێژی جەنگ برد کە عەبدوڵلا نووسیبەتی و لەوێ بۆ مامۆستاکانم خوێندەوە..وە هەڵدەستین بە شیکردنەوەی. کە بە دوو ڕستە لەسەر ئەوە هەڵدەدایێ، گوتی بوەستن منیش لەسەر ئەم دوو ڕستەیە قسە دەکەم. ئیتر کەوتە لێکدانەوەی قسەکەم. لە قسەکانیدا شێلگیر بوو. هەرکاتێك بیدیبام بەرەو ڕووم دەهات و بە لوتفەوە دەیگوت: «هیچ گیروگرفتێکت هەیە بە دەستییەوە بناڵێنی»، یان دەیگوت «بڕوا بەخۆت بکە» ئاوا لەو باروودۆخەی کە تێیدا دەژیام و کاریگەری نێزیك بوونەوەی لێیم، تێپەڕاندنی ئەو ساڵانەی بۆ ئاسان کردم.

ی.ك: ئایا مامۆستای دیکەت هەبوون؟

س.پ: بەڵێ، مامۆستایەکی دیکە هەبوو. زمانی فەرەنسی پێدەخوێندین. ئەویش خۆشی دەویستم. ناوی عەدنان بەیرەقدار زادە و خەڵکی ئەرزەڕۆم بوو. ئەگەر هێشتا لە ژیاندا بێ، بێگومان منی بیردەکەوێتەوە.

ی.ك: فارووق مرد؟

س.پ: بەڵێ بە شێرپەنجە مرد. خەفەتم بۆ کۆچی دوایی ئەو خوارد. من باسی ئەم مامۆستایە دەکەم، چونکە ئەوسا نەمدەتوانی نە خۆشەویستی بکەم و نە کارێك بکەم خۆشەویست بم. ئەو کاتە ئەم مامۆستایەم بە قوتابیەکانی دەگوت: من ئەوەم خۆش ناوێ کە عەبدوڵلای خۆش ناوێ. ئەم بڕیارەی ڕوون و ئاشکرا بوو. من ئێستا درك بەوە دەکەم کە سەبارەت بە بابەتی خۆشەویستی لە چ ئاکۆکییەکی گەورەدا بووم. من نەمدەتوانی نە خۆشەویستی بکەم و نە کارێکی وا تا خۆشەویست بم. گرەوێکی گەورەی کرد. ناتوانم هەڵسەنگاندنەکەی لە بیر بکەم.

جا کاتێك مامۆستاکەم بەم شێوەیە دەدوێت. گومانی تێدا نی یە کە هێندێك ڕاستی دیوە. سەرباری ئەوەی کە ڕووداوێکی خۆشەویستیش هەیە پشت بەم ڕاستیانە دەبەستن.

ی.ك: کاکە ئاپۆ ئایا بە وریاییەوە لەگەڵ هاوڕێکانتدا دەجوڵایتەوە؟ ئایا گاڵتەت لەتەك دەکردن؟

س.پ: لەوێ ڕاستی بێ من مرۆڤێکی سەرسەخت و شەڵگیرم. گاڵتەیان لەگەڵدا دەکردم. بەڵام هەموویان نا، چونکە من شەڵگیر بووم و حەزم بە ڕێکوپێکی دەکردو پلەوپایەیەکی جوێکراوەشم هەبوو. لە هەموو کۆبوونەوەیەکدا دەیانخستمە شوێنی سەرکردە. من لە تەمەنی حەوت ساڵانەوە تا ئێستاش ئەو وەزعەم هێشتووەتەوە. من کابرایەکی بێ‌هەوا و یەکجار دادپەروەرم و ڕێز لە هەوڵ و کۆشش دەنێم. مانای وایە من زۆر داڵا بەخوداگرم و دان بەخوداگرتنیشم وەك یەکێك وایە بتوانی بە دەرزی سیرێك لێبدات. بە باشی کارەکانم ڕادەپەڕێنم و قەناعەت بە هەموو شتێك دەکەم و باش سنوورەکانی خۆم دەناسمەوە و خودی خۆم هەڵدەسوورێنم و دەتوانم بە کاروبار و ڕەفتارەکانمدا بچمەوە.

ی.ك: ئەم لایەنەی کەسایەتیتان پێی نەزانراوە. وەختێك لە تورکیا و وڵاتانی بیانیدا باسی ئەم لایەنەی کەسایەتی تۆ دەکەم، کەس باوەڕم پێناکات. چونکە بە چاوی ئەو کابرایەوە تێدەڕوانن کە بە یەکجار سەد کەس دەکوژێ.

س.پ: ئەم جۆرە تێڕوانینە ناکرێت هەرگیز ڕاست بێ، بە تایبەتی لەم حاڵەدا. خەڵکی گوندەکەم هێشتا ماون، پێیان دەگوتم مێروولەیەکی پێپان ناکرێتەوە، کە مێروولەیەکم دەبینی پێم هەڵدەگرت. تا ئێستاش وام. لەوانەیە بڵێن ئەمە چۆن دەبێ کە ئێوە شەڕێك هەڵدەسوڕێنن. ئایا ئەمە لەگەڵ قسەکانتاندا جووت دێتەوە؟ نەخێر هیچ ناکۆکییەك لە گۆڕێدا نی یە. دەتوانن لە هەموو هەڤاڵان بپرسن. هەتا لە شیکردنەوەکانیشمدا سەدان جار دووپاتم کردووەتەوە و گوتوومە: حسابێکی قورسم لەگەڵ ئەو کەسەدا دەبێ کە دەبێتە هۆی ڕژانی یەك دڵۆپە خوێن لە جێی گونجاوی خۆیدا نەبێ. بەڵام ئێستا چی پێویست بکات لە پێناوی گەلێکدا دەیکەین. بەر پێیە ئێمە وا تەماشای شەڕ دەکەین شاجوانی گەردوونە و ئێمە ئەوپەڕی عاشقی جوانی شەڕین، لە کاتێکدا هەمووان بانگەواز بۆ ئاشتی و تەنیا ئاشتی دەکەن. دەشزانن شەڕ مانای ئاگرە. هەرچییەك نووری بدەیتە نێو ئاگر دەسووتێنێت. بەڵام سەرەڕای ئەوە «خوراسان» خوای شەڕە. بە ڕاشکاوی پێت دەڵێم مرۆڤێکت لە دنیادا دەست ناکەوێ هێندەی من لە شەڕ بترسێ. من لە شەڕ و چەکی ئاگردار و ئامێری بڕندە و بریندارکەر دوور دەکەومەوە. پێم دەڵێی لە هەموو ئەمانە دوور دەکەویتەوە و هەمان کات تیۆری و چالاکییەکانی شەڕ پەرە پێدەدەی، ئەوە چۆن لێك دەدەیەوە؟ ڕوونکردنەوەی ئەوە ئەمەیە: ئەم کارە لە پێناوی مندا نی یە. ئەگەر لە پێناوی مندا بووایە، من دوا کەسی ئەم دنیایە دەبووم حەز بە شەڕکردن بکات. بەڵام ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی بە گەلێکەوە دەبێ و مەبەستیشم

تەنیا گەلی کورد نی‌یە، ئەوە لە دنیادا کەس نی‌یە وەك من حەز لە شەڕوشۆڕ بکات و سەوداسەری بێ. ڕەنگە ئەمە بەلای ئێوەوە ناکۆکی بێ. چۆن دەبێ یەکێك تا ئەم رادەیە رقی لەشەڕ بێ، ببێتە شەرکەرێکی جەربەزە و تیۆری شەڕ پەرە پێبدات و بەجەرگانە راست جێبەجێی بکات و لە ئەزموونەوە تێن و توان بخولقێنێ. ئەمە پیشەو کاری منە. ئەمە وا دەگەیەنێ کە ئێوە دان بە وەدا دەنێن کە شەڕێك هەیە. دوژمنیش هەر وای ناوناوە. ئەمساڵ شەڕ بە بەرچاوی دنیاوە کراوە هەموو تەکنیکێکی پەرەسەندووی تێدا خرایە گەڕ. ئەمە پێوەندی منە بەم شەڕەوە. دەبێ ئاوا بمناسن. دوژمن باوەڕی نەدەکرد شەڕێکی وەها دەکات و تا ئێستا ئەم مەسەلەیەی لەلا جێی مشتومڕە. وە باوەڕی نەدەکرد کە گەلەکەمان هەستێت بە کوشتنی ئەو ژمارە زۆرەی سەربازان. نەك ئەمە بە تەنێ بەڵکو بە تیژ ڕوانینە چاوی یەك سەربازیش. وە هیچ باوەڕ و قەناعەتێکی بەوە نەبوو،بەڵام ڕاستی‌یە روشنەکە ئەوەیە کە دوژمن هەوڵی هەڵاتن و خۆشاردنەوە دەدات، ئێستا لە بارێکی پڕ ترس و بیمی بێ‌ئەندازەدا دەژی و سەدان پاسگە و سەربازخانەی خۆی ناهێڵێ.

بێ‌گومان هەموو ئەمانە پێوەندی‌یان بە منەوە هەیە. کاتێك باسی ژیانی گەلێك دەکرێت، من باش دەزانم چۆن بەم ژیانە دەگەم. چی لەژیانێك بکەم کە بووە بە زەهر و تووشی بۆگەن کردن هاتووە؟ ژیان بەلای منەوە دەکاتە سەرکەوتن، سەرکەوتن لە هەموو شتێکدا. سەرکەوتنیش بە مانا ڕەهاکەی بە ئازادی‌یەوە گرێدراوە. ئەوەی وا ئازادی خۆی لەدەست بدات ناتوانێ سەربکەوێ، ئەوەش کە سەرنەکەوێ ناتوانێ بژی. ئەمە یاسای ژیانە لە کوردستان. من ئەوە لە پێناوی یەك مرۆڤدا نالێم، چونکە من تەنانەت بۆ ڕووەکێکی بچووکیش مانای ژیان دەزانم. دەتوانم پێتان بڵێم من خۆ لەوە لادەدەم پێ بە گیایەکی دیمەن جواندا بنێم و زۆر بە وریایی‌یەوە هەنگاو دەنێم.

ی.ك: من باوەڕت پێدەکەم. من دڵنیاشم ئەوانەی کە دەتبینن و لە نێزیکەوە دەتناسن بڕوات پێدەکەن.

س.پ: من زۆر حەز لە سەوزایی دەکەم. وانە من لەوانەم کە پشتگیری دەکەن. باسی زۆرانبازی خۆمم لەگەڵ ماردا بۆ کردن. ئەم شەڕەم لەگەڵ ماراندا سەخت بوو بەڵام من لە هەمان کاتدا بایەخم بە گیاندارە بێ‌وەیەکان دەداو دەمپاراستن.

ی.ك: مارت بەچی دەکوشت، بە بەرد؟

س.پ: بەڵێ، دواتر تفەنگێکی ڕاوم پەیدا کرد. بەڵام لە بنەڕەتەوە بە بەرد زۆرانبازیم لەگەڵدا دەکردن. دەمەوێ ئەم خاڵەش ڕوون بکەمەوە: من لە هەموو مرۆڤێکی دنیا زیاتر لە کوشتن یا مردن دەترسم. هێشتا وێنەی یەکەم ڕووداوی مردنم لەدێدا لە بیرە. ئەو گۆرستانانەش تا ئێستا لەبەر چاومدان. دەمگوت: دەبێ کاروبارەکان وا هەڵنەسوورێن. مردن کێشەیەك بوو دڵەراوکەی هەمیشەیی تووش دەکردم. لە لایەکی دیکەوە دەڵێم پێوبستە بەم شێوەیە نەبێ. ئەمە ناکۆکیم بوو لەگەڵ مەسەلەی مردندا. هەرچی مەسەلەی کوشتنیشە بەلای منەوە گرێ کوێرە بوو

و تا ئێستاش وایە ڕاستیەکەی من زۆر لە مردن و کوشتن دەترسم. کە جەندرمە دەهاتنە گوند و کە گوێم لە یەك یان دوو گوللە دەبوو هەڵدەهاتم و لەم شوێن و ئەو شوێن خۆمم دەشاردەوە، باش ئەوەم لەیادە نەمدەتوانی بچمە دەرێ و تەماشایان بکەم. لەبەر ئەوە نا کە زۆر ترسنۆك بووم، بەڵکو وام دەبینی ئەم هەڵگرتن و بەکارهێنانەی چەك دژی مرۆڤ مەسەلەیەکی ترسناکە و مایەی بەجەرگییە.

ی.ك: ئایا بە خەیاڵتاندا دەهات لە دواییدا سوپا پێکەوە بنێن؟

س.پ: کەمێك لەمەوبەر باسی ئەوەم بۆ کردن کە چۆن ئەو مرۆڤەی وا زۆر لە کوشتن دەترسێ دەبێتە بەرپرسی زۆربەی ڕووداوەکانی کوشتن. وەك بڵێی ئەمە ناکۆکییەکی گەورەی تێدایە و پێویستی بە لێکدانەوەیە. ژیانی ئەمڕۆ دوام دەبێتە هەوڵی دۆزینەوەی وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارە. یەکێکی بێدەسەڵاتی زۆر لە مردن و کوشتن ترسا و چۆن دەبێ بە یەکێك بەربەرەکانێی مردن بکات و ببێتە هۆی مردن یا کوژرانی زۆر کەس؟ وەڵامم بۆ ئەوە ئەمەیە: ئێمە کە ژیان هەڵدەسەنگێنین، مردن و کوشتن دەبنە کارێك کە هەر دەبێ ببێ. من تا ئێستاش وای دادەنێم لە ژیاندام، چونکە من سەرۆکی ئەم وەزیفەیەم، ئەو مرۆڤەش سەرۆکی وەزیفەی خۆی بێ ناتوانێ ژیانێکی کۆمەڵایەتی ئاسایی بگوزەرێنێ. بۆیە من تا ئێستا نازیم. من لە منداڵیمەوە تا ئێستا مرۆڤێکی فەرمانبەرم و سەرۆکی ئەم وەزیفەیەم و بۆ ژیانیش بەرەنگاری گەلێك هەڕەشە بوومەتەوە. ئەم هەڕەشەیە لە ئاستی نیشتمانی و جیهانیەتیدا گەورەیە و چەند دوورایییەکی نێو دەوڵەتی هەن. من لەم ساتەدا ئیمپریالیزمی ئەمریکا و ئەڵمانیا و کۆلۆنیالیزم لە تورکیا و نۆکەرە کوردەکانیان بە گەورەترین مەترسی بۆ سەر ژیان دادەنێم. باڵادەستی پیاو بەسەر ئافرەتدا و تەگەرە تێخستنی خەیاڵ و ئاواتی چکۆلەکان لەلایەن گەورەکانەوە هەڕەشەکردنن لە ژیان. ئەگەر سەرنجتان دابێ هەموو ئەم هەڕەشە و گوڕەشانە یەکدەگرن و زۆرم بۆ دێنن تا پەنا ببەمە بەر هێز و بیکەم بە ئامرازێك و پاڵم پێوە دەنێن بۆ تیۆری هێز. مرۆڤی لە هێز ترساو بەم گوشارە دەبێتە مرۆڤێکی هێز خولقێن. هۆی پشت ئەوەش هەڕەشەی خنکاندنی ژیانە. من ئێستا لە تەمەنی چل و چوار ساڵیدام و بێشەرمە گەورەکان و هیچ و پووچەکان و زۆردارەکان و دزەکان و چەپەڵەکان و سەرمەستەکان کێشەیەکی گەورە بۆ ژیان پێکدەهێنن. ژیان بەلای منەوە خۆشەویستییەکی گەورەیە و من ئارێزانی ژیانم و عاشقیم و زۆر قینم لە مردنە. بێگومان من لەبەردەم ئەم هەموو هەڕەشانەدا لە ژیان ناتوانم پەنابردنە بەر هێز فەرامۆش بکەم.

ی.ك: ئەمە وەڵامی پرسیاری پێشوومە. واتە لەوەیان کە پەیوەندی بە خۆپاراستنەوە هەیە بەڵام لە ڕوونکردنەوەکەتاندا دوورایییەکی دیکە دەرکەوت، ئەویش ئەوەیە کە ئێوە ئەمریکا و ئەڵمانیا و کۆلۆنیالیزمی تورکی و باڵادەستی پیاو بە مەترسی دەبینن. وانییە؟

س.پ: بێگومان. باڵادەستی پیاوێتی دەخەمەسەر، چونکە ئەوانیش

ئیمپریالیین. باوەڕم وایە هەریەکێك لە کچان و ژنانمان دەتوانێ بڵێت: «ئەم پارچەیە بۆ ئێمە». بە چاکەی ئافرەتەوە هێشتا هێندێك بنەمای نیشتمانی و کۆمەڵایەتیمان لەسەر پێی خۆیان ماون. هەرچی پیاوە وەك دەزانین دەبێتە بەکرێگیراو و لە نیشتمان نامۆ دەبێ و ڕۆژی چل جار سەری لە بەردەم دوژمندا دادەنەوێنێ. لەبەر ئەوەی پیاو وێنەی شێواوە و ناتوانێ بەها نیشتمانیەکان بنوێنێ. لەبەر ئەمە ئافرەت پارچەیەکە لە ڕاستی کورد. پێویستە بەو پێیە دابنێین، چونکە مەسەلەیەکی گرنگە. بەڵام شوێنی ئافرەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا دەکەوێتە پاش گازەردەوە و چۆن دەستی بۆ ببەی وای لێدێت. ئەمە چۆن لەگەڵ مرۆڤایەتیدا جووت دێتەوە؟ لە مێژوو و نیشتمان و ڕۆشنبیری دووری دەخەینەوە و پاشان پێی دەڵێین: «تۆ گیان و سامانمی». لەمجا چەند پەیمان بکرێت تەنگی پێ هەڵدەچنین. ئەم ڕەفتارە بۆنی کەم ئەدەبی لێدێت و خراپترین جۆری گوشارە. هەتا پەیوەندیە جنسی‌یە ئازادەکانیش نرخ و بایەخیان چی‌یە؟ ئاوێزان بوون و پەیوەبەسترانی شێوەیەکی کۆیلایەتی و نامۆیی‌یە و مەبدەئێکی ئاژەڵانەیە. لای ئێمە دەگاتە مەبدەئی کۆلۆنیالیزم. لەبەر ئەم هۆیە من زاڵی پیاو بەم شێوەیە دەبینم و بەتوندی بەرانبەر بەم زاڵی‌یە ڕادەوەستم.

ی.ك: هەموو ئەوانە بە مەترسی دادەنێن. واتە تێکۆشانتان دوورایەکی ئینتەرناسیۆنالی هەیە، چونکە ئەم هەڕەشەیە تەنها دژ بە گەلی کورد نی‌یە.

س.پ: من مرۆڤێکی نەتەوەپەرست نیم و ئەمەش تەواو ئاشکرایە. ئەگەر قەرەی خەباتی گەلی کورد کەوتبم و تا ئەم ڕادەیە پەیبەندی بووبم، لەبەر ئەوەیە لە گەلانی جیهان زیاتر دووچاری سەرکوتکردن هاتووە. منیش زۆر گرێدراوی خەباتی سەرکوتکراوانم، لەبەر ئەوە نا کە کوردم بەڵکو لەبەر ئەوەی کە کورد سەرکوتکراوە. منیش نیشتمان پەروەر و ڕزگاریخوازم. بە ڕاشکاوی دەیڵێم من ئەو مرۆڤە نیم کە لە ڕێگای نەتەوایەتیدا ژیانی دەخاتە مەترسی‌یەوە و ژیانیشم لەو پێناوەدا ناکەم بە قوربانی.

ی.ك: ئەوەی ڕاستی بێ سەرکردەکان لە تورکیا سەرسام دەبن کە ئەم قسەیە دەبیستن.

س.پ: بەلای منەوە گرنگ نی‌یە، نامەوێ ئەوانە بناسم و ناشمەوێ لێیان تێبگەم.

ی.ك: بەڵام تۆ ناچاری بۆ ئەو کارە کە دەیکەی بی‌پاناسی. تۆ شەو و ڕۆژ بیر لەمە دەکەیەوە.

# کە کۆسپەکان بە ڕووی ژیاندا گەورە دەبن، داکۆکی کردن لە ژیان ئەمەکە بۆ شەرەف

س.پ: بە قەناعەتی من ژیانیان بێڕەوشتییەکی لە ڕادەبەدەرە. کە لەئەمریکایەك بۆ یەکەم جار چاوی پێم کەوت، لێی پرسیم: چۆن «بۆش» هەڵدەسەنگێنن. بە یەك قسە گوتم: «بێ ڕەوشتە».

ی.ك: وەڵامەکەتان بێوێنە بووە.

س.پ: بەڵێ زۆریان بوونە سەرۆکی دەوڵەت و ئەوەو لەوەو .... هەموشیان بێ ڕەوشتن. ئەگەر جۆرە پێوەندییەکیان بە ڕەوشتەوە هەبووایە، مەسەلەکانیان بە شێوەیەکی مرۆدۆستانە وەردەگرت.

ی.ك: بەڵام ڕژێمەکەیان وایان لێدەکات بێڕەوشت بن، وا نییە؟

س.پ: لەوانەیە، نامەوێ بچمە نێو ئەم باسە. ڕاستییەکەی من یەکجار بە ژیانەوە بەستراوم. دیارە کە کۆسپەکان بە ڕووی ژیاندا گەورە دەبن، داکۆکی لێکردنی ئەمەکە بۆ شەرەف. بەڵام سەبارەت بە مەسەلەی کورد پێشتر گوتم: کورد مەحکومە بەوەی کە نەژی و لە ژیان هەڵکەندراوە. کورد ئەوەیە کە لە زیندانەکانی دنیادایە و لە گشت جوانی و خۆشەویستییەك بێبەشە. سەرنج بدەن نەبڕدراوە، بەڵکو ڕیشەکێش کراوە. من باسی ڕیشەکێش کردن دەکەم. دواجار لە خودی خۆی ڕیشەکێش کراو لە هەست و سۆز بەشبراو بوو. بە کورتی لەو مرۆڤە دەچێ کە هەردوو دەست و پێی بڕدراونەتەوە، یان بونەوەرێکی لەم جۆرەیە. لە هەموو شتێك ڕیشەکێش کراوە کە پێوەندی بە مرۆڤایەتییەوە هەبێ. بەڵام بە ڕواڵەت هێشتا لە مرۆڤ دەچێ. کورد ئەمەیە. دەتوانم پەرە بەم چەمکە بدەم. هەرچی چۆنێك گفتم بدەنێ و بیخەنە بەردەستم، من چەمکی خۆمم بۆ مرۆڤایەتی هەیە، دەقەکەی ئەوەیە: لایەنگری کردنی مرۆڤی بەهێز مەسەلەیەکی نائەخلاقییە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە پرنسیپی من ئەخلاقی و مرۆدۆستانەیە و نوێنەرانی میللیگەری سەرەتایی کوردیش دوژمنی خوێنە خۆی منن و لە تورك دوژمنکارترن. لەبەرایی ئەوانەدا کە پشتگیرییان کردم «کەمال پیرو حەقی قەرار» دێن. ڕەگ و ڕیشەی ئەوانە لە تورکیاوەیە و کورد نین. هەمیشە دەڵێم: ئەوانە لە هەموو خەڵکێك زیاتر و لوتکەی پێوەبەستران بوون. ئەمە بەڵگەیە بۆ لایەنی مرۆدۆستانەم.

من ئارەزووی ژیانێکی ڕوون و لێك حاڵی بوو لەگەڵ ڕاستی تورکیدا دەکەم. هەر لە سەرەتاشەوە بە کاری شۆڕشگێرانەمان لە ڕووی فیکری و گیانییەوە ئەوەمان سەلماند و کارێکمان کرد شایستەی ئەم مەبەستە بێ. بەم پێیە وا لە تورك دەکەین سەرلەنوێ بۆ ڕاستی خۆیان بگەڕێنەوە. ئێمە ئەو بزانەین کە بانگهێشتنی ئەوە دەکات. ئێمە گرێدراوی یادی ئەو هەڤاڵانەمانین کە ڕەگ و ڕیشەیان لە تورکیاوەیە. لە کاتێکدا ئێمەیان بە هێزی چارەسەر دەبینی و باوەڕیان وابوو

ئامانجەکانیان بەدی دێنین. لەبەر ئەوە لە پاڵپشت و کۆمەك کردنماندا دریخییان نەکرد.

واتە(PKK) هەم ماناو شێوەی ئەو تورکە دیاری دەکات کە دەمانەوێ بیبینە براو دۆست و تەنانەت هەڤاڵیشمان و هەم ناسنامەشی دیاری دەکات. حیزب دەرفەتێکی پێداوە و لەم بارەیەوە بانگەوازێکی ئاراستە کردووە و گەلێك پاڵپشتیمان بەردەست خستووە کە هێشتا لەم چوارچێوەیەدا بەردەوامە. ئێمە ئەگەر کار لە سەرلەبەری دنیاش بکەین. من هەر وەك مرۆڤێکی بێلایەن دەبینمەوە کە بەتەنگ ئەوەوەیە لەسەر ئەم بنچینەیە لەگەڵ هەموو خەڵکدا بجووڵێنەوە. بەلام ئەو تورکەی کە دووچاری گرێی خۆ بە گەورەزانین بووە. ئەگەر نەتوانی ئەم گرێیە تێبپەڕێنێ و کەمێك لە پێوانەی مرۆدۆستانە نزیك بووەوە و وەك لەو مرۆڤە رەفتاری کرد کە بیر لە ئازادی و هاوسانی دەکاتەوە و ئەم رای بە دەمدا نایێت بۆنی زاڵبوون و کۆیلایەتی لێوە بێ و تەنگمان پێهەڵناچنێ، ئەوسا دەبینێ ئێمە پشتیوانێکی بەهاداری ئەوین و دەتوانێ بەرەسەندنێکی فراوان بەدی بێنێ و ئێمە لە خزمەتی ئەوەداین. ئەم قسانە بۆ یادی هەڤاڵ «کەمال و حەقی» دەکەم کە بەلای ئێمەوە بەهایەکی گەورە دەنوێنن و ئێمەش پەیبەستەی بیرەوەرییانین و کار بۆ ئەم بیرەوەرییە دەکەین.

ر.ی.ك: دۆستایەتیتان لەگەڵ کەمال پیر چۆن دەستی پێکرد؟

س.پ: ئەو سەعاتێك گوێم بۆ بگرە. بە گشتی باسی گەلێك مەسەلەم کرد. تا شەهید بوونی پێوەندی پێمانەوە هەبوو. ئەو یەکەم شەرکەر و سەرکردەی سەربازیمان بوو و لە ژێر ئەشکەنجەدا بوو بە ئێسقانێکی رەشداگەراو. ئایا لەشیتان دیوە؟ مەیجور «ئەسعەد ئوقتای» بە «کەمال»ی دەگوت: کەمال واز لە مردن بێنە. ئێمە دەتوانین ژیان بە بەرتدا بکەینەوە. کەچی کەمال وەڵامی دەدایەوە: مردنی ئێستای من گەورەترین زەبرە بۆ ئێوە و ئەوەش بەدی دێنم. دەرفەتی ئەوەتان نادەمێ بمگێڕنەوە بۆ ژیان. ئەوەی وا دەمەوێ بیڵێم چالاکی و قوربانیدانێکی گەورەیە. ئەو هەتا هەتایە پێمانەوە بەسترابوو.

ی.ك: بەڵێ، باسی ئەوەیان کرد. ئەمە مانای وایە ئێوە کەسایەتیتان وەك خۆیەتی و لەگەڵ هی ئەودا هاوشێوەیە.

س.پ: کەمال بەراستی وای دەبینی کە رزگاری گەلی تورك بە رزگاری گەلی کورددا تێدەپەڕێت. بەڵێنی ئەو لەسەر ئەم بنچینەیە بوو و تا سەر پێمەلی ئەم بەڵێنە بوو. با نموونەیەکت لەسەر ئەوە بدەمێ: لە کاتی بەرخۆدانیدا لە بەندیخانە دەڵێت: «دوژمن گەمە بە ژیانمان دەکات تا حیزب بە دۆڕاوی بێنێتە دەر. ئێمەش کارێك دەکەین دوژمن بە مردنی ئێمە بیدۆڕێنێ». ئەمە بەڵگەی بەسترانەوەی ئەوە بە بەڵێنەکەیەوە.

ی.ك: بە راستی وا بوو. شەهیدبوونی ئەمەك بوو بۆ بەڵێنی خۆی و ئەوە کارێکی شایانی هەموو رێزێکە. باشە ئاپۆی برام ژیان و خۆشەویستی چۆن پێناسە دەکەن؟

# ژیانم پوختەی بوژانەوەی کوردە

س.پ: بۆ ئەوەی دەست بە باسی خۆشەویستی بکەین، دەبێ یەکەم جار ژیان بدەین بە ناسین. لە ڕاستیدا ژیان هەر بە تەواوی بە ڕووی کورددا داتەخراوە، بەڵکو تەواو بە ڕووی تورکیشدا داخراوە. مەبەستم ئەوەیە گەلی تورك دەژی، بەلام لە پێناوی چیدا دەژی؟ ئەمە شتێکی نەزانراوە.

ی.ك: بەڵکو بە تێپەڕینی ڕۆژگار دەبێ بە ڕانەمەر.

س.پ: ئەوەش ڕوون دەکەمەوە. بەلای منەوە ئەوە گرنگە مرۆڤ بتوانێ کەمێك شەرەفی خۆی بپارێزێ. لە دابونەریتی کوردەواریشدا مانای شەرەف جیاوازە. لای کورد، شەرەفدار کەسێکی بە خێزان و ژن و کیژلگە و مریشك و سەگەکەیەوە بەستراوە. من لە بنەڕەتەوە پەڵپم لەم چەمکە هەیە و پێناسەیەکی پێچەوانەی چەمکی شەرەفم هەیە. چەمکەکەی لای من خۆدامالینە لەم مەسەلانە و بەرپەرچ دانەوەیانە. ئەو تاکە ڕێگایەیە کە دەکێشێتەوە بۆ ژیان و بگرە سەرەتای ژیانیشە. هەرچی کێشەی خۆشەویستیشە، وای دەبینم من خودی خۆشەویستیم هەڵسەنگاند و کارەکەیم ڕێکخست. یان بە واتایەکی دیکە: من بووم سەرقاڵی جێبەجێ کردنی بووم. ڕەنگە سەرەتا هۆشیار نەبوو بم. بەلام ئەوە هەڵسەنگاندنێکی تەواوی بابەتی خۆشەویستی و ژیان بووە. گوتم پێویستە ئەو خەڵکانە کە تەواو لە ژیان و خۆشەویستی ڕیشەکێش کراون، بۆ ژیانێکی جوان و تازە و بۆ خۆشەویستییەکی بە شەرەفانە ڕێنوێنی بکرێن. بە کێش کردنیان بۆ ئەو ژیانە گەورەترین شەرەفە. ئێمە ئەو هێزەمان پێشاندا.

ی.ك: بەڵێ، مرۆڤی کورد وردە وردە دەستی کردووە بە ژیانەوە و ئێستا گۆرانی «سەرۆك ئاپۆ» دەڵێت. جاران کە شەرابیان دەخواردەوە سەرخۆش دەبوون. بەلام ئێستا کە ئەو گۆرانیە دەڵێنەوە هۆش و عەقڵیان لە دەست دەدەن!

س.پ: ئەوی ڕاستی بێ ئەوە دیمەنێکی ژیان و شادمانییەتی. ئێستا مرۆڤی کوردیش دەیەوێ خۆی خۆش بوێ. ئەو کە منی خۆش دەوێ. دەست بە خۆشەویستنی خۆی دەکات.

ی.ك: بە ڕای من پەرەسەندنی مرۆڤایەتی خۆش ویستنی بەرانبەر و نکوولی لە خۆکردن دەخوازێ. من بە ڕاستی لەم بابەتەدا هاودەنگتان نیم و پشتگیری ئەو قسەیەتان ناکەم: «مرۆڤی کورد خۆشی دەوێ، چونکە خۆی خۆش دەوێ». ڕەنگە هەڤاڵە کوردەکەی زۆر خۆش بوێ، بەلام تۆ تێکڕای گەلت خۆشدەوێ.

س.پ: دیارە تۆ باسی گیانی هەرەوەزی دەکەی. ئەگەر ئاگانان لێبوو بێ حاڵی حازر ئەم خۆشەویستییە لە کۆمەڵگادا پەیدی دێت. ئەمە وا دەگەیەنێ کە گەل دەیەوێ خۆی بە ڕاستی خۆیەوە ئەتەك بدات. هەر یەکێکیش بەشی خۆی دەبات.

ی.ك: ڕاستە مرۆڤ و کۆمەڵگای کوردی خۆی لە ئاپۆ و(PKK)دا بینییەوە و متمانەی بە خۆی پەیداکردەوە. هەموو ئەمانە ڕاستن. قسەیەکیشم هەیە: «ئەو

مرۆڤەی کە متمانە بەخۆی نەکات، ناتوانێ خۆشەویستی بکات».

س.پ: گەلی کورد لە ڕادەبەدەر متمانەی بە خۆی لە دەست دابوو. تێکۆشان هێندێك متمانەی بۆ گێڕایەوە. جا کە کەمێك متمانەی بە خۆوە دی دەستی بە خۆشەویستی کرد. ئەمە ڕاستە.

ی.ك: بڕوا بە خۆکردن لە دڵەوە هەڵدەقوڵێت و بەجەرگی و هێز دەبەخشێ.

س.پ: بێگومان، متمانە بە خۆ پەیداکردن بەجەرگی و ئیرادە و شەڕ و کاری تێدایە. هەموو ئەوانەمان بە گەل بەخشی. دەکرێت گەیشتنی کورد بەم باروودۆخە لە زیانی مندا کورت بکرێتەوە. لەبەرئەوەی زیانم پوختەی زیانەوەی کوردە. واتە من هەموو شتێکم ڕێکخست و لە ڕێگای ئەوەدا شەڕێکی فەلسەفی و ئاینی و سیاسیم لەگەڵ خودی خۆمدا کرد و ئەو حاڵەش کە بە ئەنجامم هێنا ئەمەیە: «پێویستە بەم شێوەیە ژیانت خۆش بوێ». ئێستا کە گەل دەڵێت: «ئیتر بەسە، تۆ لە پێناوی ئەم ژیانەدا لەوەی پێت کرا بە زیادەوە بەخشیت». ئەم دۆخە جێی بایەخە، چونکە سەرەتا تەنیا بووم و چواردە ساڵیشە لە نیشتمانەوە دوورم و تێکەڵی کەسانێکی زۆر نەبووم. وێڕای ئەوە ئەوەی بۆ من هەڵکەوتووە بۆ هیچ سەرکردەیەکی دیکە هەڵنەکەوتووە، وەك یەکێتی گەل و ئەو خۆشەویستییەی کە باوەڕناکرێت وابێ.

ی.ك: باشە ئاپۆی برام چواردە ساڵە تۆ لە نیشتمانەوە دووری، ئەی چۆن دەگەیتە ڕاستی کورد؟

س.پ: ئەم دۆخە بە ڕێگای ئاسایی ـ ئایدیۆلۆژی و سیاسی ـ بەدی نایەت. لەم بارەیەوە تەنانەت ئەگەر نەگەیشتبینە ئەو ئاستەیش کە دەمەوێ. بەڵام پەرەسەندن هەر هەیە. بەدیهێنانی ئەوە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەخاوەن پرنسیپ بوونی مرۆڤەوە هەیە. کەمێك لەمەوبەر بە کورتی باسی قۆناخی منداڵیم بۆ کردن و گوتم: من ئەو شۆڕەسوارە شەڕکەرەیان بووم کە هیواکانی خۆیانیان پێوە بەند کردبوو. گوتیشم: من شەڕکەری (۱۱) ساڵەی ئەوانم. مانای وایە من ئەو جەنگاوەرەی گەلی کوردم کە هێشتا لە قۆناخی منداڵیدایە. ئەمەیش وام لێدەکات ناپاکی دەرهەق بە خەیاڵ و ئاوات و ئارەزووەکانیان نەکەم. من خیانەتم لەوانە نەکردووە. ئێستا کە ئەم هەموو ئیشانەش دەکەم بە بێئەوەی بیانناسم، ئەوە وا دەگەیەنێ کە من لە ژیان دوورنیم. من چاودێر و توێژەرەوەی گەورەی ئەوانم و پاسایان بۆ دادەنێم. ئەم هەموو مەسەلانەم لە ناخمدا بە سەرکەوتن گەیاندووە و هەر

لەوە ماوە پێشکەشیان بکەم. پێشکەش کردنەکەیش تەنیا مەسەلەیەکی تەکنیکییە، گەل دەست بەجێ نامەی دەگاتە دەست. باوەڕم وایە دەبێ ئەم بابەتە باشتر لێی بکۆڵدرێتەوە. مەبەستم ئەوەیە کەس ناتوانێ ڕێ لە گەیشتنم بە گەل و کۆششم لەم پێناوەدا بگرێ، نە دەوڵەت و نە سەرلەبەری دنیاو تە لەو ئاکامانەیش کە لەهەرەس هێنانی سۆشیالیزمی بنیاتنراو کەوتنەوە. واتە سەرباری ئەم هەموو کۆسپانە سەرکەوتنی بێوێنە بۆ گەلەکەم بەدی هات. ئەم سەرکەوتنەش هی

گەلێکە لە ئاگایی و زیانەوەیدا گەیشتە خاڵی کۆتایی.

ی.ك: لەوانەیە ئەمە خاڵێکی جیاوازی باسای پەرەسەندنی یەکسان بێ. ئەوەتا لە کاتێکدا کە هەموو شتێك هەرەس دێنێ، گەلێك کە وا کەس چاوەڕێی هیچی لێناکات ڕادەپەڕێ و بە سەرکردایەتی(PKK) قەڵەمبازێکی گرنگ بەدی دێنێ.

س.پ: بەڵێ دەکرێت خۆ کوردستان لاوازترین خاڵە بۆ ئیمپریالیزم. ئیسلام لە بیابانی عەرەبدا سەری هەڵدا کە مرۆڤایەتی لە خاڵی برانەوەدا بوو. شۆڕشی فەرەنسەش لە ناوەندی ئاکرەوییەکی بۆگەندا سەری هەڵدا. هەرچی کوردستانیشە هێندەی ئەوەی کە لاواز بوو، مرۆڤایەتی تێیدا گەیشتبووە خاڵی برانەوە و ئەم ڕووداوەی لێوە پەیدا بوو. دەتوانین زیاتر ئەوە لێك بدەینەوە. بەڵام دەمەوێ بڵێم بەرزبوونەوەیەکیش لە خۆشەویستیدا هەیە. «چەتین ئەمەج»ی ڕۆژنامە نووس هەیە، زیرەکە و لە ئێوە دەچێ. لە نووسینەکانی ئەم دواییەیدا گوتارێکی بۆ هەڵسەنگاندنی من تەرخان کردووە. پێم وایە ئەوە هەفتەیەك پێش کۆچی دوایی ئەو بوو. ڕۆژنامەی (حوریەت) بەهۆی ئە و گوتارەوە هانە ئێرە و پێی گوتم: گوتارێکی لەسەر نووسیوی. ئایا ئاپخەیتە نێو لیستەی دوژمنەکانت. پێم گوتن ئەم کابرایە زیرەکانە هەڵیسەنگاندووم و من ڕێزی رایەکەی دەگرم. یەکێك لە پرسەکانی کە هێڵی بەژێردا هێنابوو دەڵێت: خۆشەویستی بە ڕێگای ڕاست چی دەگەیەنێ؟ لەسەری دەڕوا و دەڵێت: شێوەی ئەو ڕێگایە چییە کە دەچێتەوە سەر خۆشەویستی لەسەر بنچینەیەکی تازە؟ ئاپۆ باسی ئەوەش دەکات. ئەمە وا دەگەیەنێ کە عەقڵی ئەم کابرایە ڕێگای ڕوو بە خۆشەویستی بە خۆناگرێ. ڕاستییەکەی ئەو کابرایە توێژەرەوەیەك بوو و من ڕێزی ئەم لایەنەم گرت. لە کاتێکدا ڕۆژنامەی حوریەت بە پێچەوانەوە ئەوەی لێك دابووەوە. ئەوەی ڕاستی بێ من وای دەبینم کە گوتارەکەی زۆر بەنرخە. لە ڕۆژنامەنووسەکانی دیکەش «ئۆزەرسن ئۆیمەن» هەیە هێندێك گوتار دەنووسێ. جگە لەوە ناهەوێ باسی ڕۆژنامەکانی «باب عالی» بکەم، چونکە زۆربەیان بەشێوازی قەشە کۆنەکان و ئامۆژگارییە کلێسەییەکانیان دەنووسن و بەو پێیە کرێی خۆیان وەردەگرن.

## یەکەم مانگرتنمان، لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکاندا بە بۆنەی کوشتاری (قزلدەرە)وە بوو.

ی.ك: باشە ئاپۆی برام با بۆ قۆناغی زانکۆ بچین، ئایا لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان دەتخوێند؟

س.پ: بەڵێ، ساڵێك لە دیاربەکر مامەوە و لە ڕووپێوان ئیشم دەکرد. دوای ئەوە ساڵێك لە ئەستەمبوڵ مامەوە. لەدوا دواییەکانی ساڵی ١٩٧١ دا چووم بۆ ئەنقەرە. لەوێ «ماهر و دەنیز»ی جووتە پاڵەوانی بەرخۆدان کە لە بەندیخانە هەڵاتبوون و

هێشتا نەگیرابوون، شەڕیان دەکرد. چالاکیەکانیان هێشتا هەر بە بەرچاوەوەن. شەهید بوونیان لە ٣٠ ی ئاداردا زۆر کاری تێ کردین. پاڵەوان بوون، متمانەی ئێمەیان بە دەست هێنابوو. پاکتاوکردنی ئەو پاڵەوانانە وای لێ کردم سەر لە نوێ بارودۆخەکە شەن و کەو بکەم. ڕەنگە بەختم یار بووبێ چونکە نرخێکی زۆرم پێدەدان و زیاتر لە جاران بایەخم بەو بزاڤانە دەدا: ئەوان بوون چالاکی خۆیانیان ڕێکخست و ئەنجامدا و بەوە قۆناخێکی گرنگی تێکۆشانیان دوایی پێهێنا. چەند لایەنگرێکی ئاسایی‌یان لە کۆلێژی زانستە سیاسیەکاندا هەبوو. لە کۆتایی ١٩٧١ و سەرەتای ١٩٧٢ دا قسەکانی «ماهر»ی و هەڤاڵانیم بیستبوو بەر لەوەی ببنە کەسانێکی نایابایی. جەربەزەیی‌یانم بینی و دیمن بە مەبدەئەوە بەستراون. تواندنی ڕاستەیم لە لابینین. ئەوسا لە دڵی خۆمدا گوتم: «پێویستە واز لەوانە نەهێنین».

ی.ك: لە کوێوە بە دووی قسەکانی «ماهر»دا چوون؟

س.پ: لە سالۆنێکی زانکۆی تەکنیکی ئەستەمبوڵدا، ئەو کۆنفرانسە یەکجار بەناوبانگ بوو. پێم وایە کۆبوونەوەیەك بوو بۆ خۆ جوێ کردنەوە لە ساڵی ١٩٧٠ دا. سێ یا چوار کەسی دیکە هاتنە پاڵ کۆبوونەوەکە، ئەوانیش «یوسف کوپەلی، ڕەمەزان ئاکتولکا، کازم ئۆزدوغان» بوون. ئەوانە دەستیان بە پێکهێنانی «THKP-C» (حیزبی شیوعیی میللی تورکیا ـ بەرە) کرد و لە بەرێز «میهری بەللی» هەڵبڕان. لام وایە لێک هەڵبڕانێکی پەلە بوو و دەرچوونێکی یەکجار بەجەرگانەش بوو لە چەمکی چالاکی‌یەکاندا. لە کۆنفرانسەکەدا باسی نیشتمانپەروەری کوردیان کرد. سەرئەنجام چەندین شت لە زەینمدا مانەوە. لەوێوە بۆ ئەنقەرە چووم و بوومە لایەنگری ئەم حیزبە کە دایانمەزراند. یەکەم مانگرتنمان لە کۆلێژی زانستە سیاسیەکاندا بە بۆنەی کوشتاری قزڵدەرەوە کرد. لە ٣٠ی ئاداردا شەهیدکران و ئێمەش لە(١)ی نیساندا دەستمان بە مانگرتن کرد. لە (٧)ی نیساندا لەلایەن ئیدارەی کۆلێژ و بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشەوە بۆ لێکۆڵینەوە بانگ کراین و گیراین. کە لە بەندیخانە بووم «دەنیز»و هاوڕێکانی لە سێدارەدران. هەرچی ڕێکخستنە چەپڕەوەکانی دیکەش بوون لە ئەنجامی کەتوماڵ کردنەوە تووشی پاکتاوکردن بوون و زۆر کەسیان گرت و زۆربەیان سەر بە «TIP» و «THKP-C» بوون و هێنایانن بۆ ئەو بەندیخانەیەی کە ئێمەی لێ بووین. بە کورتی هەموویان هاتن و لەوێ بەزینیانم بینی. لەو ئەنجامەش کە بە دەستم هێنا ئەوە بوو: دەبێ بە شێوەیەکی زۆر ڕادیکاڵانەتر ڕووبکەینە مەسەلەکە و بە دوواداچوون و بەردەوامی ڕێکخستن دابین بکەین، کە دوو کارن دەبێت بکرێن.

ی.ك: ئەمە وا دەگەیەنێ تۆ ئەو بێ‌هێزیە دەبینی کە لەلای خێزان بینیت.

س.پ: بێ‌ئەملاوئەولا وەهایە. پاڵەوانان دەکوژرێن و ڕێکخستنەکان درووێنە دەکرێن. ئەگەر ئاگاتان لێ‌بوو بێ من شوێنێکم بۆ ناپاکی پاڵەوانان لەلا نییە. ئەو پیاوانە بە هۆی مەبدەئیانەوە کوژران. دەبوو هێندێك کەس درێژە بەم مەسەلانە

بدەن. ئەو قسەیەم دەکرد و لەمە پاڵی پێوەنام ڕێکخستنێك دابمەزرێنم. باوەڕم هەیە کە دەبێ یادی پاڵەوانانی بەرخۆدان لە ساڵی ١٩٧١ دا بپارێزرێت و ئێش بۆ بەردەوام بوونی بکەین و نەیکەین بە پارووێەکی ئاسان بۆ دوژمن. بە شەهید بوونیان بۆ جاری دووەم بێهێزی و خوێن و پاڵەوانەتیم بینی و تەماشای دەوروبەری خۆمم کرد و هەڤاڵە زیرەکانم نەبینی و ئارەزووی یەکگرتنم لەگەڵ چەند ناوەندێکی دیکەدا کرد. بەڵام سەیرم کرد دوورن، بە خێرایی لێت دەتەکێنەوە.

ناونووس کرانم لە کۆلیژی زانستە سیاسیەکاندا هەشت ساڵ درێژەی کێشا و ساڵانی یەکەم لە یادی ئەو پاڵەوانانەی بەرخۆدان و هەوڵی تۆڵەسەندنەوەیاندا بەسەرچوون، پاش ئەو حەوت مانگەی کە لە پشت شیشی زیندانەوە بەسەرم بردن گوتم: «هیچ شتێك بە بێ ڕێکخستنێکی دروست و هەمیشەیی ناکرێت».

دابڕانێکی ڕاستەقینەم لەم مەسەلەیەدا بینی. بەسەرهاتی کورد کەموکوڕییەکی تێدا هەبوو. گوتم: «ئەگەر کێشەی کورد چارەسەر نەکرێت، ناتوانین بە یەك پێ بڕۆین». سوشیالیزمی شۆڕشێی بەردەوام تەگەرەی دەخستە ئەو کارە. من خەریکی ئامادەکردنی ئەم پێ و ئەو باسکە بووم. لە دەست پێکردنی ساڵی (١٩٧٢)ەوە بەم بڕیارە گەیشتم: من لە پێناوی شۆڕشدا هەم. بەڵام دەبێ باسکی کوردی ئامادە بکەم و بنیاتی بنێم و بیخەمە کار و بیکەمە بەشێکی ئەم شۆڕشە. دیارە بە بێئەوەی پێوەندیم بە هەڤاڵانی تورکەوە بپچڕێنم هەر لەو قۆناغەدا چاوم بە «کەمال پیر» کەوت و پێوەندیمان دەستی پێکرد و ئاخافتنێکی یەکجار کاریگەرم گوت. ئەم قسانە زۆر کاری تێکردن و بەس بوون بۆ ئەوەی کە خۆیان پێوە گرێبدات.

ی.ك: کە لە بەندیخانە دەرچوون بێ جێوڕێ مانەوە؟

س.پ: بەڵێ. دەچوومە ماڵی برادەران و ماڵم نەبوو. دەتوانم بڵێم من لە ساڵی ١٩٧٢ بە دواوە بە کردەوە سەرکردایەتی شۆڕشگێڕەکانم دەکرد. ڕەنگە لەمە ڕوون نەبووبێ بەڵام ئێستا پاش تێپەڕینی بیست ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا ـ واتە ئێمە لە بیرەوەری بیستەمیدا دەژین ـ ئەوە پتر ڕوون بۆتەوە.

ئەو کاتە گەلێك تۆێژی بەرفراوانمان لە ئەنقەرە و ئەستەمبوڵ ڕێکخست و توانیمان گیانی شۆڕشگێری بۆ ئەستەمبوڵ بگوازینەوە و ئەو مانگرتنە بگەیەنینە هەموو تورکیا کە ١٢ ی ئادار لە کۆلیژی زانستە سیاسیەکان دەستمان پێ کرد. ئەمە وەك قۆناغێکی تازە وا بوو. چاودێرێکی باش بووم، لەبەر ئەوەی لایەنگرێکی باشی چەپی تورکیش بووم چ خزمەتێك خرایە سەرشانم کردم و کەوتمە بەشێوەی بڵاوکراوە. هەتا گەیاندمە گوندەکەشم. ئەوە هەرگیز نارەحەتی نەکردم و هەستم بە دڵپیسی نە دەکرد. دیارە چەند هەڤاڵێکی دیکەشم لەگەڵدا بوون.

ی.ك: کەسی وا هەیە لەگەڵتدا خەباتی کردبێ و هێشتا مابێ؟ سێ

س.پ: لەم مەسەلەیەدا هەڤاڵ «دۆغان»م بیردەکەوێتەوە کە هەڤاڵی بەندیخانەم بوو. کوڕی «لیمان فرتنا»یە و پێم واشە «لیمان» لە ڕێکخراوی مافی مرۆڤدا ئیش دەکات.

ی.ك: لام وابێ ئێستا لەوێ نییە. وەك بزانم لە هەڵبژاردنەکانی دوایدا لەوێ نەبوو.

س.پ: کوڕەکەی لە قوتابخانە و بەندیخانەشدا هەڤاڵم بوو و سەر بە ڕێکخراوی ڕزگاری «KURTULUS» بوو، من ئەم مەسەلەیە دەگێڕمەوە چونکە خاڵێکی شایانی بایەخ پێدانی تێدایە. بیرتانە کە «ئاغور مومجو» گوتی: ئاخۆ پازدە ساڵ لە بەندیخانە دەمایەوە. بۆچی بەریاندا؟ ئەوەی لە گوتارێکیدا نووسی. من لێرەدا دەمەوێ ئەم مەسەلەیە کەمێك ڕوون بکەمەوە. باوکی «دۆغان» ئەفسەر بوو. لەوەیش کە لە دادگا بوو بە شایەت بە سەرمانەوە کەسێکی فاشی بوو، پێم وایە باوکی «دۆغان» لەو کاتە ئەندامی دادگای سەربازی بوو و نازانم ئاخۆ توانیبێتی کاربکاتە سەر دادگا یان نا، ئەو حوکمەی کە «باقی توغ» بۆی داوا کردبێ حەوت ساڵ بوو. بەڵام ناکرێت بە یەك شایەت حوکم دەربکرێت، ئەگەر دادگا ئەوەی کرد ئەوە هەڵاوارادنە جا بۆ ئەوەی «باقی توغ» بتوانێ ئەم حوکمە دەربکات پێویستی بە شایەتێکی دیکە هەبوو و لەیەك شایەت بەدەریش لە بەردەستیدا نەبوو. وای ئارەزوو دەکرد، بەڵام نەیتوانی. قوتابی و لاو بووین هێشتا خاڵی کوردی بە تەوێڵمانەوە نەبوو.

ی.ك: ئەو داواکاری گشتی بوو و دەیتوانی داوا بکات. دادگاش دەیتوانی ئەوە جێبەجێ نەکات. کێشەکەتان گەیشتە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٢ و حەوت مانگ لە بەندیخانەدا مانەوە. ئەوە بەس بوو بۆ بەرەڵلا کردنتان.

س.پ: بە کورتی وازیان لێهێنایین و بەریاندایین. ئەو ئەزموونە فێری کردم و واهاتەهات باش سنووری خۆم بناسمەوە. هەروەها ڕژێمی سەربازیشم ناسی و پەیم بەوە برد کە ئەم کارە بە جۆش و خرۆشی گەنجانە ناکرێت. لە دڵی خۆمدا گوتم: پێویستە ئیشلگیر بی و تەگبیری حاڵی خۆت بکەی تا جارێکی دیکە نەچیتەوە بەندیخانە و باش دەورت بگرن. پێویستە ئەوە فێر ببی و بە باسکی کوردی دەست بە کار بکەی. هەموو ئەمانە لە بەندیخانە فێر بووم.

ی.ك: بۆچی ئاوا بیرت کردەوە؟

س.پ: ئەگەر باسکی کوردی دروست نەبێ هیچ ڕووداوێکی تورکی لە ئارادا نابێ. کەمال پیر پاشتر لە لێکۆڵینەوەدا ئەوەی بە ئاشکرا گوت: «ئەگەر شۆڕش لە کوردستان گەشە نەکات، تورکیا شۆڕشی تێدا نابێ». هەڤاڵان لە چوارچێوەی ئەم تێزەدا هاتنە پاڵمان. ئەمە وا دەگەیەنێ کە شۆڕش توانی لە ڕێگای ئێمەوە گەشە بکات.

ی.ك: منیش لە منداڵیمەوە دەمگوت: «کوردستان گۆڕەپانی دروست کردنی

شۆڕشگێڕە تورکەکانە».

س.پ: بەڵێ شۆڕشی کوردستان وا لە خۆی دەکات لەم گۆشەیەوە هەستی پێبکرێت. چەپی تورکی ئەوەی لە بەرچاو نە دەگرت و لە بەردەم شۆڕشی ڕاستەقینەدا داخراو بوو و نیازی نەبوو کوردستان بخاتە پاڵ شۆڕش. گوتەکانی سۆشیالیزمیان لە هەزار جێوە کۆدەکردەوە تا بڵێن: «ناکرێت ڕێکخستنێکی دیکە لە گۆڕێدا بێ». بۆچی شۆڕشێکی دیکە ناکرێت؟ هەوڵیان دەدا ئەم تیۆریانەیان بسەلمێنن. هەرچی ئێمەیش بووین کە لە کوردستانی بنکەی وزەی زۆر و زەبەند و شاراوەی شۆڕشەوە هاتبووین دەمانگوت: «دەبێ گۆڕەپانەکەمان ببێتە سەرچاوەی شۆڕشێکی گەرم». لەم خاڵەوە دابەش بوون و لێك دوورکەوتنەوە دەستی پێکرد. بە واتایەکی دیکە لە سۆشیالیزمی شۆڤێنی دابڕاین.

ی.ك: لە تێزەکەتاندا شەرێکە بەشی یەك لە نێوان دوو شۆڕشدا هەیە. دەڵێن تورکیا شۆڕشی تێدا ناکرێت بە بێ سەرکەوتنی شۆڕش لە کوردستان.

س.پ: بێگومان «حەقی و کەمال»م لەگەڵدا بوون تا ساڵی ١٩٧٦ لە نێو شانە و ڕێکخستنەکانی چەپی تورکیدا پێکەوە بووین. لەبەر ئەم هۆیە ئیدارەی موخابەرات سەری لێشێوابوو و تا چوار ساڵ نەیدەزانی سەر بە چەپی تورکیم یا چەپی کوردی، بە بێ ئەوەی هەواڵی ڕاستیان پێبگات.

ی.ك: کەسی وا هەیە تا ئێستا نەتوانێ ئەمە هەڵسەنگێنێ؟ خۆ تا ساڵی ١٩٩٢یش هێندێکیان دەپرسن کوردە یاتورکە یا مارکسی و لە هەڵسەنگاندندا دژواری بەدی دەکەن هەیە تا ئێستاش نازانێ؟

س.پ: بەڵێ، هێ وا هەن تا ئێستاش نامناسن و دوو دڵن لەوەی کە داخۆ ئاپۆ کوردە یا تورکە و ئایا کوردستانی دەوێ یا شۆڕشێکی لە تورکیادا دەوێ و ئایا ئاپۆ سۆشیالیستییە یان نەتەوەپەرست و ئایا ئاپۆ مارکسی ـ لینینییە یان بیرێکی دیکەی هەیە.... گەلێك پرسیاری لەم چەشنە. لەم مەسەلەیەدا نە ئەمەریکا و نە تەنانەت تورکیا و ئێران و ئەوانی دیکەش هێشتا نەیانتوانیوە ئەوە دەست نیشان بکەن.

ی.ك: ناو بەناو وەك لە ڕۆژنامەکانی تورکیادا دەیخوێنینەوە ئەوانیش تا ئێستا ناتوانن ئەوە دیاری بکەن.

س.پ: بەڵێ، ناتوانن ئەم هەڵسەنگاندنانە بکەن. من هیچ شتێك سەبارەت بەم مەسەلەیە ناشارمەوە و ئاشکرا و بە بێ کەم و زیاد باسی هەموو ڕاستییەکی پەیوەند بە خۆمتان بۆ دەکەم. من لەو بارەیەوە زۆرکراوم و ئەم هەڵوێستەیش مەبدەئییە. دەبێ ڕاستییەکان بێ کەم و زیاد بن. کەس نییە وەك من بتوانێ بێ کەم و زیاد ڕاستی بڵاوبکاتەوە.

ئەگەر زەمان و زەمین لەبار بوونایە ڕاستییەکانم زیاتر وەکو خۆیان بۆ شیدەکردینەوە.

ی.ك: ئێوە هێندەی بەس بکات قسە دەکەن. من لە کاری حیزبیتاندا ئەوە بەدی

دەکەم، لە بەیاننامەکانی ئەم دوایییەتاندا لەسەر گشت شتێك قسە لەگەڵ هەمووان‌دا دەکەن. ئەمە شێوازێکی سوکراتیانەیە. ئێمە گوتمان لە زانکۆی ئازاددا شێوازی سوکراتی هەبێ، بەڵام لێرەشدا هەمان شێواز بە ڕێوەدەبەن.

س.پ: من پیرۆزبایتان لێدەکەم چونکە لە زانکۆدا هەر لە بنچینەوە شێوازی سوکراتیتان هەڵبژارد. ئەمە شتێکی زۆر باشە و تەرزی ژیانمە. سوکرات لەو یەکەمین کەسانە بوو کە ئەکادیمیای فەلسەفەیان دامەزراند. جا لێمەوە بۆ یادی یەکەم دامەزرێنەر ئەکادیمیایەکی هاکەزاییمان ڕێکخست، بەڵام پەرەیسەند. بەم پێیە پیرۆزبایی ئەم کارەتان لێدەکەم.

ی.ك: کارێکی گەورەیە و گەلێك کەس پێشوازییان لێ کرد. ئێستا با گفتوگۆکەمان تەواو بکەین. بەڵێ دەتناسن، بەڵام ناتوانن هەڵتبسەنگێنن.

س.پ: هۆی ئەوەش ئەوەیە: ئەوان بە چەند قاڵبێکی دەست نیشانکراو ڕاهاتوون و لە مرۆڤایەتییەوە دوورن. بەڵام من بە تەواوی مرۆڤم. پێویستە ئەمە لە مرۆڤایەتیدا ببینن: تێڕوانینێکی خاوەن یەك دوورایی لێیە. وەك نەتەوە و ئاین و نەژاد و مەزهەب. لە دنیادا نەیارێکم نییە تەنانەت لە نێو دوژمنەکانیشمدا بتوانێ پیاوانە شەڕ بکات. ئیتر بۆچی بەچەوتی هەڵدەسەنگێنن؟ هەیانە دەڵێت: نیشتمانپەروەرێکی گەورەیە و هەیانە دەڵێت: سەربازییە و هەیانە دەڵێت: ئاییندارە و هەشیانە دەڵێت: ئیمپریالییە و هێندێکیشیان دەڵێن: نەیتوانیوە خۆ لە تێڕوانینی تەسکی چینایەتی دەرباز بکات. بەو پێیە ئەوانە ناتوانن دەست بەرداری قاڵبەکانیان ببن و لە تێڕوانینی تەسکی خۆیانەوە دەست پێدەکەن و دەڵێن ئاوهوایە و وایە. من هیچ یەکێك لەوانە نیم و نابم. بۆچی خۆم لە خەسڵەتە بنچینەییەکانی مرۆڤ دوور بخەمەوە؟ بەڵام خۆم ناکەم بە ئامێرێك بۆ لەو خەڵکانەی کە شێوەیان تێکچووە. من نکوڵی لە مرۆڤایەتی و ڕاستی ئاین و هەموو ڕاستییە کۆمەڵایەتییەکان ناکەم. بەڵام لە بەردەم ئەم مەسەلانەدا کە بوونەتە کارێکی کۆنەپەرستانە و بەڵا بەسەر مرۆڤایەتییەوە یا بوونەتە شێوە نەعامەتی و بارێك بەسەر شانی کۆمەڵگاوە، سەر دانانەوێنم. ئێستا ڕەنگە بڵێی: تۆ یەك کەسی، پێویستە بەم چەشنە قسە نەکەی. چ پێویست بەوە دەکات. ئەوسا دەڵێم من مرۆڤم و لەبەر ئەوەیش کە مرۆڤم پێویستە ئەمە بکەم.

ی.ك: لەخێر وانالێم؟

س.پ: لەوانەیە هی وا هەبێ وا بڵێت. مەبەستم ئەم قسەیەیە: «ئەم ئاوهوایە کێیە تا لە مرۆڤایەتی بدوێت و بە ناویەوە جموجۆڵ بکات». بەڵام من مادامێکی مرۆڤم، ئیتر بۆچی بە ناوی مرۆڤایەتییەوە نەکەومە جووڵە. وانییە؟

ی.ك: زۆر وایە. ئەمە هەقی خۆتانە.

# من جەنگاوەری ڕێگای جوانی و جەربەزەییم

س.پ: هەڵسەنگاندنێکی دیکەتان لەسەر خۆم بەرچاو دەخەم: هەموو ڕێزێکم بۆ ئەو خەسڵەتە مرۆدۆستانەن کە یەکەمجار سەریان هەڵدا و تەواو دڵبەستەیانم. بەلای منەوە ئەو دۆستایەتییەی کە لە داستانی «گلگامێش»دا هاتووە لەمەڕ ڕێکەوتنێکی گەورە یان دۆستایەتییەکی لەمڕۆمان باشترە. چونکە ئاسایی و دۆستانەیە. پێوەندییەکانی مرۆڤی سەرەتایی زۆر کێشم دەکەن. لەوانەیە ئەوانە لە ڕووی زمان و سیستەمی سیاسییەوە پەرەسەندوو نەبووبن. بەڵام هەمیشە دڵبەندی پەیدابوونی یەکەمین هێڵی ئەوان بووم. لە دڵی خۆمدا واهەست دەکەم کە من لە تەمەندا هاوشانی ئەوانم و ڕەنگە هێندێکتان ئەمە وا هەڵبسەنگێنن کە کۆنەپەرستانەیە و بڵێن: تۆ بەدوای هێڵ و پرەنسیپێکدا دەگەڕێی هی پێش پێنج یا دە هەزار ساڵە. لەوانەیە وا هەڵبسەنگێنن کە زۆر پاشکەوتووم و مرۆڤێکم بەرەو دواوە دێمەوە. بەڵام بە قەناعەتی خۆم ئەو خەسڵەتانەی کە لەلای مرۆڤی سەرەتایی هەبوون پاکتر و بێگەرد ترن.

ی.ك: زۆر جوانە، ئەمە تەواو هاوجووتی سروشتە. واتە تۆ منداڵێکی لە تەمەنی پێنج یا دە هەزار ساڵەدای.

س.پ: بێنلە مرۆڤ وەك خوڵقێنراوێك هەڵبسەنگێنین. منداڵ بۆچی خراپ دەبێ؟ خەسڵەتە سەرەتاییەکانی منداڵ بێگەرد و مرۆدۆستانە و بێوەیین و هاوسانی دەزانێ. ئەمانە هەموو خەسڵەتی باشن. باوەڕم وایە مرۆڤ تا گەورە بێ، لەم خەسڵەتانە دوور دەکەوێتەوە. پێم وایە هەڵوێست دیاریکردن بەرانبەر بە مرۆڤایەتی کۆن بە هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕانە دەژمێردرێت. جا لەم گۆشەیەوە ئەوان دەبانەوێ بە پێی بۆچوونە کۆن و کلاسیکیەکانیان هەڵبسەنگێنن کە بوونەتە قاڵبی جێگیر و ووشك هەڵاتوون و بوون بە ئیسقان. با بۆچوون و ئاین و نەتەوەی خۆیان هی خۆیان بێ و با سەرمایەداری بۆ ئەوان بێ و با سۆشیالیزمی بنیاتنراویش بۆ ئەوان بێ.

ی.ك: لێرەوە تابلۆیەکی جوان دەردەکەوێ. لە هەموو لایەکتانەوە ناکۆکی دەکەوێتە ڕوو. تۆ ڕێزی ئاین دەگری و هێندێك سوورەتی قورئانت لەبەرە و لە کوردستان و تورکیادا بەڕێبەری (PKK) گەورەترین خەبات دژی جادووگەری دەکەی.

س.پ: ڕاستە من جاروبار سەرهەڵدانی (PKK) و سەرهەڵدانی ئیسلام پێك دەگرم. لێرەدا هێندێك لە چەپڕەوە ڕووکەشەکان دەڵێن: ئەو خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ. ڕاستییەکەی پێویست بەوە ناکات خۆ بەوە بزانم. لەم ڕۆژگارەدا زانست هەموو شتێکە و لێکچوون شایەنی بایەخ پێدانە و لە ڕاستیدا نەبوونی لە بیاباندا کەسایەتی بەهێز دەخوڵقێنێ. دەرکەوتنی سەردارمان محمد (د.خ) وەك تەقینەوەی گڕکان وایە لە بیاباناندا. کچ زیندە بەچاڵ کردن کارێکی چەپەڵە و بڕوای

پێناکرێت. ئەمجا هی وا هەیە ڕەخنە دەگرێ و دەڵێت: محمد (د.خ) ئەوەندە ژن و ئەوەندە کەنیزەکی هەبوو. بەڵام من بەچاوێکی دیکە دەڕوانمە ئەوە. دەبینم ئەم مەسەلەشیان بە شێوەیەکی چەوت هەڵسەنگاندووە. ڕاستە ژنهێنان هەیە بۆ مەبەستی سیاسی. بەڵام ئەگەر بە پێی ئەو ئوناخە وەزعی ژنهێنانت لەگەڵ هی جاراندا بەراورد کرد. ئەوا دەبینی کێشەی ئافرەت سەرکەوتنی تێدایە. ئەمەش هەنگاوێکی باشە. ڕوانینە ئەم مەسەلەیەش بە چاوی تەواوەتیەوە ڕاست نیە. پشتگوێخستنی دەوری محمد (د.خ) وەك شۆڕشگێڕێکی گەورە لەو هەلومەرجە مێژوویەدا و تێنەگەیشتنی، ڕاست نیە. وەك گوتم لەو بنهێزییە لە ڕادەبەدەرە وردبینەوە کە لە بیاباندا هەبوو. ئەمجا سەرهەڵدانی ئەو هێزەش . دەبینن لێکچوونی لەگەڵ سەرهەڵدانی( PKK )دا هەیە. لەم لایەنەوە مانەوە بەستراوە بە خەسڵەتی باشی پێغەمبەرانەوە و ڕووداوێکی گرنگ بۆ من پێکدەهێنێ. ئاخاوتنی وەك پێغەمبەران و ئەوە بۆ خەڵك کردن بەشێوازی پێغەمبەران چەند مەسەلەیەکی ـ بەلای منەوە ـ گرنگن. ئیتر بۆچی ئەوە خراپ دەبێ؟ لێکدانەوەم لەم بابەتەدا جیاوازە. هەیە شیکردنەوەی منی لەسەر ئاین «هەڵوێستی شۆڕشگێڕم بەرانبەر کێشەی ئاین» بە شێوەیەکی چەوت هەڵسەنگاندووە، ئەگەر چی چەندین سەرەداوی زۆر گرنگی تێدایە. بە ڕای من ئەو خەڵکە زۆرەی کە بە ئاینەوە خۆ دەنوێنن، لە گەوهەریەوە دوورن و بە تەواوی محەممەدی سەردارمان (د.خ) ناناسن و فریان بەسەرەوە نیە و ناوی شێخی فلان تەریقەت یا فلان حیزب یا حیزبی خوا «حزب الله» لە خۆیان دەنێن. ئەوانە ساختەن و دووڕوون. ئەگەر خاوەنە ڕاستەقینەکانی ئاین دەربکەون، ملی هەموویان دەپەڕێنن چونکە داگیرکەر و مشەخۆر و نەزان و فێڵباز و تا سەر ئێسقان پەیبەستەی دەوڵەتان و ڕژێمە سیاسیە دامەزراوەکان و دۆلار و موخابەراتن. ئەوانە زۆر خراپەکارن و ئەوەی کە دەیکەن ئیسلامەتی نیە، بەڵکو پیس و پۆخڵیە. ئەو ڕوخسارە ڕاستەقینەیان دەخەینە ڕوو کە لەپشت دەمامکە ئیسلامیەکانەوە لە گەلی دەشارنەوە. ئەوسا گەل بەوپەڕی تووڕەییەوە دوایان دەکەون و تا دەچنە نێو دۆزەخ ، من لەوە دڵنیام.

ی.ك: ئەوەی کە دەیڵێن زۆر ڕاستە و من پێی ڕازیم. باوەڕم وایە ئەوان بە چەوتی هەڵتدەسەنگێنن.

س.پ: ئەوان بە چەوتی دەمناسن. من دەست بەرداری مرۆڤایەتی نابم. نەك ئەوە بەڵکو دەست بەرداری منداڵی مرۆڤایەتی نابم بەهۆی داپەش کرانیانەوە بۆ چەندین گەل و ئاین. من لەو خەڵکە نیم کە گەورە بوون و لەوانەش نیم کە خۆ بە گەورە دەزانن. بەڵام سەرباری ئەمانە خۆم بە بچووك نابینم، واتە بە بچووکی ناگرم و داماونیم. نابێ هەر بڵێین خەباتی مرۆڤایەتی و بەسەریدا تێپەڕ ببین.

ی.ك: هەڤاڵەکانتان وای دەردەخەن کە ئێوە خەباتی خۆتان بە خەبات لە پێناوی سەرتاسەری مرۆڤایەتیدا دادەنێن.

س.پ: بەڵێ ئەمە ڕاستە. بەڵکو دەتوانم ئەوە بەم قسەیمان بکەمە قسەیەکی گشتی: زۆرانبازی مرۆڤایەتی دژی ئەو ئیمپریالیزمەیە کە هەوڵی سەپاندنی

مەرجەکانی خۆی دەدا بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و سیاسیدا و بە شێوەیەکی پڕ سووکایەتی خۆ بەسەر کەرامەتی مرۆڤانەدا دەسەپێنێ و مرۆڤایەتی لە هەلومەرجی ژیانی ئاسایی بێبەش دەکات. راستی زۆرانبازیەکە ئەمەیە. شۆڕشیش ئەو شەڕەیە کە مرۆڤایەتی دەیکات لە پێناوی گەڕانەوەدا بۆ هەلومەرجی ژیانی ئاسایی و بەربەرەکانی کردنی ئەو ئیمپریالیزمەی کە هەوڵی سەپاندنی مەرج و مەترسیەکانی دەدات. ئیمپریالیزم رووی زەوی و ئاسمانی دەکاتە شوێنێکی نەگونجاو بۆ ژیان و دەست بەسەر هەموو توانایە سروشتیەکاندا دەگرێ، بە توانایی ناوخۆ و دەرەوەی گەلانیشەوە. مادامێکی مرۆڤم، چۆن چاو پۆشی لەم هەموو مەسەلانە دەکەم؟ خەباتم بۆ گەیشتنە بە ژیانی ئاسایی مرۆڤ.

ی.ك: ئایا خەباتتان تا رزگاربوونی سەرلەبەری مرۆڤایەتی درێژەی دەبێ؟

س.پ: ئەم خاڵە زۆر گرنگ نی یە. ئەگەر نوانیم دڵنیا بژیم، ئەوە بەسە. بەڵام من بێ‌رەوشت نابم و بەناوی مرۆڤایەتی‌یەوە نەکەومە جووڵە تا وێرانی بکەم. گشت کار و جووڵانەوەیەکم لە چوارچێوەی رزگاری نیشتمانی و سۆشیالیزم و مەرجە بنچینەییەکانی ژیانی مرۆڤدایە و بۆ بنیاتنانی پەیوەندی و ژیانی ئاسایی‌یە و بۆ بەدیهێنانی هەلومەرجی ژیانی کۆمەڵایەتی‌یە. من پێبەندی هەموو ئەوانەم کە باسم کردن. ئیمپریالیزم بەهۆی هەستی نەتەوەیی و ئاینی هێندێك تاقم و بە شێوەی دیکە مەرجەکانی خۆی دەسەپێنێ. من دژی هەموو ئەم دیمەنانەم و دژی ئەو مرۆڤەشم کە لەم رژێمانە دێتە دەرێ. لە کۆنەوە تا ئێستا ئەو چەشنە مرۆڤانەشم خۆش ناوێ. بگرە لەم رژێمانە چی دەربهاوێژن من دەیانبوغزێنم. ئەمە ناکۆکیەکانی منن کە گشتی و جیهانین. رەنگە زۆر زیرەك نەبم و رەنگیشە پاشکەوتووبم. بەڵام من باوەڕم بە خەباتی خۆم هەیە. ئەم خەباتە مەستی‌یەکی بێ ئەندازەم دەداتێ.

ی.ك: شتێکی باشە هەموو مرۆڤێکت خۆش نەوێ.

س.پ: دیارە خۆشم ناوێ. من مرۆڤێکم بە ئاسانی خۆشم ناوێ. ئێستا تەمەنم چل و چوار ساڵە و هێشتا بەدوای ئەو کادیرەدا دەگەڕێم کە زۆر خۆشم دەوێ و دەست نیشانی دەکەم تا ببێتە باشترین هەڤاڵم. گەلێك خەڵکم لە دەور و پشتدان. من لە هەموویان بە ڤینم. ئەگەر هیوا نەبووایە هیچیانم لەلای خۆم نەدەهێشتەوە.

ی.ك: من ئێستاکە دەتبینم خۆشەویستی و توورەییت لە یەك کاتدا یەکخستووە.

س.پ: بێ‌گومان. توورەیی بەرپەرچدانەوەی کۆسپەکانی بەردەم خۆشەویستی‌یە. خۆشەویستی رووداوێکی گەورەیە. ئەگەر کۆسپێکی لە بەردەمدا بێ، ئەوسا توورەیی دەبێتە بەرپەرچدانەوەی ئەم کۆسپە. ئایا تێ‌گەیشتن لەمە گرانە؟ پێم وایە ئەمە روون و ئاشکرایە. توورەیی بە تەنیا کارێکی ئاژاوەگێڕانە و فاشیانەیە. بەڵام ئەگەر بۆ بە دەستەوەگرتنی خۆشەویستی گەورەبێ، خەباتێکی شۆڕشگێڕانەیە و خودی زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانەشە.

پێیانگوتم: «تۆ بەشوێن مرۆڤی سوپەرماندا وێڵی» نازانم ئاخۆ بە شوێن

مرۆڤی سۆڤیەرمان یا هی فاسایەدا وێڵم. هەتا هەندێکیان گوتیان تۆ بەشوێن ئەو مرۆڤەدا وێڵی کە بەختەباڵی «نیتشە»ها هاتووە. هەرچی چۆنێك بێ. من هەموو ئەوانەم نەخوێندووەتەوە. بەڵام ناتوانم مرۆڤی سووڵا و هیچوپوچ قبووڵ بکەم. من لە هەموو شتێکی مرۆڤ ورد دەبمەوە. ئەگەر مرۆڤێك هاتە لام لە تەوقی سەریەوە تا قولەپێی لێیوورد دەبمەوە. ئەو لایەنانەی کە وای لێدەکەن خۆشەویست بێ، بەلای منەوە گرنگن. هەرچی لایەنەکانی دیکەیە پەیوەندیم پێیانەوە نییە.

ی.ك: ئەمە وا دەگەیەنێ کە تۆ دەتەوێ مرۆڤی جوان ببینی.

س.پ: بێگومان. من لە خەباتێکی بەردەوامدام بۆ ئەم مەبەستە. من وەك دەبینن ئەو مرۆڤە بە شەڕ دەخولقێنم. من شەڕکەرم لە پێناوی جوانیدا. بە ڕاشکاوی دەیڵێم ئەوانەی وا دەیانەوێ لە دەورم بمێننەوە دەبێ لە نێو ئەم چوارچێوەیەدابن. ڕەنگە بڵێی ئەوانە بۆ خودی خۆیان نازین و عاشقی خودی خۆیان نین. من دەڵێم ئەگەر پێیان قبووڵە ببنە جەنگاوەری ڕێگای بەها بنچینەییەکانی مرۆڤایەتی دەتوانن لەلام بمێننەوە. دەنا با بڕۆن و با لەو شوێنە بژین کە پڕ بە پێستی خۆیانە. من جەنگاوەری ڕێگای مەزنی و جوانیم و بە کردەوە لە ڕووی تیۆرییەوە مامۆستای ئەم مەسەلەیەم. ئەوەی کە دەڵێت «من نۆ ئەوانەم» با بفەرمووێ.

ی.ك: ڕۆژی دووشەممەی ڕابردوو لە مەڵبەندی گشتی کۆمەڵەی مافی مرۆڤ بووین. ئەویش بە بۆنەی هەفتەی مافی مرۆڤەوە. لەو کۆبوونەوەیەدا قسەم کردو گوتم: «کێشەی گەلان کێشەی برایەتییە». قسەیەکم کرد لە هی ئێوە دەچێ و ئەمەیە: «کوردەکان لە سەرکەوتندان و تورکەکانیش هەمیشە سەرکوت دەکرێن. یەکیان بڵندە و ئەوەی دیکەیش لە خوارەوەیە. ئیتر برایەتی چۆن دەبێ»

## سۆشیالیزم هونەری نزیك بوونەوەیە لە ڕێکی و باشی و جوانی و، پاراستن و پەرەپێدانی خەسڵەتە باشەکانی مرۆڤ.

س.پ: سۆشیالیزم هەڵەیەکی تێدایە. ئەویش بیرکردنەوەیە لەوەی کە سۆشیالیزم یەکسانە بە چەوساوەکان. ئەمە چەمکێکی هەڵەیە. پێویستە لەسەر سۆشیالیزم لە سەرکوتکردن و گەندەڵ بوون دوور بکەوێتەوە و شەڕ بکات بۆ سەرخستنی ئەوەی کە دژی ئەو دوو شتەیە. دەنا بەدمەردی سۆشیالیزمی بنیات نراو دەچێ، چونکە سۆشیالیزمی بە چەمکە باوەکەی دیکە لێك دایەوە. وەك ئەوەی بڵێن: «هەژار بووین، بەڵام ئێستا گەدەمان پڕ بوو. ئەمەیە سۆشیالیزم».

نەخێر ئەمە سۆشیالیزم نییە. ئەمە لێکدانەوەیەکی هەڵەیە و ڕاڤەکردنەوەیەکی فراوانتر لێکی دەدەمەوە. ئەوەی وا دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە: تێگەیشتنی من لە سۆشیالیزم تەواو پێچەوانەیە. سۆشیالیزم واتە هونەری نزیکبوونەوە لە هەموو جۆرە ڕێکی و باشی و جوانی و پاراستن و پەرەپێدانێکی خەسڵەتە باشەکانی

مرۆڤ. بە تێگەیشتنی من ئەمە چەمکی زانستی سۆشیالیزمە. من دژی هەموو شتێکی خراپم . خراپیش بەلای منەوە چەمکێکی پێچەوانەی هەیە. من لە تێڕوانینمدا هەموو شتێك لێك جوێ دەکەمەوە و ناکۆکیەکان دەبینم و دەڵێم: ئەم شێوەیە خراپە و پێویستە ئاوابێ و هەموو توانا و هێزێکم دەخەمە کار تا ڕاست و چەوت هەڵبسەنگێنم. ئەمە خەرج کردنی هەوڵ و وزەی زیاتر دەگەیەنێ. حەزدەکەم ڕوونی بکەمەوە کە خەڵکانێك هەن هەوڵێکی زۆریش دەدەن و منیش بە سەریاندا هەڵناکێشم. بەلام لەو ڕێگایەدا کە لەسەری دەڕۆم هەوڵێکی لە ڕادەبەدەر و دەگمەن دەدەم.

ی.ك: لەوانەیە هێزی خۆتانتان لە کردەوەی خۆتانەوە بە دەست هێنابێ. بەلام لەوان وا تێدەمڕوانن وەك بلێی لە تایبەتمەندی ئێوەدا پسپۆڕ بم. بۆیە لە تورکیا و لە هەندەران زۆرم لەسەر تۆ لێدەپرسن. منیش پێیان دەڵێم: «عەبدوڵلا ئۆجەلان بەیانی و ئێواران بیر لەوە دەکاتەوە کە سەرۆکی ئەمریکا و سەرۆکی دەستەی ئەرکانی تورکیا بیری لێدەکەنەوە. چونکە ئەمە ئیشەتی».

س.پ: ئەوانە بەلای منەوە خەڵکانێکی بەستە باڵان.

ی.ك: ئێوە ناچارن بیر لەو سیاسەتانە بکەنەوە کە ئەوانە لە بەرەنگار بوونەوەتاندا ڕەنگیان بۆ دەڕێژن.

س.پ: من لە نێوان خۆم و خودی خۆمدا درێژ بیردەکەمەوە و دەڵێم: ئەگەر نوێنەرێکی ئەمریکام بەرانبەر بە خۆم ببینی چۆن لەگەڵیدا دەست بەقسە بکەم. دیارە پێی دەڵێم: «شەرم لە سیاسەتەکانتان ناکەن. ئێوە ئەم ئەندازە سووکایەتیە دەسەپێنن. ئایا ئەمەیە مەزنایەتی؟». کاری دیپلۆماتیم لەگەڵیاندا وا دەبێ. جا ڕەنگە هی وا هەبێ مل شۆڕبکات و بپاڕێتەوە و بەم شێوازە باسی هەق و ماف بکات و سوالی سۆز و بەزەییان لێبکات. بەلام ئەگەر من بەم دەڵێم: «ئەی هیچ و پووچ تۆ لافی گەورەیی لێدەدەی. ئایا کردەوەکانت لەگەڵ مرۆڤایەتیدا جووت دێنەوە؟» ئەمە سیاسەت و پێوەندیم دەبێ. من ئەم قسەیە دەکەم، چونکە نامەوێ بە هەڵە هەڵبسەنگێنن و وایان لێبکات هەڵە بکەن و وام پیشان بدەن کە من گەورەم و ئەوان بچووك. ناتەواوی لە خۆیان و هەڵسەنگاندنەکەیاندایە. من دەست بەرداری بەهاو پێوانە بنچینەییەکانی مرۆڤایەتی نابم. ئەمە ئەوانەی دووروپشتیشم دەگرێتەوە. من نیم پاڵیان پێوە دەنێم بۆ ئەم وەزعە هەڵەیە. بە پێچەوانەی ئەوەوە من هەوڵ دەدەم بە هەموو توانایەکەوە لەوان و دوژمنیش بۆ ڕێگای ڕاستە بەکێش بکەم. ئەوەی پێداگری لەسەر هەڵەی خۆی بکات، نامێنێ. ئەمە توانامە لە ڕێکخستندا و هێزمە لە نێو گەلدا. بۆ ئەوە شەڕ دەکەم خەڵك بۆ بەهای مرۆڤانە ڕابکێشم. بەلام دوژمن بە پێچەوانەی ئەوەوە دەڕوات. من دەڵێم: کورد هەیە. ئەو دەڵێت نییە. من دەڵێم: دەبێ کورد هەندێك ئازادی بەدەست بێنێ و ئەو دەڵێت: پێویست بەوە ناکات. ئەوسا پێی دەڵێم: تۆی هەڵەی گەورە دەکەیت و ئەوەی کە هەڵەی گەورە بکات نامێنێ. ئەمە سەبارەت بە ڕێکخستنیش ڕاستە. ئەوەی وا

پێڕەوی تەکنیك و ڕێکخستنی ڕاست ناکات، چی‌دەکات و چۆن لە بەردەمەدا ڕادەوەستێ. با بەجێیمان بهێڵێ. واتە من بە شێوەیەکی زۆر جیاواز مرۆڤ هەڵدەسەنگێنم.

ی.ك: پێت گوتم: ستالین تێکیشکاند و تێکیشکاند، لەبری خۆی هێندێك خیانەتکاری دانا کە من ئەوە ناکەم.

س.پ: بێ‌گومان ستالین کوڕێکی دنیایی بوو. ئەگەر بچینەوە سەر ژیانی و ببینین فەرمانبەرێکی سادە بوو لای لینین کاری دەکرد، ئەوسا دەتوانین ئەو قسەیە بکەین کە لەسەر ئەو کردمان. خۆ فەرمانبەری لینین هەر پێی دەکرێ فەرمان ڕابپەڕێنێ و ڕێنوێنی جێبەجێ بکات.

سۆشیالیزم بە فەرمان دانامەزرێت و یەك ڕەوت یا خاوەنی یەك ئاست نییە. ئەگەر بڕوانینە ستالین و وێڕای ئەوەی کە هێندێك لایەنی باشی تێدایە. دەبینین ئەوەوە دوورە لە سۆشیالیزمی تەواوەتی حاڵی بووبێ و بە ڕوونی ئەرکەکانی ئەنجام دابێ. ئەو بەپێی تین و توانی خۆی و بە تەواوی فەرمانەکانی بە جێ‌دەهێنا. بەڵام ئەمە بۆ سۆشیالیزم بەس نییە. توانی ڕێگای سۆشیالیزم پاك بکاتەوە و هیچی پێویستی لە ڕێگادا دانەنا، چونکە شارەزایی ئەوەدا نەبوو. ئەو هێزی خوڵقاندنی مرۆڤی نەبوو. تێڕوانینی من ئەمەیە: ئەو بوو هەستا بە ڕووخاندنی. ئەو کەسانەیش کە هێنانیە بەری مەیدان لە هی پێشوویان خراپتر بوون، چونکە ناتوانێ دروستیان بکات. ئایا دەزانن ڕێ و شوێنی ئێمە بۆ ئەوە چین؟ ڕێ و شوێنی ئێمە ئەو وەڵامدانەوەیە دەردەکەوێت کە بەرپەرچدانەوەی کێشەکانی سۆشیالیزمە، من ئەم شارەزاییەی خۆم بە تایبەتی لە نێو(PKK)دا جێبەجێ دەکەم و هەڵدەستم بە ڕێکخستنی خەڵکانی دیکە، تەنانەت ئەگەر دژی خۆشم بێت. ئەوەی وا جێبەجێی دەکەم تەواو پێچەوانەی ئەوەیە کە ستالین دەیکرد. حیزبەکان بە ڕادەیەکی باوەڕ پێنەکراو ڕای خۆیان دەردەبڕن. من هانی ئەوەیان دەدەم. لەبەر ئەمە تێدەکۆشن بەم چەمکە بژین و ئەمەیش کارێکی ڕاستە.

ی.ك: ئەوە کارێکی باشە، چونکە تۆ ئەگەر بتەوێ کارێکی گەورە دابمەزرێنی پێویستت بە کادیری داهێنەر هەیە.

س.پ: بەڵێ ئەمەش داواکاریەکی دیموکراسیە. هەر دەبێ ئەوانە ڕادەیەك ڕاستییان تێدابێ، تەنانەت ئەگەر من یەکەم کەسیش بم مەرجە لێ‌خۆش کرابێ، ئەمە زۆر گرنگە. بە ئەندازەی بایەخی ڕاستی ئەوان، ڕاستی منیش گرنگە. من لەم حاڵەدا پەنا نابەمە بەر سەرکوتکردن و پێشێلکاری وەك ڕێگایەك بۆ چارەسەر، ستالین لەم حاڵەدا وانەبوو. لە باتی من بوایە پێنج یا دە جار ئەم بزووتنەوەیەی پاکتاو دەکرد. دەبوو هەزار جار حوکمی لە سێدارەدان بدەم. بەڵام کە دەچمە سەر جێبەجێکردن، ناچاردەبم بێ‌بانخەمە بان سەرم. ئەمە دۆخێکی مایەی بایەخ پێدانە و وەك خەسڵەتێکی سیاسی من پەرەدەستێنێ. ئەوەی ڕاستی بێ من ئەوە هەتا بەسەر دوژمنیشدا جێبەجێ‌دەکەم و لایەنە باشەکانیشی دەهێڵمەوە. نە خولیای سووتاندن

و ڕووخاندنم هەیە و نە هیچ خولیایەك لەوانە کە «جەنگیز خان» هەیبوون و نە شێوازەکانیشی. هێندە بەسە ئەو کەسە لایەنێکی باشی بە ڕادەی یەك لە هەزاردا هەبێ، تا پەیبەندی بم و هەوڵی گەورەکردنی بدەم. ئەوە وەزعی منە کە تێندەکۆشم بەرەی پێبدەم. ڕاستییەکەی من زۆر لێیان توورە دەبم. هەردەم دەڵێم ئەو هەوڵ و کۆششەی کە ئەم مەسەلانە دەیبەن و ئەو دژوارییانەش کە دەیخولقێنن لە هی ڕووبەڕووبوونەوەی بەرەی شەڕی بێبەردەی دوژمن زیاترن. بەڵام من هەرگیز لە بیری ناکەم کە ئەوە داخوازییەکی سۆشیالیزمە. ئەو هۆیەش بوو کە کێشایەوە بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ سۆشیالیزمی بنیات نراودا.

ی.ك: واتە ئێوە لە منداڵیتاندا حەزتان لە گەمە دەکرد و وەك گوتتان منداڵانتان بۆ گەمە دەبرد. ئایا ئەمڕۆکە ئەو گەمە پڕ داهێنانەتان دووپات دەکەنەوە؟

س.پ: بێگومان، چونکە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان سیاسەت و گەمەدا هەیە. گەمەکانیش بەر لە سیاسەت دەست پێدەکەن و دوای ئەویش کۆتاییان پێدێت. وەك دەشزانن سیاسەت بە گەمە دەست پێدەکات، بەڵام گەلێك گەمەی گەورەی لێدەکەوێتەوە.

ی.ك: باشە ئاپۆی برام ئایا هەڵپەرکێی کوردی دەزانن و بەشداری تێدا دەکەن؟

س.پ: نەخێر، ئەو هەڵپەرکێیانە لای من بە شێوەیەکی جیاواز بەردەوام دەبن. هەڵپەرکێ لای من سیاسەت دەگەیەنێ و سیاسەتیش جوانترین هەڵپەرکێیە. واتا ئەو هەڵپەرکێیەی وا دەیکەم ئەوەیانە کە ئەنجام بە دەست دەهێنێ، بۆیە جوانترینیانە. هەڵپەرکێی ئاگرە کە کەس ناتوانێ بیکات. یەکێکی ئەڵمانیایی لەو بارەیەوە دەڵێت هەڵپەرکێی مردنە و هەڵپەرکێی مردنیش هەڵپەرکێی ئاگرە. ئەوەی وا بڕوای بە خۆی هەیە با بێتە پێش و هەڵبپەڕێت. من بایەخ بە هەڵپەرکێکانی دیکەش دەدەم. بەڵام هەڵپەرکێکەی من ئێستاکە لەوە پڕ داهێنان و گەورەترە کە ماوەی هەڵپەرکێی دیکە بدەن. ئێمە شەیدای ئەم هەڵپەرکێیە پڕ ڕێزەیین و درێژە بە سەرگەرمییەکەی دەدەین. ئەوە دەرمانی گەلێك خەم و نەخۆشییە. سەبارەت بە من ئاواتم ئەوەیە کەس باوەڕ نەکات کە ئەم گۆڕانکارییانە لە خۆوە ڕوویانداوە. بەڵکو دەرئەنجامی چەند پەلانێکی قووڵن. بە داخەوە گەلێك کەس(PKK) لەوە تێناگەن و زۆر لەو حیزبیانەش باوەڕیان وایە ئەوان بە پێی خۆیان سەر چیا دەکەون.

ی.ك: نەخێر، من دەزانم ئێوە باوەڕتان بەوە نییە هیچ شتێك لە خۆوە ببێ. لە کتێبێکتاندا دەڵێن: ویستم سەرکردایەتی بە کۆمەڵ بەکاربهێنم. جا کە نەمتوانی پەنام بردە بەر ئەوەی کە خۆم پڕی بکەمەوە. ئایا دەتوانن ئەوە ڕوون بکەنەوە؟

س.پ: بێگومان، هەموو بارەکەیان خستە سەرشانم، لە کاتێکدا بە ئاواتەوە بووم دیوانێکی بە کۆمەڵ لە ئارادابێ هێزێکی گەورەی مشتومڕی هەبێ و قسە لەسەر بابەتە گەورەکان بکات و زیرەکی هەبێ و بڕیاری ڕاست و دروست دەربکات و خاوەن ئەزموون بێ و دەسەڵاتی دەربڕدنی بەرپرسی هەبێ. بەڵام کە

ناچاریان کردووم بە تاقی تەنیا ئەم کارانە بکەم، ئەوە تێکشاندنی منە. یەکێکی ئەڵمانیایی ڕۆژێکیان چاودێری کردم و گوتی: چۆن بە درێژایی ئەم ساڵانە شێوازی تاکەکەسی دەردەبەی؟ ئەگەر من بوومایە نیو سەعاتم دەرنەدەبرد. جا کە پێمگوت: من بیست ساڵە ئەمە حاڵمە و ئاوا بەجێیان هێشتم، کابرا زۆر سەرسام بوو. ئەمە شێوازی منە کە لە گفتوگۆکردنی یەکێك بۆ خودی خۆی دەچێ.

ی.ك: بەڵام لەدوا شیکردنەوەتاندا دەبینم مشتومڕەکان بەرەبەرە لە گفتوگۆی خۆیی دوور دەکەونەوە.

س.پ: ئێمە لەبری گفتوگۆی شەخسی و بۆ بەرپەرچدانەوەی، پاش بیست ساڵ گفتوگۆی دوو قۆڵیمان پەرەپێدا و بینیم گفتوگۆی دووقۆڵی دەرمانە. بۆیە ئێستا ئیش بۆ ئەوە دەکەین بگەینە (گفتوگۆی بە کۆمەڵ)ی زیاتر پەرەسەندوو، وەك ئەوەی گفتوگۆی سێ قۆڵی و چوارقۆڵی هەبن.

دیارە ئارەزووی ئەم پەرە پێدانە دەکەین. شێوازی سوکرات هەنگاوێکە، لە کاتێکدا دەمەوێ بگەینە «ئۆرکێسترا» حاڵی حازر شێوازی گفتوگۆی بە کۆمەڵ باشە و بەردەوام پاش پەرەسەندنی و لەوانەیە بگاتە چەند هەنگاوێکی پێشکەوتوو.

## «١٩٧٤ - ١٩٧٥» دوو ساڵ بوون<br>خۆمم تیایاندا بە شۆڕشی تورکیا بەخشی.

ی.ك: ئایا دەتوانین لا لە پاش ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٥ بکەینەوە؟

س.پ: بەڵێ، ١٩٧٤-١٩٧٥ دوو ساڵ بوون خۆمم تیایاندا بە شۆڕشی تورکیا بەخشی. لەو ساڵانەدا کۆمەڵەی «ADYOD» دامەزرا و من بەرپرسی بووم. هاوبەشیشمان لە سەرهەڵدانی «دیڤ یۆل» و پاشتر «دیڤ سۆل»دا هەبوو. لە دەست پێکردنی پێکهێنانی ڕێکخستنە سەرەتاییەکانیدا وەك بەرپرسێکی پایەبەرز کارم کرد و ئیشی ئەو تاقمەی خۆمم خستەخانەی پلە دووەوە کە کارم تێدا دەکرد، لە کاتێکدا تاقمەکەم بەهاری ساڵی ١٩٧٣ بەدوا پێکهاتبوو. نەورۆزی ١٩٧٣ بەناوی ئەم تاقمەوە قسەم کرد و بەو پێیە کە کوردستان دژی کۆلۆنیالیزمە و کە ئەمە بەسەرهاتی ئاوبەستی «جوبوك»ە، بەڵام نەمتوانی بۆ ماوەی دوو ساڵ ئاستی تاقمەکەمان بەرز بکەمەوە و بەردەوام بایەخمان بە کێشەکانی لاوانی تورکیا دەدا. پاشتر کۆمەڵەی «ADYOD» داخرا و «دیڤ یۆل» و «دیڤ سۆل» دەرکەوتن.

ی.ك: کەسی چەپی تورکی هەیە بیرت بکەوێتەوە، لەوانەی ئەو قۆناغە کە ماون؟

س.پ: بەشێکی زۆر لە کادیرانی «دیڤ یۆل DEV-YOL» لەوێ بوون «دیڤ سۆل DEV-SOL»یش تاقمێکی لە دەستەسۆڵ هەبوو. بێگومان کاریگەریمان لەو

گۆڕانکاریمدا هەبوو. پاش داخرانی «ADYOD» کۆمەڵەکەی خۆمانمان دامەزراند. وەك سەرتێج دەدەی پۆلیس تا ساڵی ١٩٧٦ هیچی لەسەر ئەم کۆمەڵە نەدەزانی و دەیهێزسی ئاخۆ ئاپۆ سەر بە«THKP-C» یان سەر بە کۆمەڵێکی کوردی. ئەم مەسەلەیەیان بەلاوە ڕوون نەبوو. بە کردەوەیش ئاوابووین. هەر لەو قۆناخەدا «DDKD»یش دامەزرا. جا لەبەرئەوەی من لە «DDKD»دا چوومە نێو ئەزموونێکەوە، بایەخم بەوەی دووەمیان نەدا. من باوەڕم وابوو ئامرازێکی بە کەڵك نابێ بۆ خەباتمان و هەر کۆمەڵە بێهێزەکەی خۆمانم پاراست و بە کردەوەیش پاڵمان بە «ADYOD»ەوە نا بۆ پێشەوە. وەك گوتم لەمیان ساڵی ١٩٧٥ داخرا. پاش ئەوە هەوڵماندا لە جاران پتر بایەخ بە کۆمەڵەکەمان بدەین و لە سەروبەندی زستانی ١٩٧٥ـ١٩٧٦ دا مانیفێستۆی یەکەممان ئامادەکرد لە ڕێی هەڤاڵ «محەمەد خەیری دورموش»ەوە، ئەوە هەڵسەنگاندنێکی گرنگ بوو. دەکرێت دانەیەکیت دەست بکەوێ. ئەوە لەڕووی ڕەنگ پێدانەوەی ئاستی ئەو بیرەی کە ئەوکاتە هەبوو شتێکی گرنگ بوو. بەڵام یەکەم چالاکی جەماوەری بە کردەوە لەو قۆناخەدا لە ئاباری ١٩٧٦دا و لە بەڕێکردنی تەرمی «فەوزی ئەرسەلان سوی»دا بوو کە خەڵکی «سروج» و سەر بە ڕێکخراوی «ڕزگاری میللی» بوو و فاشیەکان کوشتیان چونکە کورد بوو. بە تەنیا خۆمان تەرمەکەیمان بۆ «سروج» برد و لە ناوەندی ئاپۆری جەماوەردا ناشتمان. ئەوە بوو هێندێك گرتن ڕوویدا. بەلای ئێمەوە خۆپێشاندانێکی سیاسی شێلگیرانە و گەورە بوو. هێندێك هەڤاڵمان لە نێو گیراوەکاندا بوون. پاش ئەوە ویستمان ئیش و کاری تاقمەکەمان بۆ کوردستان بگوازینەوە. بەو پێیە ڕووم کردە کوردستان لە مانگەکانی (نیسان و ئایار)ی ساڵی ١٩٧٧ و لەم گەشتەمدا دوو مانگی خایاند و ناوچەکانی قارس و ئاگری و دێرسیم و بینگۆل و دیاربەکر و عەینتابی گرتەوە و لەو شوێنانەدا چەندین کۆبوونەوە ڕێکخران کە هەر یەکەیان بە پەنجا تا شەست کەسی بە خۆوە گرت. لە ١٠ ی ئایاردا ئەم کۆبوونەوانەمان دوایی پێهێنا و لەگەڕێکی زۆرمان بۆ ئەوە دانا کە دەزگای ئیستخباراتی تورکیا «MIT» چاودێری کردووین و بەدوومان دەکەوێت. سەرەنجام هەڤاڵ «حەقی قەرار» لە «عەینتاب» شەهید کرا و لەوسا دەرکمان بەوە کرد کە ئەوان بڕیاری لە سێدارەدانی ئێمەیان داوە. لە ٣ ی حوزەیران و لەگەڵ کودەتای «نامق کەمال ئەرسون»دا «بیلوت»ی بەکرێگیراو فەرمانبەری چاودێریکردنی چالاکیەکانمان بوو، چونکە ڕۆژانە بە دوامان دەکەوت. کە هەڤاڵ حەقی شەهید بوو، زانیم مەترسی بڕانەوەمان لە ئارادایە و گوتم ئێستا دەوری منە، لە ٣ ی حوزەیراندا، واتە لە سەروەختی کودەتاکەی «نامق کەمال ئەرسون» و لە ئەنجامی چاودێری «بیلوت»ەوە ئەو ماڵە لەلایەن ئەندامەکانی شەڕی تایبەتەوە تووشی هێرش بوو کە «مستەفا ئەرسوو» و هەڤالان تێیدا نیشتەجێ بوو بوون. هەموویان گیران و پێم وابێ دوو یا سێ پارچە چەکیان لابوو. ئەمجا «کەمال پیر»یان گرت کە بەڕێوە بوو بۆ ئەو ماڵە. منیش بە تەمابووم بەیانی

زوو بچمە ئەو ماڵە، بەڵام نەچووم و چووم سەر لە هێندێك برادەر بدەم لە «توزلوجایر» تا بپرسم ئاخۆ هیچی تازە هەیە.پێش ئەوەی بڕۆم چەند کەسێکم نارد چاودێری ماڵەکە بکەن. ئەوانەی وا ناردبوومن هاتنەوە و گوتیان ماڵەکە دەورەدراوە و هەر بە ڕێکەوت لە گرتن قوتار بووین. ئەگەر ئەوکاتە بگیرامایە، لە بەندیخانە دەرنەدەچووم، چونکە «بیلوت» لەو چەکانە دڵنیا بوو و سزاکەم نزیکەی (٣٠) ساڵ زیندانی دەبوو.

## بۆ یادی ئەمری هەڤاڵ حەقی، بەرنامەی حیزبمان نووسی.

ی.ك: ئایا خەڵکێکی زۆر لە ساڵی ١٩٧٧ دا دەهاتنە پاڵتان؟
س.پ: چوونمان بۆ کوردستان و ئەو گەشتە بەجەرگانەیەی کە کردم زۆر گرنگ بوو، چونکە تۆوەکە لە هەموو شوێنێکدا بڵاوبووەوە و متمانەمان پەوە هەبوو. ئەوسا لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر پاش ئێستا مردین گرنگ نییە، چونکە ئەم تۆوانە نەشونما دەکەن». لەبەرئەوەی من هەمیشە چاوەڕانی مردنم دەکرد و تەنانەت زۆریش لێمەوە نیزیك بوو. نەمدەتوانی پیاڵەیەك چا بخۆمەوە، چونکە دەمزانی تیرۆر و شێوازی هیچ و پووچی دەوڵەت چۆنن. بەم شێوەیە پێتان نایە ساڵی ١٩٧٧ کە ساڵێکی شلوق و پڕ ئازار بوو. ئایا ئەم کۆمەڵەیە دەمێنێتەوە یان ئاو ئاخۆ دەتوانێ باز بۆ پلەیەکی بەرزتر بدات یان نا؟ هەموو خەمێکمان ئەمە بوو.
دوای شەهیدبوونی هەڤاڵ حەقی و بۆ ئەمر ڕاگرتنی یادەکەی هەوڵی نووسینی بەرنامەی حیزبماندا، چونکە ئەمە باشترین وەڵام بوو دەکرا بۆ شەهیدبوونی بیدەینەوە. هەنگاوێکی گرنگ بوو بۆ پێشەوە. بەرنامەی حیزب تا ئێستا ماوە و نازانم داخۆ وەك بەڵگەنامەیەك بۆ(PKK) قبوڵ دەکرێت یان نا. تێڕوانینەکانی ئەو بەرنامەیە تەواو باش و واقیع بینانەن. پاش ئەوە هەوڵماندا لە ١٩٧٧-١٩٧٨ بەرنامەکە بیەخشینەوە. قۆناخی «ئایا دەتوانین ببینە حیزب یان وەك کۆمەڵێکی خاوەن ئایدیۆلۆژی دەمێنینەوە» و قۆناخی بڕیاردان بوو. دوای ئەوەی کە گەلێك دژواری گەورەمان تووش هات، بڕیارماندا ناوی حیزبی ئەم کۆمەڵە ڕابگەیەنین، سەرباری ئەوەی کە دەمانزانی لەوانەیە ئەوە لاوازو بێکاریگەری بێ. بەڵام گوتمان با لانی کەم ناوی حیزب لە مێژوودا بە ئەمری بهێڵینەوە و ئەمەش شتێکی باش بوو.
ی.ك: لەو کاتە هەڵویستتان چۆن بوو؟ ئایا لەگەڵ ئەوەدا بوون حیزب بنیادبنرێت یان کۆمەڵەکەتان بمێنێتەوە؟
س.پ: من بووم دەستم بە هەموو مشتومڕێك دەکرد و ئامادەکاریم ئەنجام دەدا و لێی دەدوام.
ی.ك: هێندێکیان پێیان گوتم. چەند پێشنیارێك لەساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦ هەبوون بۆ دامەزراندنی حیزب. بەڵام سەرۆك ئاپۆ ئەوەی بە زوو زانی. ئایا وەزعێکی وا لە

گوڕیندابوو؟

س.پ: نەخێر هەڵکالی وا بەهێز نەبوون. گەلێك بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە لەسەر بنیاتنانی حیزبی کوردی پەرەیان دەسەند، بەڵام هەموویان لەم بیرەوە دوور بوون.

ی.ك: باشە، جگە لە(PKK) پێشنیارێك هەبوو بە ناوی دیکەوە. یان چەند ناوێکی جێگرەوە هەبوون؟

س.پ: بیرۆکەی بنیاتنانی کۆمەڵەیەك بەناوی یەکێتی لاوانی شۆڕشگێڕی نیشتمانی کوردستان «KYDGB»ەوە هەبوو. لەوسا گوتمان ئەمە هەر یەکەڵکی لاوان دێت. بیریشمان لە نموونەیەکی لینینی کردەوە و گووتمان با ناوی «یەکێتی تێکۆشان لە پێناوی رزگارکردنی کار»دا بێت. بەڵام تەماشامان کرد ئەوەش لەگەڵ ئامانجەکانماندا تەواو جووت نایەتەوە بۆیە بڕیارماندا ناوێکی تایبەت بە خۆمان جێبکەینەوە. وەك زانراویشە لە مانگی یازدەی ساڵی ١٩٧٨ دا یەکەم کۆبوونەوەمان بەم ناوەوە کردو لەو کۆبوونەوە گەورەیە دەچوو کە «حیزبی کرێکارانی سۆشیال دیموکراتی رووسیا» ساڵی ١٨٩٨ کردی. لەوە دەچوو ئێمە لە کوردستان پێڕەوی هەمان شێواز و تەرزمان کردبێ. باوەڕم وایە پێویستە هێندێك لەو خاڵانە روون بکرێنەوە کە هێشتا بوونەتە مایەی هێندێك قسە و قسەلۆك لای رۆژنامەنووسان، وەك «لۆغرو مومجو» کە دەپرسێ رەگەزنامەکەی چی‌یەو کێ خەزووریەتی.

## وەك رێسایەکی بنچینەیی بە ئاسانی زیندەڕەوی لە هیچ پێوەندی‌یەکدا ناکەم و ناشبمە هۆی پچڕانی هیچ پێوەندی‌یەك.

ی.ك: خانوو «کەسیرە» خانم لە کوێ دەیخوێنند. ئەویش لە نێو تاقمەکەتاندا بوو؟

س.پ: لە کۆلێژی «چاپ و بڵاوکردنەوە» بوو، تێدەکۆشاین رایبکێشینە نێو تاقمەکەمان. سەر بە خێزانێکی لایەنگری «CHP» بوو. ئەم خێزانە ساڵی ١٩٢٥ بە دوا ملکەچی کەمالیزم بوو. واتە لە خێزانێك بوو دەوری سەرکردایەتی لە رۆشنبیری کۆماریدا گێڕا. ئەوەمان دەزانی و لایەنە خراپەکانیشمان دەزانی. بەڵام وێڕای لەوە هەوڵی بە کێش کردنیمان دەدا بۆ تاقمەکەمان.

ی.ك: کچ یا ئافرەتی دیکە جگە لەو لە نێو تاقمەکەدا هەبوون؟

س.پ: هێندێك هەبوون. بەڵام لەو بوو نوێنەرایەتی ئافرەتانی دەکرد و بایەخی بە تاقمەکەمان دەدا. بەڵام سەرەڕای لەوە خۆپارێز بوو و هەڵوێستەکانی لە هی ئێمە جیاواز بوون. هەرچی هەڵوێستی منیش بوون سۆزیان تێکەڵ بوو بوو. لایەنی مرۆڤانەم چەندە گشتی و بایەخدار بووبێ بە کۆمەڵگا و بەزانستەوە بەستراو بووبێ، ئارەزووی پێبەندبوونیش لەلای من بەتین بوو. سەبارەت بە من

دەبێ هەموو شتێك بە کەمێك مەشق و پێبەندبوونەوە بەرێوەبچێ. من تا ئێستاش وەهام. ئەم مەسەلەیە لەلای من جێگیرە. ئەگەر ئافرەت هاتە نێو هەر مەسەلەیەکەوە، دەبێ چەند پێت دەکرێت لێی نێزیك ببیتەوە و دەبێ لێنزیکبوونەوەکەشت بۆ ئامانجێکی سیاسی بێ، بەلام لەگەل ئەوەشدا هەول بدەی سوود لەو توانایانە وەربگری کە لای دەست دەکەون. تەنانەت ئەگەر پەیوەندیەکانت لە ئاستی بە قوربانکردنی سۆزیشدا بێ، دەبێ لێك نزیکبوونەوەکە بێسنوور بێ. واتە بە کورتی ئەگەر چەند بناغەیەکی سیاسی لە ئارادابێ، ئەوسا گرنگ نییە لە خێزانێکی یەکرێکگیراو بێ یان نا. دەبێ کۆسپ نەخەیتە رێی ئەم پەیوەندییە. ئەو کاتە ئاوام دەگوت جا لەبەر ئەوەی کە من بەرپرسی ئەو تاقمە بووم، ئەم هەلوێستەم پاڵپشتی بوو، بەم هەلوێستە هەوڵمان دەدا ئەو کەمتەرخەمیە نەهێڵین کە لێی دەردەکەوت و وای لێبکەین هەست بە هێزی خۆی بکات. بەلام پێم وابێ هەلوێستی بە شێوەیەکی دیکە بوو. من نامەوێ درێژە بەم بەسەرهاتە بدەم. بەلام ئەم رەفتارە هەلوێستی بەجەرگانەی من بوو. لەوە بوو توانیم بەجەرگانە و بە شێوەیەك کە نە چاوەروانم دەکرد و نە پاشتر توانیم لێکی بدەمەوە، لە دەرگای ئەو خێزانەمدا. منی رارای زۆر متمانە بە خۆ نەکردوو لە دەرگای ئەم خێزانە دەدەم، ئەمە هەلوێستێکی یەکجار بەجەرگانەیە، چونکە لە خێزانێك بوو زۆر ئیشی بۆ بەرژەوەندی کۆماری تورکیا و دژی هەلگەرانەوەی کوردی کردبوو و بەم خەسلەتانە ناسرابوو هەرچی منم رزگاریخوازێکی سەرپەرگر بووم لە سەرکردایەتی بزووتنەوەکەدا. بیر لەم مەسەلەیە بکەنەوە. ئەوە ناکۆکییەکی زۆر سەیرە. لەوەش سەیرتر بانگهێشت کردنی خۆمە بۆ ئەم ناکۆکیە. بەلام ئەگەر لێت بپرسم بۆچی ئەوەت کرد، دەلێم: «سیاسەت هونەری هەست کردنە» و هۆیەکانیشی ئەمانەن: یەکەم ـ کچێك بوو نیشانەی ژیر بوونی پێوە دیار بوو. دووەم ـ پێبەستەی دابونەریتی «CHP» بوو و دەکرا لە رووی سیاسییەوە کەلکی لێوەربگرین. سێیەم ـ ئەگەر توانیمان کاری تێبکەین وای لێبکەین نۆکەرایەتی تێبەرێنێ، پەرسەندنێك بۆ بەرژەوەندی حیزب یا بزووتنەوەکە تۆمار دەکەین، راکێشانی نۆکەرانی کورد باشتر و لەبارترە بۆ کوردستان لە بری لێدانیان. چوارەم ـ ئەگەر توانیمان بە شەخسی رای بکێشین، ئەوا راکێشانێکی بە واتا دەبێت بۆ ئێمە. پێنجەم ـ ئەگەر وا رێکەوت گومانی لێکرا، هەر دەتوانین سوودی لێوەربگرین. ئەم پێنج خالە نهێنی بوون و کەس پێیانی نەدەزانی. پێرەوی هەر خالێکی بکردبایە، ئێمە دەست بەرداری نەدەبووین.

من هەموو ئەمانە بە راشکاوی دەلێم. بەلام ئەوسا لە شێوەی هەستدا بوون. بۆ نموونە ئەو کەسەی کە ناوی «بیلوت»مان لێنابوو خەلکی «ئاگری» و ناوی «نەجاتی قایا» و کورەێکی بێوێنە رێکخراو بوو، واتە «بیلوت»ێکی باش بوو. بەجەرگ بوو و لەرووی بنیاتی فیزیاییەوە بەهێز و جیاوازبوو، چونکە فرۆکەوان بوو.

ی.ك: ئایا لە هێڵی ئاسمانی تورکیا بوو؟

س.پ: نەخێر، لە هێزی ئاسمانی تورکیا بوو. ئەفسەر بوو، هاتە لام و پێی گوتم ئەوان لەبەر ئەوەی کە کوردە لە وەزیفە دەریانکردووە. لە ڕاستیدا دەرنەکرابوو. بەڵکو ڕاسپێردرابوو خۆی تێکەڵکێشی ڕیزەکانمان بکات. لەوەبوو بە ئەرەیەکی بەرزەوە چووە کۆلێژی زانستە سیاسیەکان و بەهارە خۆی ناونووس کرد و لەوساتەوە بووین بە برادەر. مەسەلەی بەکرێنگرتنی خانوویەکی لەلا کردبێتەوە تا من و کەسیرە تێیدا دابنیشین و بمانخاتە بەر چاودێری خۆی. دەیگوت: «زێرتان بۆ دەکڕم و خانوویەکتان بۆ بەکرێ دەگرم». ئاوا خزمەتی خۆی بەردەست خست. بە کورتی ئەم «بیلوت» هەمووان دەیناسن. ساڵی (۱۹۷۷)یش ساڵێکی پڕ لە هەڵبەز و دابەز و پیلانگێڕان بوو و دەوڵەت دەستی وەردەدایە هەموو کاروبارێك.

ی.ك: ئەو کاتە خانوویەکت لەگەڵ کەسیرەدا بەکرێ گرت؟

س.پ: نەخێر، خانوویەکی سەربەخۆمان نەبوو دوور لە هەڤاڵان تێیدا بژین. بەڵام چەندەها خانوومان هەبوو، لەوێ چاومان بە یەکدی دەکەوت. بیلوت خانوویەکی بەکرێنگرتبوو و دەیشچووینە ئەوێ. تەنانەت ڕۆژی ۱۹۷۷/۱/۱ کۆبوونەوەیەکی گرنگمان لە خانوەکەی بیلوت کرد. ئەوە یەکەم کۆبوونەوەی هەمەلایەنە و شێلگیری ئێمە بوو. هیچ پەڕەیەکی نووسراومان لەبەر دەستدا نەبوو و دەمی زۆرپاکە کرابووەوە تا بتوانین ئەو دوو یا سێ پەڕە نووسراوەی تێفڕێ بدەین ئەگەر پۆلیس خافڵگیری کردین.

ی.ك: ژمارەتان چەند بوو؟

س.پ: دەوری ۱۰ یا ۱۵ هەڤاڵ بووین. بیلوت خواردنەکەمانی سازدەکرد و هەمیشە ڕستەی «لەم خوێندانە بۆچییە؟ باڵندە ئاوا پێدەگات و بەهۆی ئەم خوێندانەوە خوێنی پێوە دەکرێت و ئەمجا دەخورێت» دەگوتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ لەم قسەیەدا مەبەستی ئێمە بوو و وازی لێنەدەهێنام. پێم وایە ئەم وەزیفەیەی پێسپێردرابوو. لێرەدا پشتم بە هەستی خۆم بەست و پەیوەندیەکانم ڕەت نەکردەوە. ئەگەر دەنگم لێبڕیبایە، ئەوە گومانی دەوروژاند. بەڵام پاشتر دەستی کەوتە ڕوو.

ی.ك: دەستی کەوتە ڕوو؟

س.پ: بەڵێ. لە سەروبەندی کودەتای «ئامق کەمال ئەرسون»دا ویستی پاکتاومان بکات. تا دوازدەی شەو لە کۆڵمان نەبووەوە. ئەو دووزمانی لەسەر کردین. بەڵام سەرباری ئەوە دەستمان لێهەڵنەگرت و گوتمان با ئەم «بیلوت» بهێڵینەوە.

جا وەختێك «ئۆغرو مومجو» دەڵێت: ئاپۆ لە نووسینێکیدا گوتوویەتی پێویستە بپارێزین وەك چۆن چاومان دەپارێزین، ڕاست دەکات. ڕەنگە دارشتەیەکی جیاوازی هەبووبێ، بەڵام بەو مانایە بوو. بەم پێیە پەیوەندیمان لەگەڵ کەسیرەدا لەم ساڵەدا چڕوپڕ بوو. من لەم پەیوەندیانەدا شێلگیر بووم و تەواو نەمدەزانی ئاخۆ ئەوە ئاکامی ئامانجی سیاسییە یان هەر خۆی کارێکی سۆزاوی

بوو. بەڵام ئەوە دەزانم کە دەبوو ئەم پەیوەندیانە بێ پێچ و پەنا چڕبکرێنەوە. ئەمە روویدا. لەوانەیە من هەوڵم دابێت. خۆ لەو تەنگانەیە قوتار بکەم کە لەو قۆناخەدا بە دەستیەوە دەمناڵاند. پەیوەندیم بە «پیلوت»ەوە بەشێکی ئەم تەنگانەیە بوو، بەتایبەتی قۆناخەکە قۆناخی بەرەی نەتەوەیی بوو کە جڵەوی حوکمی بەدەستەوە گرت. بارودۆخەکە ناسك و مەترسیش گەورە بوو. «حەقی» شەهید بوو بوو و «قەرەسوو»ەو هەڤاڵان لە بەندیخانە بوون و ئەوانەی کە مابوونشەوە خەریك بوو نەمێنن. هەوڵم دەدا خۆ لەم هەموو تەنگانەیە دەرباز بکەم و لەوەدا رێگایەکم دۆزیەوە.

ی.ك: واتە ئێوە بیرتان لەوە دەکردەوە بەرگێکی دیکە بە بەرخۆتاندا بکەن، وانییە؟

س.پ: هەتا ئەگەر ئەوە روونیش نەبووبێ، بەڵگەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن. «ئۆغور مومجو» لەم مەسەلەیەدا دەڵێت: «ئایا ئیستخباراتی تورکی(MIT) بوو کارێکی کرد ئاپۆ بژی و پشتیوانی لێ کرد؟». نەخێر، پێموایە ئەو خۆی حەزی کرد بەو شێوەیە لێکی بداتەوە. خۆ مەسەلەکان بەم چەشنە سادە نین، چونکە ئیستخباراتی تورکی هەوڵی دەدا چاودێریم بکات. تا ئێستاش ناتوانم بڵێم کەسیرەی هەڤاڵمان نۆکەر بوو. ئەوەی وا بەدڵنیاییەوە لەسەر ئەو دەیزانم لەوەیە خێزانەکەی دەچوە بەرێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی. باوکی پەیوەندی بەوانەوە هەبوو. لەوانەیە وایان زانیبێ کە من بەم رێگایە لە ژێر دەستیاندام، وەك بڵێی بڵێن: «مادامێکی ئەم کابرایە پێبەستەی ئەم جۆرە پەیوەندیەیە، کەواتە لە ژێر دەستماندایە. با درێژە بەم پەیوەندیە بدەین». رەنگە ئەو خێزانە ئاوا بەم پەیوەندیە قایل بووبێ و لەمەش رێی تێدەچوو. من بە پێی بیرکردنەوەی ئەوان لە ژێر دەستیاندا بووم، مادام پەیوەندیم لەگەڵیدا بەردەوام بوو. لەلایەکی دیکەوە «پیلوت»یش خستبوویە ژێر دەستی خۆی. ئەم دوو فاکتەرە لە ژیانما هێشتمیانەوە.

ساڵی ١٩٧٨ و بە دیاریکراوی یەکەم رۆژی مانگی یەکەم کە ئەجەوید سەرۆک‌وەزیران بوو. لەو رۆژە بڕیارێکی دەرکرد. پێم وایە دوژمنکاری ئەجەوید پەیوەندی بەم مەسەلەیەوە هەیە. بڕیارەکە دەڵێت: «پێویستە کۆنترا کەس نەکوژن، بەڵکو دەبێ تەنها زانیاری کۆبکەنەوە». ئەم بڕیارە لە چوارچێوەیەکی تەسکدا جێبەجێ کرا. ئێمەی خستە بەر چاودێرییەکی توند، چونکە فەرمانی تەقە لێکردن لە ئارادا نەبوو. هەوڵیان دەدا بڕیارێکی تازە دابڕێژن گرتنیش بگرێتەوە. ئاوا بیریان دەکردەوە. گرتنی هەڤاڵانیش لەم هەلومەرجەدا کرا. ئەگەر بیانتوانیبایە بمگرن، لانی کەم حوکمی (٣٠) ساڵیان دەدام. هەر بە رێکەوت نەچوومە لەو ماڵە و پێیان نەکرا بمگرن. پاشتر ئاڵۆزوقەش درێژەی کێشا. هەرچی مەسەلەی ژنهێنانیشە، باوەڕیان وابوو منیان خستووەتە ژێر دەستی خۆیان. ساڵی ١٩٧٨ ئاوا تێپەری. ئەوان پێیان وابوو من لە دەستیاندام و تەواو ژێر

دەستەیان کردووم و کەی ویستیان دەستگیرم دەکەن. هەڤاڵێکی «دۆغان» ناومان کە ساڵی ۱۹۷۹ کاتێك لە دەرەوەی نیشتمان بووم گیرا، کاتی لێپێچانەوە یەکێکی میت پێی گوتبوو: «ئاپۆ لە نێو چنگ و لە لەپی دەستماندا بوو، چۆن لە دەستمان دەرچوو». بە دەم و چاوی خوێدا دەکێشا. ئەم هەڤاڵەمان هێشتا لە زیاندایە و پێی گوتم: سەرۆك.. کابرای ئیستخبارات شێتگیر بوو.

هەرچی بەسەرهاتی دەرچوونیشمە، ئەوان پێیان وابوو من لە نێو ئاپلۆوقەیاندام و لە ژێر دەستیاندام، بەڵام من ئەوە بە کەمی ئامرازیانەوە دەبەستمەوە. کە هاتمە دەرێ کەس بە بڕیارەکەمی نەدەزانی. یەك یا دوو هەڤاڵ ناڕاستەوخۆ دەیانزانی، چونکە من ئاگادارم کردنەوە کە ئێمە «لەوانەیە هێندێك ڕێ و شوێن بۆ چوونەدەرەوە دابنێین». بەڵام من کەسم لە ڕۆژی چوونە دەرەوەکە ئاگادارنەکردەوە و تەنانەت «کەسیرە»ش نەیدەزانی. ئەوی بۆ ماوەی سێ مانگ بۆشایی تێکەوت. هەرچی «بیلوت»یش بوو، ئاگادارم کردبووە و کە من لە زستانی(۱۹۷۸)دا لە ئەنقەرە دەبم و پاشان تێیدا دەگیرسێمەوە و ڕۆژنامەیەك دەردەکەین و لەوێوە درێژە بە چالاکییەکانمان دەدەین. قەناعەتی بەوە هەبوو و بەوپێیە ڕاپۆرتەکانی بەرزەکردەوە. واتە کە من لە نیشتمان چوومە دەرێ، کەس نەیدەزانی نیازی دەرچوونم هەیە یا نەیدەتوانی چاوەڕوانی دەرچوونم بکات، چونکە نموونەیەکی هاوشێوەی ئەم کارەیان لەلا نەبوو. شۆڕشگێڕانی تورك دەرنەچوونە دەرێ تا ساڵی ۱۹۸۱. بەڵام من لە کۆتایی حوزەیرانی (۱۹۷۹)دا هاتمەدەرێ و تەنانەت میتیش وای دانەنابوو ئەو کاتە دەردەچم. هەرچی ئێمەش بووین تا دواسات ئەم جۆرە بڕیارەمان نەبوو. سەروبەری بڕیارەکە تەنها بە دوو ڕۆژ درا، بە بێئەوەی کەس پێی بزانێ. ئیتر چۆن هەواڵەکە بە میت(MIT) دەگات؟ سەرچاوەکانی ڕاپۆرتی ئاسایی خۆیانیان بەرزەکردەوە و دەیانگوت هەموو شتێك بە دڵی خۆمانە.

ی.ك: باشە، ئێوە بڕیارەکەتان بە «بیلوت» ڕانەگەیاند. ئەمە وا دەگەیەنێ ئێوە بڕوای پێناکەن؟

س.پ: بۆ شەش مانگ یا هەتا ساڵێکیش بوو بە ئەنقەست دەمخەڵەتاند. واتە لە ۳ی حوزەیرانی ۱۹۷۷ بەدوواوە زانیاری هەڵەم بە بیلوت دەدا و بەلاڕێدا دەمبرد. ئەگەر بیلوت بیزانیبایە ئێمە دەستیمان بۆ کەوتووەتە ڕوو، ئەوا ڕاپۆرتی خۆی بۆ بەرزەکردنەوە و دەیگوت: «ئەوان خەڵەتاندمیان». بەڵام ئێمە بە تەواوی پەردەمان لە ڕوو هەڵماڵیبوو. ڕاپۆرتەکانی «بیلوت»یش ڕۆیشتن. لام وایە پێی وابوو ئاپۆ ژنی هێناوە و لە دیاربەکرە و لە ماوەیەکی کورتدا بۆ ئەنقەرە دێتەوە. میتیش چاوەڕێی ئەوەی دەکرد. لە کۆتایی ۱۹۷۸ و سەرەتای ۱۹۷۹ دا ئەوەی وا لە منیان چاوەڕوان دەکرد چوونە دەرەوەی نیشتمان نەبوو، بەڵکو گەڕانەوە بۆ ئەنقەرە بوو. بە پێی ئەوەش تەگبیری خۆیانیان کرد. منیش سەرم لە ماردیندا و پاشان ڕوومکردە ئورفە. ئەوسا گەلەکۆمەی گرتن لە «العزیز» دەستی پێکردبوو. «شاهین دوونمز» گیرابوو و ئیعترافی کردبوو و بە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی

گوتبوو: ئاپۆ لە ئورفەیە یا ماردین. دەتوانین بچین دەستگیری بکەین. بەڵام بەڕێوەبەری ئاسایش لەبەر ئەوەی مەسەلەکە لە دەسەڵاتی ئەو بەدەر بوو ڕوویکردە دەوروپشتی «العزیز». جا بۆ ئەوەش کە بکاتە ئورفە یا ماردین، دەبوو ئەنقەرە لە بارودۆخەکە ئاگادار بکاتەوە. ئەنقەرە لە دوادوایەکانی ۱۹۷۹دا دەیتوانی بڕیاری چالاکی‌کردن لە دژمان بدات، ئەویش پاش گۆڕانکاریەکانی «سیوەرەك». بەڵام پێش ئەوە هیچ بڕیارێك لە ئارادا نەبوو بۆ دەستگیرکردنم.

ی.ك: ئەو کاتە دیمیریل سەرۆکی حکوومەت بوو؟

س.پ: نەخێر، ئەجەوید سەرۆکی حکوومەت بوو و کەلەکۆمەی گرتنی «العزیز»یش بەس نەبوو بۆ دەرکردنی فەرمانی گرتنم، چونکە بەڵگەکان زۆر بێهێز بوون. هەرچی «شاهین»یش بوو دەیگوت: با بڕۆین و بە دەستی خۆمان بیگرین. زۆر سوودمان لە گرتنەکانی «العزیز» وەرگرت، چونکە زوو وریای کردینەوە و وای لێکردین بە خێرایی بڕیاری خۆمان بدەین. ئەمە ئەو تاکە سوودە مێژووییە بوو کە لە شاهین کەوتەوە. ئەم گرتنانە و ئیعترافەکانی شاهین پالیان پێوە نام بڕیاری چوونە دەرەوە بدەم. ئەگەر نەگیرابایە یا لە بری ئیعتراف کردن و گرتنی هەڤاڵان دەستی لەگەڵ ئەنقەرەدا تێکەڵ بکردبایە، ڕێی تێدەچوو بمگرن.

ی.ك: سەرۆکی گەورەم دوو پرسیارم هەن: یەکەم ئەوەیە ئایا خاتوو کەسیرە لە ئیدارەی باڵای حیزبدا بوو؟ دووەمیش: چۆن بەمە ڕازی بوو و پاشتر هاتە دەرەوە، وانییە؟

س.پ: من بڕیاری ڕۆیشتنی خۆمم پێنەگوتبوو.

ی.ك: بەڵام دوایی هاتە ئێرە بۆ لاتان.

س.پ: دیارە هەر دێت. لە چوارچێوەی پەیوەندی ڕێکخستندا هات. ئەوە هیچ مەبەستێکی تێدا نییە. بە پێی ڕێ و شوێنی ڕێکخستن کەسم لەم بڕیارە ئاگادار نەکردەوە. ئەوە بڕیارێکی نهێنی و ئاسایی بوو. ئەوان پاش چوونە دەرەوەم زانییان و، پاش ئەوەی هەمووان لە ڕێگای ئەو هەڤاڵانەوە کە پەیوەندییان پێمەوە هەبوو زانییان، ئەویش زانی.

ی.ك: دوای ئەوەی کە هات، پێی نەگوتی بۆچی ئاگادارت نەکرووەتەوە. ئایا بڕوام پێناکەی و ئەوەشی نەکردە مەسەلەی لە خۆگۆڕانێکی شەخسی؟

س.پ: لە بنەڕەتدا کەشێکی بێبڕوایی لە ئارادا بوو. ئەو هەوڵی دەدا تێمان بگات. پێم وایە بیری دەکردەوە و دەیپرسی ئاخۆ لەبەر سۆز یان بۆ ئامانجی سیاسی پەیوەندی لەگەڵدا دامەزراندووم. ئەگەر هۆیەکان لە ڕووی سۆزەوە بوونایە، هەوڵی دەدا ئەم سۆزە تاقی بکاتەوە. بەڵام ئەگەر پەیوەندیەکە بۆ ئامانجی سیاسی بووایە، ئەو دەیگوت: «من سەرکردەم»، چونکە ئەم کابرایە لادێییەکی سادەیە و من کچی خێزانێکی سەرکردەم. ئیتر ئاکۆکی لەم جۆرە دەستی پێدەکرد.

ی.ك: بەڵام ئەمە زۆری خایاند.

س.پ: بێگومان زۆر بوو. ئەو شەڕەی کە ئێمە دژی ئەو دەمانکرد لە شێوەی ملململانێیەکی نێوان دوو سەرکردایەتیدا بوو، یەکیان لە خێزانێکی کوردی زەحمەتکێش و نەدار کەوتبووەوە و ئەوەی دیکەشیان لە خێزانێکی نۆکەر کە هێزی خۆی لە چوارچێوەی پەیوەندییەکانیدا بە کۆماری تورکیا «T.C»وە وەردەگرت و یەکێکی ئەم خێزانەی بەسەر سەرکردایەتی ئەم بزووتنەوەیەدا سەپاند.

ی.ك: ئایا خەسڵەتەکانی سەرکردایەتی کردنی هەبوو؟

س.پ: بێگومان. کەسایەتی بەهێز و ئاڕاستەیەك زیرەك بوو. ئەگەر بهویستبایە دەیتوانی یەکجار سوودمان پێبگەیەنێ. بەڵام پێی باشتر بوو بەپێی چینی کۆمەڵایەتی و دۆخی خێزان خۆی هەڵبسەنگێنێ. جا تەواو نایشزانم ئاخۆ هیچ ڕێنوێنییەکی دەوڵەتی تورکیا لە ئارادا بوو یان نا. بەڵام بەهرەکانی خۆی لەسەر بنچینەیەکی باش نەدەخستە گەڕ.

ی.ك: باشە، ئایا ناکۆکی لەم حاڵەدا پەیدابوو؟

س.پ: نەخێر، پێشتریش هەبوو. نموونەیەکت لەسەر ئەوە دەدەمێ. بۆ ئەم نموونەیە گەلێك بەڵگە هەن. ماڵێکمان لە دیاربەکر هەبوو. کە کەمال پیر لە ساڵی (١٩٧٨)دا هاتە ئەوێ و دۆخی پەیوەندییەکانی زانی بە «جەمیل بایەق»ی گوت: وەرە با ئەم ژنە بکوژین. ئێمە پێمان قبووڵ ناکرێت هەڤاڵەکەمان بەم شێوەیە سووکایەتی پێبکرێت. هەڤاڵانیش باشتر گوتیان با وازی لێبهێنین، لەوانەیە مەسەلەی وا هەبن ئێمە پێیان نەزانین و ئەم هەڤاڵەمان خۆی لە ئەستۆیان بگرێ. ئاوا وازیان لێهێنا واتە هەڤاڵان لەساڵی ١٩٧٨ بە دواوە دەیانزانی لە چ دۆخێکدایە. کەمێك لەمەوبەر هەندێك هەڤاڵی ئێرە گوتیان: ئەوە خەفەتباری کردین کە تۆ پەیوەندی وا دادەمەزرێنی. دەچووین دەمانکوشت، بەڵام باشتر وازمان لێهێنا. لە «دێرسیم»یش دەیانگوت: ئەم خێزانە دژی میللەتی کوردە، چۆن چووی ئەم جۆرە پەیوەندییەت لەگەڵدا دامەزراند. لەمە ناکۆکییەکی زۆری تێدا بوو و بووە هۆی گومان لە دوورەپشتم و ئەو گومانەش ساڵانێکی درێژ بەردەوام بوون. بەڵام پەرەسەندنی پەیوەندییەکان سەبارەت بە «کەسیرە» بەو هەڵوێستەیەوە بەند بوو کە دەڵێت: «بەو ئەندازەیەی کە دەیخەمە نێو دەستم، لە کوردستان هێز پەیدادەکەم». ئەم مەسەلەیەی بە مللیەتر حسێب دەکرد و نیزیکبوونەوەی خۆی بەم حسێبە دیاری دەکرد. واتە لەم مەسەلەیەدا پەیوەندی مێینەیی خۆی وەك ئامرازێکی سیاسی بەکار دەهێنا.

ی.ك: ئایا متمانەی بە پاشەڕۆژی( PKK ) هەبوو؟

س.پ: بە تەنیا پاشەڕۆژ نا. بۆم باسکردن زۆر زیرەك بوو لە سەرکردایەتی تێدەگەیشت و دەیزانی سەرکردایەتی کردنی چینەکان چییە. لەوێ کوردستانی لە دەست دەرچوو و دەیتوانی بە هۆی مێنەوە بە دەستیەوە بگرێ یا کە منی گرت دەیتوانی پەیوەندی تایبەتی خۆی بە شێوەیەکی باشتر لە ئێمە بخاتەکار. ئێمە لەم مەسەلەیەدا سوزاوی بووین. لە کاتێکدا ئەو واقیع بین بوو و لە ئیش و کاریدا

پشتی بە سۆز نە دەبەست و هەوڵی دەدا بە زیرەکی خۆی ڕێگا خۆش بکات.
بەرانبەر بە من ئاوا بوو و ژیانی ڕۆژانەشم بەم شێوەیە بوو.

ی.ك: کەی ئەم زانیاریانەتان کەوتە لا، پاشتر یان هەر لە سەرەتاوە هەتانبوو؟

س.پ: بێ گومان ئارەزووی دەکرد رابکێشمە ڕیزی سەرکردایەتیەکەم. جگە سۆشیالیزم لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە ڕوون و ئاشکرایە ئەو ڕێبازی ڕزگاری نیشتمانییەش کە پشت ئەستوورین پێی هەر ڕوونە. دەبوو بە هەر شێوەیەك بووە وەزعی خۆی تێبپەڕێنێ. ئەوە وای پێویست دەکرد خێزانەکەی ڕەت بکاتەوە. ئەوە تاکە ڕێگای، لێخۆشبوونی بوو. ئەمەش ڕێگای لە بەردەم بەرپەرچدانەوەی لایەکەی دیکەدا دەکردەوە. لە باتی ئەوەی چینەکەم ڕەت بکەمەوە، دەچمە نێو ئەم بزاڤە بۆ خزمەتی چینەکەم. لە باتی ئەوەش شوێنکەوتەی ئەم چەشنە سەرکردایەتیە بم، دەتوانم وا لەم سەرکردایەتیە بکەم شوێنم بکەوێ. بیری لەم بوارەدا قەتیس بوو بوو. من لە جێگایەکدا نیم بتوانم مەودای پێوەندی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی ئەم هەڵوێستانە بە دەوڵەتی تورکیاوە ڕوون بکەمەوە.

ئەم ناکۆکیە لە سەرەتای دامەزراندنی پێوەندی نێوانمانەوە سەری هەڵدا و ئەمەش کێشایەوە بۆ پەیدابوونی ناکۆکی گەورەتر لە دواییدا. جا لەکاتێکدا بە ڕاستی و ڕێکی و بنەڕەتی ئێمەشم بۆ ڕاکێشانی دەکرد، ئەو کەوتبووە بەستنەوەی من بەخۆیەوە. ئەم دۆخە دەبووە هۆی بێزارییەکی زۆر بۆ من، چونکە ئەم پێوەندیە ژەهراوی بوو. بیرەوەرییەکی دیکەتان بۆ باس دەکەم. ئایا پیاو لەماڵ هەڵدێت؟ من لەماڵ هەڵاتم.

ی.ك: لە دیاربەکر هەڵاتی؟

س.پ: بەڵێ.

ی.ك: ئەمە وا دەگەیەنێ کە بێزاری هەر لە سەرەتاوە هەبووە؟

س.پ: زۆریش بوو.

ی.ك: سەرەرای ئەوە ماوەی (١٠) ساڵ درێژەتان بەم پێوەندیە دا؟

س.پ: پاش ئەوە دڵەڕاوکە و گومانی سیاسی دەستیان پێکرد. بەڵام هەر گومانی سیاسی نا، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەوە تەگەرەی خستە ڕێی ڕاکێشانی یەك مناڵ و بووە هۆی هەوڵدانێکی بێوچان لەم ڕێگایەدا.

ی.ك: ئەمە مانای وایە ئێوە بە خێرایی جوێ نەبوونەوە؟

س.پ: من وەك ڕێ و شوێنێکی بنچینەیی بە ئاسانی زیندەوەی لە هیچ پێوەندیەکدا ناکەم و نابمە هۆی پچڕانی هیچ پێوەندیەك. مێژووی(PKK) پڕە لە هەزاران نموونە لەسەر ئەم مەسەلەیە. من لە دۆخێکدام ئەم پێوەندیانە پەرە پێدەدەم. ئەگەر ئەم پێوەندیانە نەبوونایە(PKK) ساڵانی ١٩٧٧ـ١٩٧٨ ئەو قەیرانانەی تێنەدەپەڕاند. زۆر ڕوونە کە پێوەندیەکان چوونە ژێر باڵی میت(MIT) و چاودێری تەواوی ئەو. کەواتە ئەم تاقمە چاودێری دەکرا. میت ئاوا بیری دەکردەوە و منیش کە ئەم پێوەندیەم بەکار هێنا کارێکی کرد(PKK) لە ساڵانی

١٩٧٧ـ١٩٧٨ ڕەت بین. واتە ئێمە بەوە کەبشتین(PKK) ڕابگەیەنین و پاش ئەوەش کەلەکۆمەی گرتن لە «العزیز» دەستی پێکرد و ئەوە پاڵی پێوەناین بڕیاری چوونە دەرەوە بدەین. دەرچوونمان بۆ دەرەوەی نیشتمان بەم شێوەیە بەدی هات.

ی.ك: من تێدەگەم چی دەڵێن. بەڵام کەڵکی هەموو ئەمانە چییە. من دەبینم ئێوە ئەو کاتە دوودڵ بوون، چونکە شارەزاییتان وەك هی ئێستا نەبوو.

س.پ: پێشتر پێمگوتن من ئەوەم کرد تا هەستم و هێندێك سەرەدا و بەدەستەوە بگرم.

ی.ك: بەڵام لە ١٩٧٨ دا عەبدوڵلا ئۆجەلانی ئێستا نەبوون و هەستتان تا ئەم ڕادەیە بە تین نەبوو و ڕوانینتان وەك حالی حازر ڕوون نەبوو و بە سۆزی خۆتان بیرتان لە پێوەندیتان بە کەسیرەوە دەکردەوە.

س.پ: دەتوانم بڵێم سۆز وای لێکردین نرخێکی گران بدەین.

ی.ك: بەڵێ من دەمەوێ بزانم «ئوغرو مومجو» دەیویست چی بە ئەنجام بهێنێ.

س.پ: ئارەزووی دەکرد ئەمە بە ئەنجام بهێنێ: ببێتە هۆی خولقاندنی نیشانەی پرسیار لە عەقلی خەڵکدا لە بارەی ئاپۆوە، بەو مانایەی کە داخۆ ئاپۆ مرۆڤێکی جێی گومانە؟ بەوە خزمەتی دەوڵەتی تورکیای دەکرد. بەڵام «جنید ئارجا یورك» لە ڕۆژنامەی «حوریەت»دا باسێکی هەبوو تێیدا دەیگوت: ئیستیخباراتی دەوڵەت هەڵەیەکی مێژوویی گەورەی کرد. درێژی مارەکە لە بستێك زیاتر نەبوو و چەکمەی سەربازێکمان بەس بوو پانی بکاتەوە، بەڵام ئەم هەڵەیە کێشایەوە بۆ نەهامەتییەکی گەورە بە بان سەرمانەوە. ئەم باسەی لە ڕەوتی شیکردنەوەکەیدا بوو بۆ ١٢ای ئەیلوول و مەبەستی ساڵی ١٩٧٨ بوو.

ی.ك: ئەمە لەلایەکەوە ڕاستە و مەسەلەی «ئوغر مومجو»یش زۆر گرنگ نییە.

لەوەی وا لەم هەموو قسانەدا بە دەستم هێنا ئەمەیە: مادامێکی بەڵوت زانیاری چەوت بۆ ئیستیخبارات(MIT) دەگوازێتەوە و دەڵێت من چاودێرییان دەکەم، تا جموجۆڵەکانی باشتر دەربکەون و مینیش بەم شێوە بیبردەکاتەوە و ئێوەش لە ١٩٧٩ بەدوا سا یا بەمەستی خۆتان یان لەبەر هۆی دیکە وڵات بەجێدەهێڵن. ئەمە بەڵگەیە کە ئێوە نۆکەری میت(MIT) نین و ئەو نەیتوانیوە هەڵتان بسووڕێنێ یا کۆنترۆڵتان بکات.

س.پ: بێگومان ناسەلمێندرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە. ئەجەوید سەرۆکوەزیران و «CHP» دەسەڵاتدار بوو و ئەو خێزانەش پەیوەستەی ئەوان بوو و بەو پێیە ئێمەش پێیانەوە بەسترابووین. واتە ئێمە لە ژێر دەستیاندا بووین و پێویستی بە هیچ کردەوەیەکی توندوتیژ نەدەکرد. ساڵی ١٩٧٨ ئاوا بە بێ نەهامەتی و ڕووداو تێپەڕی. هێندێك ڕێکخراوی تورکی هەبوون لە ئێمە زیاتر پەلاماریان دەدا. تاقمەکەمان هێشتا دەستی بە بەکارهێنانی چەکی ئاگردار نەکردبوو. بۆیە ئەگەر ڕژێم حیزبمان یا تاقمەکەمانی دەستگیر بکردبایە، هیچ بەهانەیەکی بە دەستەوە

نەدەبوو تا بە ڕاشکاوی حوکم بدات. تەنانەت حیزب نە بەرنامەیەکی هەبوو و نە بەڵگەنامەی زۆر تایبەتە شایەت. هەتا ئەگەر پێشیانیزدەبنایە بۆ دادگا بەریان دەدابن. بە کورتی هیچ بەڵگەنامەیەکی وا لە گۆڕێدا نەبوو (PKK)ی پێ تاوانبار بکرێت، چونکە مشووری خۆمانمان خواردبوو و ئەوە کەمێك ڕزگاری دەکردین. وێڕای ئەوە کە میت متمانەی بە چاودێری ئەو و میکانیزمەکەی کرد.

ی.ك: بەڵێ. ئەم جۆرە بارودۆخە بە سەر حیزبی «بولشەوی»شدا تێپەڕی. ئیستخباراتیش ماوەیەك خستبوونیە ژێر دەستی خۆی. بەڵام شەڕەکە بە شێوەیەکی بنچینەیی لەگەڵ «ناردونێك»دا بوو.

س.پ: وەك مالینوفسکی وابوو کە لەگەڵ «لینین»دا کاری دەکرد. واتە کێ بیتوانیبایە، بەکاری دەهێنا.

ی.ك: بێگومان. دۆخی وا ڕوودەدات. ئێوە یەکەم و دوا ڕێکخستن نین کە میت چاودێری دەکات. تەنانەت هەندێك ڕێکخستن پەل دەهاوێژێت ئەمجا میت دەستگیری دەکات، چونکە کۆنترۆڵ و چاودێری دەکات. ئەگەر ڕێکخستنەکان گەورە نەبن. هیچ کێشەیەك لە ئارادا نابێ.

س.پ: ئەوی ڕاستی بێ ڕێکخستنەکەی ئێمەش ئەو ڕێکخستنە گەورەیە نەبوو کە مایەی سەرنجڕاکێشان بێ. ئەمەش لایەنێکی گرنگە. جا کە (PKK) گەورە بوو دەستیان کرد بە گوتنی ئەم قسەیە: «بۆچی ئەوسا نەیانگرت؟». بەڵام حیزب تا ئەو وەختە مەترسییەکی گەورە نەبوو. هەتا منیش وام وێنا نەدەکرد کە تا ئەم ڕادەیە دەبێتە مەترسی بەسەر دەوڵەتەوە و نەمدەزانی حیزب بەم شێوە فراوانە پەرەدەستێنێ. جا دوژمن چۆن ئەمەی دەزانی؟ ئەگەر ئەمەی نەبینیبێ چۆن تەگبیری حاڵی خۆی کردووە؟

ی.ك: لە ڕاستیدا مرۆڤ بیری بۆ ئەوە ناچێ (PKK) بە چ خێراییەك پەرەی سەندووە. ساڵی ١٩٨٨ چووم بۆ لەندەن. لەوێ هەر سێ کەس هەبوون لایەنگری ئێوە بوون. جا کە ساڵی ١٩٩٢ چووم سەیرم کرد هەموو کورد بوونەتە (PKK).(PKK) بە خێراییەکی لە ڕادەبەدەر پەرە دەستێنێ. پێم وایە پێویستە باسی ئەوەش بکەین. ئەم پەرەسەندنە کێشەیەکی گرنگە. چۆن دەتوانن لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە فێریان بکەن؟ چۆنیش مەشقیان پێدەکەن؟ هەموو ئەمانە شتێکی سەیرن.

س.پ: ئەمە کێشە نییە. بەڵام ئەو پەیوەندیانەی کە باسم کردن لە قۆناغێکدا بۆ ئێمە بوون بە هۆی دڵەڕاوکە و گیروگرفت و گومان و زەربان و وەك گوتم توانیمان لێیان ڕەت ببین.

ی.ك: وەك کەسێك حەز لە دۆستایەتی دەکەن و بە دوویدا دەگەڕێن، ئایا پاش کۆتایی ئەم هەموو پەیوەندیانە بیر لەوە دەکەنەوە کە ئەگەر ئەم پەیوەندیانە نەبوونایە باشتر بوو؟ یان سەرباری هەموو ئەوانە باش بوو؟

س.پ: ئەمە ئەزموونێکی گەورە بوو بۆ من و گەلێك ڕاستی لە بارەی ژیانەوە فێربووم. من متمانە بەشتێك ناکەم ڕژێم بیدات، چونکە تێکدەشکێنێ. ئەگەر

ڕژێم ژنێکی پێ‌دای لەوە بۆ تۆ نی‌یە. ئەگەر پیاوێکیشی پێ‌دای ئەویش هەر بۆ تۆ نی‌یە. تۆ ناچاری هەموو بەهایەکی خۆت بە دەستی خۆت دروست بکەی.

ی.ك: ئەوسا بابێینە سەر خۆشەویستی. ئەو ئافرەتەت خۆش دەوێ کە خۆت دروستی دەکەی؟

س.پ: قورسە. باسی لەمەشم کرد. کێشەی عەشق و سیاسەت لەم حاڵەدا دەردەکەون. ئەو دەمە پەنا دەبەینە بەر یاساکانی کۆمەڵگا. چوومە نێو ئەزموونێکەوە. دایکم پێی دەگووتم: «تۆ بەم عەقڵەتەوە سەرناکەوی». لەوانەیە لە دڵی خۆمدا گوتبێتم «بۆچی تاقی نەکەمەوە». دابونەریتم لە بەرچاو گرت. ئەمە مایەی وورووژان بوو، چونکە من بەرهەڵستی دابونەریتم دەکرد و کەمێك بایەخم پێ‌دەدا. دیارە گەلێك شت هەن بۆ خۆمیان دەهێڵمەوە. ئەمە بوو ناکۆکی نایەوە. من وام چاوەڕوان نە دەکرد ئەم جۆرە ئەزموونە سەربگری. ڕەنگە منیش کوشتەی ئەزموونی عەشق و سۆز و ژنهێنان بووبم. من بۆ ئەم جۆرە پەیوەندیە ساز و تەیار نەبووم. پەیوەندی بنچینەیی لێرەوە پەرەدەستێنێ، وەك ئەو کەسەی کە خۆی هەڵدایە نێو ئاگر و ئەمجا هەوڵی خۆڕزگارکردن دەدات. بێ‌گومان خەباتێکی سەخت بوو کردمان. ئەو دەرس و پەندانەی کە لەم پەیوەندیەوە فێریان بووم و ئازارم پێوەچێشت لە هەر شتێك گەورەتر بوو لەوانەی کە لە قوتابخانە و بنگەکانی پێ‌خوێندن فێریان بووم. لە ئەنجامی ئەم پەیوەندیەوە فێربووم بە شێوەیەکی بێ‌ئەملاوئەولا کەڵك لە هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ ڕژێمدا وەرناگیرێت. ئەگەر ئافرەتیش بووایە، ئەوە هەرگیز نەدەکرا. تەنانەت ئەگەر بەم چەشنە پەیوەندیەش لەگەڵ ڕژێمدا ڕازی ببومایە، ئەوا ئاکامی زۆر زیانبەخش دەبوون. ڕژێم شتێکت دەداتێ و لەبری ئەوە هەزاران شتت لێ‌دەبات. کۆنەپەرستی ڕژێم بەسە بۆ بڕانەوەت. لەم بارەدا دەبێ زۆر وریا بین و خۆبپارێزین و لە ترسی شەرەکە فوو بە ماستەکەدا بکەین. من باش لەم کارە فێر بووم. پەیوەندیەکی سزاوی بوو منی گەیاندە دووڕیانی هەڵبژاردنی یا سۆز یان کوردستان لە شێوەی «یا من یان کوردستان» و «یا من یا حیزب» و «یا من یا هەموو هەڤاڵان»دا.

ی.ك: دیارە ئەمە زۆر سەرەتایە، ئەمە هەڵوێستێکی کۆنەپەرستانەیە، وانی‌یە؟

س.پ: ئەمە چوارچێوەی پەرەسەندنی پەیوەندی کوردی‌یە و سەروساختی لەگەڵ کۆلۆنیالیزم و دەرەبەگایەتی و خێڵەکایەتی و چینایەتیدا هەیە. لەو کاتە کەسێرە ئەم ڕستەیەی خوارەوەی دەردەبڕاند: «خەڵکانێك هەن پاشا دروست دەکەن». مەبەستی ئەوە بوو تۆ خۆت بە پاشا دادەنێی. بەڵام هەن پاشا دروست دەکەن. مەبەستی لەوە خۆی بوو.

ی.ك: هیچ بەرپەرچدانەوەیەکی ئەم هەڵوێستەتان هەبوو؟

س.پ: لە جەرگەی شەڕێکی دەروونی گەرمدا بووین، واتە لەو بە کۆلۆنیالیزم و ئەرستۆکراتی‌یەوە شەتەك درابوو و ئەو پەیوەندیە کەمالی‌یانەی کە وەریگرتبوون لەلای بنجبەست بوو بوون. لە کاتێکدا پەیوەندیە میللی‌یەکانی یەکجار کزبوون و

لە ئاستی لایەنگری میللی «CHP»دا بوون و چەپڕەویەکەی بە ئەندازەی چەپڕەوی ئەو حیزبە بوو. پەیبەند بوونم بەو پەیوەندی‌یە و ڕادەی گونجانی لەگەڵ ڕزگاری میللیدا بەلای منەوە جێی گومان بوون.

ی.ك: ئایا مەبەستت ئەوەیە ئەو نموونەی مێژوویی «دیزرسیم»ی دەخواند؟

س.پ: بەڵێ بە جۆرە شەیدایەك هاندرا بۆ گەیشتن بە دیزرسیم و دامەزراندنی پەیوەندی تازە و پێکەوە بەستنی سونەگەرایی باشوورو عەلەوی بوونی باکور، ڕاکێشانەوەی سەرلەنوێی بەکرینگیراوێك و هێنانیە پاڵ گەل. کۆششەکانم بۆ ئەم هەموو مەسەلانە بوون و هەموو ئەوانەم بە نیازپاکی‌یەوە دەکرد، بە ڕواڵەت باش بوو. ئەگەر باش بووایە بەوە زۆر شادمان دەبووم. بەڵام ڕاستیەکان تەواو پێچەوانەی ئەوە بوون.

## من، ئەو ئافرەتەی کە نەتوانێ چوارچێوەی کۆمەڵگای ملکەچی دەسەڵاتی پیاو بشکێنێ ولەو بەرارەدا تێنەکۆشێ؛ بە کۆیلە هەڵیدەسەنگێنم.

ی.ك: باشە، پەیوەندیتان بە «کەسیرە»وە چۆن دوایی پێ‌هات؟

س.پ: پەیوەندیەکانم لە چوارچێوەی یاساکانی تێکۆشاندا بە شێوەیەکی پڕ بە پێستی ئەم یاسانە ناپچڕێنم. من لەسەر بنچینەیەکی سیاسی دەست بە هەر پەیوەندی‌یەك دەکەم و هەرواش لەسەری دەڕۆم. هەوڵمدا زیانی هاوجووتی سیاسەت و حیزب بێ و نەرم و نیان و کوڵنەدەر بووم، بەڵام ئەو بەدان بە خۆداگرتن و لاساری‌یەکی زۆرەوە شێوازی خۆی داسەپاند. بێ‌گومان من شەڕکەر و زەحمەتکێشێکی ڕەسەنی ئەم ڕێکخستنەم. هەرچی ئەوە هەوڵێکی کەمی‌دا و کارێکی نەکرد حیزب خەڵك ڕابکێشێ و هیچی لەسەر یاساکانی سەرکردایەتی نەدەزانی و باش دەیزانی کە دەرەبەگەکان کۆمەڵگای کوردی‌یان بەڕێوە دەبرد. بۆیە تێدەکۆشا خۆی داسەپێنێ. دواجار هەوڵیدا پەنا بباتە بەر شێوازی پیلانگێڕان. کە پێمان نایە ساڵی (١٩٨٦)ەوە هەوڵیدا خەسڵەتە مێینەکانی خۆی بە شێوەیەکی زۆر خراپ بخاتەکار تا بەسەرمدا زاڵ ببێ و لە ڕێگای خۆگرێدانیەوە بە من ئامانجەکانی بەدی بهێنێ، وەك ئەوەی بڵێت: «ئەگەر ژیانێکی ئاسایت دەوێ، پێویستە گوێ ڕایەڵم بی». بێ‌گومان من پێبەستەی ئامانجە سیاسیەکان و ڕاستی سەرکردایەتیم و پێم ناکرێت ئەم چەشنە زەوتکاری‌یە قبووڵ بکەم. ئەمە وای کرد ئەم ناکۆکی‌یە بگاتە چڵەپۆپە. شێوازی منیش شەڕکردنە بە چەکی حیزب و، ئەویش خۆی بە چەکی ژن پڕچەك کرد و، هەوڵی‌دا دەوروبەری خۆی ڕێك بخات و لە کێشەی ئافرەتدا بخاتە هەڵوێستێکی شڵۆقەوە. بۆیە هەڕەشەم لێ‌کرد و گوتم: «ئەگەر لە مەسەلەی ئافرەتدا تۆخنم بکەوی، ئەمە بۆ تۆ شتێکی زۆر قورس

دەبێ». هەڵسەنگاندنی من ئەمە بوو. نموونەیەکی ژیانی «گاندی»م دابێ و بۆ لێکدایەوە کەمن دەتوانم دەست لەشێوەی پەیوەندی نێوان ژن و پیاو هەڵبگرم و تا دواپلە خۆم و هەست و نەستم کۆنترۆڵ دەکەم. بەڵام شێوازی تۆ کە هەڕەشە و گوڕەشە و گفتنی دروزنەیە بە کەڵکی پەیوەندی کۆمەڵایەتی مرۆڤدۆستانە نایێت و ئەمەش بۆ تۆ زۆر ترسناکە. ئەمە دوا قسەی من بوو بۆ ئەو لەم چوارچێوەیەدا. ئەویش بە شوێن هەلێکدا دەگەڕا تا بگاتە ئەنجامەکانی ئەم پەیوەندییە. لەوە بوو بە کچە ڕێکخراوەکانی نێو ڕیزەکانی حیزب بەرەنگاری بوومەوە. لەم پەیوەندیانە ـ بە پێی تێگەیشتنی ئەو ـ مەترسییەکی گەورە بوون و هەوڵیدا بێیانکات بە کێشە. ئەوسا زۆری هەڵوێستە لەسەر مەسەلەی ئازادی ئافرەت کرد. جا وەك چۆن ئافرەت خۆی هەڵدەسەنگێنێ، دەبوو منیش بە پێی بیرکردنەوە و پرنسیپی خۆم ئافرەت هەڵبسەنگێنم. ئەو هەڵسەنگاندنەم بە شێوەیەکی قووڵ و هەمەلایەنە کرد. بە پێی ئەو ئەنجامانە ڕوومکردە شیکردنەوەی پەیوەند بە باروودۆخی ئافرەت.

ی.ك: ئەمە زۆر جوانە. گشت پەرسەندنێك لە ژیاندا بۆ ئێوە چاوگەیەکی فێربوون و فێرکردن پێکدەهێنێ.

س.پ: بەڵێ، ئەگەر ئافرەتێك تا ئەم ڕادەیە تەنگەتاوم بکات، پێویستە لەسەرم ڕاستی ئافرەت بزانم. جا بە پێی ئەم چەمکە «کەسیرە» بە مامۆستای گەورەم دەژمێردرێت، بەڵام بە ڕێگایەکی پێچەوانە.

ی.ك: لەوە دەچێ بەرهەڵستەکانت ببنە مامۆستا بۆ تۆ.

س.پ: بەرهەڵستان لانی کەم هێندەی مامۆستاکانی دیکە مامۆستان و دوژمنم باشترین مامۆستامە. ئاوا دەڵێن.

ی.ك: کە لە قۆناخی خوێندن و فێربووندا دەبن، چی دەکەن؟ ئایا هێندێك شت دەخوێننەوە و چاودێریان دەکەن؟ یان پەنا دەبەنە بەر مشتومڕ؟

س.پ: ئەوەی کە دەیکەم هەر خوێندنەوە نییە، بەڵکو دەکەومە چڕکردنەوەی بیرەکانم. مرۆڤ باشتر فێری ڕەفتارەکان دەبێ، بە تایبەتی ئەگەر مەسەلەکە ژیان بخاتە بەرانبەر مەترسییەکی گەورە. لەم قۆناخە مرۆڤ بە باشی فێردەکات.

ی.ك: کتێبەکەتانم لە بابەت کێشەی ئافرەتەوە خوێندەوە. گەلێك زانیاری مێژوویی هەن پەیوەندیان بە ئافرەتەوە هەیە.

س.پ: بێ گومان. کەڵکم لە «ئەنگلس» بینی و کتێبەکەی «بنەڕەتی خێزانی و دەوڵەت و موڵکداری تایبەت» زۆر سوودی پێ گەیاندم بەڵام من ئەزموونی ڕاستەقینەی ژیانم یەکەم سەرچاوەم بوو. من وەك پیاوێك خەباتێکی گەورە دژی باڵادەستی پیاو دەکەم. بە باوەڕی من دۆخی ئێستای پیاو قبووڵ ناکرێت. ئەو باروودۆخانەش کە حاڵی حازر ڕووبەڕووی ئافرەت دەبنەوە لەلایەن پیاوەوە و باڵادەستی پیاو پێویستە ببنە هۆی هەڵگەڕانەوەیەکی فراوان لە نێو چوارچێوەی کۆمەڵگادا و ئەمەش بەلای منەوە پرنسیپە. من ئەو ئافرەتە هەڵدەسەنگێنم کە نەیتوانیوە چوارچێوەی کۆمەڵگای ملکەچی کۆنترۆڵی پیاو ببڕێ، یان لەم

ڕێگایەدا نە جەنگاوە وەك ئەوەیە کە کۆیلە بێ. بەو پێیە هیچ پێوەندییەکی نە بە خۆشەویستی و نە بە دۆستایەتییەوە نامێنێ. لەم چوارچێوەیەدا ئەو پیاوە نابینم کە شایستەی ئەوەبێ خۆشەویستی بکات یان خۆشەویست بێ. ئەمە پرسیاری فەلسەفەکەمە. هەروەها زۆردارم خۆش ناوێ و من ئێستاکە خەریکم گوشار دەخەمە سەر کچان و پیاوان و تۆش خۆت ئەوەت بینیوە. ئەوەتا بە کچان دەڵێین: «چۆن ڕێ بە پیاوێکی شێوە دڕندە دەدەی لەسەرت دابنیشێ و چۆن پێت هەڵدەگیرێ؟ ئەو تا ئەم ڕادەیە ئایەخ و توند و تیژ و سەرکوتکەر و سووکە. چۆن قایل دەبی ئەم پێوەندییە مەزن و پیرۆزە بخرێتە ژێرپێ و تووشی سووکایەتی ببێ. چۆن بەم چەشنە باروودۆخە دڵتی بەڵێ». عەقڵم تا ئێستاش ئەوە وەرناگرێ کچێك بەوە ڕازی بێ چەندە لادێیی یا شارستانی و خوێندەوار یا نەخوێندەوار بێ. بەم پێوەندییە سەرکوت بکرێت و هەستی پێنەکات؟ لەوانەیە هەست بکات، بەڵام نازانێ چی بکات. تەنانەت ئەگەر پەلپیشی گرت، سەرناکەوێ و بێچارە دەمێنێتەوە. من لە منداڵییەوە خەون دەبینم و بیر لەوە دەکەمەوە ڕێ و شوێنێك بۆ ئەم کێشەیە دابنێم. پیاوەکان دەهاتنە شوێنی کۆبوونەوە و سمێڵی هەموویان بابڕ بوو. تۆ دەزانی سمێڵی بابڕ دیاردەیەکی پیاوەتییە. ئەوسا بە خۆمم دەگوت: «ئەوان چییان کردووە تا سمێڵیان بابڕ بکەن؟». لەبەرئەوەی پاشکۆی ناوچەوانی هەموویان کردەوەی بەتاڵە و باروودۆخیان بۆ هیچ کارێك یارمەتیدەر نییە، بۆیە تەنیا سمێڵیان بادەدەن. لەو کاتەیشەوە کاردانەوەیەکم دژی سمێڵ بادان لەلا پەیدا بوو و وام لێهاتووە دڵبەستەی پیاو نیم.

ئێستاکە هێندێك ئافرەت هەن بەرهەڵستی ئەم جۆرە پیاوانە دەکەن. بەڵام من زیاتر ڕقم لە دیمەنەکانی پیاوەتی هەڵدەستێ. مەبەستم ئەوەیە خۆم دەخەمە شوێنی ئافرەت و لە دڵی خۆمدا دەڵێم: «ئەوانە چۆن دەتوانن لەگەڵ ئەم جۆرە پیاوانەدا بژین». من بە ڕاشکاوی ئەوە زۆر بە خراپ دەبینم. ژیانم بە بەرچاوی تەماشاکەرانەوەیە و خۆم بە شتێکی ئایەخ لەکەدار ناکەم و ئیش بۆ ئەوە دەکەم پاکی خۆم بپارێزم. من بایەخ بە کچە تازەکان دەدەم. ئێوەش دەزانن ئەوان بە هەزاران دێنەلامان و خەباتیش هێشتا بەردەوامە و، پیاوان ملکەچی ڕێکوپێکین بەڵام هێشتا پەسندکراو نین. ئێمە پێیان دەڵێین: دەبێ بە هەر شێوەیەك بووە وەزعی خۆتان ڕاست بکەنەوە. ئێستا پیاو لە پاڵ ئافرەتدا لە ڕیزەکانی سوپای گەریلادایە. کەس ناتوانێ خراپە دەرهەق بەوی دیکە بکات و ناتوانن پێوەندی لەم چەشنە دابمەزرێنن و هەر دەستدرێژییەکیش بوار لە بەردەم کێشەی گەورەدا دەکاتەوە، چونکە ئێمە بەرێوەین بۆ بنیاتنان و سەرخستنی تەرزێکی تازە لەم پێوەندیانە. ئێمە زۆر ناچاری ئەوەین.

ی.ك: باوەڕم وایە ئەم قۆناغە زۆر باشە. چەند شتێکم لەسەر هێندێك جێبەجێکردنی ڕاستەقینە لە بابەت ئەم مەسەلەیەوە خوێندووەتەوە. ئایا ئەمە ڕاستە؟

س.پ: لەم جێبەجێکردنانەدا بنچینەکانی پێوەندی جنسی ناکەین بە پاڵپشت، چونکە بەکارهێنانی ئەم پێوەندیانە بە شێوەیەکی ئاژاوەگێرانە دەبێتە هۆی ناپاکی کردن لە ئەرکەکان و جێبەجێکردنیش بەم بنچینانە دەکرێت. واتە ئەم جێبەجێکردنانە بەهۆی ئەو ناپاکییەوە کران کە خراپە لەسەریان. دەشبینین پێوەندی جنسی هۆی پەیدابوونی ئەم چەشنە ناپاکییە بوو و وەك ئامرازێك بۆی خراپە گەڕ.

## بەهای ئازادی لە شۆڕشێکدا پێبەستەی ئازادی ئافرەتە لەو شۆڕشەدا و ئاستی ئازادی کۆمەڵگایەکیش پێبەستەی ئاستی ئازادی ئافرەتە لەو کۆمەڵگایەدا.

ی.ك: ئایا جێبەجێکردنی لەو شێوەیە هەن کرابن؟

س.پ: زۆرنا. ئەوە بوو توانیمان چەمکە تازەکە پەرە پێبدەین. ئاراستەیەکی باشی گەورە و چڕوپڕ لە ڕێکخستنی پێوەندیەکاندا لەسەر بنچینەی تازە هەیە. وەختێك باسی ڕاستی کوردی دەکەین، ئێمە هەوڵدەدەین خێزان و ئافرەتی کورد بە فراوانی شیبکەینەوە و دەشبێ بیر لە هێندێك بنچینەی دروست بۆ ئەم پێوەندیە ئاسایە بکەینەوە. یەکەم بنچینە ئەوەیە تا دوا پلە نیشتمانی بێ، دووەم: نیشتمان و ئازادی گەل هاوسەری بێ. سێیەم: لەگەڵ ڕێبازی پێشەنگی حیزبیدا هاوجووت بێ. چوارەم: بە تەواوترین شێوە و بە پێی ئەو سێ بنچینانەی پێشوو ئەرکەکانی ڕابپەڕێنێ. ئەمجا پاش ئەوە دەتوانین چەمکێك بۆ پێوەندی پیاو و ژن دابنێین. دەبێ سەلماندنی ئەوە هەر بەقسە نەبێ، بەڵکو بە شەڕ و هەر لەو ڕێگایەوە بێ. ئەم پرنسیپانە سەرجەمیان یەکجار گرنگن.

ی.ك: ئاپۆی برام ئایا دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە تێی بگەین: «مرۆڤ دەبێ یەکەم جار خۆی بەرزبکاتەوە، ئەمجا دوای ئەوە مافی بیرکردنەوە لەم جۆرە پێوەندیە بەدەست بهێنێ»؟

س.پ: زۆر وایە. تەنانەت کۆمەڵگا سەرەتاییەکانیش کە دەیانویست ژن بۆ کوڕێکیان بهێنن، داوایان لێدەکرد ئاژەڵێکی دڕندە ڕاوبکات و دەیانگوت: بۆ دارستان بچۆ و فلان ئاژەڵ یا فلان دوژمن بکوژە تا مافی ژنهێنانت بدرێتێ، من ئێستاکە ئەم پرنسیپە بە سەرخۆمدا جێبەجێدەکەم. ئەگەر ژنهێنان مافێك بێ لە مافەکان، دەبێ ئەم مافە پشت بە قەوالەیەکی مێژوویی ببەستێ. منداڵان لە کوردستان گیروگرفتن، نە ماڵیان هەیە و نە کار. بۆیە ژنهێنان لە کوردستاندا و لەم هەلومەرجەدا کارێکی خراپ و دزێوە. لە تورکیا سێ یەکێکی خێزانەکان یا نێزیك بەوە ناچارن خۆیان بفرۆشن. ئێوەش ئەوە دەزانن. ئەمە ناتەواوییەکی گەورە لە ڕەوشتدا پێکدەهێنێ.

ی.ك: مخابن ئەمە ڕاستە. ئەوەتا داوێن پیسی بڵاوبووەتەوە.

س.پ: ئەمە شتێکی زۆر ترسناکە و دۆخێکی مرۆڤ تۆقێنە. بەسترانەوەمان بە پرنسیپی مرۆڤدۆستانەوە وامان لێدەکات ئەوە ببینین. ژن بهێنە، پاشان ژنەکەت یا کچەکەت بۆ فرۆشتن بخەرە بەری مەیدان. ئەمە ڕووداوێکی سامناکە و سووکایەتی پێکردنێکی بەردەوامی زیانیشە. بەڵام ئەمە بە بەرچاوی هەمووانەوە دەقەومێ، ئەگەر هی وا هەبێ ئەوەی پێقبووڵ بێ، بە لای منەوە تەواو ڕەتکراوەیە. ئەگەر کارەکە پێویست بکات من دەتوانم لە ڕووی مرۆڤایەتی و ژیاندا ڕابوەستم تا ئەم سووکایەتیە قەدەغە بکەم. ئەمە پرنسیپی منە. پێوەندیمان لە مەسەلەی ژنهێناندا نێوانێکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ شەڕدا هەیە. جا کاتێك دەتوانم کچێك بخەمەپاڵ ڕیزەکانی حیزبمان، ئەوە پێوەندییەکی توندوتۆڵی بە شەڕەکەمانەوە هەیە. لەوەی وا دڵمان خۆش دەکات و پلە و پایەمان بەرزدەکاتەوە ئەم شەڕەیە کە دەیکەین. ئەو کچانە بەجەرگی لە شەڕەوە وەردەگرن و دێنەلامان. ئەمە باشە. پێویستە ئەوە لەسەر بنچینەیەکی ڕێك و ڕاست هەڵبسەنگێنین. پیاوان و کیژان لەبەر ئەم هۆیە دێنە پاڵمان. دەبێ ئەوە وەربگیرێت. چارسەرەکە ئالێرەشدا پەنهانە، ئەویش شەڕ و ڕزگاری نیشتمان و ئازادی گەل و بنیاتێکی حیزبی ڕاست و دروستە.

هەموو ئەوانە پێوەندییەکی لە پچڕان نەهاتوویان بەیەکەوە هەیە و چەمك و باسان. لەوەی وا بەتەمایە بگاتە ئەم پێوەندیانە، دەبێ نیشتمانپەروەرێکی ڕاستەقینە و جەنگاوەرێکی میللیی باش و حیزبییەکی ڕاست و دروست بێ. پێیان دەڵێم: «پێویستە خۆتان بسەلمێنن و دوای ئەوە دەبینە یەکەم کەسانێك کە چەپڵەتان بۆ لێدەدەن». ئەمە باسای عەشقە لای ئێمە. سەربکەون تا چەپڵەتان بۆ لێبدەین. ئەگەر کیژ و پیاو لەم مەسەلەیەدا خۆیانیان سەلماند، گەورەترین ڕێزیان لێدەنێین. ئێمە دەمانەوێ ئەم مەسەلانە بەم ڕاستەڕێیەدا ڕێبکەن و ئەمە ئەو پرنسیپەیە کە بەدەستمانەوەیە.

لەم پرنسیپەش زیاتر، ئێمە لە کاری ڕاستەقینەدا جێبەجێی دەکەین. حاڵی حازر پێشبڕکێیەکی ڕوون و ئاشکرا لەم بارەیەوە لە گۆڕێدایە. با هەریەکێك بتوانێ بە پێی بە شەڕەوە بەستراوی ڕێزی ئەوی دیکە بگرێ. ئەمە ڕێگا لە بەردەم کچاندا تەخت دەکات تا بێنە نێو ئەم شەڕە گەورەیەوە، هەر بە شێوازی دەرەبەگانە نا بەڵکو بە هاتنە پاڵ شەڕ و پەرەپێدانی ئەم شەڕە بۆ خۆسەپاندنیان.

ی.ك: ئەمە زۆر جوانە. ئەمە کارێك دەکات عەشق و شەڕ پێکەوە پەرەبسێنن.

س.پ: وەختێ باسی واقیعی کوردستان دەکەین، ئەگەر شەڕ و( PKK ) نەبوونایە کچی کورد بە شووکردن نەبووایە نەیدەتوانی لەماڵی خۆی بێتە دەرێ. پێم وایە شووکردن لە واقیعی ئێستادا و لەنێو چوارچێوەی ڕژێمدا دوایی بە هەر جەربەزەیی و ئازایەتییەك دەهێنێ کە ڕەنگە هەبن. لەپاڵ ئەوەدا من کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان ناژمێرم، بەڵکو بابەتەکە هەر لە ئاستی خۆشەویستیدا وەردەگرم. ئەگەر ئەو کەسە لە نیشتمان و ئازادی گەل دابڕابێ و

بەرهەڵستی ئەم چەمکانە بێ، ئەوا خۆشەویستی دەگۆڕێ. منیش لە ئەنجامی نێوەنێودان یا پێبەندبوون بە لایەکەوە لام لەم بابەتانە نەکردووەتەوە. ڕووداوی خۆشەویستی بابەتێکە خراوەتە بەردەم زانست و مەعریفەت. «خۆشەویستی دۆخێکی دەروونی جیایە»، من بە چاوێکی زانستیانەوە تێی دەڕوانم. پڕنسیپە میکانیکیەکان ناتوانن لێکیبدەنەوە. سەرباری لەوەی کە شەڕ مرۆڤ وا لێدەکات بە ڕواڵەت جوان بێ.

ی.ك: من هیچ گومانێکم لەو ڕووەوە نییە. هیچ شتێك نییە لە شەڕ زیاتر مرۆڤ جوان بکات. باوای دابنێین ئەواڵ ئێشیان بەم پڕنسیپە جوانانە کرد و بە تەواوترین شێوە چی داواکرابوو کردیان و ئەمجا عاشقی یەکدی بوون. ئایا ئەمە لەشەڕی ڕاستەقینەشدا جێبەجێ دەکرێت؟

س.پ: دەزانن هەر پێوەندییەك چەند قۆناخێکی هەیە و با بڵێین ئەم قۆناخە قۆناخی گوڵکردنە. واتە ئەم قۆناخە پێوەندیەکان تا ڕادەیەك هەڵدەگرێ. وشەی گوڵکردن لە زمانی تورکیدا ماناکەی خراپە بەڵام لە ڕاستیدا وشەیەکی جوانە، وە مانای قۆناخی نزیك بوونەوە و ناسکردن دەگەیەنێت. لەوانەیە پێم بڵێن چۆن لەمە دەبێتە پڕنسیپ. بە قەناعەتی من ئەو قۆناخەی کە کوردستان لە ڕزگاربووندا پێی گەیشتووە ئەم خەسڵەتەی لە پێوەندیەکاندا گەرەکە و پێویستە بە پێی ئەو قۆناخە بیسەرخێنین. پێم وایە بەهای ئازادی لە شۆڕشێکدا پێبەستەی بەهای ئازادی ئافرەتە لەو شۆڕشەدا و، ئاستی ئازادیش لەلای کۆمەڵگایەك پێبەستەی ئاستی ئازادی ئافرەتە لەو کۆمەڵگایەدا. دەتوانین ئەوە کەمێك بکەینە شتێکی گشتی. خۆ ئاستی ئازادی لەلای هەر بزووتنەوەیەك یا هەر حیزبێك یان هەر کەسێك پێبەستەی ئاستی پێوەندییەتی بە ئافرەتەوە. ئەو پێوەندیە ئازادەی کە لەنێوان ئەو و ئافرەتدا دادەمەزرێت ئاستی ئازادی لای ئەو حیزبە دیاری دەکات. ئەمە ئاستی ئازادی لەلای گەل ڕوون دەکاتەوە و ئەوەش بە گشتی ئاستی ئازادی لەلای ئەو کۆمەڵگایە ڕوون دەکاتەوە. بەو پێیە پەرە پێدانی پێوەندی ئازاد لەگەڵ ئافرەتدا، ئاستی ئازادی لەلای( PKK ) دەردەخات و، لەوەوە مەودای ئەو هاوسانییە بنچینەییە دەرك پێدەکەین کە هەیە. ئەگەر ئافرەت هەستی بەوە کرد ئازادە، ئەوە ئاستی ئازادی لای( PKK ) دەخاتەڕوو.

ی.ك: ئەگەر پیاو و ژن بە تەنێ مانەوە و پیاو توانی دەست بەرداری هەڵەی کەڵەکەبوونی ساڵان و قورسایی ئایدیۆلۆژی ببێ و خۆی بە هاوشانی ئافرەت دابنێ، ئەمە بە پەرجۆیەکی گەورە لە قەڵەم دەدرێت.

س.پ: بێگومان پەرجۆیە. منیش مرۆڤم و ئارەزووی گەورە گەورەم هەن و بە ڕاشکاوی پێتان دەڵێم: ئەگەر ئەم بارودۆخە بابەتی توێژینەوە بێ، ئەوا من گەیشتوومە تەمەنی چل و چوار ساڵیم و سەرەڕای ئەوە هەست بەوە دەکەم کە من ناچارم لەهەر کەڵە فەیلەسووفێك زیاتر پەرە بە بیرێکی تازە بدەم. ئەگەر مرۆڤ پێبەندی ئارەزووەکان بوو و بووە شوێنکەوتەیان، ئەوا لە سیاسەتدا دەدۆڕێ و

تێکدەشکێ. ئەگەر وازیشی لە سۆزەکانی خۆی هێنا هەر تێکدەشکێ. ئاوا ئێمە لە ناکۆکی‌یەکداین لێ‌دەرچوونی گرانە. حەزدەکەم بڵێم خەسڵەتی دەسەڵات و دڵبەندی و هێزی جوانی لەلای من لە ئاستێکی پێشکەوتوودان. من لەم مەسەلەیەدا ئاپەمە کابرایەکی ساختە و خۆم لەکەدار ناکەم. پیاوان و کچان ڕەنگە بتوانن ئەوە بکەن، بەڵام من لەم مەسەلەیەم پێ‌قووت ناچێ و زەبری خۆمیان پێ‌دەگەیەنم و، سەرنجی سەودای بابەتی پەیوەندی ئازاد و جوانیش دەدەن.

ی.ك: زۆر کەڵکمان لەم چاوپێکەوتنە وەرگرت. ئەو بابەتە گەورەیەی ئێوەم بە خۆشەویستی مرۆڤ پێ‌نەدەزانی. ڕاستیەکەی ئەم چاوپێکەوتنە لە هی پێشوومان باشتر و بەرهەمتر و پڕ شادی بوو.

س.پ: خۆ خەریك کردن بە مرۆڤەوە بە لای منەوە کارێکی هونەری‌یە. من بە شێوەیەکی هەمەلایەنە لا لە ڕووداو دەکەمەوە و شیکردنەوەیەکی ورد دەکەم بە جۆرێك کە لەڕووی خەیاڵ و زانست و شێوە عەمەلیەکانەوە بە خەیاڵی هیچ پیاو و هیچ ژنێکدا نایەت. عەولەکانم پەرەسەندنێکی گەورەیان تێدایە و هیواپڕاو نیم. پێش کەمێك گوتتان: «لەوانەیە نائومێد بووبن». ڕەنگە ئەوە ڕوو بدات، بەڵام هێشتا هیواکانم هێشتوونەوە و پێدەچێ ئافرەتێك نەبێ هیواکانم بەدی بهێنێ. بەڵام ئەمە هەرگیز گرنگ نی‌یە.

ی.ك: ئەگەر میرێك بوویتایە لە میرە کۆنەکانی کورد، لەوانەبوو شازادەی خێڵێکی دیکە پەیدابکەی.

س.پ: نەخێر. توانایەکی زۆر لە هەموو ڕوویەکی شەخسی‌یەوە لە ئارادان بۆ بەجێ‌هێنانی ئارەزووەکانم. بەڵام بە هەموویان ڕازی نابم، چونکە بۆ خۆمم ناوێن. من لە ئاستێکدام دەتوانم بچمە نێو هەر شێوە ژیانێکەوە دڵبەستەی بم و ئەوەم بە توانای شەخسیم بەدی هێناوە. بەڵام من چەند چەمك و پرنسیپ و بنکەیەکم هەن پێبەستەیانم و ناتوانم بە بێ ئەوان بمێنمەوە.

ی.ك: من لێتان تێ‌دەگەم. خۆشەویستی ئارەزووە و پێکەوە پەرەسەندنیان واتە کارەباوی بوون.

س.پ: بگرە لەوەش زیاتر. ڕووداوی خۆشەویستی هونەرە و خۆشەویستن هونەرە. دەبێ بابەتی خۆشەویستی بایەخ بە هونەر بدات. بابەتی خۆشەویستی بابەتێکی هونەری‌یە و دەبێ خاوەنەکەی ئەکتەر بێ. لە تورکیا ناوی هونەرمەندیان بۆ مانایەکی خراپ ئاڵوگۆڕ پێ‌کردووە. پێم وایە شۆڕشگێر باشترین ئەکتەرە. وەك دەزانن وشەی هونەرمەند لە هونەرەوە هاتووە، واتە ئەکتەر هونەرمەندە. دەبێ مرۆڤ هونەرمەند بێ تا بتوانێ لە ڕووداوی خۆشەویستی حاڵی ببێ. ئایا دەتوانین تا چ ڕادەیەك کەسێکمان خۆش بوێ پەیوەندی بە هونەرەوە نی‌یە؟ بێ‌گومان من ئەکتەرەکانی «یشیل جام»م خۆش ناوێن و تکام وایە بە چەوتی لێم تێ‌نەگەن. من بە چاوێکی زانستانەوە دەڕوانمە «یشیل جام» و تێدەکۆشم لە ئەکتەرەکانی تێ‌بگەم و بەهۆی ئەم تێڕوانینەوە بێ‌یاتگەمێ. لەوەش گرنگتر

خیانەت لە جوانی نەکەین و دەست بەرداری نەبین و زەوتی نەکەین. بەڵکو ئەوپەڕی ڕێزی بگرین و هێز و توانای سیاسیمان لە ڕێگای خراپدا نەخەینە کار. ئەم پرنسیپانە زۆر گرنگن. هەندێکمان جوانی بە ڕێگایەکی زۆر خراپ بەکاردەهێنن و تێکیدەشکێنن. سەرەنجام دەمەوێ بگەمە ئەم خاڵەی دوایی کە ئەمەیە: ئەگەر پیاو توانی لە چوارچێوەی پاراستنی ڕێزی خۆیدا خۆی بە سەر ئەو ئافرەتەدا بسەپێنێ کە ئەویش هەر لەم چوارچێوەیەدا خۆی دەسەپێنێ، ئەوا شایانی چەپڵەی ئێمەیە و پێویستە لە سەرمان پیرۆزبایی ئازادی تەواوەتی خۆیانیان لێبکەین.

ی.ك: قسەکەتان ڕاستە و من هاودەنگتانم. باشە سەرۆکم: ئایا بیر لەڕێ و شوێنەکانی ناوخۆ دەکەنەوە؟ ئایا ڕێ و شوێنێ وا هەیە؟ بڕوانن من وشەی ژنهێنانم خۆش ناوێ، بەڵام وشەیەکی دیکە لە زمانەکەماندا هەیە. ئایا ڕێ و شوێنی ژیانی هاوبەش چی‌یە؟ واتە ئایا لە ناوەوەدا بەڕێوەبردنێکی توندوتیژ هەیە؟ لێك جوێ بوونەوەش لە دوایدا چۆن دەبێ؟ ئایا ئێوە و حیزب بیرتان لەم مەسەلەیە کردووەتەوە؟

س.پ: دەتوانم زیاتر لە بیروڕاکانی حیزب، باسی بیروڕاکانی خۆم بکەم. با بڵێین سیستەمی ماڵ نەك سیستەمی ژنهێنان.

ی.ك: بەڵام من دەڵێم پێکەوە ژیان، چونکە نامەوێ بڵێم مێرد و ژن.

س.پ: بەڵێ، زاراوەیەکی خراپە. بە داخەوە پەندێکی تورکی لەم بارەیەوە هەیە دەڵێت: «ئەگەر ژن منداڵی لە سکدا بوو، دار لە پشتی کەم مەکەرەوە». من قێز لەم قسەیە دەکەمەوە. قسەیەکی زۆر خراپە.

ی.ك: بەڵێ هەمو قسە و شتێکمان لێوان لێوی شۆفێنیزمی پیاون.

س.پ: ڕەنگە باڵادەستی بێ، بەڵام تا ئەم ڕادەیە نا «دار بەسەر پشتیەوە و منداڵ لە سکیدا». ئەوە گەورەترین سووکایەتیە، وشەی ژنهێنان و ژنیش هەروەها. هێزی دەرکەوتن و هێزی کار و کادر و پێشکەوتن لە خەیاڵمدا ـ گرنگ نی‌یە بەدی هاتبێ یان نا ـ لە پێوەندیەکانمدا هەن. ئەگەر کەسێك پێی نایە نێو ئەم پێوەندیە، دەبێ دەستەبەری هێزێکی کۆمەڵایەتی گەورە بکات. ئەگەر لە کۆمەڵگا چووە دەرێ و کۆمەڵگای خستە دۆخی بێ‌هێزیەوە، ئەوا پێوەندی ژنهێنان لەم حاڵەدا زۆر خراپە. من ڕێزی ئەو ژن و ژنخوازیانە دەگرم کە کراون و نامەوێ بە جووتی لێم حاڵی بن. بەڵام کە ئافرەت ناز بفرۆشێت لەبەرئەوەی کە جوانە و پیاویش نازبکات لەبەرئەوەی کە سەر گەورەیە، من وای دەبینم ئەم بارودۆخە بە خۆڕایی لە دەستدانی مرۆڤایەتی و بگرە داخورانی بەهای مرۆڤایەتی‌یە. دەبێ ئافرەت چاو نەترس و زیرەك بێ و ئیرادەیەکی بەهێزی هەبێ و بتوانێ حوکم بدات. دەبێ ئەم خاسیەتانە هەموویانی تێدا کۆببنەوە. ناشێت مرۆڤ بە بێ‌ئیرادە خۆشەویست بێ. بەڵکو پێویستە لەسەری باڵادەست بێ. بەڵام خراپە دەرهەق بەخۆی و دەوروبەری نەکات و پێوەندیەکانی هەڵبسووڕێنێ و بە سەریاندا زاڵ بێ.

ناشێ شێوەگۆڕاو و خراپەکاربێ. دیارە لێرادە بەشێکە لە هەموو ئەمانە و بەمە بە کردەوە دەبێتە بەشێك لە ژیانێکی مایەی دڵبەستەیی. من بێز لەو ئافرەتە دەکەمەوە کە شەرم دەکات و لە بەردەم پیاودا خۆ کوردەکاتەوە. ڕەنگە پیاوەکان بە شێوەیەکی زۆر چەوت ئافرەتێکی لەم تەرزە هەڵبسەنگێنن. بەڵام ڕای من ئەوەیە: دەبێ ئافرەت ئەو سیفەتانەی هەبێ تا پیاو نەتوانێ بە سەریدا زاڵ بێ و بۆ هەموو شتێکی خراپ بەکاری بێنێ و وەك پارە و سامانی خۆی مامەڵەی لە تەکدا بکات. لە بری ئەوە دەتوانێ کوشش خۆی بخاتە پاڵ هی ئەو و ببێتە خاوەنی ئەم شەرەفە. چوونە پاڵ یەك یان ژنهێنانێك ئەم سیفەتانەی تێدا هەبێ شەرەفێکی گەورە و ژیانە و یاسای ژیانیشە. ڕەوایی ژنهێنانیش ئاوا دابین دەبێ و دەبێتە مایەی شانازی. دەبێ پیاو بە کردەوەی خۆی نەك بە پارە و وەزیفەکەی و بە چەربەزەیی و وان بەخۆداگرتن، شایستەی ئەم ژنهێنانە بێ. بۆیە دەبێ ئەم سیفەتانەی هەبێ. ئەم مەسەلانە بەلای منەوە جیهانین و هەر بۆ کوردستان نین.

ی.ك: باشە، بەڵام شێوەی ئەم ژنهێنانە چۆن دەبێ؟ واتە ئایا دەستی یەکدی دەگرن و ناوی خۆیان بەپێی گەورە تۆمار دەکەن بۆ دەربڕینی عەشقە گەورەکەیان و ڕاگەیاندنی هاوجووت بوونیان یا هەر شتێکی دیکە؟

## ئافرەت لەوە گەورەترە کە بە دەستەپاچەیی بژی یان لەجێی ڕووەکی ڕازاندنەوە دابنرێت.

س.پ: بەم هەموو شێوانە نابێت، نەك ئەوە تەنانەت ئەم ژنهێنانە، نە سەرەتا و نە کۆتایی دەبێ.

ی.ك: دەمەوێ ئەمەتان لێ بپرسم.

س.پ: بە هەڤاڵانم گوت: «هێندێکتان بە بێ ئەوەی بزانێ ژنی هێناوە و هێندێکی دیکەتان بە بێ ئەوەی بزانێ ژنی تەڵاق داوە». جۆرە ژنهێنانێك لەنێو (PKK)دا بەدی هاتووە و ئەوان پێی نازانن. لەوانەیە سبەی بە شێوەکەی بزانن، ئەوی ڕاستی بێ ئێمە جۆرە ژنهێنانێکمان هێنایە گۆڕێ... وانییە؟ بەڵام شێوە و ڕواڵەتی گرنگ نین بۆ نموونە من گوتم: «من ژنم نەهێناوە، بەڵکو ئازادی ئافرەتم هێناوە». بە باوەڕی من دەبێ مرۆڤ لە ناخەوە پەیبەستەی خۆشەویستی و شێلگیری و پێکەوە گرێ دراو بێ. دەنا پەل گرتنی کچێك و دەرکەوتن یا خۆدەرخستن لە بەردەم خەڵکدا بە کارێکی ڕووکەشانەی دەبینم و بچووك دێتە بەرچاوم.

ی.ك: ئەمە ڕاستە. ڕواڵەت و شێوەی بێ گەوهەر ژیانێکی خاوەن دوو ڕوویییە.

س.پ: تا ئەو پەڕی خاوەن دوو ڕوویییە. ڕەنگە لە ناوەوە وێرانە و بۆگەن بێ. هەر دەستگرتن بەس نییە، بەڵکو دەکرێت ئەم پەیوەندیە قووڵ بکرێتەوە. زۆر

لەوانەی کە پێیان وایە ژنیان هەیە، دەیانبینم ژنیان نەهێناوە. ئەگەر باسی ژنهێنانی ڕاستەقینە دەکەن، دەبێ لەو چوارچێوەیەدا کە نەخشەیم کێشا بۆی بگەڕێن. ئەو ڕووداوەی کە هیچ و پووچی و هەموو جۆرە دوورکەوتنەوە و قێز لێکردنەوەیەك پەردەپۆش دەکات، ژنهێنان نییە بەڵکو «درۆ ڕووبی‌یە».

ی.ك: ئەگەر ئافرەت بەم جۆرە شووکردنە قایل بوو، ئەوە ئافرەتێکە بۆ فرۆشتن، چونکە دەچێتە نێو پێوەندی بازرگانی‌یەوە.

س.پ: بەڵێ. بە زۆرداری بەکاردەهێنرێ. لەبەر ئەوە سووکایەتی‌یەکی گەورەیە بۆ پیاو. چۆن بۆم هەیە ڕێز لەو پەیوەندیە بگرم؟ ئەگەر بمتوانیبایە هەموو چەشنێکی ئەم هاوجووتی‌یەم بە یەك ڕۆژ هەڵدەوەشاندەوە. بۆیە لە ژنهێنان دوورکەوتمەوە و تا ئێستاش دووردەکەومەوە. گەورەترین ئەشکەنجە بەلای منەوە ژنهێنانە. ئەگەر بە زنجیریش بمبەستنەوە، ناتوانن ئەم چەشنە ژنهێنانەم بە سەردا بسەپێنن. لەوەبوو باسی ئارەزووەکانی خۆمم بۆ کردن. دەمەوێ سەرلەبەری مێژوو بە چەمکی ئێمەوە گرێ بدرێن و من گرێیان دەدەم و بەسترانەوەی ئافرەت بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر پەرە پێدەدەم. بێ‌گومان زۆر ڕێزی ئەو بەسترانەوەیە دەگرم کە بە تەواوی ئیرادەی خۆی بێ تا پەرەپێدان شیاوی بەدیهاتن بێ. من بەم کارە تۆڵە لەو کۆمەڵگایە دەستێنمەوە کە ئەم پێوەندیەی بە قوڕدا برد. ئەمە بەرپەرچدانەوەمە. من ئێستا لە دۆخی هێرش بردندام، چونکە مرۆڤایەتی و جوانی لە نیشتمانەکەمدا بەخەگیری قرتێنخستن و سەرکوتکردن بوون. من گێل نیم تا خۆم سەرقاڵی خواردن و ئافرەت بکەم، لەوانە تێنوێتیم ناشکێنن. چارەنووسی گەلێك و کێشەی ڕزگارکردنی لە گۆڕێدان، چۆن دەتوانم نوقمی هیچ و پووچی و دەستەپاچەیی ببم؟ نەخێر ئێمە جوانی گەورە دروست دەکەین. ئەمە گەوهەری هونەرە و پێوەندی جەربەزەیی دەخولقێنن. ئەمە ئەو شتەیە کە تێر و تەسەلم دەکات. من بانگی هەموو خەڵك دەکەم بۆ ئەم سەما و گەمەیە. با بزانین کێ سەرنجی کێ ڕادەکێشێ.

ی.ك: هەر کاتێك سەر لە لەندەن و ستراسبورگ دەدەم. ئاسایی سەر لە برایانی کوردیشم دەدەم. لە نەورۆزی ئەمساڵدا لە ستراسبورگ قسەم کرد و ڕووی قسەم کردە ئافرەتان: «سوپاسی بزووتنەوەکەتان بکەن، چونکە پیاوەکانتان دڵبەندی ئێوە نەدەبوون و بەدووی کچی بیانیدا ڕایاندەکرد. بەڵام (PKK) ئەوەی هەرەس پێهێنا و ئافرەتی ئازاد کرد» ئەوە بوو هەمووان ڕاوەستان و کەوتنە چەپڵە لێدان.

س.پ: بەڵێ، ئافرەتان پەرەسەندنێکی گەورە لەوەدا بەدیدەکەن. دەتوانم وا لە پیاوان بکەم ئافرەت بپەرستن.

ی.ك: پیاویش هەست بە کوردبوونی خۆی دەکات. پاش ئەوە دەڵێت من مرۆڤم و کە ئەوەش دەڵێت دەست بە خۆشەویستی ئافرەت دەکات.

س.پ: بێ‌گومان، من دەڵێم ئافرەت بەلای پیاوەوە نیشتمان و خودی ژیانە. من لە ڕێگای شەڕی گەورە و حیزبایەتی و ڕێکخستنەوە دەیخەمە نێو ئەم بارودۆخەوە.

ئافرەتیش دەزانێ کە ئەمە ڕێگای بردنەوەیە، بۆیە ناچار دەبێ بێتە نێو شەڕ.
ئەگەر تین و توانی گەورەی من نەبووایە، ئەوە بەدی نەدەهات.

ی.ك: بەڵام ئاخۆی برام ئەو هەستە ئاینیانەی کە لە منداڵیدا هەتانبوو، لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی دیکە زیاتر نابێ؟ مەبەستم ئەوەیە ئێوە ئەو هەستانەتان هەبوو. من دەبینم ئێوە ئافرەت بۆ ئاسمان بەرز دەکەنەوە.

س.پ: مەزنکردنی ئافرەتی داماو کارێکی زۆر جوانە. من لەم مەسەلەیەدا ئامەوێ بەمە ئامراز بە دەستی ئەو پیاوەی کە چەندەها چەرخی دوورە، هەڵوێستەکانی خۆی بەسەر ئافرەتدا سەپاندووە.

ی.ك: ئەو چەمکە ڕاستە. بەڵام تۆ ئافرەت پیرۆز دەکەی.

س.پ: نەخێر پیرۆزی ناکەم، بەڵکو وای لێدەکەم لیش بکات. خۆ هەموو خانمەکان وەك گیانفیداییەکان کاردەکەن.

ی.ك: کار گرنگ نییە.

س.پ: لەوانەیە وابێ. بەڵام من کۆنترۆلی پیاو و هێندێك خەلتەی بیروڕاکانی دەبینم. ئەمڕۆ زۆریان لە پایەی ئافرەت هێنایە خوارێ و وایان لێکرد لە ڕووەکی ڕازاندنەوە بچێ. وای دەبینم ئەوە قابیلی ئافرەت نییە. کوا ئەو قسەیە کە دەڵێت: «ئافرەت بەشێکە لە پیاو». بە ڕای من ئەگەر ئافرەت توانی خۆی بدۆزێتەوە، ئەوسا دەبێتە بەشێك لە پیاو. ڕەنگە پێم بڵێی تۆ بۆ ئافرەت زۆر سەرپەرگری. نەخێر. من ئافرەت بە شێوەیەکی واقیع بینانە هەڵدەسەنگێنم وا کە ئافرەت جێ و ڕێی ڕاستەقینەی خۆی لە کۆمەڵگادا بدۆزێتەوە. هێندێکیان دەربڕینی کۆمەڵگای بەهەشت یا کۆمەڵگای ئاشتی یا کۆمەڵگای هاوسانی بەکاردەهێنن. لەوانەشە ئازادی لەو کۆمەڵگایەدا ڕێگری نەبێ. بەڵام بابەتی ماهییەتی ئافرەت مەسەلەیەکی یەکجار گرنگە. من هێشتا بە شوێن ئەوەدا وێڵم و هێندێك متمانەم دەوێ و خەیاڵ پڵاو نیم. من شەڕ دژی دەستەپاچەیی ئافرەت دەکەم و ئەوە کارم تێدەکات. پێویستە باوەڕم بە گەوهەری کێشەکە هەبێ.

بەم قسانەمان دەگەینە ئەم ئەنجامەی خوارەوە: ئێبینی پێوەندی نێوان خەیاڵی منداڵی و سیاسەت دەکەین، هەروەها پێوەندی نێوان کەسێك کە خۆی و ڕێگای ڕوو بە ئاسینی گەل دەدانە ئاسین و شەڕی کەسێکیش کە گەل بەربەرەکانێی دەکات. هەموو ئەمانە دەبیبین ڕوون و ئاشکرا پێکەوە گرێ دراون. هەروەها پێوەندیە جۆراوجۆر و ئاساییەکانی سەرکردایەتی جیاواز دەردەچن. پێوەندی هێنزیش بە بێهێزییەوە کە هەوڵی ئامادەکردنیماندا. ئەمە بابەتەکە تەواو دەبێ.

دەربڕینێکم بە کارهێناوە تێیدا لە سەر گەلی کورد گوتوومە: «گەلێکە بووە بە ژن». ئەو بە ناویش دەربڕینێکی دیکە بەکار دێنم، ئەویش ئەوەیە: «گەلێکە بووە بە منداڵ». ئەوە لە بارەی خۆشمەوە دەڵێم. واتە من خۆم دەخەمە جێی منداڵ و ئافرەت تا بتوانم ئەنجامەکان بە دەست بهێنم. لەبەر ئەمە ئافرەت و منداڵ شتی خراپ نین. هەوڵ دەدەم سەر لەنوێ و بە ڕێگایەکی ڕاست پێناسەیان بکەم و

نیشتمان و کەسایەتییان بە خەباتێکی قاست بەرز بپارێزم. لەوانەیە بڵێن ئەم جۆرە ئــاڵە داڵ پێدانانێکی ڕاشکاوانەیە. بە ڕای من پێویستە لەسەر هەموو شۆڕشگێڕێکی بە تایبەت سۆشیالیست پێبەستەی پرنسیپی کرانەوە بێ. ڕەنگە من هێندێك زاراوەم بە شێوەیەکی سەرپێرگرانە یا لەشوێنێکی ناشیاوەدا بەکارهێنابێ. بەڵام گوەهەرەکەیان پێوەندی بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و هەڵە و ڕاست و باشی و خراپیەکانیەوە هەیە. دەبێ هەموو شتێك داماڵراو بێ تا بە ڕوونی لێی تێبگەین. زانست بانگەواز بۆ ئەمە دەکات و جێبەجێکردنی ئەم مەسەلانەش سوودێکی زۆری هەیە و لەیەش پێشەنگی لەوە پێکدەهێنین.

ی.ك: ئەوەی ڕاستی بێ لەوەدا کە دەیخوێنمەوە هەست بەوە دەکەم. بەڵام دووبارە بیستنەوەی شتێکی زۆر جوانە.

س.پ: هێندێکیان لە بارەی ئەم بابەتەوە دەڵێن: خەڵك زۆر مشتومڕ لەگەڵ ئاپۆدا دەکەن. منیش لەم مشتومڕەدا لە هەست بە شانازی دەکەم و لە داخی بۆ دەخۆم. مشتومڕی ئاپۆ مشتومڕی مرۆڤایەتییە و ئاپۆ بەسەرهاتی گەلێکە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و چینایەتییەوە گەیشتووەتە خاڵی کۆتایی و جارێکی دیکە ژیاوەتەوە. لەوانەیە هێندێك خەڵك گلەییم لێبکەن و بەبێنن سادەم و هێندێکیشیان بەبینن جوانم. من وازیان لێدێنم بە بارێکدا دابیشکێنن. بەڵام دەبێ بە دروستی هەڵسەنگاندن بکەین. من شەرکەرێکی ئەم کوتاخەم و هێندێك هێز وەردەگرم. ئەم هێزەم لە نەبوونەوە دەست کەوت. ئەگەر بیهێننە بەرچاوتان چۆن دەستم خستووە، دەزانن من بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن و دادپەروەرانە و لەجێی خۆیدا بەکاری دەهێنم.

ی.ك: من دەتناسم و خۆشم دەوێی و دەزانم و بگرە دڵنیاشم لەوە ئەم هێزە بە شێوەیەکی خراپ بەکارناهێنن.

س.پ: بێگومان، من بۆ بەرژەوەندی زۆرلێکراو و جوانی و کۆشش و چەربەزەیی بەکاری دێنم و دژی هەر یەکێك شەڕ دەکەم لە بەردەم ئەم بەهایانەدا ڕابوەستێ و نامەوێ هیچ کەسێك بە چەوتی لێم تێبگات. من کراوەم، بە برادەرەکەم و دوژمنەکەشم بەساسی وەك خۆم باسی خۆمم کردووە و ڕەنگە بشمکوژن. هەروەك باسی ئەزەلیبەتیشم کردووە. ئەگەر یەکێکیان بیرووڕام بخوێنێتەوە و هەوڵی تێگەیشتنم بدات، دەبێتە هاوڕێم بۆ هەزار ساڵ. من لە ئێستاوە برادەرایەتیم لەسەر ئەم بنچینەیە بنیات دەنێم. ئەوانەی وا پاڵەوانانە شەهید دەکرێن، هاوڕێمن، بۆ هەزار ساڵ پیاوان و ژنان بوونە پاڵەوانی مەزنی بەرخودان. ئەوانە بەشێکن لە من و منیش ئەو نوێنەرەیانم کە تا ئێستا لەسەر پێی خۆی ڕاوەستاوە. گومانی تێدا نییە کە دوای من شەرمەندێك دێتە دەری، ئەگەر دەرکەوت باش دەبێ و پێویستە بێتەدەر. جا مردن لە نێو ئەم چوارچێوەیەدا لە هەر کوێوە دێت با بێت. گرنگ نییە، چونکە ئەمە سەرکەوتنە و سەرکەوتنی ئێمەش هی مرۆڤایەتییە.

ی.ك: بە باوەڕی من خراپیەت تووش نابێت. ئەگەر لەوەش ڕوویدا، ئەوا ئەو ئاگرە کە(PKK) کردیەوە ناکوژێتەوە و بەردەوام دەبێ.

س.پ: بەڵێ، ئەم سەرکەوتنەتان بیر نەچێ و ڕێزی بگرن. با گەلی تورك و لاوان و کچانی شایستەی ئەم سەرکەوتنەش بن. ئەوسا مردن لە کوێوە دێت با بێت، بە لامانەوە گرنگ نییە. داوایەکی دیکەشم هەیە. ئەم ڕاستییە باش وەربگرن. هێندێك سەرکەوتنی باش هەن بۆ لێتوەن. لە ڕاستیدا جوانی و برایەتی و چونە پاڵ یەکتر و ژیانی گەورەش لە ئارادان. بۆچی خۆتانی لێبەدوورەدەگرن. تەماشامان بکەن. من بۆوم خۆمم بەم شێوەیە خستە ڕوو، چۆن دەبمە دوژمنی یەکێکتان و چۆن ژیانی یەکێکتان ئاسان ناکەم و واتان لێناکەم پڕاوپڕی جوانی بن و چۆن ناتانکەمە ئارەزوو و لێشاوێکی بە تەوژمی خۆشەویستی؟ هەموو ئەمانە جوانن و بانگەوازیان بۆ دەکەین. لە هەر کاتێکی ڕابردوو زیاتر ئێوە بکەن. هەستمان پێبکەن تا مرۆڤایەتی بۆ چەند پلەیەکی بالاتر بەرزبکەینەوە.

ی.ك: بەڵێ زۆر جوان و ناسکە.

# بەشی دووەم

## ئەوەی باوەری وابێت کە شۆرشەکەمان شۆرشێکی سیاسی بەتی‌یە یان ئامانجی ئەوەیە بە رێگای سەربازی بگاتە دەسەڵات،ئەوە مەودای تێروانینی تەسکی خۆی دەردەبرێ.

ی.ك: سەرۆکی ئازیزم، درێژە بە باس و خواستەکەمان دەدەین پاش ئەوەی باسی منداڵیتان و باوکتان و بێ‌دەسەڵاتی‌یەکەی و سەرچاوەی هێزتان و ئەو چەتوونەکەتان و خەم و خەفەت و کوچکردنتان لە گوند و چەوساندنەوەی گەلی کورد و سەرکەوتن و باڵابوون و کەسایەتی مرۆڤمان کرد و لامان لە مەسەلەی ئافرەت و چەوسانەوەی زیاتر لە کەسانی دیکە کردەوە، بەو پێ‌یەی کە بابەتێکە مێشکتانی خەریك کردووە. تا گەیشتینە ئەو خاڵەی کوردستانتان تەنها بە رزگاری ئافرەتی کوردەوە گرێدا و بگرە رزگاری مرۆڤایەتیشتان بە هی ئافرەتەوە گرێدا. ئێستا کە دەست بە باسی ئەو هێزانە دەکەین کە پێتان وایە دەتوانن مرۆڤی نوێ بخوڵقێنن جا ئیتر کورد بێ یا تورك و پیاو بێ یا ژن. ئەو هێزانە چین؟

دەمەوێ روونی بکەمەوە کە من بە دووداچوویەکی باشی چالاکیەکانتانم و چی بنووسن دەیخوێنمەوەو چی رابگەیەنن گوێی لێ‌دەگرم. بۆیە پرسیارێکی دیکەتان لێ‌دەکەم کە لەوەتی ئەو نامەیەتانم خوێندووەتەوە کەوا بە بۆنەی(١٥)ی ئابەوە ئاراستەتان کردبوو، ئارەزووەمە بیکەم. بە باوەری من وەختێك قسەتان بۆ ئەندامانی حیزب کرد و گوتتان: «شەر و سەرکەوتن بەلای منەوە هێندەی پێ‌نانی ئێوە بۆ نێو ئەم قۆناخە، گرنگ نین ». مەبەستتان ئەوەیە: «چوونمان بۆ نێو جەرگەی ئەم شەرە لە هەموو شتێك گرنگترە». من لەوە لەم گوزارەیە تێگەیشتم کە سەرۆك ئاپۆ وا دەروانێتە شەر کە ئامرازێکە لە ئامرازەکانی گۆرینی مرۆڤ. ئایا ئەمە تێروانینی ئێوەیە؟ دیارە لە کۆبوونەوە بتانەوێ دەتوانن وەڵام بدەنەوە. لە سەروبەندی ئەو کۆبوونەوانەدا کە ئەم هاوینە لە ئەورووپادا کردمن زاراوەیەکی تازەم خستە بەرچاو ئەویش «شۆرشی رۆشنبیری ئاپۆچێتی» بوو - پاش ئاگاداریم لەو کارە کە دەیکەن - ئەوە چۆن دەبینن؟ میکانیزمەکەی چی‌یە و هێزەکانی چین؟ لە گوتارێکی دیکەیشدا نووسیوەمە: «گرێ کوێرەی ناسنامەی سۆشیالیستی پارتی کرێکارانی کوردستان PKK» ئایا ئەمە هێزەکانیەتی؟ ئەگەر وایە، ئەم ناسنامە سۆشیالیستی‌یە چی‌یە؟ ئەو جوگرافیایە کامەیە کە بیردەکەنەوە ئەو سۆشیالیزمەی لەسەر جێبەجێ بکەن؟ حەز دەکەم گفتوگۆکەمان بەم بابەتە دەست پێ‌بکات. با لەوێوە بێینە سەر پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) با لە دروست بوون و تێروانینی بۆ کێشەکانی ئەمرۆ بتوێژینەوە و

بزانین دەکرێت تا چ رادەیەك بە پێشڕەوی بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکانی دیکە دابنرێت و هەڵوێستی بەرانبەر بە حیزبە شۆڕشگێڕەکان و گەروگرفتەکانیان و تێڕوانینی بۆ «حزب الله» و عیلمانیەت و بۆ ئایین چی‌یە؟ ئەو خاڵە بنچینەییەی کە پێم خۆشە دەستی پێبکەم ئەمەیە: ئێمە لە باسەکەماندا لامان لە خێزانەکەتان و لەدایکبوونتان و بالاکردنی مرۆڤی کورد و ئافرەتی کورد کردەوە، ئایا ئەو کارکرد و هێزانە کامانەن کە ئەکان بەم بالاکردنە دەدەن؟ بە کورتی دووپاتی دەکەمەوە: یەکێك لەم کارکردانە کە بەپێی تێگەیشتنی من لێکتان دایەوە ئەوەیە ئێوە وا ئاڕوانە ئەم شەڕە کە بە تەنیا ئامرازی ڕزگار کردنی کوردستان بێ، بەڵکو لەبەرئەوەی کە مرۆڤی کورد کاتێك ئەم شەڕە دەکات دەگۆڕێت. ئاوا حاڵی بووم.

س.پ: لەوەی کە پێم‌وایە شۆڕشەکەمان شۆڕشێکی سیاسی بەتی‌یە یان ئامانجی ئەوەیە بە ئامرازە سەربازیەکان بە دەسەڵات بگات، دەریدەبڕی کە تا چ رادەیەك تێڕوانینی تەسکە و لە تێگەیشتنی ئێمەوە دوورە. ئەوی ڕاستی بێ ئامانجی ئێمە مرۆڤایەتی و یەکپارچەیی‌یە و ئەوانە بە بنچینەی شۆڕشەکەمان وەردەگرین. دەتوانم جارێکی دیکە لە خۆمەوە دەست پێبکەم تا بە شیکردنەوەی مرۆدۆستانە بگەم. بارودۆخی مرۆڤانە بە شێوەیەکە زەحمەتە قبووڵ بکرێت. بە تەنیا لەبەرئەوە نا کە کەوتووەتە بەر هەڵسوڕاندنی ئیمپریالیانەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی کە ڕۆشنبیری چینە کار هەڵسووڕێنەکان بە درێژایی مێژوو و ئەو ئاکامانەی کە بۆ سەر تەرزی ژیان لێی کەوتتەوە، ئەوانەن دەبنە هۆی کاردانەوەم.

ی.ك: کەستان بەدڵ نی‌یە، نە کورد و نە تورك و هەتا ئەوروپاییش وانی‌یە؟

س.پ: بەڵێ، من مەبەستم بارودۆخی سەرلەبەری مرۆڤایەتی‌یە. ئەم بارودۆخە دەمارگرژ و تووڕەم دەکات و بە مەترسیشی دەزانم. بەڵگەکانیش زۆرن، زۆرداری مێژوویی و ڕژێمە خوێناویەکان و ئەو زیانەی کە لە سروشت دەکەوێ گۆی زەوی وا لێدەکات بە کەڵکی ژیان نەیەت. ئەم هەموو کارکردانە ناهێڵن تامی حەوانەوە بکەم. هەروەها من وای دەبینم مەترسی چەکی ئەتۆمی کە وەك شمشێرەکەی دیموکلیتس هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکات شوورەیی و سووکایەتی‌یە بۆ مرۆڤایەتی و بەدترین جۆری دەبەنگی‌یە. گوناحی لەوە گەورەتر نی‌یە کە سیاسەتێکی ئاوا پەیڕەو بکرێت و لە سایەیدا پەرەبستێنێ. من ناتوانم ئەمە قبووڵ بکەم و دەبینم ژیان لەم جۆرە دنیایەدا نائاساییە. ناشێت بە ئارامی بژیم و سروشتیش بەم شێوە بێ‌پەردەیە دووچاری تێکدان بێ. سەرباری ئەوە تەماشاکردنی مرۆڤ بەو پێیەی کە ڕانەبەر یان دەنکە لەمن تێڕوانینێکی ناپەسند و گرانە.

ی.ك. واتە تۆ مەبەستت ڕاماڵینە لە لایەکەوە و تووڕدانەتی بۆ لایەکەی دیکە؟

س.پ: مرۆڤایەتی داخورانێکی بێ‌ئەندازە بەرۆکی گرتووە. بەها باڵاکان تووشی لە نێوچوون دەبن و توێژێکی کەمینە باڵ بە سەر زۆرینەی مرۆڤایەتیدا

دەکێشن و خێروبێرەکانی بە تالان دەبات. من ئەم بارودۆخە بە تەشەنەکردنی شێرپەنجە ناودەبەم، چونکە کۆمەڵگا دەبێتە کۆمەڵگایەکی بەرخۆر و ئەوەیش شێرپەنجە دەگەیەنێ. ئەو لایە هەرچی چۆنێك بێ کە لێوەی دەڕوانین، ئەم ڕێڕەوە ئەگەر بەردەوام بێ دەکێشێتەوە بۆ تەفروتوونا بوونی مرۆڤ و نەمانی ڕەگەزی مرۆڤ. دیارە من باسی ڕۆژی حەشر و قیامەت ناکەم. بەلام وەك چاودێرێکی زیتەلە وای دەبینم کە مرۆڤایەتی بە دەرد و نەخۆشی مرۆڤانە دەبڕێتەوە نەك لە ئەنجامی پەتایەکی سروشتی یا نا تەواوی‌یەکەوە لە کۆمەڵەی خۆردا.

ی.ك: مەبەستت ئەوەیە کۆمەڵگای بەرخۆر، سەری ڕەگەزی مرۆڤ دەخوات.

س.پ: کۆتایی لە ئەنجامی نەخۆشیە کۆمەلایەتیەکانەوە دەبێ. ئەمە چەمکی فەلسەفی منە. ئەوەتا شێرپەنجەی زینگە بە بەرچاومانەوە دیارە و کۆمەڵگای بەرخۆر ئەستێرەکەمانی کردووەتە زبلدان. زیندەڕەوی لە پێوەندیە جنسیەکاندا دەرگای لەسەر پەیدابوونی کارەساتێك کردەوە بە «ئایدز» ناودەبرێت. ئەگەر زیادبوونی دانیشتوان بەم خێراییە درێژە بکێشێ، گۆی زەوی دادەپۆشێ و دەیکاتە شوێنێکی بێکەڵك بۆ ژیان. بایەخدەران بە کاروباری مرۆڤایەتی ناتوانن بە خۆشی بخەون. ئەم هەموو کارەساتانە بەر دەرگایان پێ گرتووین. ڕەنگە پێم بڵێی: «لەباتی ئەو چوکلەی لە چاوتدایە دەری بهێنی، هەوڵدەدەی ڕێپوق لە چاوی کەسانی دیکە دەربکەی». بەلام مرۆڤایەتی بە لای منەوە یەکێتی‌یەکی تەواو کراوە. ئەگەر ئەومان لە دەستدا گوێ بە گیروگرفتەکانی مرۆڤایەتی بدەین، شێلگیرانە بایەخ بە گەلەکەمان نادەین. ئەگەر هەولیش بدەین، بۆمان ناچێتەسەر مرۆڤی تازە بخولقێنین.

ی.ك: کە باسی مندالیتانمان کرد، باسی ئەوەتان کرد کە خەلکی گوندەکەتان پێ‌یاندەگوتی: «عەبدوڵلای کوڕمان پشتی خۆی پچڕاندووە». ئێستا ئەگەر گوێیان لێت بێ، دەڵێن: «ئاپۆ وەك خۆیەتی، ئێستا بیر لە ڕزگاری مرۆڤایەتی دەکاتەوە! وامان لێ‌چاوەڕێ دەکرد خۆی ڕزگار بکات، بەلام وازی لەوە هێنا و ڕووی‌کردە کوردان. تەنانەت ئێستا بە تەمای ڕزگارکردنی مرۆڤایەتیشە».

س.پ: ئەگەر بێینەوە سەر مێژووی ئاینەکان لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا، بۆمان دەردەکەوێ کە پەیامی پێغەمبەران هەر لە سەرهەلدانیانەوە ڕووی دەمیان لە مرۆڤایەتی بووە. وەکو دەڵێن: ژمارەی ئەو پێغەمبەرانەی کە بۆ مرۆڤایەتی نێردراون دەگاتە ١٢٤ هەزار پێغەمبەر. بۆیە ئەگەر کەسێك باسی قۆناخی ئەو پێغەمبەرانە لە خۆرهەلاتی ناوەڕاست دەربکەوێ و دوو قسە دەربارەی چارەنووسی مرۆڤایەتی بکات، پێویستە کەس پەست نەبێ چونکە مێژوومان زۆر دەولەمەندە.

ی.ك: لەڕاستیدا زۆرم پێ‌بەیرە ئەگەر یەکێك دوای بیستنی ئەم گفتوگۆیەمان بە ڕەگەزپەرستی تاوانبارت بکات، چونکە پێم وایە کێشەکە ئەمەیە: لەکاتێکدا چەندین گوشار دەخرێتە سەر مرۆڤایەتی، مرۆڤێك لە کوردستان پەیدادەبێ تا سەرلەنوێ کورد دروست بکاتەوە. ئەم هەموو کاروبارانەش کە دەیانبینم بەلگەی

ئەوەش کە ئەم رزگاربوونە لێرەوە دەست پێدەکات. واتە لەم ناوچەیەوە کە لانکەی مرۆڤایەتی بووە. ئێوە باوەڕتان بەمە هەیە. وانییە؟

س.پ: بێ گومان. ئەم ناوچەیە لانکەی مرۆڤایەتییە. وەختێك کەوتینە خەباتکردن ئاماژەمان بۆ ئەم لایەنە کرد. ئێمە لە لانکەی مرۆڤایەتیدا سەرمان هەڵدا و مرۆڤایەتیش لەم لانکەیەدا یەکەمین خەسڵەتەکانی خۆی بە دەست هێنا.

ی.ك: ناوچەی میزۆپۆتامیا «نێوان دوو ڕووبار ـ دیجلە و فورات».

س.پ: کەنارەکانیان و دەشتەکانیان.

ی.ك: دەشتەکانی نێوان ڕووباری سوور و ڕووباری سەوز.

س.پ: نازانم ئەلام ئەو ناوچەیە کە مێژوو بێئەملاولەولا بە لانکەی مرۆڤایەتی زانیوە «میزۆپۆتامیا»یە. خەسڵەتە بنچینەییەکان لەوەوە بە دەست هێنراون. ئەمە وادەگەیەنێ کاتێك جۆری مرۆڤ بوو بە شێوەی کۆمەڵگایەك، خەسڵەتە بنچینەییەکانی خۆی لەم ناوچەیەدا خستە ڕوو. مێژووش دەیسەلمێنێ کە ڕۆشنبیری سیاسی و سەربازی و مافناسی و ئابووری لەم ناوچەیەوە بەجیهاندا بڵاوبوونەوە. قەناعەتێکی دیکەم هەیە: ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ وەك جۆر تووشی گەندەڵ بوون نەهاتووە و ئەو خەسڵەتانەی کە هەر لە سەرەتاوە پەیدای کردوون هێشتا پاکژ و ئاسایین و دووچاری پیس بوون نەبوون.

ی.ك: خەسڵەتی بێگەرد.

س.پ: خەسڵەتی بێگەرد لێرە «لەم ناوچەیەدا» دەبینین.

ی.ك: لێرە و دوای ئەوە (حیسیەکان).

س.پ: نەخێر. حیسیەکان دواتر دەرکەوتن. شارستانیەتی میسری و هیندی پێش ئەوان دێن. من ئەم خەسڵەتە ڕەسەن و بێگەردانە دەکەم بە نموونەی باڵای خۆم و چاویان لێدەکەم. پێم گرانە کە بڵێم: مرۆڤی ئەمڕۆ زیاتر شارستانی و خێرا و پێشکەوتووە، تەنانەت دەتوانم بڵێم: کۆنەپەرستی و پاشکەوتوویی بە سەر ئەو خەسڵەتە مرۆڤایەتیانەدا سەپێندراون کە لە قۆناخەکانی پێشوودا هەبوون، وەك بڵێی ئەوان نموونە باڵاکان سەرتاسەر قڕتێدەخەن. بە دووری نازانم ئەمە پیلانێکی خۆرئاوا بێ.

ی.ك: بەشێوەیەکی ڕوونتر: مستەفا کەمال «خۆرئاوایی بوون»ی پەرۆز ڕادەگرت.(لینین)یش دەیگوت من خۆرئاواییم، ئەی ئێوە چی دەڵێن؟ ئایا دەڵێن من خۆرهەڵاتیم؟ من وای تێگەیشتووم.

س.پ: من ناڵێم هەر خۆرهەڵاتیم. بەڵکو دەڵێم: من سەرچاوەی مرۆڤم و خۆرهەڵاتیم، چونکە مرۆڤایەتی لە خۆرهەڵاتدا خۆی دۆزییەوە. مەسەلەی خۆرئاوایش سەرلەبەری هێرشە بۆ سەر بەهای مرۆڤدۆستانە. خۆرئاواش وەك دەستەی ئەرکانی ئەم هێرشە وایە، بە تایبەتی پاش سەرهەڵدانی سەرمایەداری، واتە دڕندایەتی و داگیرکردنی مرۆڤایەتی. نموونەی ئەوە شارستانیەتی ڕۆمانییە کە لە ئەنجامی ئەو لەشکرکێشییەوە کەوا لە باکورەوە تووشی هات، هەرەسی هێنا. خۆ

(ڕۆما) مەڵبەندی شارستانەتی ئەو کاتە بوو و لەشکرکێشی دیوی باکور ئەم شارستانەتیەی لە نێو برد.

ئەگەر ئەم نموونەیە گشتی بکەینەوە دەبینین دەستکەوتەکانی مرۆڤایەتی لە بەها و نموونەی باڵا و شارستانەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست و شۆڕشی پیشەسازیەوە تا بە قۆناغی ئیمپریالیزم دەگات کە هەوڵدەدات وەك سیستەمێکی جیهانی خۆی بە سەر مرۆڤایەتیدا بسەپێنێ بە دەست دڕندایەتی خۆرئاواوە دووچاری وێرانکاری دەبن. ئەو تەرزەی کە ئەمڕۆ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەرجەستە دەبێ لە دڕندایەتی و پەلامار بردنیە سەر ئەم بەهایانە ئەڵمانیای هیتلەری تێدەپەڕێنێ.

ی.ك: منیش دەمەوێ شتێك بۆ خوێنەران و گوێگران سەربار بکەم، ئەویش ئەوەیە کە مارکسیزم ستایشی لایەنە پێشکەوتووخوازەکانی سەرمایەداری دەکات. مەبەستم ئەوەیە مارکسیەکان لە جیهاندا باسی لایەنە پێشکەوتنخوازەکانی سەرمایەداری دەکەن و بە ڕادەیەك بە شان و باڵی ئەم لایەنانەدا هەڵدەدەن کە وات لێدەکات پێت وابێ سەرمایەداری سیستەمێکی تەواوە، کەموکوڕی نییە و دەکرێت لە هەموو لایەکەوە چاوی لێبکرێت. هەتا «مانیفێستی کۆمۆنیست»یش ئەم خاڵەی تێدایە. لەو دەرسانەدا کە دەیانڵێمەوە هەمیشە دەڵێم: کەسم نەدیوە لە مانیفێستۆ زیاتر ستایشی سەرمایەداری کردبێ!

س.پ: ئەمە ڕاستە. وەك بڵێی سەرمایەداری دوا قۆناغە لەوانەیە مرۆڤایەتی بیگاتێ. وێڕای ئەوەی کە مارکسیەکان و لینینیەکان ڕەخنە لە سەرمایەداری دەگرن، بەڵام هەر لە نێو ئەم چوارچێوەیەدا دەمێننەوە. لەبەرئەوە ناچاردەبن لە جمۆجووڵەکانیاندا ملکەچی یاساکانی سەرمایەداری بن. بە بەڵگەپشتنەوەی سۆشیالیزمی بنیات نراو لەگەڵ سەرمایەداریدا دواجار وا لێکدەدرێتەوە کە کەم و کورتییەکی مارکسیزمە، چونکە زێدەڕۆیی لە دەرخستنی لایەنە باشەکانی سەرمایەداریدا کردووە و مەترسی و شوێنەوارەکانی گەندەڵی سەرمایەداری پیشان نەداوە.

ی.ك: من زۆرم پێخۆشە کە گوێتان لێبگرم. ئەو پرسیارانەی کە دەیانکەم بۆ خوێنەواران و بە دووداچوونە. بە پێی لێکدانەوەی من سەرهەڵدانی پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK» ـ وەك لە هەندێك ئەدەبیاتتاندا هاتووە وەك پارێکی ڕەت کردنەوە و خۆدامالین هاتە ئاراوە، واتە ڕەتکردنەوەی چەپی تورك و خۆدامالین لە چەپی کورد. دوایی دێینە سەر ئەم باسانە. ئایا بەم قسەیەتان ئەوە دەردەبڕن کە لە ڕوانگەی چەمکی شارستانەتیەوە خۆتان لە شارستانەتی سەرمایەداری خۆرئاوا داماڵیوە؟

س.پ: زەحمەتە بەبێ بە قووڵ ناسینی سەرمایەداری لە پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) و کێشەکانی ئەمڕۆ تێبگەین. ئاشکرایە ناسینی سەرمایەداری، ناسینی باروودۆخی گشتی مرۆڤایەتی پێدەوێ. پێم وایە سەرمایەداری باڵاترین پلەی مرۆڤایەتی نییە، بگرە لێڵ کردنی زەین و بیری

مرۆڤایەتیشە. سەرمایەداری هێندێك دەوڵەمەندی خستە سەر ژیانی مرۆڤایەتی، بەڵام سیستمێکی خاوەن چەند خەسڵەتێکی وێرانکاری گەورەیە.

ی.ك: هاوبەشی پەرەپێدانی تاکڕەوی دەکات.

س.پ: سەر ڕووکردنی بە گیانی تاکڕەویدا دوژمنایەتییەکی گەورەی بەهای کۆمەڵایەتی مرۆڤایەتی تێدایە. بە پێچەوانەی ئەوەوە، سۆشیالیزم لە ڕووی تاکڕەویدا ڕادەوەستێ. ئەگەر سۆشیالیزم دژی داخورانی کۆمەڵگا ڕاپەڕیوە کە لە تاکڕەوییەوە پەیدابووە، ئەم هۆیە بەسە بۆ ئەوەی کە هەمووان سۆشیالیستی بین، چونکە ئەوە بەس نییە تەنیا شەریکەبەشی هەوڵ و کۆشش بین بەڵکو دەبێ پێکەوە داکۆکی لە کۆمەڵگا بکەین و خەسڵەتی مرۆڤدۆستانە بناسینەوە کە لە دەرکەوتنی بەکەم کۆمەڵگای مرۆڤایەتییەوە تا دوا کۆمەڵگای سەرمایەداری نەگۆڕاوە. لێرەوە من وای دەبینم کە سەرمایەداری لەلایەکەوە گشت بنچینە و پایە کۆمەڵایەتییەکان تێکدەدات و وێران دەکات و لەلایەکی دیکەشەوە فوو بە گیانی تاکڕەویدا دەکات و هانی دەدات. لە کاتێکدا تێگەیشتنی تاکڕەوی کۆمەڵگای بە تەواوی قووتداوە. لە کۆندا بەگ یا ئەو کەسەی کە کۆمەڵێك کۆیلەی هەبووایە، بە سەر مرۆڤایەتییەوە مشەخۆر بوو. هەرچی ئێستایە سەرمایەداری ئەم مشەخۆرییەی دژی تونێژێکی بەربینی کۆمەڵگا تەشەنە پێداوە. هەتا وای لێهاتووە وەك ئەمڕۆ دەیبینین کۆمەڵگاکان ناتوانن دەربچن.

## ئەو ماوەیەم بەلاوە گرنگ نییە کە ئەم شەڕە دەیخایانێ، بەڵکو گرنگ ئەوەیە ماهییەتی ئەم شەڕە چییە.

ی.ك: من ئەوەی کە دەینووسن دەیخوێنمەوە. ئەو خاڵەی وا حەزدەکەم لای لێبکەمەوە ئەمەیە: ئێمە لە کوردەوە دەست پێدەکەین و ئینجا ڕوو لە مرۆڤایەتی دەکەین. لەم ناوچەیەوە دەچینە دەرێ کە لانکەی شارستانییەتە. لە باس و خواس و نووسینەکانی پێشووتاندا ئەوەم پێ سەیر بوو لە پەستا ڕەخنەتان دەگرت «ئەو کەرەستە خاوەی کە لە دەستتاندایە مرۆڤە». ئەمە ڕاستە. هەمیشە ڕەخنەت لە کورد دەگرت و ئەمەش کارێکی باشە. ئەو قسەیەتانم لە یادە: «تۆ ئەی گەریلای کورد پێشمەرگێ بۆ مردن دەکەی، بەڵام بۆچی لە ڕێگای پەرستندندا سستی دەنوێنی؟». تەنانەت ئەم قسەیەت کردووە بە شێوازێك بۆ قسە لەسەر کردنی لەگەڵ هەر کەسێکدا لە گەڵتدا دابنیشێ. ئێمە وادەگەیەنێ لێرە بیر لە هەڵکشان دەکەینەوە. ئەو کەرەستە خاوەش کە لە بەردەستتاندایە بریتییە لە: ئەو کوردەی کە داد و بێدادیەتی بە دەست سەرمایەداری و مۆنۆپۆلەکان لە لایەکەوە و لە لایەکی دیکەوە گوشاری هۆزایەتی و کۆلۆنیالیزم و ئەمانە وایان لێکردووە کەسایەتی و ئیرادەی نەبێ و لێرەش ئێستا هەوڵدەدەن دەستی ئەم کوردە بگرن و هەڵیبکێشن. ئەو هێز و کارکردانە کامانەن کە جگە لە شێوازی سوکراتیانە پێیان پشت ئەستوورن؟

ئاخۆ ئەم مرۆڤە لە سەروبەندی ئەو شەڕەدا کە لەئێرادەی ئێوە بەدەر ڕوودەدات دەبێتە مرۆڤێکی پەرەسەندووی هاوکار کە بتوانێ بەرپرسی دەربپات؟ ئەو سۆشیالیزمەی کە باسی دەکەن چۆن کاریگەری لەسەر دەبێ و لەوە لە چ ناوچەیەکی جوگرافیایی دەبێ؟

س.پ: زۆر ڕوونە. ئێمە پاڵ بە مرۆڤێکەوە دەنێین بۆ شەڕ کە لە خود و ڕاستی خۆی دوور کەوتووەتەوە و لە واقیعی خۆی نامۆ بووە. ئەمجا وای لێدەکەین کە شەڕی ئەم نامۆییە بکات کە بە هێز و بە کردەوە بە سەریدا سەپێنراوە. ئێمە کەمێك هێزی ئیرادەمان لەلا خولقاندووە. کێشەکە لەوەدا حەشاردرابوو کە وای لێبکەین هەست بەو نامۆییە بکات کەوا کۆمەڵگای کوردی بە دەستیەوە دەناڵێنێ. لەوەدەچێ توانیبێتی لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ و بچێتە شەڕەوە. پاڵنان بە کوردەوە بۆ شەڕکردنی چارەنووسە ناوەڕۆکەی قۆناخێکی شۆڕشگێڕی مەزنە. ئەوەی وا ڕوودەدات ئەوەیە: پاش بە گەرمی شەڕکردنی بەختی ڕەشی خۆی دەناسێ و هەنگاو بە هەنگاو نامۆیی خۆی تێدەپەڕێنێ. ئەو ماوەیەم بەلاوە گرنگ نی‌یە کە ئەم شەڕە پێیدەچێ، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ماهی‌یەتی ئەم شەڕە چی‌یە. هەروەها دوورایی سیاسی ئەم شەڕە بە ئەندازەی گەوهەر بۆ پەیداکردنی گرنگ نی‌یە. لەمە گرنگترین ئامانجە. واتە ئەوەی کە گەل بگاتە ڕاستی و خودی خۆی و نەبێتە گەلێك تەنیا لە شەڕدا سەرکەوتبێ، بەڵکو ببێتە گەلێك بزانێ چۆن شەڕ بکات.

ی.ك: مەبەستان لەمە ئەوەیە شەڕ تا هەتا هەتایە بەردەوام دەبێ؟

س.پ: شەڕ بە شێوەی جۆراوجۆر بەردەوام دەبێ. ئەگەر دڵتان دابنێتە هەڵوێستەکانم، من هەردەم باسی هەڵسەنگاندنێکی ڕیشەیی مرۆڤانە دەکەم. لەگەر مرۆڤ لە سایەی ئەو پاسایانەدا بژی کە بۆ خۆی داناون، ئەوا شەڕ بەو پێیە کە دەیبینم درێژە دەکێشێ. ئەوسا ڕەنگە ئەم خەباتە جاروبار سەربازی بێ و جاروباریش لەبەرەی سیاسیدا بێ، لە پاڵ بەرەی ڕۆشنبیری و ڕوحیشدا و لە شێوەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە و لە قۆناخێکەوە بۆ یەکێکی دیکە بگوازرێتەوە تا ئەو خولقێنراوە جوانە «مرۆڤ» دەبێتە بەشێك لە کۆمەڵگای بێوەی. ئەو دەمە شەڕ دەبێتە جوانترین شەڕ و ژیانیش جوانترین ژیان.

ی.ك: ئایا دەتوانین وا بڕوانینە کارەکانتان کە شۆڕشێکی ڕۆشنبیرین بە کورد دەست پێدەکات و لەنێو گەلانی دەوروبەردا دەتەنێتەوە؟

س.پ: قالبێکی دەست نیشانکراو و تەرزێکی تایبەتیمان لە جێبەجێکردندا بۆ چەمکی شۆڕشی ڕۆشنبیری داناوە. لە کاتێکدا ڕاستی ئەوەیە کە ڕۆشنبیری واتە دروست بوونی مرۆڤ و کەڵەکەبوونی چالاکی مرۆڤانە بە درێژایی هەبوونی، ئێمە بەهۆی ئەم ڕۆشنبیریەوە لێکحالی دەبین. ئەم ڕۆشنبیریە چەند کوڵەکەیەکی هەن، هەوڵ دەدەین جارێکی دیکە بە دەستیان بێنین. چەند کارکردنێکیش هەن ئەم ڕۆشنبیریە تێك دەدەن. پێویستە لەسەرمان شەڕ دژی ئەم کارکردانە ڕابگەیەنین. هەر لەم چەمکەوە، پڕ بایەخترین لایەنی خەباتمان ڕۆشنبیری‌یە واتە شەڕ لە

پێناوی ڕۆشنبیرییدایە بە مانا بەرتەسك و فراوانەكەی.

ی.ك: دەڵێی بیرۆكەیەكتان بۆ تازەكردنەوەی مرۆڤایەتی لە ڕێگای شەڕەوە هەیە؟

س.پ: شەڕ تاكە ڕێگایە بۆ بە ئەنجام گەیشتن. بۆچی؟ چونكە گەورەترین و گرنگترین شۆڕش بە ڕێگای شەڕ سەركەوتووە. خۆ شۆڕشی ئیسلامی شۆڕشی شەڕوشۆڕ بووە و دروشمەكەی «شمشێر و جیهاد» بووە و لە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەرەوە تا ئێستا هێشتا بەردەوامە. چەند خاسیەتێكی هاوچەشن لە شۆڕشی فەرەنسیشدا هەن. هەرچی شۆڕشی ئۆكتۆبەرە، سەرباری ئەوەی كە ئێمە قبەی دەكەین، كەچی بە بەكارهێنانی هێزێكی كەمتر سەركەوت.

ی.ك: بەڵێ خوێنێكی كەم ڕژا.

س.پ: ئەگەر شۆڕشی كوردستان ویستی قووڵ ببێتەوە مۆركێكی مرۆڤدۆستانەتر وەربگرێ و خاسیەتی مرۆڤدۆستانە بە دەست بهێنێ، پێویستە بچێتە جەرگەی شەڕێكی تێكهەڵپێچ و سەرتاسەری و تێكگیراوەوە و ئینجا بۆ چارەسەری ناكۆكییەكانی بكات و ئارەزووی بڵاوبوونەوەی هەبێ . ئەم جۆرە شۆڕشە ڕاناگیرێت و بەردەوامی ئەم شۆڕشانە پشت بە خاسیەتەكانی گەلان و جوگرافیا و سوود وەرگرتن لەلایەنە باشەكانی ئەم خاسیەتانە دەبەستێ تا سیستەمی تایبەتی خۆی دادەمەزرێنێ. لێرە دەمەوێ باسی ئەوە بكەم كە نابێ نكووڵی لە هەموو شتێكی مرۆڤدۆستانە بكەین. گەلێك خاسیەت و ئاستی شارستانەتی گەلان هەن كە دەچنە نێو ئەم سیستەمە و لەگەڵ سیستەمدا یەكتر تەواو دەكەن و دەبێتە دەسكەوتێكی ئەو و لەوانەیە بایەخێكی زۆریان بۆ ئەم سیستەمە هەبێ.

ی.ك: ئاپۆی ئازیزم پرسیارێكی دیكەم هەیە. ئێوە بەجەرگییەكی گەورەتان هەیە و یەك یا دوو بەڵگە لەسەر ئەوە هەن. وەختێك ئامادەی ئاهەنگەكانی نەورۆز دەبووم لە لەندەن، ئەو نامەیەتان گەیشت كە بەم بۆنەیەوە خوێنرایەوە. ئەوەی تێیدا گوتتان: «تاكە حیزبێك كە لە جیهاندا ماوە و پرنسیپەكانی ماركسیزم ـ لینینیزم هەڵدەگری پارتی كرێكارانی كوردستان PKKیە». ئێوە بەوپەڕی دڵنیاییەوە وا دەڵێن. بەڵام نموونەی دووەم پشت بە ڕاستی كورد دەبەستێ. پارتی كرێكارانی كوردستان(PKK) ساڵی چواردەیەمی خۆی تەواو كردووە و هێشتا لێدانی دڵی بە دەست ئێوەوەیە. ئەمە بوار بۆ هێندێك مشتومڕ دەكاتەوە. تەنانەت هێندێك سۆسیالیستی كورد پەلپ لەم كارە دەگرن. ئێوە باسی گەوهەر و ناسنامەی سۆسیالیستی پارتی كرێكارانی كوردستان دەكەن. ئەم هەموو مەسەلانە ـ بە قەناعەتی من ـ بەخۆدا ڕاپەڕموونێكی زۆریان پێ‌دەوێ. هەرچی ئەو شەڕەیشە كە دەیكەن، مەسەلەیەكی دیكەیە و باسیمان كرد و دەیكەین. بە قەناعەتی من هەڵوێستی هەرە بەجەرگانەتان وەك سیاسییەكی شۆڕشگێڕ و قورسترین ئیش و كارتان لە كاتی كۆنفرانسی بەندیخانانەدا بوو. ئایا كەسانێك لە دەرەوە هەبوون لایەنگری لەو مەسەلە ناوخۆییانە بكەن كە لە نێو بەندیخانەدا دەركەوتن؟ ئەو كێشەیەش هیچ دوورایەكی فەلسەفی هەیە؟ چەش پاڵی پێوەنان بەم شێوە

توندوتیژە ڕەخنە لەو شۆڕشگێڕە کوردانە بگرن، بە تایبەتی کە ئەوان ماوەیەکی درێژخایەن لە بەندیخانەدا مانەوە و بەرخۆدانیان کرد و دەریانبرد و بگرە جاری وا هەبوو لە لێواری مردن دەگەڕانەوە؟ بە باوەڕی من ڕەخنە گرتنتان لەوە بەجەرگی‌یەکی لە ڕادەبەدەری تێدایە و کارێکی باشە. ئەگەر لە شوێنی ئێوە بوومایە نەمدەتوانی ئەوە بکەم. دووراییە لەطـفی‌یەکانی ئەم کارەتان چین و ئایا ئەمە لە چوارچێوەی شۆڕشێکی ڕۆشنبیریدا بوو؟ چیشتان کرد؟ من و تۆش لەو بەندیخانانەدا ماینەوە و هەر یەکێك لەو زیندانیانە بە چاوی پاڵەوانانەوە دەیڕوانی‌یە خۆی، بە تایبەتی کە ئەوان لە قۆناغی ١٢ی ئەیلوول بە دواوە ١٠ تا ١٢ ساڵیان بەسەربرد؟ ئەو هۆیانە چی‌بوون کە داوای ئەم شێوە بەزاندنەی ئەوانی دەکرد؟

س.پ: ڕازی نەبووم ئەو هەڤاڵانە پاش بەرخۆدانی پاڵەوانانەیان وەك پیاوی گرگن لە ناوەندی حیزبدا بکەونە ڕوو. بە قووڵی بیرم لەم مەسەلەیە کردووەتەوە و سەرنجم‌داوە کە داخوڕانێك هەیە. من باسی قەوارە و بەهای ئەو بەرخۆدانانە ناکەم. ئێمە ڕێزی هەموویان دەگرین و لە پێشەوەیاندا بەرخۆدانی ١٤ی تەمووز کە هۆی مەزنی ئێمە و شانازی مرۆڤایەتی بوو. کاتێك دیمن لەم مانایانە دوورکەوتوونەوە، دەبوو بوار لەبەردەم ڕەخنەدا بکرێتەوە. من وام چاوەڕوان لە دەکرد ئەم چەشنە بەرخۆدانە مەزنە ببێتە بالاترین جۆری لیبرالیزم، بە تایبەتی کە دەکەوێتە ناوچەیەکەوە لە نێو چوارچێوەی دەسڕۆیی ئێمەدایە. ئەمە بارودۆخێکە کە ناتوانم قبووڵی بکەم. پێمگوتن: ئەگەر ئەمە نابینن، واتە ئێوە بەرخۆدانی خۆتان نانرخێنن. تاکە چالاکی‌یەکی بە کردەوە لە مێژووی کۆماری تورکیادا نی‌یە ئەوە بسەلمێنێ کە مرۆڤ لە بەندیخانەدابەرانبەر بەو کردارانەی کەوا دەیخەنە حالی نەبوون دەستەوەستان ڕابوەستێ، هێندێك پاڵەوانی بەرخۆدان نەبن کە بە هەموو ڕێزێکەوە باسیان دەکەین، وەك دکتۆر «حیکمەت» کەتا دوا هەناسەی بە تاقی تەنیا بوو، بەلام بەختی ڕەش بوو و نەیتوانی ببێتە هێزێکی سیاسی. «ناظم حیکمەت»یش تەنیا بوو و وەك دوژمنێکی گەلەکەی پیشانیاندا. ئەوە پالی پێوە نا لە ئامێزی ئافرەتێکی ڕووسیایدا بە شوێن خۆشەویستیدا بگەڕێت. لەمە زیاتر نی‌یە. بەلام ئەوانە «هەڤاڵەکانمان» خاوەنی بەرخۆدانێکی درێژ خایەن و دەگمەنن لە بەندیخانەدا.

ئەوانە بەرخۆدانی مەزنن و بوونەتە بەشێك لەژیانیان. بەلام تەنیا و دوور لە سیاسەت مانەوە. واتە بوونە کەسانێکی بەزیو.

ی.ك: بەڵێ، من دەبینم چەپڕەوەکانی تورك بە کەسایەتی‌یەکی دووفاقەوە لە بەندیخانە دەرچوون. لایەنی یەکەمی یەکجار پاڵەوانانەیە و، هەرچی لایەنەکەی دیکەیشیەتی یەکجار بێ‌هێزە.

س.پ: بەوە بەمەی خوارەوە دەگەین: حوکمدراوانی ١٢ی ئادار و ١٢ی ئەیلوول بە چەند خەسڵەتێکی کۆنەپەرستانەوە لە بەندیخانە دەرهاتن و پێستی خۆیانیان گۆڕی. ئەمە ڕۆشنە. ئەو ڕێکخراوانە چی‌دەکەن کە ئەم بەرخۆدانە دەتوێنن؟ ئایا

ڕێکخستنەکانیان هیچ بەهایەکیان نییە تا بچنەوە لایان؟ ئەگەر بەرخودانتان کردبێ و دوو ڕستەتان دەرکاندبێ و پاڵتان بەو خەڵکەوە نابێ بۆ ئاگر و شەڕ و وازتان لێهێنابێ ڕووبەڕووی جۆرەها ئەشکەنجەدان ببن، ئایا تا ئەم ڕادەیە بە ئاسانی باسی ئەو خەڵکانە دەکرێت تا بە سەریاندا تێپەڕ ببن؟ تا ئەوانە بێدەنگ بن و دەستبەرداری هەموو شتێك ببن، لە کاتێکدا بەر لە بەردرانیان کەرامەتیان لێداماڵرا. ئەو خەڵکانە چۆن دەتوانن پاش دەرچوونیان لە بەندیخانە وەك کەسانێکی ئاسایی لە نێو گەلدا بژین؟ چۆن بەم جۆرە ژیانەش قایل دەبن؟ ئەم لایەنە زۆر گرنگە. هەرچی ئاتمەکەی ئێمەش بوو، هەڵوێستیان پێشکەوتوو بوو و ئەم چەشنە کۆتاییەش پەسند نەبوو. هەرکە لە بەندیخانە دەرچوون، پێشبڕکێیان بوو بۆ ڕیزەکان و تێکۆشان. بەڵام بڕیاری ئێوەش هی وامان لە نێودا دەرکەوت بە دروشمی مافی مرۆڤەوە کە ئیمپریالیزم بۆ دەستەمۆکردنی مرۆڤ و ڕاکێشانی بۆ نێو جۆغزی دەستڕۆیی خۆی ڕازاندوویەتیەوە «مافی زیندانیان»ی پێشێل کرد کە ئەمەش گەشە بە خولیابوونی ئەنانییەتەوە دەدات لە دەروونەکاندا و ئەوەش بووە هۆی گەندەڵ بوونی. سەرۆکی دەوڵەتی تورکیا پشت ئەستوور بەمە و سەرباری ڕێ پێنەدانی دەستوور بە زۆری کۆمەڵەی ئەوروپا ئەم سیاسەتەی بەسەر بەندیخانەکاندا جێبەجێکرد تا بەوە دەنگدانەوە و ئارەزوویەك لەلای هێندێك ناوەند پەیدابکات و ئەمە زانرا بێ یان نا بوو بە واقیع. هەر لەم قۆناخەدا هێندێك بەهای بنچینەیی شێوازی بەرخودانی( PKK ) دەستیان بە داخوڕان کرد و ئەوەش لە بەرخودانی چەکداریدا ڕەنگی دایەوە. جا هەر بۆ تەراوکردنی، داخوڕان لە بەرخودانی سیاسی و ڕۆشنبیریشدا دەستی پێکرد. بەلای منەوە لەم داخوڕانەی بەرخۆدان ئەوە دەگەیەنێ کە دنیا وێران کراوە و قیامەت هەڵساوە. گەلێك خوڕاگر و شەهید لە بەرخۆدانی بەندیخانەکاندا هەن. لە هەر گۆشەیەکەوە بڕوانین، ئەم بارودۆخە قبووڵ ناکرێت، تەنانەت ئەگەر دەوڵەت سەرەڕای بەرهەڵستی دەستوور دەرگا لەسەر بەردەست خستنی هێندێك تەنازول و قەرەبوویش بکاتەوە. دەبوو ئێمە بە توندی و ڕێکخراوی لە بەردەم ئەم چەمکانەدا ڕابوەستین و هەر وایشمان کرد.

ی.ك: سەرۆکم ئایا مەبەستتان ئەوەیە، ئەوان لە بەندیخانەکاندا گەوهەری کادیران لە بەرخودانی ڕاستەقینە خالی دەکەنەوە و هیواکانیان بە چەند مانایەکی پەتی وەك مافی مرۆڤەوە گرێ دەدەن. مەبەستتان ئەمەیە؟

س.پ: ئەمە زۆر ئاساییە. قەناعەت پێنەکردنی ئەوانەی کە بە ڕەمزی بەرخۆدان دادەنرێن بە شتی بچوکی وەك خواردن و خواردنەوە و دەست بەرداركردنیان لە بەرخودان و هەزار جار دوورکەوتنەوەیان، خیانەتە بۆ خۆیان.

ی.ك: چۆن بەم خێراییە تێبینی ئەم مەسەلەیەتان کرد؟

س.پ: بۆچی ئەوە تێناگەم. من ڕاستی مرۆڤ هەر بە ڕوانینە چاوەکانی بۆ یەك دەقە دەزانم. بەڵام ئەوانە یەك چرکە بەس بوو بۆ ناسینیان. ئەوەی کە بکەوێتە بەر چاودێری من، ناتوانێ هیچم لێبشارێتەوە.

ی.ك: باشه. بەڵام ئەنجامەکان چی بوون؟

س.پ: ئەنجامەکان بەلای منەوە بایەخێکی زۆریان نییە، بەڵام باش و سەرکەوتوو بوون. لە هەموو ئەوانەش گرنگتر تێکۆشانە. لێرەدا پرنسیپەکە مەسەلەی بە دوواداگەڕانە و هەر ئەویش شەڕ دەکات. ژیانی هیچ و پووچانە پەسەند نییە و شایانی نە شەهیدان و نە کەسانی خاوەن بەرخۆدانە. ئەگەر بتەوێ ڕێزی خۆت بگری، پێویستە ڕێزی کەسایەتیە خۆگرەکەت بگری. لەوانەیە ئەزموونی برسێتی بچی و بێپارە بمێنیتەوە و ڕەنگە کەسیش گوێت پێنەدات. بەڵام وێڕای ئەوە پێویستە خۆت سووك نەکەی و خۆ نەدەیتە دەست ئافرەتێك و نەبیتە ئامرازێك بە دەستی ڕژێمەوە، بەڵکو دەبێ کەرامەتی خۆت بپارێزی چونکە لێیان دای و سووکایەتییان پێکردی و تۆش خۆگریت کرد و مەزن بووی و پێویستە مەزنایەتی بپارێزی. ئەمە چەمکی کۆنفرانسی بەندیخانەیە و توانیمان لە ڕێگایەوە پارێزگاری کەرامەتی بەرخۆدان و پاڵەوانانی بەرخۆدان بکەین و ئەمەش زۆر گرنگە. وەك گوتم لایەنی مەبدەئی زۆر گرنگ.

هەڵوێستی سەرسەختانەم بەرانبەر بە ڕەفتاری هەڤاڵانی بەندیخانە وا ناگەیەنێ کە من بارودۆخیان فەرامۆش دەکەم و، لەوەوە سەرچاوە ناگرێ کە من هەوڵدەدەم گوێڕایەڵی و ڕێزگرتنی خۆمیان بەسەردا بسەپێنم یان من لەم ڕووەوە نیگەرانم. بەڵکو لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە دەوڵەت پیلانێکی پەنامەکی چەپەڵی ئامادە دەکرد. لەوانەبوو لە کاتی سەرگرتنی ئەو کۆمەڵکوژییە ڕەزاگرانەدا لە ئەنجامەکانی خۆیشی تێبەرێنێ. ئەوان زانیبێتیان یان نا هەڵوێستێکی ڕیفۆرمیستانەیان دیاری کرد و بوونە ئامرازی ئەم پیلانە. واتە لە بەر بەلاهەڵوەشان و بارودۆخێك لە ئارادا بوو لە پیلانی ئیمپریالیانە دەچوو کە چی پێخۆش بێ ئەوە بۆ گەلان دەکات و ئەمجا بە بەهانەی داکۆکی کردنەوە لە مافی مرۆڤ دەیخاتە بەرچاودێری خۆی. من تا ئەو ڕادەیە دەبەنگ نیم ئەم کارە قبووڵ بکەم. واتە من مەبەستم ئەوانەیە کە داوای پاراستنی مافی مرۆڤ دەکەن و هەر خۆشیان ئەم مافانە پێشێل دەکەن. دوژمن تا دوا هەناسە ئەوانە سەرکوت دەکات. پاشان هەوڵ دەدات بە هێندێك ڕەفتاری نەرم و نیان بە خۆیان بگرێ و ڕایانبکێشێتە نێو باوەشی خۆی. کێ بوو هەڵدەخەڵەتێ؟ ڕژێم تێدەکۆشێ بە دابین کردنی هێندێك هەلومەرجی حەوانەوە ئەوانە بکڕێ. ئەو شۆڕشگێڕە لە کوێیە کە ئەوە قبووڵ دەکات؟ ئەگەر هەموو ئەمانە قبووڵ بکەین ژیانێکی پڕ سووکایەتی دەژین. وانییە؟ ئەوانەی کە لە تورکیا بەوەیان نەزانی، بوون بە ئامراز بە دەستی ڕژێمەوە و خۆیانیان هاویشتە باوەشی و ئەمەش کێشەکەیانە. بەڵام من خۆم لەکەدار ناکەم، چونکە ئەم بەرخۆدانانە ناوی هەڤاڵان «مەزلووم و کەمال و خەیری» و ناوی منیشیان بەکار هێنا. ئەوانە ڕاسپێرییەکیان لەلام هەیە و ناتوانم ناویان پیس بکەم. لێرەدا ژمارە و ناو گرنگ نین، بەڵکو ئەنجام گرنگە. ئەوانە کەڵەمێری مەزنی بەرخۆدانن. پێویستە بەڕەهایی ڕێز لە بیرەوەرییان بنێین.

بەڵام تاکەکەتان لە تورکیا هەموو ئەمانەیان خستەلاوە. من تێیان دەگەم و دەبێ ئەوانیش لە ڕادەی هەڵوەشانی کەسایەتییان و بوونیان بە فاشی شارستانی تێبگەن. هێندێك شت هەن قووت نادرێن. ئەگەر یەکێك زللەیەکی پێدا کێشای، تۆ بۆ چل ساڵ ئەوەت لەبیر ناچێتەوە. لە کاتێکدا ئەوانە کێشەکەیان یەك زللە نییە، بەڵکو لێشاوێك ئەشکەنجەدان و سووکایەتی پێکردن و هەوڵی لەنێوبردنیانە. دەبێ باش دەرك بەمە بکەن. من ڕۆژانە بەو هەڤاڵانە دەڵێم: من لە ژیانمدا یەك کەرەت بە ئەفسەرێك و چوار سەربازەوە بۆ ماوەی نیو دەقە ئەشکەنجەیان دام. پەندم لەوە وەرگرت و جارێکی دیکە نەچوومەوە بەندیخانە و خۆمم نەخستە ئەو بارودۆخەوە. گوتم: هەتا ئەگەر ئەوە وای پێویست کرد ڕێکخراوێك بنیات بنێم، ئەوا بنیاتی دەنێم. ئەگەر کارەکەم وای پێویست کرد خۆ سازبکەم و زەمینە بۆ ئەم پرۆسەیە خۆش بکەم، ئەوا دەیکەم. ئەگەر ڕووخاندنی بەندیخانەیشی بەسەریاندا پێویست بوو، ئەوە دەبێ بیڕووخێنم. ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە بە خۆمم داوە.

ی.ك: لای ئێمەش دەڵێن: «جارێکی دیکە لەوێوە ڕەت نابم». بەڵام خەبات بەجێدەهێڵن.

م.پ: ئەمە سووکایەتییە بۆ مرۆڤایەتی. تۆ دووچاری هەموو شێوە سووکایەتی و ئەشکەنجەدانێك دەبی و پاشان ڕازی دەبی لە سایەی ئەو ڕژێمەدا بژیت! پێویستە لەوانە بپرسین: «ئێوە چ جۆرە مرۆڤێکن!». ئێوە پرسیاری هێزەکانتان لێ کردم. پێدەچێ حەز بکەن جۆری ئەو مرۆڤە بناسن کە ئێش بۆ خولقاندنی دەکەین. ڕەخنە گەورەکانمان هەموویان لە پێناوی ئەم مەبەستەدا بوون و هەر قسە نەبوون. کردەوەکانیشمان ڕەخنەگرتنن. جارێکیان گوتم: «ئێوە ڕەخنەی تیۆری پەرە پێدەدەن و منیش بە سەر واقیعدا جێبەجێی دەکەم و بەشێوەیەکی سەیر قووڵی دەکەمەوە».

ئەم هەموو هەوڵانە لە پێناوی دۆزینەوەی ڕابەردووی ون یا خولقاندنی تازەی داواکراون. باوەڕم وایە کە ئێمە بۆمان چووەسەر هێندێك شتی داواکراو بدۆزینەوە. دەتوانن ڕواڵەتی کورد بە شێوە دیاری بکەن، بەڵام گەوهەرەکەی سۆشیالیستییە. من پەلپ لەوە دەگرم تاکە کەسێك خۆی مەزن بکات و ئەم مەزن کردنەش لە کۆمەڵگاکەیدا ڕەنگ پێبداتەوە. ئێمە نکووڵی لە تاکە کەس ناکەین، بەڵام بە پێی هەم ئەو دەورە باشە کە لە کۆمەڵگادا دەیگێڕێت و هەم ڕادەی بەستراوەیی بەم دەورەوە هەڵیدەسەنگێنین. دەبێ وریای ئەو کەسانە بین کە دەورێکی تێکدەرانە لە چواردەوری خۆیاندا دەبینن. ئەوەبوو داواکارانی پاراستنی ژینگە لە ئەورووپا دەرکەوتن و دەڵێن پێویستە ڕێك بخەین و وا و وا بکەین بۆ پاراستنی ژینگە. بەڵام دەم لە بەرپرسی یەکەمی ئەم تێکدانە کە ئیمپریالیزمە هەڵناهێننەوە. سەرباری ئەم قسە و قسەڵۆکانەیان لە سایەی ئەو ڕژێمانەدا دەژین و دووڕوون. ژینگە پارێزان خۆیان دەخەڵەتێنن. ئەوان پیس بوون و زیانەکانی

دەبینن.

ئەو ڕژێمە پشت گوێ دەخەن کە ئەم تێکدانە دەکات. هەروەها ڕادەی لەبەر یەکهەڵوەشانی ئەخلاقی تاکەکەس دەبینن و، هیچ ڕێ و شوێنێك بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردە نالەبارە دانانێن و لافی ئەوە لێدەدەن کە مرۆڤدۆستن. ئەمە سیاسەتێکی دووڕووانەیە. ئاڕاستەیەکیش بۆ زیندەخۆری لە ئاستی وڵاتاندا هەیە، وەك کۆمەڵگای ئەڵمانی کە زیندەخۆرە و «هیتلەر» ویستی بۆ ئەم مەبەستە پەل بهاوێژێ. بارودۆخەکە لە یەکەم شەڕی جیهانیدا وا بوو. ئینگلیز و فەڕەنسییەکانیش بەم پێیەن. ئەوانە گەلانی بچووك قووت دەدەن و لافی شارستانی بوون و جوانی لێدەدەن ... هتد. دەبێ ئەو دەورە تێکدەرانەیە بناسینەوە کە ئەم دەوڵەتانە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا گێڕاویان و ئەوە بەرچاو بخەین. دەکرێت بە شێوەیەکی زانستی ئەوانە بکۆڵدرێنەوە و ورد بکرێنەوە و ئەو دەورەی کە هەرلایەك بینیویەتی بناسرێتەوە. مەبەستم ئەوەیە دەوری ئەڵمانەکان و ئینگلیز و دەوری ئەمەریکایی و ڕووسەکان چی بوو؟ یا دەوری هەریەکەیان ببینین. بۆچی لەسەر ئەم بنچینەیە وردیان نەکەینەوە؟

ی.ك: من دێمە پاڵتان. بەڵام زانست ئەوە نییە کە ئێوە باسی دەکەن. واتە زانستی ئەمڕۆ ڕێ بە ئەنجامدانی ئەم جۆرە توێژینەوەیە نادات، چونکە ئەو دووڕووانە ـ واتە ئەڵمانیاییەکان ـ مرۆڤایەتی و گەلانیان بە پێی «زانست» خۆش دەوێ. وەك گوتتان ئەوانە بەهۆی زیندەخۆرییانەوە لە قووتدانی گەلانی بچووکدا بەم قۆناخە گەیشتن. ئەمە لە زانستی ئەمڕۆدا نییە. بەڵام ئەگەر دەتانەوێ زانستێکی تازە دابمەزرێنن، ئەمەیان مەسەلەیەکی دیکەیە.

س.پ: ڕاستە. تۆ مەبەستت ئەوەیە زانست لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا لە خزمەتی ئیمپریالیزم و مۆنۆپۆلەکاندایە.

ی.ك: بێگومان. من پێداگرم لەسەر ئەمە. زانست لەم ناوچەیەدا سەرلەنوێ لە دایك دەبێ.

س.پ: زانست دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و مێژووییە. زانستی ئەمڕۆ لە نێو دەستی دڕندەکاندایە و بە شێوەیەکی زۆر خراپ بەکاری دەهێنن. دەبێ زانست لە دەستیان دەربهێنرێت. من و تۆ بۆ یەکەم جارە باسی ڕزگارکردنی زانست دەکەین.

ی.ك: من دێمە پاڵتان. ئەوەندەی ژیان لەم ناوچەیەدا دەبووژێتەوە، زانست دەگەڕێتەوە لای.

س.پ: لەبەر ئەمە داکۆکی لە زانست و سەربەخۆیی دەکەم. واتە ئێمە تەنیا داوای سەربەخۆیی نیشتمانی و ئازادی کۆمەڵایەتی ناکەین، بەڵکو داوای سەربەخۆیی ئایدیۆلۆژی و زانستیش دەکەین. لێتان ناشارمەوە، ئەورووپا بەربەرچم دەداتەوە و پێم تەنگەتاوە، چونکە من لەبەردەم باڵادەستییان و خۆگرێدانم پێیانەوە داخراوم. ئەمە دەوڵەتانی کۆلۆنیالیش دەگرێتەوە، لەبەرئەوەی من لەبەردەم سیاسەتە بنچینەییەکانیاندا داخراوم. هەڵوێستم بەرامبەریان بەم پێیەیە:

«ئەگەر تەنیا بمێنمەوە و هەرچەندە تووشی هەلومەرجێکی سەخت ببم، هەر بە کەرامەتی سەربەخۆییمەوە گرێدراو دەبم».
ئەمە سوێندی منە بۆ ئەوان. من مەزنی و حەوانەوە و کەرامەتم لەوەدا دەبینم کە خۆم لە خۆبەگەورەزانینیان بپارێزم هەر وەك مرۆڤێکی سەرەتایی بمێنمەوە. ڕەنگە هێندێك دژواری لە ئارادا بن. لەوانەیە ببمە نیوە شێت. بەڵام من کەرامەتم لەم مەسەلەیەدا دەبینم.

ی.ك: ڕاستە. ئەگەر لەگەڵیاندا یەك نەگری، بە پێی تێگەیشتنی ئەوان دەبی بە شێت. ئاراسموس گوزارەیەکی جوانی هەیە تێیدا دەڵێت: «پێم باشترە لە باتی یەككەوتن لەگەڵیاندا ،، پاساکانی خۆمەوە شێت ببم». ئەگەر گوێیان لەم باس و خواسانەمان ببێ، پێیان سەیرە، لە کاتێکدا چەند بەهایەکی جیهانی لێرەوە دەژیێنەوە.
س.پ: لێرەدا دێینە سەر پرسیارەکەتان کە لەو کەسایەتیەی تێدادەپرسن کەوا هەوڵدەدەین بیخەینەڕوو و ئەو بنچینە فەلسەفەییانەش کە پشتیان پێدەبەستین. لەوەمان لە حاڵی واقیعی کوردستانەوە ڕوون کردەوە و چەند هێڵێکمان بۆ لێكجوێ کردنەوە دانا. ئێمە کوردستان بەو ناوچەیە لە قەڵەم دەدەین کە مرۆڤایەتی لە هەر ناوچەیەکی دیکە زیاتر بەهای مرۆدۆستانەیی تێدا لە دەست داوە. لە بارەی ئەم ناوچەیەوە دەڵێین لانکەی مرۆڤایەتی‌یە. لام وایە لەو ناوچەیەی کە مرۆڤایەتی زیاتر بەها باڵاکانی خۆی تێدا لە دەست دەدا، هەمان ناوچەیە کە لەوانەیە مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی ترسناك بەها باڵاکانی تێدا بە دەست بهێنێتەوە. واتە برینی دەستەپاچەیی چەندە قووڵ بێ، پاڵەوانەتی بێوێنە دەبێ. ئێمە ئێستاکە لە ژێرراوە تا ئەوپەڕ دەست پێدەکەین. ژێرڕا کوردستانە و سەرکەوتن لەوێوە دەست پێدەکات. ئەگەر سەرکەوتنیش ڕوو لەوپەڕ بێ ئەمەیان شتێکی مەزنە.
ی.ك: بەڵێ، هەر ئەوە نا کە کوردستان ژێرڕایە، بەڵکو دەست پێکردنی ئەم سەرکەوتنە لە قۆناغی هەرەس هێنانی سۆشیالیزمی بنیات نراودا بایەخێکی گەورە بە سەرکەوتنی شۆڕشی کوردستان دەبەخشێ کە ئومێدی ئەوانە دەژیێنێتەوە کەوا گۆڕانی بۆ سۆشیالیزمی ڕاستەقینە دەڵێن. ئەمە لایەنێکی زۆر گرنگە، لەبەر ئەوە نا کە مرۆڤی کورد گەلێك تووشی سەرکوتکردن هاتووە، بەڵکو هەمان کات لەبەر ئەوە کە مرۆڤایەتی دوو شۆڕشی مەزنی بە خۆوە دیوە. یەکەمیان شۆڕشی فەرەنسەیە کە تێکشکا و دووەمیش شۆڕشی ئۆکتۆبەرە. هێندێکیان شۆڕشی کوردستان بە شتێکی بچووك دەبینن. بەڵام ئەو سەرکەوتنەی کە لە کوردستاندا بەدی هات هاوزەمانی هەرەس هێنانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بوو. وانی‌یە؟
س.پ: لەوە حاڵی دەبم. گرنگ نی‌یە ئەوە بە نیازی خراپ یان باش هەڵسەنگێندرێت. ئەوەتا کوردستان ئەو گۆڕەپانەیە کە مرۆڤایەتی پتر لە هەر گۆڕەپانێکی دیکە بەهاکانی خۆی تێدا لە دەست داوە. مەبەستم ئەوەیە ئێمە ناتوانین باسی ڕیفۆرمێکی دیاری کراو یا نیوە چارەسەر یا ئارایشتدانێکی سادە

یا پینەکردنی باروودۆخی کوردستان بکەین. ئەمە ڕۆشنە. نموونەیەکی دیکەت دەدەمێ. ئەگەر بیناکە لە بناغەوە لەرزۆك بێ، تۆ پێت ناکرێ لە نهۆمی سێیەم یا چوارەمەوە دەست بە چاککردن بکەی، چونکە بارەکە کەلەکە بووە و نموونە و نەخشەیەکی خراپیش هەیە. جا پاش لابردنی بارەکە، پێویستیمان بە بەرد و خشتی تازە و هەم بە نەخشە کێشانێکی تازە دەبێ تا بیناکە تەواو ببێ.

ی.ك: ئەمجا ڕێم بدە بڵێم: «بەرنامەی ئۆتۆنۆمی بۆ ڕۆشنبیری کوردی» کە باسیان کرد ڕەتکراوەیە، هەر لەبەرهۆی عەمەلی یا سیاسی نا، بەڵکو لەبەر هۆی فەلسەفیش. واتە ئێوە لە بنچینەوە پەلپی لێدەگرن و هۆی فەلسەفی دەخەنەڕوو چونکە ئەوە ناکرێت...

س.پ: ئەگەر دەوڵەت سەربەخۆییشمان بداتێ، هەر لە بەجێهێنانی ئامانجەکانمەوە دوورە. ئێمە گرێی «دەوڵەتی کوردی» یا «ئۆتۆنۆمی بۆ ڕۆشنبیری کوردی» یا چارەسەری لەم چەشنەمان نییە.

ی.ك: سەرۆکم من ئەمە تێدەگەم. بەڵام ئەو خاڵە کە لێی‌دەدوێم ئەمەیە: «بیناکە هەر لە بناغەوە تووشی لەبەر یەکهەڵوەشان بووە». من لەمەش بە ئەنجام دێنم: مادامێکی ئێوە ئاوا بیردەکەنەوە، کەواتە پەلپ گرتنتان لە سەربەخۆیی ڕۆشنبیری لەبەر هۆی سیاسی و عەمەلی نییە بەڵکو بە تێگەیشتنی فەلسەفییە، چونکە ناکرێت شتێکی لە بناغەوە گەندەڵ بوو بە ئۆتۆنۆمی چاك بکرێت، یان بە چاکردنی لایەك لەلایەکانی. ئایا مەبەستتان ئەمەیە؟

س.پ: ئێمە مەسەلەکە بە سادەیی شی‌ناکەینەوە. وەك سەرنج دەدەن ئێمە باسی ڕزگاری تەواوی مرۆڤایەتی و کۆمەڵگا دەکەین. بەڵام دوورایییەکانی ئەوە بە دەوڵەت و ڕۆشنبیریشەوە زۆر گرنگ نین. من بە زۆر دروشم لە خشتەنابرێم، وەك «خۆزگە خاوەنی دەوڵەت بووینایە»و «دەوڵەت هەموو شتێکە لە ژیانماندا» کە خەڵکانی دیکە دەیانڵێن و دەیانپەرستن، چونکە ئەم بیرکردنەوەیە لە بیرکردنەوەی خێڵەکی کۆن دەچێ. دەوڵەتێکت هەیە، هەستە سەرتی پێدابکێشە. من بەخێلی پێوان نابەم و ئەو شتانە بە مەزن نازانم کە بەرچاویان دەخەن و خۆم گیرۆدەی ئەم جۆرە شتانە ناکەم. من چەند بەهایەکم هەن لە دەوڵەت باڵاترن و من بە دوای پێکهاتەی لە دەوڵەت جوانتردا دەگەڕێم. ئەم دەوڵەتە چییە کە لێی‌دەدوێن؟ سایبەتەی ئاستێکی کۆمەڵایەتی دەست نیشانکراوە و دووبارە بوونەوەی پەیوەندییە ناوەکییەکانە. خۆ کۆمەڵگا گەندەڵ بووە و دەوڵەتیش هەزار ئەوەندەی ئەو گەندەڵ بووە. کۆمەڵگا ناتوانێ هەناسە بدات و دەوڵەتیش لە لێواری ئوقم بووندایە. هیچ شتێك نییە مایەی شانازی بێ. دەوڵەتێکی بەم شێوەیە شایانی سووکایەتی پێکردنە و هیچ لایەنێکی تێدا نییە پێویست بە گەورەکردن بکات. وەك ئەوەی بڵێین ئەو هەموو شتێکە لە ژیانماندا و ....هتد.

خۆزگە مرۆڤی تورك لەم ڕووەوە لە باروودۆخی خۆی تێدەگەیشت، با کەمیش بێ. دەوڵەتی تورکیا وەك دەروزەکەر دەڕوانێتە دەستان و چاوتەزێری دەکات.

جارێکیان بە چەپ و جارێکیان بە ڕاستی دەدرەوشێن. مرۆڤی تورك تا ئەو ڕادەیە داماوە کە هەموو ئەوانە نابینێ. ئێمە بە دوای دەوڵەتێکی ئەم چەشنەدا ڕاناکەین.
جا چۆن باسی سەربەخۆیی ڕۆشنبیری کورد دەکەین؟ کوا ڕۆشنبیری کورد و چۆنە؟ پێم وایە هەتا ئەوانەش کە ئەم قسەیە دەکەن لێی تێناگەن و لە مانای ڕۆشنبیری حاڵی نابن و لام وانییە لە هێز و خەباتی سیاسی تێبگەن. وەك سەرنج دەدەن من لە مەسەلە ڕیشەییەکان دەدوێم. دیارە لایەنی فەلسەفییش هەیە. هەرچی لایەنی عەمەلییە زۆر قووڵە. من مرۆڤێکی عەمەلیم. لەبەرئەوەی عەمەلیشم ئەو کێشانەی کە دەستیان بۆ دەبەم تێکەڵبوون. هەموو ئەم سیفەتانە لە مرۆڤی کوردا بەرجەستە دەبن. ئەگەر ئەوە لە مرۆڤی تورکدا تاقی بکەمەوە، ئەوانەیە زیاتر هەڵوێستە بکەم. بەڵام ئەمە شتێکی تایبەت بە تورکەکانە. دەتوانم هەمان کار لەگەڵ ئەڵمانەکاندا بکەم. ئەگەر بچوومایە بۆ ئەوێ و ماوەیەکی کورت لە نێویاندا بژیامایە، دەمتوانی بیانجووڵێنم. جێبەجێکردنی ئەم هەڵسانگاندنە بەسەر هەلومەرجی ئەڵمانیادا زەحمەت نییە. بەڵام ئێستاکە ناوەندی کوردی زیاتر لەبارە بۆ ئەوە و پێویستی پێیە. گەل لێرە لە خەڵکانی دیکە سۆزمەند ترە، بۆیە دەتوانێ سەرنجڕاکێشترین شێوەی خەبات ئەنجام بدات چونکە زیاتر دووچاری زۆرداری و دەستدرێژی بووە. لەبەرئەوە دەبێ لێرەوە ئەرکەکانمان ڕاپەڕێنین، چونکە ئەوە پتر سەرکەوتنمان پێدەبەخشێ.

## بابەتی خۆشەویستی بەلای منەوە هۆی شەڕە و ئامانجی شەڕیش خۆشەویستییە.

ی.ك: بەڵێ ئەوە ڕەنگ دەداتەوە، ڕاستی مرۆڤ لە دوو مەیداندا دەکەوێتە ڕوو: مەیدانی خۆشەویستی و مەیدانی شەڕ. من زۆر بایەخ بە شەڕ نادەم، چونکە نرخی بنیاتنانی مرۆڤایەتی لە شەڕدا مردنە. ئەگەر هەڤاڵە بریندارەکەت بە شان هەڵگرت، تۆیش دەمری. ئەوە لە شتی دیکە ناچێ. گۆڕانکاری گەورەی مرۆڤ لە شەڕدا ڕوودەدات. ئەمەم لە قسەکەتدا بینی. باسی خۆشەویستیشمان کرد.
س.پ: هێشتا لە دوو بابەتی بنچینەییدا لە ئیشان پێکەوە دووری. بەلای منەوە بابەتی خۆشەویستی هۆی شەڕە و ئامانجی شەڕیش خۆشەویستییە.
ی.ك: جوانە. لەو بارەیاندا ناچنە بەهەشت، چونکە بەهەشت شەڕی تێدا نییە. خۆشەویستی و شەڕتان بەلاوە وەك یەك وایە.
س.پ: ڕاستە. بەڵام وەك یەکێك هەڵسەنگێنن کە خۆشەویستی دەستی لێوەشاندبێ.
ی.ك: نەخێر.
س.پ: من بە ڕواڵەت مرۆڤێکی سۆزمەندم و لە خەڵکان کەمتر شەڕدەکەم و کەمتریش خۆشەویستیم هەیە. من لە غەریزە شاراوەکان دەدوێم.

ی.ك: بەڵام لەوە دەچێ تۆ مرۆڤێکی تینووی خۆشەویستی بی.

س.پ: من زیاتر لەوەی کە تینووی خۆشەویستیم، من بەرگریکەری مەزن و تێکۆشەری نموونەیی ئەوم. لەوانەیە خۆشەویست یا خۆشەویستی لە چەمکی ئێستایدا گەورەترین سووکایەتی بێ، چونکە خۆشەویستی تا رادەیەکی زۆر لە مانای راستەقینەی خۆی لایداوە. ئەویش لەبەر ئەوەی هێزی و هەرچەی رەزاقورسەکان کاریان تێ کردووە و پێی‌ناوەتە بازرەنجێکەوە ناتوانێ خۆی بناسێنێ و داکۆکی لە خۆی بکات. من تێدەکۆشم بۆ راستکردنەوەی ئەم مەسەلەیە، کادیرێك و شەرکەرێکیش بم و هیچ پەرۆشییەکم بۆ گەیشتن بە خۆشەویستی نییە. من لەم بابەتەدا سنووری خۆم دەزانم و باش کەسایەتیم هەڵدەسووڕێنم. من لەم شەڕەدا بە زۆری کادیرم و هێندێکیان ئەوە نابینن. خۆزگە جوانی ئەو ژیانەتان بدیبایە کە ئامانجمان دروستکردنیەتی. ئەوسا لەو مرۆڤە حاڵی دەبوون کە لە ڕێگای ئەم بزووتنەوەیە دەستی بەم شەڕە کردووە و ئەمەش لەو هۆیە بنچینەییەیە کە شەڕ بەم شێوەیە لە پێناویدا پەرەی سەندووە. دەروو کەرەوەکانی جوانی بنچینەمن و من لە هەموو کارێکدا کە دەیکەم بە شوێن چڵەپۆپەی جوانیدا دەگەڕێم.

ی.ك: بێ‌گومان. بابەتەکە پێوەندی بە شێلگیرییەوە هەیە و گرنگییەکی بایەخ بە خۆدانە، لەو مرۆڤەی کە دەڵێت: «من پەرووم بە جوانی دەچێ» و «دەڵێم بە جوانی دروێنە دەکرد» و «گەڵام بە جوانی کۆدەکردەوە»، من دەڵێم مرۆڤێکی شێلگیرە و لە منداڵییەوە بایەخی بەخۆی داوە. بایەخ بەخۆدانی مرۆڤ شتێکی گرنگە. کە دەچنە جێگایەك و مرۆڤ لە یەکەم چاوپێکەوتنەوە پەسندتان دەکات، ئەوە شتێکی ئەوپەڕی گرنگە. جا لەم تووختە نیگایەوە، کارێکی ئاسانە مرۆڤ عەبدوڵڵا ئۆجەلان وەك سەرکردەیەك قبووڵ بکات. لە دیدارەکەی پێشوودا هەوڵمدا ئەوە بخەمەڕوو. وەختێك منداڵ بووی، منداڵانی دەوروپشت پەردەیان لەسەر ئەم هەستانە لادەدا؟ لایەنی دووەمیش ئەمەیە: ئایا هاوڕێکانت لە زانکۆ ڕاستەوخۆ قبووڵیان دەکردی؟ لە کاتێکدا زەحمەتە لەو کەسانەی کە تەمەنیان لێك نزیکە سەرکردایەتی یەکتر قبووڵ بکەن.

س.پ: بێ‌گومان پەسندکراو بووم. «موحەمەد ئاکسۆی»ی مامۆستامان کە مامۆستای دەرسی دەستوور بوو لە دەرسێکیدا گوتی: «یەك گەل لە تورکیادا هەیە، نیشتمانەکەی یەکپارچەیە جوێ ناکرێتەوە». لەو کاتەدا وەڵامم دایەوە: «نەخێر تورکیا لە دوو نەتەوە پێکدێت و نیشتمانیش دوو نیشتمانە». ئەم هەڵوێستەم چەپڵەیەکی توندی بە نسیب بوو. ئەمە لە کاتێکدا کە هەموو قوتابیانی پۆلەکە کوڕانی گەورە ئەفسەران و پارێزگاران و بەرزکراوەکان بوون و خۆشیان دەویستم و تا ئێستاش زۆربەیان ماون. مەسەلەکە بریتی بوو لە درکاندنی قسەیەکی جوان.

ی.ك: جاروبار لەوەتەم دەبێ بە لووتی ئەو قوتابیانەوە کە هاوقوتابی خوێندنت

بوون و هێندێکیان لەگەڵ ئێمەدا لە زانکۆ وەک مامۆستا ئیش دەکەن و جاروبار باسی دەکەین. یەکێک هەیە...

س.پ: بەڵێ، برادەری نزیکی من بوو. ئەگەر پاشگەز نەبوونەتەوە باشە.

ی.ک: پەیوەندیمان باشە.

س.پ: خراپ نییە، ئێستا بزووتنەوەکەمان هەمان کات بزووتنەوەی لە یەکدانی جوانییە. ئەگەر ئەم هەموو مەسەلانە لەگەڵ یەکدیدا کۆبکەینەوە، ئەو دەمە دەبینی کە من هەر شۆڕشگێڕێکی سیاسی نیم. ئەگەر لە هەر کوێیەکەوە بتەوێ تێم بڕوانی، ئەوسا دەبینی پەیوەندی مرۆڤی جوانم و ئەم مرۆڤەش پەیوەندی بە کردەوە و کورد و جوگرافیاوە هەیە و پاشەڕۆژ لەم بابەتەدا کرول دەبەمەوە.

ی.ک: من ئێستاکە دەست بە بەختیاری لایەکی دیکە دەکەم، لەبەرئەوەی کە سالانی ١٩٨٧ـ١٩٨٨ بەدواوە پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK» و عەبدوڵڵا ئۆجەلان و بابەتیانم ناسی و بەو پێیە هێندێک مەلۆریست و هەنگاوی داواکراوم دیاری کرد. بەڵام من تا ئێستا ناسنامە و کەسایەتییەکتان تێدا دەبینم کە چوارچێوەی سیاسی تێدەپەڕێنن.

س.پ: بە دڵنیاییەوە. سیاسەت بێئەندازە هاتووەتە نێو ژیانم و دوورایی سیاسیشم لەلا زۆر چڕوپڕە. وەک لەم ئاخاوتنەمدا دەرمخست، ژیانم زۆر لەوە تێدەپەڕێنێ.

ی.ک: بەڵێ سەرکردەی ئازیزم. ئایا باسی جوگرافیا و میزوپۆتامیا و دەوروبەری بکەین، یان ڕاستەوخۆ بێینە سەر پارتی کرێکارانی کوردستان؟ میراتی ئەو شارستانەتیە سەبارەت بە ئێمە چی بوو؟ بارەکە پێش (١٥ یا ١٠) هەزارساڵ لە ئێستا چی بوو؟ ئایا لەوێوە دەست پێبکەین و وەک مرۆڤی ئەو ناوچەیە بیربکەینەوە؟ لە ئاخاوتنەکەتدا باسی ئەوەت کرد کە تۆ لە کۆنە گوندێکی ئەرمەنی خوێندت. ئایا لە میزۆپۆتامیاوە بڕوانینە ئەو ناوچەیە؟ یان بڕوانینە ئێران و تورک و کورد؟ یان درێژە بە باسی پارتی کرێکارانی کوردستان بدەین؟ چونکە ئەم هەموو خاڵانە لە بەرنامەکەمدان. ئایا لە «PKK»ەوە دەست پێ بکەین؟

س.پ: هەموو ئەو خاڵانە کە باست کردن پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) دەردەبڕن و، حەز دەکەم ئەوە ڕوون بکەمەوە کە.ئەگەر گوتمان: «بەرنامەی سیاسی و سیاسەتی ڕێکخستنی ئاوایە و چالاکییەکانی و پێکهاتنی حیزبی ئاوایە»، ئەو قسەیە لەم چوارچێوەیەدا ناسنامەیەکی بەرتەسکی حیزب دەردەبڕێ و قبووڵی ناکەم بەم شێوەیە لە حیزب بدوێین. بە کورتی(PKK) جوگرافیا و مێژووی مرۆڤایەتییە و شوێنەواری مێژوویی و شوان و تروێکی چیاو ئەستێرەی ئاسمانە. مەبەستم(PKK) زمانێکی یەکپارچە دەخوێنێ. ئێستا هەموان دەزانن کە پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) دەستی کردووە بە تێپەڕاندنی ئەوەی کە حیزبێکی سیاسی یا تەنانەت بزووتنەوەیەکی ڕزگاری نیشانی بێ. لەبەر ئەم هۆیە ناتوانن

بە ئاسانی پێناسەی پارتی کرێکارانی کوردستان(PKK) بکەن. سەبارەت بەم بابەتە گەلێك نیشانەی پرسیار و تێکەڵ و پێکەڵ کردن لە عەقلی هەمووانا هەن. هەتا بێگانان و هاوڵێشتمانانی تورکیاش عەقڵیان شێوێندراوە. کاتێك باسی مێژووی ئامیاو کوردستان دەکەین، گەلێك بەهای مرۆڤدۆستانەمان بیردەکەوێتەوە. ڕەوتی مرۆڤایەتی لە مێژووی ئامیا بەلای منەوە شتێکی زۆر پیرۆزە. جا کە هێندێك بەڵگەم بێنی، بابەتێکی گەورەم بەوەدا، وەك هەستی هەڤالبەندی لە داستانی «گلگامێش»دا و ڕووداوی کەشتی نووح «خوا لێی ڕازی بێ»و شوێنەوارەکانی نەمروود و دۆڵی فورات. هەموو ئەمانە زۆر گرنگن.

ی.ك: بۆ نموونە، زێدی لە دایك بوونتان سەر بە ویلایەتی «ئوورفە»یە.

س.پ: بەڵێ، شوێنەوارەکانی ئیبراهیم خەلیل لە ئوورفەن و زۆر گرنگن. ئاوی دیاربەکر و قەلای «خۆشاب» لە وان و کڵێسەی «ئەقدامار»یش گرنگن. هەر کاتێك کڵێسەی ئەرمەنەکان دەبینم، مەزنی ئەو خەڵکانەم بیردەکەوێتەوە. شوێنەواری دیکە هەن بە کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە. پێم دەکرێت زۆر نموونە لە سەر ئەوە بدەم. بە قەناعەتی من باڵندەکانی کوردستانیش بەش بە خۆیان ڕۆشنبیرییەکی جیاکراوەن. تا ئێستاش وێنەی ئەو گژوگیایانەم لە خەیاڵمدا پاراستووە. کێڵگەکانمان بەروبوومێکی زۆروزەبەندی وەك هی ئەورووپا بە دەستەوە نادەن، بەڵام من تا ڕادەی پەرستن گرێدراویانم. ژیانم لە گژوگیای ئەو کێڵگانەدا بەدیکرد و هێشتا عاشقیم و وەك چۆن ناوی خۆم دەزانم ئاواش دەزانم هەریەکەیان لە کوێ دەڕوێن. گرێدران بە سروشت و مێژووەوە زۆر گرنگە. بە پێی باوەڕی من مرۆڤایەتی پشت ئەستوور بە بەروبوومی سروشت کە پاشتر ناسی پەرەی سەند. من هەموو ئەمانە وا دەبینم کۆمەڵە هێڵێکی مرۆڤایەتی بن و بێ پێچوپەنا لە یەك چوارچێوەدا بن.

ڕۆشنبیری چەندەها گەل لەم ناوچەیەدایە. ئەوە وەڕەزم دەکات کە ڕۆشنبیری ئەم هەموو گەلانە بە هی یەك گەل دابنێین. تورکان دێن و وەك دەستبڕ تالانی دەکەن و دەڵێن: «ئەمە بۆ ئێمەیە». عەرەب دێت و پێیەپێ دەڵێن: «ئەمە بۆ ئێمەیە». ئەمە تێڕوانینێکی نەتەوەیی بەرتەسکە. بۆیە پێویستە لە ڕووی چەمکی نەتەوەیی بەرتەسکی ئەم ناوچەیەدا ڕابوەستین و بە کەمی بگرین. دەبێ پێیان بگوترێت: «ئەوە چی دەکەن» ئەم جۆرە تەنگەتاوکردنانە هەتا لە سەردەمی پێغەمبەریشدا نەبوون. دەکرێت ڕەخنە ئاراستەی هێندێك لەو قوتابخانە بکرێت کە ئاینە ئاسمانییەکان پێیاندا ڕەت بوون. بەڵام سەرەڕای ئەوە دەبێ گشت ئاینەکان پیرۆز رابگیرێن و ڕێزیان لێبگیرێت. ئەم تێڕوانینە نەتەوەییە و ئەم خۆرئاوایی بوونە لە پای چی؟ بە بچووك گرتنی بەها مێژوویییەکان و زەوتکردنیان، لە ڕێگای نۆکەران و خزمەتکارانی خۆرئاواوە نەبێ ناکرێت. هەموو ئەمانە لەگەڵ چەمکەکانمدا جووت نایێنەوە. با بڕوانینە ئێران کە لافی ئیسلامی سەربەرگر لێدەدات. لە ڕاستیدا و بەڕای من جۆرێکە لە نەتەوەپەرستی و ئەمڕۆ دەبەوێ بە

دینی بورژوازی نەتەوەییەوە خۆ دەربخات و بۆ ئەوە ڕووپۆشی ئیسلامی بەکاردەهێنن. هەموو ئەمانە قۆڕیان بە سەر خەسڵەتەکانی نە شۆڕشی ئیسلامی و نە دەرکەوتنی شۆڕشگێڕانەوە نییە. لەبەر ئەم هۆیە پشت بە نەتەوەپەرستی دەبەستن. عەرەب هەر ئەوەندە لە پرنسیپە ئیسلامییەکان تێدەگەن کە لەگەڵ نەتەوەپەرستییەکەیاندا دەگونجێ. هەرچی تورکیشە، ئەوە ئیسلام ئاینێکی نەتەوەیی تورکی پێتییە.

ی.ك: ئاپۆی برام من پێم وایە چەمکی کەمالیزم بۆ مێژوو و نەتەوایەتی کە تورکان لەبەر ڕۆشناییدا پەروەردە بوون و ئارادەیەکیش کاری کردووەتە سەر کورد، بووەتە کۆسپێك لە ڕووی ئاسینی گەلانی ناوچەکەدا کە کێشاویەتیەوە بۆ گەلێك ناتەواوی و هەڵەی زل زل. کەمترین شتێك کە لەبارەی ئێرانەوە بیزانین - بە باوەڕی من - ئەوەیە کە ئێران دوو خەسڵەتی هەن: یەکەم - شارستانێتییە و. دووەم - دەوڵەتێکی پەلهاوێژە و پتر لە تورکیا سەرمایەدارییە. سەرباری ئەوە تورکان متمانەیان بە خۆیان نییە، بەلام ئێران زیاد لە پێویست متمانەی بە خۆی هەیە. تورکان لەم دوایییەدا کەوتنە بایەخدان بەم خاڵە، پاش ئەوەی پشت گوێیان خستبوو. ڕۆشنبیرانی کوردیش ڕۆشنبیری تورکی کاری تێکردوون. هەرچی ئێرانە بستەباڵا بووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێ بە بچووك تەماشای بکەین. چونکە لە ٢٥٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە ڕۆشنبیرییەکی گەورە و ئیمپریالی هەیە. وەك گوتتان ئەو ئیسلام وەك ئامرازێکی پەلهاویشتن دەخاتەکار، لە کاتێکدا ئیسلام تاکو ئێستا لە تورکیاشدا هێشتا ئامرازێکی پەلهاویشتنە. کە سۆڤێت هەرەسی هێنا، تورکیا ویستی لە سایەی ئیسلامدا ڕوو بە ئاسیای ناوەڕاست پەل بهاوێژێ. بەڵام ئێران شارەزاییەکی زیاتری لەو ناوچەیەدا هەبوو و گەیشتە «تاجیکستان - کازاخستان - ئازەربایجان - ئەفغانستان» و هەتا گەیشتە ئەرمەن. ئەوانەی وا لە کوردستان ناوی «حزب الله»یان بە سەر خۆیاندا بڕیوە هەر ئامرازێکی پەلهاویشتنی ئێرانن لەو ناوەدا.

س.پ: بەڵێ..حالیم. ئەوانە هەر لە سەرەتاوە ئیسلامیان وەك ئایدیۆلۆژییەك بۆ پەلهاویشتنی ئیمپریالی خۆیان بە دەستەوە گرت. تورکان هەزار ساڵە بە ناوی ئایدۆلۆژی ئیسلامەوە درێژە بە داکشانی خۆیان دەدەن. ئێرانییەکان و عەرەبیش ئیسلامیان بەکارهێنا.

ی.ك: ئەمە سەبارەت بە ئێران ڕاستە. لە پێش زاینەوە هێزێکی ئیمپریالی بووە. ئێمە کە بە ئایدیۆلۆژی کەمالیزم پەروەردەبووین، هەمیشە لەبەردەم خۆرئاوادا خۆمانمان بە بستەباڵا هاتووەتە بەرچاو.

س.پ: تۆ ناچارم دەکەی بڵێم: تورکەکان بوونە نەتەوە، بەڵام ئاسۆیان زۆر تەنگەبەر بوو و لە شۆڤێنیزمی خێڵەکی دەچێ. کەمالیزمیش چوارچێوەکەی لەوە تەنگەبەرترە. بێناوەڕۆکە و هیچ دوورایییەکی میللی نییە و تێگەیشتنی لە نەتەوە بە ئاستەم لە شۆڤێنیزمی خێڵەکی تێدەپەڕێنێ. هەر لەم دەستپێکەوە چۆن دەتوانێ

بەم شۆڤێنیزمە و بەم بنیاتەوە کە لە خۆی بەدەر کەسی دی نابینێ، لە ئێران و ئەوروپا تێ بگات.
ی.ك: منیش مەبەستم ئەمە بوو. ئێران هێزێکی پەلهاوێژە لەم ناوچەیەدا. پێویستە وریای ئەوە بین.

## ئەگەر میللەتێکی تورك هەبێ ڕزگار بکرێت، ئەوە دەتوانێ ڕزگار بێت و پێش بکەوێت بە مەرجێك لە کەمالیزم ڕزگار بکرێت.

س.پ: تورکیاو ئێران دوو دەوڵەتی پەلهاوێژن. دەبێ هەموو مرۆڤێك بە چاوپۆشین لە نیشتمان و گرێدرانی نەتەوەیی خۆی بەرهەڵستی کاری پەلهاوێشتن بکات و بزانێ چۆن بەرانبەر بەوە بەرخۆدان دەکات. ئەمە قەناعەتی منە. بەڵام بیری نەتەوەپەرستی تورکی بەرتەسك مرۆڤی تورکی بە شێوەیەکی جەرگبڕ سەرگەردان کرد و لە نەزانییەکی بەربڵاودا بە جێیهێشت و سەرقاڵی کۆمەڵێك مەسەلەی بێبایەخی کرد. لە ئەنجامی ئەمەدا چووە نێو شەڕ و شۆڕێکەوە کە بەلایەوە گرنگ نین و بەوە مەرگ و نەهامەتی بە سەرخۆیدا هێنا. ئەمە لە بیرتەسکی توێژە حوکمدارەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. حوکمداری تورك بە شێوەیەکی بێوێنە گەلەکەی خۆی سەرکوت کردووە و مێژووی تورکیش لەم ڕووەوە یەکجار بەد و چەواشەکراوە.
ی.ك: دوا نموونەت لە سەر ئەمە دەدەمێ. گەیشتووینەتە پلەیەك ئەو کۆمارە تورکییانەی کە لە سۆڤێت هەڵبراون، وەختێك پێیاندەڵێین ئێمە ڕزگارتان دەکەین باوەڕمان پێناکەن. بەهۆی ئەوەوە هەرگیز تورکیایان خۆش ناوێ.
س.پ: وێنەی بڵاوی تورك زۆر دزێوە. بۆیە کەس تورکی خۆش ناوێ، تەنانەت ئەو کۆمارانەش تورکیایان پێقبووڵ نییە.
ی.ك: کۆنگرەی کۆمارە تورکییەکان لە ئەنقەرە کرا. گوتیان لە ئاستی ناوچەکەدا چلەپۆپە بوو. بەڵام ئامادەبووەکان گوتیان نا.... گوتیان بازاڕێکی هاوبەش و واو وا.... بەڵام کەس پێی ڕازی نەبوو، ئەو کابرا سەرەتاییە نەبێ کە «شیبی»ی پێ دەڵێن.
س.پ: ئێمە لێرە باس لە کەمالیزم تێدەگەین. هێندێك ناکۆکی لە کۆمەڵگای تورکیدا پەرەیان سەندووە. ئەوی ڕاستی بێ ناکۆکییەك لە نێوان لوتکە و بنکە و نێوان کۆمەڵگا و سیاسەت و ڕاستی سوپا و نەتەوەدا هەیە. چەند ناکۆکییەکی شێلگیر هەن پەرەدەستێنن. پێویستە مرۆڤ دەست بخاتە سەر ویژدانی خۆی و هەوڵبدات بە ڕاستی لەم ناکۆکیانە حاڵی ببێ. پێویستە بە وردی لە ڕووی کەسایەتییەوە لە کەمال بکۆڵدرێتەوە و، ئەگەر چی دەوری سەرکردایەتی لە پێناوی بنیاتنانی دەوڵەتدا بینی. بەڵام بە پێی قەناعەتی من. لە بری

سەرکردایەتی کردن کۆنترۆڵ و زەوتکاری کرد. لەم لایەنەوە هەوڵەکانی کازم قەرەبەکر لە هی ئەو گەورەتره، وێڕای ئەوەی کە دەور و کۆششەکانی ڕەئووف ئۆربای و عەلی فوئاد جەبسوی کەم نەبوون، بەڵام ئەوانە کەوتنە حاڵی نەبوون. ئەم کابرایە وەك لاسایکەرەوەیەك هات و ئەوانەی بەکارهێنا و هەوڵەکانیانی زەوت کرد و خۆی کرد بە پیاوی یەکەم و ڕۆیشت. ئەمە هەڵسەنگاندنێکی ڕاستە. ئەم شێوە قەبە و گەورەکردنەی کەمالیزم ناچێتە قوڕگی خزمەتکردنی نەتەوەی تورکەوە. من ئەوە ناڵێم هەر بۆ ئەوەی کەمالیزم بە بچووك بگرم و ڕیسوای بکەم، بەڵکو بۆ ئەوەی بۆتانی ڕوون بکەمەوە کە ئێوە بە کەمالیزم بوون بە بستەباڵا. ئەوەی لە ئارادایە تورك لە ڕێگای کەمالیزمەوە خۆی دەکات بە بستەباڵا. مرۆڤێکی لەم شێوەیە تا ئەم قەوارەیە قەبە دەبێ و پاشان باسی مەزنی مرۆڤی تورك دەکات! ئەمە ناکۆکییەکی گەورەیە. بە زانێکی تەواوەوە ئەم ناکۆکیە وەلابنێن، مرۆڤی تورك هیچی لێبەسەر نایەت. ئەگەر میللەتێکی تورك هەبێ ڕزگار بکرێت، ئەوە دەتوانێ ڕزگار بێت و پێش بکەوێت بە مەرجێك لە کەمالیزم ڕزگار بکرێت. سەبارەت بەم بابەتە ڕووی ئاخاڤتنم دەکەمە پیاوانی زانست و نوسەران و نێومندە ڕۆشنبیری و پێیان دەڵێم «ئێوە کەسایەتی مرۆڤی تورکتان بستەباڵا کرد بەرامبەر بە قەبەکردنی کەمال».

ی.ك: کە گەیاندیانە پلەی خوا، خۆیان بوون بە کۆیلە.

س.پ: بەڵێ کردتانە خوا و بوون بە کۆیلە. لە دیموکراسی و توانایە شاراوەکان دوورکەوتنەوە. لەبەر ئەم هۆیە نەتانتوانی تەنانەت چینێکی سەرمایەداریش پێکبهێنن.

ی.ك: بە پێی تێگەیشتنی من و وەك ئەو نموونەیەمان لەسەر ئێران، چاوپلکەی وایان خستووەتە سەر چاوی خەڵك، ڕوانین دەشارێتەوە و چاو لێڵدەبێت و دنیا تاریك دادەنێن. واتە دنیات بە شێوەیەکی شێوێندراو پیشان دەدات.

س.پ: وەك گوتەکەی ئەتاتورك: «یەك تورك دنیا دەهێنێ». کەس دەسەڵاتی بە سەر بە جێهێنانی ئەم قسەیەدا ناشکێ. بەڵێ دەکرێت ئەم گوتەیە بۆ بەرزکردنەوەی وورەی تورك بڵێی و دەتوانی بە پێی هەمان تەرز بڵێی «من چەندە بەختیارم چونکە تورکم». بەڵام بڕوانە ئێمە، من هەڵوێستێکم بەرانبەر بە کورد هەیە و ڕێزی گەلی کورد دەگرم و پێتوەی گری دراوم. ئەمە لە ڕێگای کردەوە سەلمێندراوە. وێڕای ئەوە گەورەترین تۆمەت و ڕەخنەی ئاراستە دەکەم و هێشتاش ئەوە دەکەم و دەڵێم: پەسندکردنی ئەم زیانە سووکایەتییەکی گەورەیە و لێتان عەرامە بخۆن و بخۆنەوە و زیانتان پڕاوپڕی بە کەمگرتن و هیچ و پووچییە. ئەو گەلەش کە بە هەموو ئەمانە قایل دەبێ شایانی نەفرەتە. هیچ شتێك نییە شایانی شانازی پێوە کردن بێ. ئێستاکەش با بڕوانینە گوتەکەی مستەفا کەمال. تورکان لە باروودۆخێکی قورس و پڕسووکایەتیدان. سەرباری ئەوە دەڵێت: «من چەند بەختیارم...واو وا». ورەتان چەند بەم قسەیە بەرزدەبێتەوە و تا چ ڕادەیەك دەتوانن

دەست بە شەڕێکی ڕزگاریخواز بکەن؟ وەك لەواقیعدا دەبینن نەیانتوانیوە خۆ لە هیچ شتێك قوتار بکەن. ئێوە دەچنە ئەمریکا و لێی‌دەپارێنەوە و دەچنە ئەورووپا و ئەنادۆڵ دەفرۆشن و هەوڵێکی بێ‌پسانەوە دەدەن و بەناوی سیاسەتەوە تەنازولی ترسناك پێشکەش دەکەن، ئایا ئەمەیە ڕزگاربوون؟ ئایا ئەمە تورکان مەزنتر و مەزنتر دەکات؟

ی.ك: تێڕوانینی «PKK» بۆ میللەتی تورك لە هی بزاڤەکانی دیکەی ڕزگاری نیشتمانی و هەتا بزاڤە کوردیەکانی دیکەش جیاوازە. ئەوەی ڕاستی بێ ئەو بزاڤانە هیچ دوورێکیان نەماوە. ئەمە خاڵێکە ئێوە لەوان جوێ دەکاتەوە و زۆر گرنگە. لای «کەمال پاشا» زێدەڕۆیی‌یەکی زۆر بە میللەتی تورکەوە دەکرێت. ئەگەر وەکو زێدەڕۆییش قبوولی نەکەین، ڕازی بوونە بە واقیعی دامەزراو و ئەو مانی خەڵکی نەداوە بۆ گۆڕینی ئەم واقیعە. خاڵێك هەیە لای «PKK» تێبینیم کردووە و لە دادگاکان و کۆڕەکاندا گوتوومەتەوە: «عەبدوڵلا ئۆجەلانی سەرکردەی(PKK) دەیەوێ کورد بگۆڕێ و بەرزیان بکاتەوە. لەبەر ئەم هۆیە بەخەگیری ڕەخنە لێگرتنێکی توند دەبێ». ئەمە ئەو خاڵەیە کە لە کەسانی دی جوێتان دەکاتەوە و هەمیشە مایەی شانازی پێوەکردنە.

س.پ: ئەمە شێوازی بنچینەییمە و ناتوانم پەرەی پێبدەم یا بیگۆڕم. بەڵام دەبێ ڕەخنەی تورکی بە ڕێگایەکی ڕاست بێ. دەبێ ڕەخنەتان لە کەمال پاشا گەورەتر بێ. ئەمە نکوولی کردن لە کەمال یا تورکان ناگەیەنێ. ئەگەر تورك ویستی هەناسە بدات و واقیع بوێن بێ، پێویستە ڕەخنەی توندی لێبگیرێت. باسی ئێرانتان کرد، بەڵام هەر لە ئێراندا نا بەڵکو ئەگەر مرۆڤ ویستی قەرەی مرۆڤایەتی بکەوێ ئەوە ئەم قسەیە ڕاستە. با تێڕوانینی کەمال بۆ کورد وەربگرین. ئاخۆ «وەك کەر یا ئەسپ یا حوشتر یا مەڕ» لا لە کورد دەکاتەوە؟ ئەمە ڕوون نی‌یە، چونکە جۆری ئەو کۆلۆنیالیزمەی دیاری نەکردووە کە بەسەر کورددا جێبەجێی دەکات و دەبێ ئەمە هەر بە شۆڤێنیزمی ترسناك لێکبدەینەوە. تەنانەت نەیدەزانی چۆن کاروباری کورد هەڵبسووڕێنێ و بەڕێوە ببات. جڵەوی بۆ سوپایەکی دڕندە شل کرد تا سەرجەم شێوازەکانی شەڕی تایبەت بە ڕێگای «بکوژە و سەرببڕە» و بە بێ‌حیسێب بە جێبهێنن. هەموو ئەمانە تورکەکان بە کوێ دەگەیەنن؟

## «حزب الله» لافی ئیسلام لێدەدات،
## بەڵام هێزێکی هیچ و پووچی پشت هەموو تاوانێکی گەورە و چەپەڵە.

ی.ك: گەیشتینە قۆناخێك ئەگەر هەر سەرۆك دەوڵەتێك تیایدا گوتی: «کورد لە تورکیا هەن» چەپڵەیەکی توندی بە نسیب بوو و کورد و تورکیش چەپڵەیان بۆ لێدا. مانای وایە پێش ئەوە گەورەترین تاوان لە ئارادا بووە و لەبەرئەمە چەپڵە

لێدەدەن. ئەم سەرۆکە هیچ ناکات مایەی شانازی پێوەکردن بێ، بەڵکو هەر ڕاستییەکی پێ‌قبووڵە کە بە زۆر زەوت کرابوو. ئێمە کاتێك چەپلە لێدەدەین دەڵێین: «باشە و بۆ پێشەوە و ئەمە کرانەوەیەکی گەورەیە» وا نییە؟ توورگووت ئۆزاڵ نموونەیەکی ئەوە بوو.

س.پ: ئەوە بارودۆخێکە تەریقی و شەرم دەخوازێ. هەتا سوڵتانەکانی عوسمانیش لەم لایەنەوە لە سەرۆکەکانی کۆمار زیاتر وەزعێکی پڕ ڕێزیان هەبوو. خۆ سوڵتانەکان بە سوڵتان عەبدولحەمیدیشەوە وەك ئەوانە شاڵاویان نەبردە سەر زمان و ڕۆشنبیری و ژیانی کوردەواری. کەچی پاشاکان و سەرۆکەکانی کۆمار کوشتاریان دەرهەق بە ئێمە کرد. پێم وانییە گەلێك هەبێ ئەوەندەی کە گەلی کورد تووشی هاتووە، کوشتار و کەتلوعامی دەرهەق کرابێ و دووچاری ڕیشەکێش کردن بووبێ. نموونەی تورك لە تاوانەکانیدا لە هیتلەریش تێ‌دەپەڕێنێ. جا لەبەر ئەوەی کە جوولەکە کاریگەر بوون لە جیهاندا توانییان ناوی هیتلەر بزڕێنن. بەڵام ئەمە بۆ ئەرمەنەکان وا نەکەوتەوە، بۆیە نەیانتوانی بکەونە باسی تاڵاو چێشتنیان بە دەست تورکانەوە. هەروەها لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا قەکەرێك بە ناوی کوردەوە نەبوو، لەبەر ئەمە نەیانتوانی دەردەدڵی خۆیان بکەن. بۆیە من دنیا هەڵدەستێنم و دایناییشێنمەوە. باوەڕم وایە ئەم چەشنە تاوانە لە مێژوودا نەکراوە. ئەوان تێکدانی سەربازی و سیاسییان پێ بەس نییە، بەڵکو دەستی تێکدانیان دەگاتە خاسیەتە بنچینەییەکانی مرۆڤ. چ فەلسەفە و چ ئایینێك ئەمەی پێ‌قبووڵە؟ لە کاتێکدا دەبینین «ڕەفاه» و «حزب الله» و موسڵمانان تێکڕایان پێیان قبووڵە. حزب الله لافی ئیسلام لێدەدات، بەڵام هێزێکی هیچ و پووچی پشت هەموو تاوانێکی چەپەڵە. ڕەفاه ترسناکترین هێزی گڵاوە. هەر چی حیزبە بۆرژوازیەکانی دیکە و فەیلەسووفان و مامۆستایانی زانکۆ و حاجییانیش یەکێکیان لێ‌پەیدانابێ بڵێت: «تۆ گەمە بە بەها بنچینەیی و مرۆڤایەتییەکان دەکەی و سەرپێچی ڕێنوێنییەکانی ۱۲٤هەزار پێغەمبەر دەکەی. کوا ئیمان و ویژدانت؟ وە تۆ دژی فەلسەفەی ڕۆژئاوا کاردەکەیت، ئەی کوا مرۆڤایەتیت».

ی.ك: باشە سەرکردەی ئازیزم. با کەمێك باسی فەلسەفە بکەین. وانییە؟ لام وایە کەمال پاشا لە هەڤاڵان و دەست و پێوەندەکانی زیاتر پاشکەوتوو بوو و، لە ساڵی (۱۹۲۰)دا و لەبەر چەند هۆیەکی جۆراوجۆر کردیان بە سەرۆك. پاش ئەوە ـ واتە لە ساڵی(۱۹۲۵ـ۱۹۲٦) بەدواوە تا دەگات بە ساڵی ۱۹۳۰ ـ بنچینە سەرەکییەکانی کەمالیزمی بە شێوەیەکی کاتی دانا و کەوتە خۆ بۆ کۆکردنەوە و سڕینەوەی میللەتی کورد. لایەنی سەرنجڕاکێش ئەوەیە: توانی لای کورد خوێشی میللەتی کورد پەردەپۆش بکات.

پێم وایە کەمالیزم پێوەندییەکی جیاکراوەی بە «ئەرمەبیسك»ەوە هەبوو. مەبەستم لە «ئەرمەبیسك» ئەوەیە هەموو شتێك لە جیهانی هەرمەدا بە ڕووکەشی و قووڵ نەبوونەوە و ڕۆنەچوون بۆ بنج و بناوان جوێ دەکرێنەوە. کەمالیزم ئایدیۆلۆژی

«ئەرەبێسك» بە مانا فەلسەفی‌یەکەی. دەتوانین لە بارەی ڕووداوەکانی ئێستاوە بڵێین: «لێكترازانێکی مێژوویی»ە، چونکە کۆتایی دەوڵەتی کەمالی کە تووشی چەندین ڕاچڵەکینی گەورە بووە لەسەر دەستی میللەتی کورد دەبێ. من وەختێك دەڕوانمە پارتی کرێکارانی کوردستان بە سەرکردایەتی ئێوە، ئەم خەسڵەتانە دەبینم. وەك ڕوونتان کردەوە سەرکەوتن و دەرەوشانەوەی کورد خەریکە بڵاودەبنەوە. ئەگەر بڵاوبوونەوە، ئەوا ئاڵای مرۆڤایەتی بەرز دەکەنەوە. ئەمە لە لایەکەوە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە ئەوە وەك سەرەتای ڕووکردنە مرۆڤی ناوچەکە وا دەبێ. لە گۆشە نیگای تورکەوە پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) یەکەم هەڕەشەی بنچینەیی و شێلگیر بۆ قەوارەی حەفتا ساڵەی دەوڵەتی تورکیا دەنوێنێ. ئایا لەسەر ئەم بارودۆخە بڵێین «لێكترازانێکی مێژوویی»یە؟

س.پ: دەتوانین بڵێین سزای ئەو گوناح و تاوانانەیە کە دەوڵەتی تورکیا دژی کورد و گەلانی دیکە و هەتا گەلەکەی خۆیشی کردوونی.

ی.ك: ئێستاکە ئەم سزایە بە دەستی کورد جێبەجێ دەکرێت.

س.پ: هەوڵماندا ئەمە سزای گوناحە گەورەکان بێ، بەڵام بەس نی‌یە. خۆ کەمالیزم بە کردەوە جۆرێکە لە «ئەرەبێسك» و گڵاو و مەکرۆ و ڕووکەشی‌یە. گەمەیەکی تەکتیکی‌یە بۆ دەست بە سەر داگرتن و کۆنترۆڵ کردن. خاڵێکی دیکە هەیە دەمەوێ ڕوونی بکەمەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئیمپریالیزم، کەمالیزم و هاوبیرەکانی بە گونجاوترین ئامراز دەزانێ بۆ پاڵکێشانی دەسەڵاتی. گەلێك نووسەریش لە کاتی هەڵسەنگاندیاندا بەم شێوەیە دەیبینن. کەمالیزم وەك ڕژێمێك بە جیهاندا بڵاودەبێتەوە چونکە زۆر سوود بە ئیمپریالیزم دەگەیێنێ و دەزگایەکی لە باری نۆکەرایەتی‌یە.

ی.ك: واتە خۆ ڕەتکردنەوە و سیاسەتی باوی خاوەن دووڕوو؟

س.پ: بە دڵنیاییەوە. ڕژێمی کەمالی بنچینە مێژووییەکانی کۆمەڵگای خۆی دەشێوێنێ و ڕەتیان دەکاتەوە و دەرگا لە بەردەم خۆرئاوادا دەخاتە سەرپشت و دەچێتە نێو چەند پیلانێکی خیانەتکارانە و سەرپێچی دژ بەم گەلە. ئەمە چەك داماڵینی ئەم گەلە دەگەیێنێ لە بەرانبەر ئیمپریالیزمدا. هیچ ڕژێمێك لە جیهاندا نی‌یە گەلەکەی چەك کردبێ وەك ڕژێمی کەمالی کردوویەتی. ئەمە ئەو پشتیوانیە گەورەیە لێكدەداتەوە کە ئیمپریالیزم پێشکەشی کەمالیزمی دەکات. دەنا بۆچی هەموو ڕژێمەکان بە ڕژێمە پاشماوەکانی هەرەس هێنانی سۆشیالیزمی بنیات نراویشەوە پشتیوانی ڕژێمی کەمالی (١٢)ی ئەیلوولی کرد بۆ بەرەنگاربوونەوەمان؟ چونکە ئەو ڕژێمەیە کە بە تەواوی گەلەکەی چەك بەکات و لەبەر چاوی کاڵی خۆی پشتیوانی‌یان نەکردوە. لەبەرئەوەی ئەم تەرزە ڕژێمە تەرزی چەك کردنی گەلانە. بۆیە کەمالیزم ئەو ناوەیە کە دەتوانین لە باشترین نۆکەری ئەلقە لە گوێی بنێین کەوا داواکاری‌یەکانی ئیمپریالیزم بە تەواوی جێبەجێ دەکات. کاتێك کەمالیزم شی‌دەکەینەوە، پێویستە وا لای لێنەکەینەوە کە

ڕووداوێکی هەڵاوێردەی ناوچەیی‌یە تەنیا تورکان پێیەندی بوون. ئەم جۆرە ڕژێمە لە جیهاندا بڵاوبووەتەوە و لەم ڕۆژەماندا کۆڵەکە بنچینەییەکانی سیستەمی ئیمپریالی پێکدەهێنن.

ی.ك: باشە. لەو کتێبەمدا کە بە ناونیشانی «چەند تێزێك لەسەر ڕوشنبیران»ەوە دامناوە، لە دابونەریتی خۆرئاوا و ئەو نۆکەرایەتی‌یەی کە تورکان دەیکەن دوواوم. گوتوومە تورك ڕەگوڕیشەی نی‌یە. لەم پێوەدانگەوە دەتوانین بڵێین: ڕژێمە هاوشێوەکانی کەمالیزم سەرپاکیان ڕەگوڕیشەیان نی‌یە.

س.پ: ئەو ڕژێمەی کە باسی‌دەکەم هەر ئەوەندە بەس نی‌یە بڵێین بێ ڕەگوڕیشەیە. چونکە ئەرزێکە ڕەگوڕیشەی خەڵکانی دی هەڵدەکێشێ. ئەوە بوو لە خۆرهەڵاتدا کەوتە ڕیشەکێشکردنی ڕوشنبیری ئەنادۆڵ. ئەگەر ئەم ڕۆشنبیرییە بە ڕۆشنبیری‌یەکی جیهانی دابنێین، ئەوە ئەم ڕژێمە شادەماری مێژووی بڕیوە. ئەم کارە لە ئیمپریالیزم بەدەر، کەس کەڵکی لێوەرناگرێ. بۆ نموونە ئینگلیزەکان بە شێوەیەکی سەیر پاڵپشتی ئەم ڕژێمە دەکەن. چەند ڕۆژێك لەمەوبەر یونانی‌یەك لە پەرلەمانی ئەورووپادا ڕووی دەمی کردە یەکێك لەو ئینگلیزانەی کە بە سیفەتی سەرۆك و قسەکەر بە ناوی لەنجوومەنی ئەورووپاوە لەوێ بوو و گوتی: «کورد لە باشووری خۆرهەڵاتی تورکیادا ڕیشەکێش کراوە و تا ئێستاش ڕیشەکێش دەکرێت». دریژەی پێدا «کاکی وەزیر چی دەڵێی؟». کابرای ئینگلیز لەم قسەیە زیاتر دەرووبەکی نەدۆزییەوە: «بەڵێ پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) حیزبێکی تیرۆرکارە. شتێکی دیکە هەیە بیڵێی؟». کابرا داکۆکی لە کەمالیزم کرد و مافی تەنانەت ڕەخنەیەکی سادەیشی بەو نەدا. لەمە جێی‌تێگەیشتنە. خۆرئاوا بەرانبەر بەم خزمەتە پارچە ئێسکێك فڕێ دەداتە بەردەمی. سەرئەنجام ئەو ڕاستیانەی کە کەمێك لەمەوبەر باسمان کردن دەکەونەڕوو و بە شێوەیەکی بێ‌تەمومژ ڕوون دەبنەوە. دیارە هەموو ئەوانەی کە گوتمان پێوەندی‌یان بە ڕاستی مێژوویی و ئەو بەها مرۆڤایەتیانەوە نی‌یە کە لای گەلانی تورك زمان هەن.

ی.ك: لەوسا دەتوانین بڵێین: کۆماری تورکیا لە ساڵانی بیستدا دامەزرا. ئەو بەربەرەکانێیانە کامانە بوون کە بەرەو ڕووی بوونەوە. لافی ئەوە لێدەدەن کە ساڵی ۱۹٤٥ بەرەو ڕووی بەربەرەکانێی یەکێتی سۆڤێت بووەوە. بەڵام بە پێی ئەو کتێبانە کە هەمن و خوێندوومنەوە، ئەوە گەمەیەك بوو لە بنەڕەتدا بۆ پاڵ پێوەنانی ڕژێم بوو بۆ نێو باوەشی ئەمەریکا. هەروەها ئەو کودەتایەی کە لە ۲۷ی ئایاری (۱۹٦۰)دا ڕوویدا وەك خۆتازەکردنەوەی کەمالیزم وەها بوو. لە ساڵانی حەفتادا حیزبی ڕزگاری میللی تورکیا «THKP» وزەیەکی چەکدار بوو. بەڵام نەخشەی بۆ دەستگرتن بە سەر دەسەڵاتدا نە دەکێشا یا مەبەستی ڕژێم بە دەستەوە گرتن نەبوو. حیزبی ناوبراو دان بەم ڕاستی‌یەدا دەنێ. واتە هیچ بەربەرەکانێیەکی شێلگیری ڕژێم لە گۆڕێدا نەبوو. کەواتە ئەم حیزبە بۆ چی بوو؟ بە تێپەڕاندنی ئەو هەموو ڕووداو و گۆڕانکاریانە و بە باوەڕی من ئێستاکە پارتی کرێکارانی

کوردستان « PKK »مان هەیە، بوونی رژێم هەر لە کوردستانی کۆلۆنیدا ناهەژێنن، بەڵکو وەك سەرۆکی لەرکان دانی پێدانا ئەم حیزبە لە ئەزمیر و قۆنیە و بورسە و ئەستەمبوڵ دەنگدانەوەی دەبێ. ئەوان لەوە دەترسن، چونکە دوایی بە سیاسەتەکانیان دینێ. پێم وایە پێشکەوتووخوازەکان لە تورکیا ئەمە نابینن. وانییە؟

## دەوڵەت و داروودەستەکانی لە تورکیا
## ئادگار و جوێکەرەوەکانی گەلی تورکیان ون کرد.

س.پ: گومانی تێدا نییە کە بینینی سەرۆکی دەستەی لەرکان لە هەر کاتێکی رابردوو پتر راستی رەنگ پێدەداتەوە، پێم وانییە تورکیا تێروانینێکی پێشکەوتووخواز یا چەپڕەوی تێدابێ. من ئەم کەرتە وا هەڵدەسەنگێنم کە هەرە داخراوترین و کۆنە پارێزترینە و هەڵوێستی ئەوانیش هەڵوێستی راستڕەوەکانی سەلماند.

ی.ك: کاتێك دەڵێن داخراو من کەمالیزم بیردەکەوێتەوە و کاتێك دەڵێن: «چەپی داخراو» وا حالی دەبم کە ئەوان هێشتا کەمالین.

س.پ: بەڵێ زۆر داخراو و بێشێوە و خاوەن رایەکی خۆگونجێنن. جا لەبەر ئەوەی کە پارتی کرێکارانی کوردستان « PKK » بناغەکانی دەوڵەتی تورکیا دەخاتە لەرزە، کاریگەری هەر لە خۆرهەڵاتدا رەنگ ناداتەوە، بەڵکو بۆ خۆرئاوایش درێژدەبێتەوە. ئەوان هەر لە کوردی ئەوی نەترساون، بەڵکو لەوەش ترساون کە گەلی تورکیش بکەوێتە بەرخۆدان لە دژیان. ئەگەر گەلی تورکیا بوو بە پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەو دەمە دنیا دەگۆڕێت.

ی.ك: دەڵێن کاتێك گەلی تورك دەبێ بە پارتی کرێکارانی کوردستان « PKK ». ئایا مەبەستتان ئەوەیە کە گەلی تورك دەبێ بە شۆڕشگێڕ؟

س.پ: بێگومان. من مەبەستم ئەوە نییە ببنە ئەندام لە « PKK »دا، بەڵکو ببون بە تەرزی پارتی کرێکارانی کوردستان و بە شێوەیەکی تورکی. ئەوسا دنیا ئالوگۆڕ دەکات. لەوانەیە گەلی تورك چەندین توانایی هەبێ و بتوانێ بە رێکخستنی حیزبی خۆی بگات لە شێوەی پارتی کرێکارانی کوردستان « PKK »دا. ئەگەر گەلی کورد توانیبێتی بەم قۆناخە بگات، سەرباری لە بەر بەلاهەڵومشان و شوێنە ون بوونی بە رادەیێك کە پێی نەگوترێت گەل، لەوا گەلی تورك دەتوانێ زیاتر لەوە بکات، چونکە هێشتا هێندێك لە خەسڵەتە گرنگەکانی ماون و کێشەکەیشی لەوەدا پەنهانە کە کەسانی باڵ کێشاو بە سەر دەوڵەتی تورکیادا گەلیان لە رێگای خۆی لاداوە. ئەگەر گەلی تورك پێینایە قۆناغی چەك هەڵگرتن یا قۆناخێك تێیدا بتوانێ لەو باڵادەستانە بپێچێتەوە لەسەر ئەو گوناحانەی کە کردوویانە، لەوانەیە شۆڕشێکی گەورە لەوێوە دەست پێبکات و ئەو

دەبە گەلێك گۆڕانكاری گەورە ڕوو دەدەن. من لەوە تێدەگەم كە ئەم گەلە خەڵكانێكی نی‌یە بە ناوییەوە قسەبكەن. هەروەها تێ‌دەگەم كە قسەكەری خراپ و دیماگۆگیش هەن. دەوڵەتی توركیا و داروودەستەكانی ئادگار و جوێكەرەوەكانی گەلی توركیان لە دەستدا.

ی.ك: جۆری بوونەوە لە دەوڵەت نەریتێكە پێشكەوتووخوازەكان و چینی ڕۆشنبیران لە توركیا لی‌یانە و زەحمەتە لەوە بێن.

س.پ: ئێوە جۆرێك لە یەكپارچەیی میللەت و دەوڵەتتان هەیە. یەكپارچەیی دەوڵەتی نەتەوەیی و سوپا زۆر بەهێزە. بەڵام ئێمە نە باسی میللەت و نە باسی سوپا دەكەین و دەڵێین: ئێمە بە تەنیا گەلێكمان هەیە. بەڵام ئێوە بە پێچەوانەی ئەوەوەن. جا لەم گۆشەیەوە ناكرێت بیر لە ڕۆشنبیرێكی بێ دەوڵەت و سوپا بكرێتەوە.

ی.ك: با بگەینە خاڵێكی دەست نیشانكراو. لە توركیا بە شوێن حیزبێكی تازەدا دەگەڕێن. من لەو بەڵگەنامانەدا كە لە «ئۆزگور خەلق» و ڕۆژنامەكانی دیكەدا بڵاودەبنەوە، شت لەم بارەیەوە دەخوێنمەوە. لەو بەڵگەنامانە خاڵێكیان تێدابوو پەیوەندی‌یان بەم گفتوگۆیەمانەوە هەیە. من بە زۆر بووم بە مێژوونووس و دەبینم و دەنووسم توركیای ئەمڕۆ و پێش ئەویش حوكمی عوسمانی كەموكوڕی‌یەكی تێدابوو. ئەم كەموكوڕی‌یەش لە نەبوونی جووڵانەوەی میللی دیموكراتی شێلگیردا خۆ دەنوێنێ. خۆ كورد لە سەروبەندی دەوڵەتی عوسمانیدا چەندەها جووڵانەوەی ڕزگاری وەك جووڵانەوەی «بەدرخانیەكان»یان هەبوو سەرەڕای خەسڵەتە ئاینیەكانی. مەبەستم لەوەیە گەل با كەمیش بێ بەخۆكەوت و پەنای بردە بەر چەك بۆ بەرەنگاری ڕژێم. بەڵام توركیا شتێكی لەم چەشنەی تێدانەبوو. جا ئێمە لەبەر نەبوونی ئەم جووڵانەوانە، نموونەكانی «تازە حیكمەت و بەدرەدین» قەبەدەكەین. بەڵێ ئەوانە بەرهەڵستكاری ڕژێم بوون، بەڵام شایستەی ئەم هەموو گەورەكردن و پێداهەڵدانە نین.

س.پ: هێڵەكانی مێژووتان ڕۆشنن. خۆزگە دەتانتوانی بە شێوەیەكی ڕاست هەڵی‌بسەنگێنن. لە كاتێكدا پێویستە وریای ئەوە بین كە توركمان چینێكی لەعنەت لێكراو بوو و دووركەوتنەوەی بە سەردا بڕا. دەبێ ئەو «توركمان»انە لەسەر بنچینەیەكی چینایەتی شی‌بكرێنەوە، هەر لەو كاتەوەی كە لە پشتی باپیرە ئۆغووزەكانیان كەوتنەوە و لە ئاسیای ناوەڕاست هاتنەدەری و وەك داگیركەر گەیشتنە باڵكان و بەو ناوچانەدا وەربوون. لە ئەنجامی ئەوەوە، ئەو بنەچە توركەی كە خۆ لە توركماندا دەنوێنێ نەفرەتی لێ‌دەكرێت. پێویستە سەرنجی ئەمە بدەین. هەرچی ڕووداوی دووەمە، بەرەو دەوڵەت ڕۆیشتنی تورك كە كۆزمۆپۆلیتیكانە بوو و دەبێ تێبینی ئەم ڕاستیە بكەین.

ی.ك: من باوەڕم وایە كە كۆماری توركیا نوێنەرایەتی دەوڵەتی توركیا ناكات.

س.پ: پێویستە ئەوانە بترسن كە توندڕەوانە بانگەشەش بۆ میللەتی تورك

دەکەن. ئەگەر بە شوێنی بن و بنەچەی ئەوانەدا بگەڕێن، بۆتان دەردەکەوێ تورك نین. سەدان بەڵگەم لەسەر ئەمە لەلایە. ئەگەر سوراخی بنەچەی ئەو کەسە بکەن کە

دەڵێت: من نەتەوە پەرستێکی سەرپەرگری تورکم، بۆتان ساغ دەبێتەوە کە سەر بە گەلێکی دیکەی غەیرە تورکە. بڕوانە «زیا گوکالپ»، کەمالی‌یە و خاوەنی ئایدیۆلۆژی‌یەکی نەتەوەیی تورکی‌یە و خەڵکی «سالۆنیك»ە. ئینەنۆش بە بنەچە لە گەندەڵەکانی کوردە. بەم پێیە دەبینین سەرجەمیان بەم شێوەیە لە کەسانی گەندەڵی گەلانی دیکەن. بنەچەی زۆر لەوانەی کە حاڵی حازر نوێنەرایەتی میللەتی تورك دەکەن، دەچنەوە سەر بالکان و قەوقاز. تورکانی ئەنادۆڵیش دوا کۆمەڵن لەوانە. پێویستە ئەم ڕاستیە ببینین. مەبەستم ئەوەیە نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری سیفەتی کوزموپۆلیتیبیان هەیە. ئەگەر لەوانە وردبینەوە کە بانگەواز بۆ دەوڵەت دەکەن و بە زۆری وشەی نەتەوە دەردەبڕن. دەبینین بە پێی پێویست نیشتمان پەروەر نین.

ی.ك: ئەوانەی وا کۆمەڵەی «ئیتحاد و تەرەقی»یان بۆ لاوانی تورك «جان تورك» دامەزراند دووانیان کورد بوون و سێیەمیان چەرکەسی و چوارەمیان عەرەب بوو.

س.پ: ئەمە ڕاستە. واتە دەبێ هێندێك هەڵ لە مێژووی تورکدا وردبکەرینەوە. کەمالیش لە بنەڕەتدا ئایەخی هەموو ئەوانە و دووره‌گێکی بنەچە نە ناسراو بوو. بە کورتی دەمەوێ بڵێم ئێمە دەتوانین وەك چۆن کۆمەڵگای کوردی هەڵدەسەنگێنین، ئاواش کۆمەڵگای تورکی شی‌بکەینەوە. ئێوە ئەوەتان گەرەکە و لەم ڕێگایەدا کۆششی پڕ بەهاتان هەیە، بەڵام پێویستی بەوە هەیە بخرێتە نێو چوارچێوەیەکی سیاسی‌یەوە. واتە وەك باستان کرد لە شێوەی حیزبێکی شۆڕشگێڕی تورکیدا بێت. ئێمەش لەم لایەنەوە کۆششمان هەیە و دەمانەوێ گەلی تورك ناسنامە و تەرزێکی لە بەرخۆدان هەبن. بە تەنیا ئاقیکردنەوە و شیکردنەوەی ئەم بابەتە بەس نین. کەواتە ئەو تەرزە تورکی‌یە کامەیە کە هەوڵدەدەین بەدی بێنین؟ تورکی شایستەی مانەوە کامەیە و وەك دەیبینن خەسلەتە بنچینەییەکانی کامەن؟ ماهی‌یەتی پێوەندیشی بە شەڕەوە چی‌یە؟

ی.ك: من وای دەبینم مەیدانی گەورەی شەڕ هەیە، لەبەرئەوەی ناسنامەی تورکی وردە وردە ون دەبێ. تۆ ژیانی پڕ لە ناکۆکی خۆتم بۆ دەگێڕیتەوە و منیش وەك کەسێك کە لە کۆڕەکاندا زۆر قسە دەکات، دەبینم ئێمە لە خاڵێکداین میللەتی کوردی تێدا سەردەکەوێ و گەلی کورد بەرەبەرە ناسنامەی خۆی بە دەست دێنێ. هەرچی تورکیشە ناسنامەی خۆی لە دەست دەداو لە چاولێکەری زیاتر هیچ شتێکی تورکی نامێنێ. خۆ کەمال پاشا لاسایی فەرەنسییەکانی کردەوە و حوکمدارانی ئێستاش چاو لە هەموو شتێکی ئەمریکایی دەکەن. تەنانەت خەڵکە ئاساییەکەش هەموو شتێکیان تێدا لاسایی کردنەوەیە «ئافرەتان، شایی، گریان». ناسنامەی تورکی ڕووی لە ون بوون کردووە و زەمینە بۆ بڵاوبوونەوەی داوێن

پێی خۆش بووە. زۆربەی ئەوانەی کە باج بە دەوڵەت دەدەن ئافرەتی لەحەپسخانەکانن. کەسانی وەك «وەهبی قووچ و سابانچی» سەرباری ئەوەی کە گەورەترین دەوڵەمەندی تورکیان هیچ نرخێکیان نەماوە. ئەندامی کۆنترا لەم رۆژمانەدا نرخێکی گرانبەهای هەیە. بڕوانن ئەمە ناکۆکییەکی گەورەیە. من ئێستا وام لێهاتووە شەرم لەوە دەکەم کە خەڵکی تورکیام. ئێوە دەم لە «برایەتی» دەژەنن، کورد زۆر باڵادەکات و تورکیش بە قوڕدا دەچێ. ئیدی باسی چ برایەتییەك بکەین!.

س.پ: دیارە ناکرێت. برایەتی تەنیا لەسەر بنچینەی ئازادی دەکرێت. لەوانەیە لە شوێنی یەکتربڕینی هێڵەکانی سەرکەوتنی ئازادیدا پەدی بێت.

## لە بەریەك هەڵوەشانی دەوڵەتی تورکیا لە خۆرهەڵاتدا(*) بەختی زیندوو مانەوەی لە خۆرئاوادا پێلەدەست دەدات.

ی.ك: من ئەم مەسەلەیە بەم شێوەیە دەبینم: ئەو راگەیاندنەتان کە لە رۆژنامەی «ئۆزگوور گوندەم»دا بڵاوبووەوە بنچینەیی و زۆر گرنگە. پێویستە تورکان سوراخی چارەسەرێك بکەن. دەوڵەت رووبەڕووی کێشەیەکی گەورە بووەتەوە کە خۆی لە پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK»دا دەنوێنێ. ئەم حیزبە دەستی ناوەتە بینی دەوڵەت. قسەیەکی گرنگتان لەو ئاخاوتنەدا هەبوو لە دەفتەرەکەمدا تۆمارم کردووە. تێیدا دەڵێن: «شۆڕشی کوردستان لە لایەك و شۆڕشی تورکیا لە لا یەکی دیکە». ئەگەر هەڵەیەك لە قسەکەمدا هەیە، تکام وایە ڕاستی بکەنەوە. ئایا ڕاست لە بابەتەکە حاڵی بووم؟ لەمە وا دەگەیەنێ کە کودەتای ئەیلوول هات و شۆڕشی تورکیا دۆڕاندی. لە هەمان کاتدا ڕژێمی سۆڤێتی هەرەسی هێنا. ئەوسا دەسەڵاتدارانی تورکیا هەستیان کرد ئەوان تا رادەی خوایەتی بێ‌لەملاوئەولا بەهێزترینن و هەموو شتێکیان پێدەکرێت و توانیویانە لەو شۆڕشگێڕانە لە نێوبەن کە لێیان دەترسان و ڕێکخستنە چەپڕەوەکانیان پەرش و بڵاوکردەوە و خستیانە نێو بەندیخانە. هەر ڕاست لەم کاتەدا پارتی کرێکارانی کوردستان بە بەرچاویانەوە قوت بووەوە. ئەم حیزبە لە رووی مێژوویی و لە رووی تورکییەوە گرنگە. من وای دەبینم ئەوان مەست بووبوون، چونکە بە سەر شۆڕشگێڕەکانیاندا زاڵ بوون و ئەو پەیمانەش ئەوان تێیدا ئەندامن بە سەر سۆڤێتدا زاڵ بوو. بەو پێیە لە دەرەوە لە کۆمۆنیزم و لە ناوەوەش لە شۆڕشی تورکیا ڕزگار بوون، لە ناوەندی شادی دەوڵەمەندانی تورکدا بەم دەسکەوتە تا پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK» هات و بنچینەکانی دەوڵەتی تورکیای هەژاند. سەرەتا ناوی ئەو

---

(*) لێرەدا مەبەست لە رۆژهەڵات باکوری کوردستانە و لە رۆژئاواش تورکیایە

حیزبەیان نەدەبرد و دەیانگوت: ڕێکخستنی جوداخواز یا هەر شتێکی دیکەی لەم چەشنە لە بری ئەوەی کە بڵێن «PKK». بەرەبەرە فێری گوتنی ناوی ئەم حیزبە بوون. ئێستاش قسەکەرانی زمانحاڵی دەوڵەت بە شێوەیەکی ڕەسمی ناوی «PKK» دەڵێن. سەرباری ئەوەی پێشکەوتووخوازانی تورك ئەمە بەدی ناکەن و هێشتا تێڕوانینیان بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK» دەقاودەق کەمالیانەیە و بە گاڵتە جاڕییەوە دەڵێن: «بزووتنەوەی کورد چی سەوز دەکات؟». لێرەدا دەمەوێ ئەم پرسیارە بکەم: ئایا شۆڕشی کوردستان هەمان کات بە شۆڕشێکی تورکیایی دادەنێن؟ ئەمە بەو مانایە دەڵێن کە من لێی تێدەگەم، یان مەبەستتان پێ شتێکی دیکەیە؟ تکاکارم بفەرموون ئەم خاڵە ڕوون بکەنەوە.

س.پ: ئەو دەوڵەتەی تورکیا کە لە خۆرهەلات شکستی هێنا، لە خۆرئاواش هەر بەزی. لەبەر پەلقەلوەشانی دەوڵەتی تورکیا لە خۆرهەلاتدا، بەختی زیندوومانەوەی لە خۆرئاوادا پێ لەدەست دەدات. بابەتی باسەکە دوو گەلی زۆر تێکەبەربوون و ملیۆنەها پەیوەندی ڕۆژانەیان هەیە و شۆڕشی «PKK»ش لە خۆرهەلاتدا بە خێراییەکی زۆر لە خۆرئاوادا ڕەنگ دەداتەوە. ئێمە بەم مانایە ئەوەمان مەبەستە. بە هەمان شێوە دەکرێت چەندین چەمکی هاوشێوە بە دەست بێنین کە بە سەر سەرتاسەری ناوچەکەدا جێبەجێ دەبن. جا لەبەرئەوەی هەموو دەوڵەتێك کوردستان بە موڵکی خۆی لە قەڵەم دەدات و شۆڕشی کوردستانیش کە موڵکیانە دەبێتە شۆڕشی ئەوان، بۆیە من دەڵێم: «پەیوەندبوونیان بە کوردستان بەختەوەرم دەکات». با تا شۆڕش دەستی لێیان گیر دەبێ، ئەوان پەیوەندی بن.

ی.ك: زۆر جوانە! با پەیوەندی بن تا شۆڕش بنچینەکانیشیان دەهەژێنێ.

س.پ: هەموو حسێبکارییەکی بە کۆمەڵیان لەم مەسەلەیەدا تووشی نائومێدی دەبێ و هەڵوێستیان دژ بەم گوتەیەی خۆیان دەردەچێ: «ئامانەوێ پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) ببێ بە موڵکی ئێمە». پێش ئەوە دەیانگوت: «جوداخواز» و چەند پێیان بکرابایە فەرامۆشیان دەکرد. پاش ئەوە دەڵێن: «PKK» بۆ هەمووومانە. من لەم گۆشەنیگایەوە وای دەبینم کە پەیوەندبوونیان بە کوردستان شتێکی خراپ نییە. با کوردستان بە موڵکی خۆیان دابنێن. ئەوسا شۆڕشی کوردستانیش بە موڵکی خۆیان دادەنێن و بەوە شۆڕش دەخەنە نێو گەل و نیشتمانەکەیان. ئەمە پەرەسەندنێکی باشە. کوردستان بەم چەمکە لە دۆخێکی ئینتەرناسیونالی چڕوپڕدا دەژی. من لەمەدا مەبەستم تەنها ئەو دەوڵەتانە نییە کە کوردستانیان کردووە بە کۆلۆنی، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ئەڵمانییەکان لە تورك پتر پەیوەندی کوردستانن و ئەمەریکاییەکان و ئینگلیزەکان و فەرەنسییەکانیش لانی کەم هێندەی تورکیا کوردستان بە هی خۆیان دادەنێن. ئەمە چی دەگەیەنێ؟ سوپاسیان دەکەین کە بایەخمان پێ دەدەن، بەڵام با خۆیان بۆ شۆڕشی کوردستان و کاریگەرییەکانی ئامادەبکەن و با کێشەکانی دیکەیشی قبووڵ بکەن. لەم گۆشەیەوە زاراوەیەك هەیە مامۆستا ئیسماعیل بێشکچی گوتوویەتی، لە کاتێکدا لە بارەی

کوردستانەوە دەڵێت: «کوردستان کۆلۆنی‌یەکی نێودەوڵەتی‌یە» بە هەمان شێوە «شۆڕشەکەمان دەبێ بە شۆڕشێکی نێو دەوڵەتی». مادامێکی کوردستان کۆلۆنی‌یەکی نێودەوڵەتی‌یە و مادامێکی تا ئەم ڕادەیە گوێی خۆیانیان لە مرۆڤەکانی خەواندووە و خاکەکەی لە سەدداسەد (۱۰۰%) بە موڵکی خۆیان دادەنێن، ئەو دەمە شۆڕشی کوردستانیش شۆڕشیانە و دەبێتە موڵکی سەرلەبەری مرۆڤایەتی.

ی.ك: مەبەستتان ئەوەیە «با باش دەستمان پێوەبگرن و بۆ کوێ دەچن با لە گەڵیاندا بڕۆین» و وا دەڵێن؟

س.پ: مادامێکی ئەم نیشتمانە تا ئەم ڕادەیە بە موڵکی خۆیان حسێب دەکەن، پێویستە لەسەریان ئەو شۆڕشە کە دەکرێت بە موڵك و شۆڕشی خۆشیان بزانن، ئێمە لەمەدا هەست بە هیچ بێزاری‌یەك ناکەین.

ی.ك: بەڵێ دارشتەیەکی تازەیە. با جارێکی دیکە بێینەوە سەر تورکیا. ئەو دژواریانەی کە بەرەو ڕووی ڕژێمی تورکیا دەبنەوە و ئەو مەترسیەش کە چواردەوری گرتوون چۆن دەبینن؟

س.پ: ئەو مەترسیانەی کە بەرەو ڕووی ڕژێمی تورکیا بوونەتەوە زۆر ڕامەکێشن. تورکیا هەوڵدەدات درێژە بە پووش بە سەر کردنی مەسەلەکان بدات و ئەو تین‌وتوانەی نی‌یە ناکۆکیەکانی خۆی سەربخات. ئەو ئەگەر ئەم ناکۆکیانە سەربخات، گڕاڵکی شۆڕش ئاگر دەدات. تورگووت ئۆزال لەم بارەیەوە تێدەکۆشێ هێندێك دەست پێشخەری بکات، بەڵام ترسنۆك و دوودڵە و ئەو کەسایەتیەی نی‌یە.

ی.ك: باشە. ئایا دەتوانین وا بڕوانینە ناکۆکی نێوان ئۆزال و مەسعود یەلماز کە ناکۆکی نێوان ئەڵمانیا و ئەمریکایە.

س.پ: بەڵێ. دەتوانین تۆخنی ئەو هێڵانە بکەوین. دیارە ئەڵمانیایی بوونی مەسعود یەلماز و ئەمریکایی بوونی تورگوت ئۆزال ڕوون و ئاشکران. زەحمەت نی‌یە ئەوە بە ئەنجام بهێنین کە ناکۆکی‌یان لە ناکۆکی نێوان ئەڵمانیا و ئەمریکاوە سەرچاوە دەگرێ.

ی.ك: باشە سەرکردەی ئازیزم. ئەگەر حیزبی «ڕەفاە» و دڵخوازی کردنی لەگەڵ ئەڵمانیادا بخەینە پاڵ ئەم پەردە شانۆیە، ئەنجامەکانی ئەم پێوەندیە چ کاریك دەکەنە سەر ناوچەکە و ئەو ڕاستیانە چین کە پێوەندی‌یان بە ئەڵمانیاوە هەیە؟

س.پ: ئەوپەڕی ڕۆشنن. ئەڵمانیا دەیەوێ سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدمان بیر بهێنێتەوە و حیزبی «ڕەفاە»یش دەیەوێ نموونەیەك لە نموونەکانی سوڵتان عەبدولحەمید پەرە پێبدات. هاوپەیمانەتی ئەڵمانەکان و سوڵتان عەبدولحەمید یەکجار ڕۆشنە. ئەڵمانیا پەلهاویشتنێکی زۆر وردی بە جیهانی ئیسلامیدا هەیە و لەگەڵ هێندێك دەوڵەتی وەك ئێران و دەوڵەتانی عەرەبیدا لەم سیاسەتەیدا بەردەوامە و پێوەندی بە هێندێك دەوڵەتی ئیسلامی دیکەوە پەرە پێدەدات. ئەگەر ئێلتنیزیك

بوونەوەی تورکیا و ئەلمانیا لەبەرچاو بگرین، دەردەکەوێ حیزبی «ڕەفاە» داینەمۆی ئایدیۆلۆژی ئەم پەیوەندییەیە و حەزدەکات ببێتە یەکەم کارکرد بۆی. خوێندنی ئەربەکان لە ئەڵمانیا و پەیوەندیە ڕاستەوخۆکانی هاندەری ئەمەن. لەم دەستپێکەوە، ئەڵمانیایی بوونی حیزبی «ڕەفاە» لە قۆناخی عەبدولحەمید کەمتر نییە، بگرە پەیوەندیەکانی ئێستا زۆر پەرەسەندوترن و بە شێوەیەکی سەربەرگرانە گەشە دەکات. ئەڵمانیا دایەنی ئەم جۆرە ئیسلامەیە و ناکرێت بڵێین بە بێ هۆ پێبەندی «جەمالەدین قەبلان» و هاوچەشنەکانیەتی. ئەو زۆربەیان دەجوڵێنن. زۆر ڕێی تێدەچێ ئەڵمانیا پاش قۆناخی حیزبی نیشتمانی دایك بیر لە تەرزێکی لە شێوەی حیزبی ڕەفاە بکاتەوە. ئەگەر بیر لە چۆنیەتی پشتیوانی لێکردن و پەرەپێدانی تەرزی حیزبی نیشتمانی دایك «ANAP» لەلایەن ئەمریکاوە بکەینەوە، دەتوانین لەگەڵ پشتیوانی ئەڵمانیاو پاڵپشتکردنیدا لە حیزبی ڕەفاە «RP» بەراوردی بکەین. مەبەستەکە هەریەکە، ئەویش تازەکردنەوەی ڕژێمی تورکیایە بە پێی بەرژەوەندی هەر یەکەیان و زیاتر پاڵ پێوەنانیەتی بەرەو جوغزی دەسترۆیی‌یان. ئەگەر مەسعود نەبێ، ئەربەکان دێت. مەسعود یەلماز لانی کەم بەرواڵەت لیبرالی و شارستانی‌یە. هەرچی ئەربەکانە ئیسلامی ڕەنگە و ئەڵمانیا پشتیوانی‌یان لێدەکات. ئەم لایەنە گرنگە. لام وایە ئەڵمانیا کۆششی لەم چەشنەی هەیە.

ی.ك: لە ڕۆژنامەکاندا دەبینین «یالچین دۆغان و ئالتان ئۆیمەن» قەڵەم بە دەستی ئەڵمانیان لە ڕۆژنامەنووسیدا.

س.پ: هەر ئەوانە نا. پێویستە گوێی خۆمان لە گەشت و گەڕانە چەپەڵەکانی ئەربەکان نەخەوێنین، مەبەستم ئەوەیە ئەوانەیە تورکەکان لە ڕێگای ئەڵمانەکانەوە بیر لە پەلهاویشتن بکەنەوە. پێدەچێ بەشێکیان بیر لە پەلهاویشتن لە ڕێگای ئەمەریکاییەکان و ئینگلیزەکانەوە بکەنەوە. لەوانەشە دەمەقرە و ناکۆکی لە نێوانیاندا پەیدابێ.

ی.ك: باشە، ئایا ئەڵمانیا خۆی لە «حزب الله» بە دوور دەگرێ؟

س.پ: پێویستە بە شێوەیەکی جیاواز «حزب الله» هەڵسەنگێنین. تەوژمی ئیسلامی بە گشتی لە دەستی تورکاندایە. دەکرێت ئێران و عەرەبیش بخرێنە پاڵ ئەوانەی کە ئیسلام هەڵدەسوڕێنن. تورك ئیسلام وەکو ئامرازێك بۆ پەلهاویشتن دەخاتەکار. هەرچی ئێرانە بە مەزەبی شیعەگەرایی وەڵامی دایەوە و ئەو مەزهەبەی بە بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانیەوە گرێدا. واتە ئەوان ئیسلامیان کردە ئینتەرناسیۆنالی و بە ئیمپەریی ڕۆژگاریش دەیکەن بە تەوژمێکی ئیمپریالی. عەرەبیش مەزەبی سونی‌گەرایی‌یان پەرەپێدا و لە پێناوی پەلهاویشتنی خۆیاندا خستیانە گەڕ. بەڵام تورکەکان ئیسلامیان بە گشتی بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشتمانی خۆیان و لە ڕێگای سەقامگیرکردنی بنچینەکانی ڕژێمی دەوڵەتەکانیاندا خستەگەڕ. واتە لە ناوەوە و دەرەوەدا وەك چەکێکی بنچینەیی بەکاریان هێنا. دەنا ئەگەر ئیسلام نەبێ

چۆن دەتوانین بیر لە هاتنە ناوەوەی تورك بۆ بالكان و ئەنادۆڵ بكەینەوە؟
ئیسلامی تورك بە داگیركردن و توانەوەی گەلان و پەلهاویشتن جووت دەكرێتەوە.
ئەمە لە هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە ڕوون و بەردەوامە. ئەگەر باسی پەیوەندی كوردمان
بە ئیسلامەوە كرد. ناكرێت هەمان ڕێوشوێنی بەردەست خراو جێبەجێ بكرێن.
كورد قوربانی ئیسلامی عەجەم و تورك و عەرەب بووە. چونكە هەر یەكەیان
ئیسلامی بۆ فووتدانی ئەو بەكارهێناوە و ئیسلامێكی كوردی لە دایك نەبوو و
ئیسلام بە ڕەنگێكی نەتەوەیی كوردی نە نەخشێندرا. هێندێك ڕێبازی سۆفیەتی و
هێندێك مەزهەبیش هەبوون. بەڵام هیچ كاریگەریان نەكردە سەر مەسەلەی نەتەوایەتی.
خۆ سەعید نورسی و شێخ سەعید ڕێبازی تایبەتی سۆفیەتی جۆراوجۆری
خۆیانیان هەبوو. ڕێبازی نەقشبەندیش هەروەها. بەڵام هیچ یەكێك لەم مەزهەبانە
نەگەیشتە دووراییی نەتەوایەتی، چونكە هەموویان وەك كرێگرتەی ئیمپریالیزمی
ئیسلامی وابوون. ئیدریسی بەدلیسی پەیڕەوی ڕێبازی نەقشبەندی دەكرد و
نۆكەرێكی «یاووز» بوو. دواجار بارزانییەكانیش نەقشبەندین و گەورەترین
بنەماڵەی بەكرێگیراون.

دەوڵەتی توركیا لە قۆناغی (١٢)ی ئەیلوولدا گەلێك بارمەتی گەورە گەورەی بە
شێوەیەكی ڕاستەوخۆ پێشكەشی كەسانی خاوەن ڕێبازی سۆفیەتی كرد. ئەمەش
بەڵگەی ئەوەیە كە لە كوردستاندا ئایدیۆلۆژی كەمالی قبووڵ نەكرا. بە تایبەتی
بە هۆی بەرز هەڵكشانی پارتی كرێكارانی كوردستان «PKK»ەوە. بۆیە
بۆشاییەكی دەروونی گەورە پەیدا بوو. ئەوان تێبینی ئەم بۆشاییەیان كرد و
ویستیان بە شێوەیەكی ڕێكخراو لە ڕێگای پڕوپاگەندە كردنەوە بۆ ڕێبازە
سۆفیەتیەكان پڕی بكەنەوە. «عەبدولقادر ئاقسۆ»ی وەزیری ناوخۆ نەقشبەندییە و
ڕێبازی نەقشبەندیش بە باشی ڕێكخراوە. لەبەر ئەوە بایەخی ئەم ڕێبازەیان كرد
و بۆ پێشەوە پاڵیان پێوەنا. هەزاران و بگرە دەیان هەزار كەسیان بەم شێوەیە بۆ
ئەم ڕێبازانە ڕاكێشا. ئەمە لەو شێوازە كۆنە دەچێ كە موسڵمانەكان بەكاریان
دەهێنا، وەختێك پاش كوشتارەكان دەستیان بە سەر منداڵی دیان (مەسیحی)ەكاندا
دەگرت و دەیانبردنە قوتابخانەی سوپای ئینكیشاری و دەیانكردنە ئامرازی ملكەچ
بۆ خزمەت كردنی میللەتی تورك. بەو پێیە ئەوان منداڵانی كوردیشیان
بەكاردەهێنن و دەیانخەنە خزمەتی دەوڵەت. قەرەكۆتنی ئەم ڕێبازانە هەنگاوی
یەكەمی ڕوو بەخۆ تەرخانكردن بۆ خزمەتی دەوڵەت پێكدەهێنن واتە ئەوە
خولێكی ئامادەكردنی كادرانە. قوتابخانەكانی پێشنوێژ و خوتبەخوێن هەن كە
پێشتریش هەبوون. ڕێبازە سۆفیەتیەكانیش لەسەر ئەم بنچینەیە بنیات نراون.
سەرەڕای هەموو ئەوانە «حزب الله»یان دامەزراند. ئەم حیزبە بنكەیەكی لە لای
قوتابخانەكانی پێشنوێژ و خوتبەخوێن و لای كەسانی خاوەن ڕێبازی سۆفیەتی
هەیە. لە لایەكی دیكەوە، كاریگەری و بەرەسەندنی شۆڕشی ئێرانیش لە
ئارادابوون، لە كاتێكدا شۆڕشی ئێران پێویستی بە (حزب الله) بوو بۆ

فراوانکردنی چوارچێوەی دەسەڕۆیی خۆی لە نێو کوردستاندا. زۆر ڕێی تێدەچێ ئیستخباراتی تورکیا دزەی کردبێتە نێو ئەم جوڵانەوەیە بۆ هەڵسوڕانی چالاکییەکانی. کادیرانی ئەم حیزبە بە نیوەیی لە نێوان ئێران و تورکیادا دابەش بوون، هەتا لە نێو خۆشیاندا لەسەر هەندێك کاروبار لێكحالی دەبن و بە گوشاری ئێران یەکگرتوو بوون. قوتابخانەکانی پێش‌نوێژ و خوتبەخوێن و کەسانی خاوەن ڕێبازی سۆفیگەری بە ناوی (حزب الله)وە یەکیان گرتووە بۆ بەرەنگای(PKK) و کردوویانە بە نیشانەیەکی چالاکییەکانیان. بەڵام ئێران لە کاری ئەم ئیستخباراتی تورکیایە بە ئاگامات و هەوڵی سەپاندنی دەسەڕۆیی خۆیدا. بەم پێیە (حزب الله)ی ئێرانی و (حزب الله)ی تورکی لە ڕووبەڕووبوونەوەی «PKK»دا یەکیان گرت،چونکە «PKK» دەوری کەمالیزمی لە کوردستاندا خستە پەراوێزەوە، واتە ئەو دووانە ئامانجیان «PKK» بوو، لەبەر ئەوەی «PKK» دژی بەرژەوەندی هەردوو وڵات بوو. باوەڕم وایە ئامانجی دیداری بێ‌پسانەوەی نێوان بەرپرسانی ئێرانی و ئۆزاڵ و دواجار سەردانی دیمیریل بۆ لای ئەوان زیاد کردنی هاوئاهەنگی نێوانیان بوو بۆ ئەم مەبەستە. لە کاتێکدا لە گفتوگۆکانیاندا دەیانگووت: («PKK» وا کۆمۆنیستە و وا کوردە...وا زیان بە بەرژەوەندی هەردووکمان دەگەیەنێ. بە ئازادی ڕەفتار بکەن، ئێمەش وا دەکەین. با هەردوو حیزبیشمان پێکەوە ئیش بکەن). ئەوان لەسەر ئەم مەسەلەیە لەگەڵ یەکدیدا ڕێککەوتن.

دووەم ـ گەلێك ناوەندی بەکرێگیراو هەن بە توندی دژی بوونی «PKK»ن و کەرتێکی گەورە پێکدەهێنن کە بەرژەوەندییەکانی بە سەرکەوتنی «PKK» زیانیان پێ‌گەیشتووە و هەوڵدەدات سیفەتێکی ڕێکخراوەیی بە ناوی (حزب الله)وە بە دەست بێنن بۆ دوژمنایەتی کردنی ڕاستەوخۆی «PKK»، لەوانەیە بەم شێوەیە بنکەیەکی کۆمەڵایەتی ئارادەیەك بەهێز بە دەست بێنن. وە ئێمە دەزانین کە ئەم کەرتە زیان پێ‌گەیشتوانە پاڵپشتی ئەم حیزبە دەکەن، وە ئەمە بەڵگەی یەکێتی نۆکەرایەتی دێرینە و پەلهاوێژی تورکی ئیسلامییە لەگەڵ پەلهاوێشتنی ئێرانی ئیسلامیدا کە دەست دەخەنە نێو دەستی یەکدی تا بکەونەڕوو. ئەو مەترسییەی کە خۆ لە (حزب الله)دا دەنوێنێ لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە لە نۆکەران و هەواڵگەیێن و هێزی نیوە سەربازی پێکهاتووە. دەتوانین بڵێین: ئەم ڕێکخستنە نوێنەرایەتی فاشیزم دەکات. تەنانەت دەتوانین بڵێین ڕێکخستنێکە لە ڕاوکەرانی کەللەسەر پێکهاتووە.

ڕەنگە هەندێك موسڵمانی ماوێن پاك کە لە خشتەبراون لە نێو ئەوانەدا بن، بەڵام ئەوانە هەڵاواردەن. ئایدیۆلۆژی و ڕێکخستنی (حزب الله) لەو چوارچێوەیەدان کە باسم کرد.

ی.ك: ئایا مەبەست ئەوەیە (حزب الله) هاوچەشنی حیزبی بزووتنەوەی نەتەوایەتی «MHP»ی ساڵانی حەفتایە؟

س.پ: بەڵێ، شێوەیەکی کوردستانی بە خۆوە گرتووە کە شێوەیەکی

ئیسلامییە بە سەر کوردستاندا سەپێنراوە. ئەوە حیزبی بزووتنەوەی نەتەوایەتی تورکە بە هێندێك دەستکاری ئیسلامی و شۆڕشی ئێرانەوە شێوەیەکی تازەی وەرگرتووە.

ی.ك: بەم پێیە ئەو مەسەلانەی کە باستان کردن چەند مانایەکی ڕەوانی پێدەبەخشن، «MHP» ئیسلامی تورکی دەنوێنن و ئەمەش وا ڕەنگی بۆ ڕێژراوە ببێتە ئیسلامی کوردی و چەند لقێکی ئاسایشی تێدا هەن.

## دەیانەوێ بەهۆی ڕێبازی سۆفیگەری «ئۆزال» و ئاینی «ئیفرین»ەوە پەل بهاوێژن و دوورایەکی تازە بە میللەتی تورك ببەخشن.

س.پ: چەند لقێکی ئاسایشی تورکی بە ئاشکرا تێدا هەن. لەوانەیە ئێران و تورکیا و هەتا سعودیەش پشتیوانی بکەن. بەمە بووەتە گردبوونەوەی گەلێك لایەنی ئیسلامی کە لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی هاوبەش یەکیان گرتووە و «MHP»ش ـ واتە حیزبی بزووتنەوەی نەتەوایەتی تورك ـ هێزی سیاسی ئێو ئەو گردبوونەوەیە دەنوێنێ. تەنانەت بنگەی گوندپارێزانیش پشت بە چەند ڕیشەیەکی حیزبی بزووتنەوەی نەتەوایەتی تورك «MHP» دەبەستێ.

ی.ك: هەمان ئەناعەتم هەیە.

س.پ: ئێستا با بە شێوەیەکی فراوانتر ئەم بابەتە ڕوشن بکەینەوە. لە کاتێکدا شۆڕشەکەمان گەیشتووەتە قۆناغی بەرخودان، «حزب الله» کتوپڕ لەبەردەمماندا قوت بووەتەوە. ئەم پێکهاتەیە چییە کە هەولدەدەن بە ئەمانکی «حزب الله»وە بەسەرماندا زال بکەن و ڕاستییە مێژووییەکانی چین؟ لاکردنەوەمان لەم بابەتە لە ڕووی مێژووییەوە هاوبەشی باشتر تێگەیشتنی بابەتی «حزب الله» دەکات، بە تایبەتی کە ئەمڕۆکە باروودۆخەکە زۆر تێکچڕژاوە. ئەوان تێدەکۆشن پاش هەرەس هێنانی سۆشیالیزمی بنیات نراو چەند زەبرێکی کوشندە بە بیری شۆڕشگێڕی کۆمۆنیستی بگەیەنن. هەروەها ئێمەش ئەمڕۆ سۆراخی ئەوە دەکەین کە ئەزموونی ڕووسیا تا چ مەودایەك کۆمۆنیستی بوو و کەی دەستی بە دوورکەتنەوە لە بیری کۆمۆنیستی کرد و بوو بە ئیمپریالی و خەسلەتە ئیمپریالیەکانی کامانەن؟ هەموو ئەم مەسەلانە جێی مشتومڕن. کاریگەریەکانی سۆشیالیزمی بنیات نراو بێ ئەندازە شوێنە ون بوون. لە کاتێکدا لەو تێکدانانەی کە حیزبی شیوعی تورکیا کردنی مەترسی خۆی پێ لەدەستدا و ڕەوایی خەبات لە بەردەم سۆشیالیزمی شوڤێنیدا کەوتەڕوو. ئەم خەباتە بە کردەوە دەستی پێکرد. بۆیە هەر مەترسییەك کە لەم کەنالانەوە هاتووە لە گۆڕێدا نەماوە، چونکە بە باشی ئەم ئەزموونەیان ئەنجامدا و بە سەرکەوتنیان گەیاند.

ئەم مەسەلەیە میللی‌گەری سەرەتاییش دەگرێتەوە. ئەو شێوانەی کە سەپاندیانن هاوشێوەی «پارتی دیموکراتی کوردستان KDP» بوون و پشتیان بە میللی‌گەری سەرەتایی بەست و لەگەڵ دەزگای ئیستخباراتی تورکیا «MIT»دا یەکیانگرت و لە نێو خۆیاندا بوونە تێکەڵەیەك. هەوڵیشیاندا لە شێوەی کۆمەڵە و ڕێکخراوی کوردی لە چەشنی «DDKD، KUK، ÖY...تد»دا بیسەپێنن تا میللی‌گەری سەرەتایی جێ‌بکەنەوە. ئەوان ئێستا تێدەکۆشن ئەم شێوانە لە کوردستاندا لە ڕێگای تاڵەبانی و بارزانی‌یەوە بسەپێنن. ئەم بیرە گەلێك لق و پۆپی لێ‌دەرکەوتن. بەڵام هێزی بنچینەیی هەر خۆ لە تاڵەبانی و بارزانیدا دەنوێنن. بەڵام شۆڕشی کوردستان توانی لای گەل پەردە لە ڕووی میللی‌گەری سەرەتایی هەڵبماڵێ و ئەوە بیست ساڵە خەباتێکی سەخت لە دژی دەکات.

ی.ك: مەبەستت ئەوەیە بارزانی و تاڵەبانی بنچینەن.

س.پ: بەڵێ. تەنانەت حیزبی ڕێگای ئازادی «Ö.Y»یش کە بە خۆی دەڵێت سوشیالیستی پێ‌یان پشت ئەستوورە و پاڵپشتی دەکەن. داگیرکەر هەوڵیدا لە ڕێگای ڕێکخراوی هاوچەشنی وەك «KDP، ئاڵارزگاری ALA RIZGARI، ڕزگاری RIZGARI، کاوە KAWA، KUK،....هتد»ەوە کاریگەری خۆی زیاد بکات، ڕیشەی ئەو ڕێکخراوانە دەچێتەوە سەر هێزی خێڵەکی و هۆزایەتی و پەیوەندی شاراوەیان بە نەتەوایەتی تورکەوە هەیە، بە تایبەتی لە ڕێی ئیستخباراتی تورکیا «MIT»ەوە. ئەوانە سەرجەم ئامانجیان خنکاندنی نیشتمانپەروەری شۆڕشگێڕانەیە و تەگەرە خستنە بەر پەرەپێدانی بوو. پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK» خەباتێکی بێ‌پسانەوەی دژی ئەوانە کرد. جا لەبەرئەوەی کە ئەوانە لە بنیاتی خۆیاندا پشتیان بە توێژی خێڵەکی و ئاغا دەبەست و بەشی هەرەزۆری گەلیش زەحمەتکێش بوو، ئەوە یارمەتی داین لە ڕێگای ئەو خەباتەوە کە لە ساڵانی حەفتاوە تێی‌هەڵچووین لە بەردەم گەلدا پەردە لەسەر ڕاستی‌یان لابدەین.

بە کورتی، چووینە مەیدانی دوو خەباتەوە و توانیمان نەتەوایەتی تورك و میللی‌گەری سەرەتایی کوردی لای گەلی کوردستان ئاوزڕاو و ئاوەڕووت بکەین. لە کاتێکدا «PKK» توانی دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژی خۆی بە سەر خەباتدا بسەپێنێ کە وای لێ‌کرد بە پێی ئەو خەباتە ئایدیۆلۆژیەی کە کردی هێڵێکی سیاسی بەهێز بگرێتەبەر. لەم دەستپێکەوە، هەر لە ساڵی ١٩٨٠ بەدواوە پێی نایە قۆناخی ئامادەکردنی گەریلا. کاتێکیش پێمان نایە ئەم قۆناخە و ڕوومانکردە ئامادەکاری سەربازی، ئەو تەوژمانەی بەرهەڵستی‌یان دەکردین وەك سوشیالیزمی شۆڤێنی و میللی‌گەری سەرەتایی و شێوە نەتەوایەتیەکانی دیکە بێدەنگ بوون. قەڵەمبازی (١٥)ی ئابیش وەك سەرکەوتنی ڕێڕەوی ئایدیۆلۆژی سیاسیمان بە سەر ئەواندا هاتە پێش. بێ‌گومان ئەم قەڵەمبازە بەرهەمی زۆر کردەوکۆشی دیکە بوو. هەروەها لە تواناماندا نی‌یە بیر لەوە بکەینەوە کە دەکرا هیچ سەرکەوتنێك بە بێ قەڵەمبازی(١٥)ی ئاب بەدی بێت. بەم پێ‌یە خەباتی ڕزگاریخوازمان کە گەیشتە

ساڵی ۱۹۹۲ نموونەیەکی بێوێنە بوو بۆ سۆشیالیزمی تازەخولقێن و توانی هەموو هێزە نەیارەکان بەزێنێ.

کاتێك بۆرجوازی نەتەوەیی تورکی هەموو هێزەکانی خۆی لە دەستدا، هەستی کرد پێویستی بە ئامرازی تازەیە تا بۆ هێرشکردنە سەرمان بەکاری بێنێ. بەڵام نەتەوایەتی تورکی کە لە فاشیزمی دڕندەی ۱۲ی ئەیلولدا خۆی نواند، هەڵی پێکهێنان و خولقاندنی هێزی دژ بە ئێمەی وەك جاران لەبار برد. بۆیە بۆرژوازی نەتەوەیی پەنای بردە بەر سەپاندنی شەڕی تایبەت بەسەرماندا و بەوە ئەم شەڕەی کردە بەرەنگاری‌یەکی سەربازی بێبەردە لە نێوان ڕژێمی فاشی (۱۲)ی ئەیلول و گەلی کورد ستاندا و کارێکی کرد فاشیزمی ۱۲ی ئەیلول هەست بکات شەڕە تایبەتەکەی بەس نی‌یە و ئامرازی ئایدیۆلۆژی و سیاسی دیکەی پێ‌ئەوێ. جا لەبەر ئەوەی کە پارتی کرێکارانی کوردستان ڕێگای لە تەوژمەکانی میللی‌گەری سەرەتایی گرت. پەنای بردە بەر تەوژمەکانی سۆشیالیزمی شۆڤێنی بە ئەمامکی سۆشیالیزمەوە. بەڵام هێندەی نەخایاند بۆی دەرکەوت ئەمەش لە کارکەوتووە و بۆ ڕاوەستان لە ڕووی «PKK»دا بەس نی‌یە. بەم شێوەیە سەیری کرد تێکرای چەکە کۆنەکان وایان لێ‌هاتووە بۆ لە ڕوودا ڕاوەستانی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان لە کەڵك کەوتوون.

کەواتە چی بە دەستەوە ماون؟ جارێکی دیکەش چەکی کۆن. ئەوری لەو چەکە هاتە پێشەوە کە هەزار ساڵە بەکاردێت، و سوودی لە بنیاتی پاشکەوتووی کۆمەڵگای کوردی وەرگرت. ئەم بنیاتە دابەش بوو بوو بۆ چەند مەزەب و ڕێبازێکی سۆفێتی، ئەوەش فاشیزمی تورکیای هاندا جارێکی دیکە پەنابباتەوە بەر چەکی ئاین. ئایندار ئێفرین و پێبەندبوونی ئۆزاڵ بە ڕێبازی سۆلێتی بە خۆڕایی نەبوون. ئەوە بوو بینی‌یان ئەوان دەتوانن بەم ئامرازە دوورایی‌یەکی تازە بە فراوانکردنی چوارچێوەی نەتەوایەتی تورك ببەخشن. ئەمە پەنابردنە بەر کۆنە چەکی ئایدیۆلۆژیای دەگەیاند. سەرەنجام تەماشا دەکەین ڕژێمی (۱۲)ی ئەیلول بە شێوەیەکی نائاسایی پەنای بردە بەر ڕێبازی سۆلێتی و کەوتە داهێنکردنی پشتیوانی مادی بۆی، بە تایبەتی ئەو پارەتیانەی کە لە سعودیەوە بە سەریدا هەڵڕژان. دەستیان کرد بە مووچەدان بە گەلێك پیاوی ئاینی و شارەکانی کوردستان وەك «باتمان، دیاربەکر، نوورفە، سیلوان» بوونە لانەی ڕێبازی سۆفیێتی. ئەو منداڵانەیان برد کە تەمەنیان لە (۷) ساڵان تێنەپەڕێنێ و بیروباوەڕی دۆگمایی‌یان پێ‌لەبەر کردن تا لە ڕاستی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی‌یان دووریان بخەنەوە و لەم ڕێگایەدا چی پێویست بوو کردیان، وەك چۆن عوسمانیەکان لە قوتابخانەکانی ئینکشاریدا دەیانکرد. لە کاتێکدا ئەم شێوازەیان بە سەر منداڵە دیانەکاندا جێبەجێ کرد تا بی‌یانکەن بە تورکی موسڵمان. بگرە ئەم کردەوەیان لە هی سەروبەندی ئینکشاری عوسمانی‌یان تێپەڕ کرد. ئەتاتورکیش ئەم شێوازەی بە شێوەیەکی دڕندانە لە دێرسیم جێبەجێ‌کرد بۆ بە

تورك كردنیان. لەو منداڵانە كە پاش كوشتاری دێرسیم كۆیانكردنەوە بوونە نەتەوەپەرستی توركی لە تورك خۆی توندڕەوتر و هێندێكیان بوون بە وەزیر و جەنەراڵی نەتەوەپەرست و سەرپەرگری تورك و تا ئێستاش بەشێكیان ماون. ئەمانە دەرئەنجامی شێوازی چڕوپڕی تواندنەوەن كە لە قوتابخانەكانیاندا بە جێ‌دەهێنرا. لەو هەوڵانەی كە لە ڕێبازی سۆفیێتیدا دەدرێن لەپێناوی هێنانەدەری وەچەیەك لە خیانەتكاران و نۆكەران.

ی.ك: مەبەستت ئەوەیە ئەوەی وا دەیكەن لە ڕێگای ئایندا نییە.

س.پ: بێ‌گومان، نەتەوەپەرستی سەرپەرگری تورك پێی ناكری بە بێ تێكەڵی ئاین بوون زەمینەیەكی دیكە بۆ خۆی بدۆزێتەوە. تاكە ڕێگا پەنابردنە بەر ڕێبازی سۆفیێتی‌یە بە دەمامكی ئاینەوە. لە كاتێكدا ئەوی ڕاستی بێ ئەوە سیاسەتی سەرپەرگرانەی بە تورك كردنە. لەبەرئەوەی «PKK» نەیهێشت ئەوەی وا لە دێرسیم جێ‌بەجێیان كرد بیكەن، پەنایان بردە بەر تێكەڵ كردنی ئاین بە نەتەوە پەرستی تورك.

ئێستا گەلێك پێكهاتەی ئاینی تازە دەركەوتووە و ڕۆژنامە و گۆڤار دەر دەكەن. ناوەكانیان گرنگ نین چونكە ڕێكخستنێكی سەرپەرگریان هەیە خۆی لە «حزب الله»دا دەنوێنێ. مادامێكی ئیسلام لە ڕووی تیۆری‌یەوە نەتەوە و نەژادی تێدا نی‌یە، با ئەم پرسیارە لەم تۆڕەی تاوان بكەین: ئێوە بە چ زمان و ڕۆشنبیری‌یەك پەلامارمان دەدەن؟ پارەكانتان لە كوێوە دێن؟ كێش ژیانتان ڕێكدەخات؟ ئەو چوارچێوە نەتەوەییە چی‌یە كە لە نێویدا ئیش دەكەن؟ ئەمجا پاش هەموو ئەوانە دێن ودەڵێن نەژادپەرستیمان نی‌یە. خۆ ئەم كردەوانەتان كە دەیانكەن گەورەترین نەژادپەرستی دەنوێنن. تەنانەت ئەم نەژادپەرستی‌یە لەو جۆرەیان ترسناكترە كە هیتلەر بانگهێشتنی بۆ دەكرد. ڕووسەكانیش لە قۆناغێكدا نەژاد پەرستی‌یەكی ڕووڕەشانەیان هەبوو، ئەوەش دەسەلمێنین كە (حزب الله)ش هەڵدەستێت بە پەیڕەوكردنی نەژادپەرستی‌یەكی ڕووڕەشانە و ئێمەش ڕووی ڕاستەقینەیان ئاشكرا دەكەین، ئەمانە تێكڕایان چەند ڕێكخستنێكی نەژادپەرستی توركین و هیچی دی، وشەی (كورد)یان لە دەمەوە دەرناچێ و ئەگەر باسی كوردیان لەلا بكەی، ئەوا دەڵێن: ئەمە نەژادپەرستی‌یە. ئەوانە نەتەوەپەرستی سەرپەرگری توركن. تەنانەت هەندێك لە ڕۆشنبیرە كەمالی‌یەكانی وەكو (ئالهان سلجوق)یش هەبوونی كورد ڕەت ناكەنەوە، كەچی ئەوانە ڕەتی دەكەنەوە.

بەو شێوەیە پێویستە ئێمە بەوانە نەڵێین كە ئەوانە موسڵمانی ڕێبازە سۆفیگەرەكانن، بەڵكو لە جیاتی ئەوە دەڵێین كە ئەوانە دەمامكی ئیسلامیان لە ڕووناوە و خاوەن ڕوو و دڵ و كاری ڕەش و نوێنەرایەتی شۆفێنیزمی توركی توند ڕەو دەكەن. با لە نەقشبەندیەكان و سلێمانیەكان و نوورچیەكان بپرسین: سەرچاوەی باربووكردنتان چی‌یە؟ ئەگەر سەرچاوەكە توركی یا عەرەبی یا فارسی بێ، بۆچی ئەم پارانەتان دەدەنێ؟ ئایا لەبەر ئەوەیە كە دادپەروەری‌یان خۆش

دەوێ؟ ئەوەتا کارەساتی بەردەوام هەن و نیشتمانێك بووەتە داروپەردوو و کوشتاری بە کۆمەڵ دەرهەق بە گەل و زمان و ئایین و ڕۆشنبیری و گشت بەهایەکی مرۆڤدۆستانەی دەکرێن. بۆچی یارمەتی ئەم گەلە نادرێت؟ بۆچی پارەکان بەم گەلە نادرێن؟ بەڵکو دەدرێن بەوانە کە تکوولی لەم گەلە و خیانەت لە نیشتمانیان دەکەن. لەم شتانە لە واقیعدا دەکرێن. ڕژێمی فاشی(١٢)ی ئەیلوول بە سەرکردایەتی ئۆزال و ئێڤرین توانی هێندێك سەرکەوتن لەم ڕووەوە بە دەست بێنن. ئەم سیاسەتەیان تەنیا لەگەڵ سوننیدا پەیڕەو نەکرد، بەڵکو لەگەڵ عەلەوییەکانیشدا. ئەوە بوو هێندێك شێخی ساختەی تیرە عەلەوییان خستەڕوو و چەند کۆمەڵەیەکی ساختەیان لە ناوەوە و لە دەرەوە پێکهێنا. بەڵام ئەو لایەنەی کە لە پشت ئەم کردەوانەوە ڕاوەستێ هەریەك لایەنە.

ئامانجی هەموو ئەمانە ڕێکخستنی عەلەوییەکانە لە باکور و سوننییەکانیش لە باشور، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خەباتی ڕزگاری کوردستان. چەند وەزارەتێکی پەیوەندییشیان بۆ ئەم مەبەستە دامەزراند. خۆ «عەبدولقادر ئاکسو»ی وەزیری ناوخۆ نەقشبەندییەکی سەرپەرگرە لەسەردەمی ئۆزالدا هات. بۆ چەوساندنەوەی چینە زەحمەتکێشەکانی عەلەوییەکانیش «محەمەد موغولتا»یان هێنا کە عەلەوییەکی بە بنەچە خەڵکی دێرسیمە و لە حکوومەتدا کردیان بە وەزیر. واتە وای لێهاتووە چینی باڵای دەسەڵاتدار بووەتە تۆڕێك، بەرژەوەندی هاوبەش کۆیان دەکاتەوە.

ئەگەر عەلەویگەرایی گەوهەرێکی شۆڕشگێڕی هەبێ، ئەوە ئێمەین نوێنەرایەتی دەکەین. ئەگەر ئیسلامیش گەوهەرێکی شۆڕشگێڕی هەبێ، ئێمە باشترین کەسانێکین نوێنەرایەتی دەکەین. لە کاتێکدا ڕێبازێکی سۆفیگەری ئایینزایەك نییە بتوانێ دوو وشە لەسەر کورد بڵێت، چونکە کوردیان لە مەینەتی خۆیدا بە جێهێشتووە. ئێمە لەو پرنسیپەمانە کە هەر لە سەرەتاوە بانگەوازمان بۆ دەکرد. ئەمەش ئەو بنچینەیەیە کە لە بەرەنگاربوونەوەی ساختەکاراندا لەسەری ڕاوەستاین. هەموو ئەوانەی کەسەر بە سەرجەمی ئایینزاکان و ڕێبازە سۆفیتیەکان بوون و پەیوەستی ڕژێم نەبوون، ڕوویانکردە ئێمە و هاتنە پاڵمان و لەم ڕێگایەدا دووچاری هیچ دژوارییەك نەبوون.

جا هەر ئەوەندەی کوردستان لە ساڵانی ئەوەدەوە بەهۆی سەرهەڵدانەکان و پەرەسەندنی چالاکییەکانی گەریلاوە بووە گۆڕەپانی دەسڕۆیی پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK»، کە ئەم ئاڵوگۆڕەیان بینی تووشی ترس و بیم بوون، لە کاتێکدا سەدان ساڵ بوو ئەم گەلەیان هەڵدەخەڵەتاند و بە ناوی ئایینزا و سوڵتان و کۆمار و ڕێبازی سۆفیگەرییەوە گەلێك دەسکەوتی گەورەیان بە دەست هێنا. ئێستاش باسی پێکهاتەیەك دەکەن ژمارەی ئەندامانی دەگاتە سەدهەزار.

ی.ك: سەدهەزار ئەندام.

س.پ: بەڵێ. هێندێك شێخی نەقشبەندی هاتنە ئێرە و گوتیان: ئەو پارانەی کە

له ئەندامەکان کۆریان دەکەنەوە دەگاتە ملیارەها و پێنج یا دە نوێنەریان له پەرلەماندا هەیە و چەند وەزیرێکیشیان هەیە. واتە ئەوانە شەریکەبەشی ڕەسمی دەوڵەتن. جا کە ڕوومان تێ‌کردن، توقین و ترس و بیم بەرۆکی گرتن، لە ترسی ئەوەی نەبادا ئەم هەموو دەستکەوتانەیان لە دەست دەربچن. لە لایەکی دیکەوە، ئەمڕۆ عەلەویگەرایی پێی‌ناوەتە ئەورووپا و چەند ناوەندێکی دیکەش. دەوڵەتی تورکیا بەهۆی پەیدابوونی هەندێک هەڵوێستی دژ بە بەرژەوەندی چەند شێخ و پیاوێکی ئاینی عەلەوی‌یەوە ئەم مەسەلەیەی لە ڕێگای نۆکەرانیەوە گەیاندە ئەورووپا تا گەوهەری عەلەویگەرایی بشێوێنێ و بیخاتە بەر خزمەتی خۆی. گەلێک ڕێبازی سۆفیێتی دیکەش لە هەموو ناوچە و ویلایەتێکدا هەن، بە ڕادەیەک ـ وەک گوتمان ـ مۆرکی گەلەکەمان دەگۆڕن. ئەوان هەتا وازیان لە منداڵانیش نەهێنا و کوێریان کردن و کردیاننە سەرپەرگری وا کە دژی ڕاستی خۆیان ڕاوەستن.

بەڵام شۆڕشی ئێران توانی پاش ساڵی ١٩٨٠ کەڵک لە هەندێک خەسڵەتی ئیسلامی وەربگری دژی باڵادەستی بێگانە و نوێنەرایەتی سەرکوتکراوان و زۆر لێکراوانی گرتە ئەستۆی خۆی و شۆڕشەکەی لەسەر ئەم بنچینەیە سەرخست. ئەم شۆڕشە کاری کردە سەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و تورکیاش، بە تایبەتی کە پێوەندیەکانی لەگەڵ تورکیادا تا ساڵی ١٩٩٠ و وردتر بڵێین لەگەڵ خودی ئۆزاڵدا پڕ ناکۆکی بوو. تەنانەت ئەوانەی وا بە ڕەسمی لە ئێرانەوە دەهاتن ڕازی نەدەبوون سەر لە گۆڕی ئەتاتورک و گڵکۆی مەولانا بدەن. تورکیا بەم ڕەفتارانە قایل بوو و خۆی تەسلیم کرد. ئەو کاتێک ئەم تەنازولانەی دەکرد، بیری لەوە دەکردەوە شتێک بەرانبەر بەوە وەربگرێ لە کوردستان. هەروەها وایان تێ‌گەیاند کە بزووتنەوەی ڕزگاری کوردستان هەڕەشەیەکی هاوبەشە بۆ سەر هەموویان و دژی شۆڕشی ئیسلامی و نەتەوایەتی تورکی و کەمالی‌یە و ئەگەر ئەم بزووتنەوەیە پەرەبسەنێت مەترسیەکانی بۆ ئێرانیش زۆر دەبن. تورکیا ئێستاکە هەوڵدەدات بەم شێوازە ئەم مەترسی‌یە لە سوریا و عێراق بگەیەنێ.

## «حزب الله» پێوەندی بە پۆلیسخانە و مەڵبەندی ڕێبازە سۆفیگەرەکانی ناوخۆ و ئیدارەی ڕەوشی ئاوارتەوە هەیە.

ئەو ئاغا و شێخ و سەرخێڵانەی کە جاران نوێنەرایەتی کرێگرتەیی‌یان دەکرد و زیان بە بەرژەوەندەکانیان گەیشت و نیشانەی دوورەپەرێزی‌یان پێوەدەرکەوت، ئەم هەموو پێوەندی و ناکۆکیانە بە تایبەتی لە کوردستاندا وای لێ‌کردن ببنە نیشانی داکراو بۆ کۆماری تورکیا، بە تایبەتی کە ئەوان پێویستی‌یان بە هەر پاڵپشتێک هەبوو بۆ خۆیان. بۆیە لە دەوری ڕێبازە سۆفیێتیەکان خڕبوونەوە و بەوە دەوڵەتی تورکیا کە سەدان ساڵە ئەم چەکە ـ واتە چەکی ئاین ـ بەکاردەهێنێ، کاری

تێکردن بە ڕادەیەك ئەو نۆکەرانە کەوتنە ئەوەی بە سووریا بڵێن ئێمە نوێنەرایەتی عەرووبەمان کردووە. هەموو ڕۆژێك هەواڵی تازەمان بۆ دێت، ئەوانە دەڵێن: «PKK» داوای چەك و پارەتی مادیمان لێدەکات و ئێمەش نایدەینێ. ڕاستەوخۆ درێژەی پێدەدەن: ئەم حیزبە فڕی بەسەر ئاینەوە نییە. بەم پێیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ سەروساختیان لەگەڵ «حزب الله»دا ساخ دەبێتەوەو لەوانە ئەم قسەیە دەکەنە بیانوو بۆ نزیك بوونەوە لە (حزب الله). بەم شێوەیەش ئەوە دەردەبڕن چۆن بەرژەوەندییەکانیان دەپارێزن. شۆڕشی ئیسلامی ئێرانیش سەرباری ئەوەی کە سنوودار بوو؛ بەڵام بەوە جوێ کرایەوە کە شەقڵێکی دژ بە ئیمپریالیزمی هەبە و چەند لایەنێکی باش و خراپی هەن. کەچی وێڕای ئەوانە، ئێران بە شێوەیەکی گونجاو ئیسلام لەگەڵ دابونەریتی نەتەوایەتی خۆیدا دەخاتە گەڕ و ئیسلام دەکاتە ئامرازێك بۆ پەرەسەندنی خۆی و گوێ بە پەرەسەندنی میللەتانی دیکە و لەسەرروویانەوە میللەتی کورد نادات، چونکە زۆربەی کورد سوننی مەزهەبن و ئەوەش وایان لێدەکات ببنە کۆسپ لە بەردەم ئێرانیەکاندا.

میللەتی تورکیش تێدەکۆشێ سوود لەم ناکۆکیە ببینێ تا دژی( PKK ) بەکاری بێنێ. تا ئێستا بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نییە ڕادەی کەڵك وەرگرتن لەوە پیشان بدات. بەڵام ئەوەی وا بۆمان ڕوون بووەتەوە ئەوەیە کە «حزب الله» پێیەکی لای ئێرانیەکان داکوتاوە. ئەگەر گوتمان تەنیا پشت بە ئێران دەبەستێ، ئەمە ڕاست نییە. ئەو ڕاستیانەی کە لەم ساڵانەی دواییدا کەوتنە دەستمان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە «حزب الله» پێوەندی بە پۆلیسخانە و مەڵبەندی ڕێبازە سۆفیتیەکانی ناوخۆ و ئیدارەی ڕەوشی ئاوارتەوە هەیە. واتە پێوەندیان بە بنکەکانی کۆلۆنیالیزمی تورکی و بە تایبەتی دەزگای ئیستخباراتی تورکیا «MIT»ەوە ڕاستەوخۆیە. لەوانەیە ئێران ویستبێتی لە پێناوی پەلهاویشتنی ئایدیۆلۆژی خۆیدا بەکاریان بێنێ. بەڵام ئەم مەسەلەیە تەواو ڕۆشن نییە، چونکە دەبێ لەم ڕووەوە تەواو دڵنیا بین. ئەگەر چی پێوەندی «حزب الله» بە نۆکەرانی ناوخۆوە شتێکی نەگۆڕە لەلامان.

پێناسینی ڕاستەقینەی «حزب الله» بەم جۆرەی خوارەوەیە: ئەم حیزبە نوێنەرایەتی کرێگرتەیی بۆ ئەو چینە حوکم بە دەستانە دەکات کە نکوڵی لە بوونی مێژوویی گەلی کورد دەکەن. نۆکەرێکی ئیسلامی ڕەنگە، خزمەتی بەرژەوەندی نۆکەرایەتی کوردی دەکات و دەمامکی نەتەوەپەرستی فاشی تورکە کە بۆی نەچووەسەر سۆشیالیزمی شۆڕشی بخاتەکار و دەستی بۆ ئەم حیزبە درێژ کرد تا بە سوود وەرگرتن لە ئاینزا و ڕێبازی سۆفیتی وەك ئامرازێکی ئایدیۆلۆژی بەکاری بێنێ و ڕێگەی بخات و بۆ بەرەنگاری «PKK» پڕ چەکی بکات و لەگەڵ کۆنە نۆکەرەکانیدا یەکیان بخات. ئەوە بۆ ئەوەی بچێتە جێی ئەو چینە کۆمەڵایەتیەی کە لە کوردستان پشتی پێی ئەستوور بوو. لەوانەیە ئێرانیش ویستبێتی ئەم حیزبە بۆ هەمان مەبەست بەکار بێنێ. هەرچی نۆکەرانی

کوردستان، ئەوانە لەو کەسانە پێکدێن کە زەرەرمەندی دەستی «PKK» بوون و وای دەبینن کە «PKK» دوژمنی چینەکەیانە. ئەوانە خزمەتی میللەتی سەربەست دەکەن و لە خاوەنەکانی پتر لافی تورك بوون لێدەدەن.واتە ئەوانە خیانەتکاری میللەتی کوردن و بەئومێدن بەم پێوەندی‌یە بەرژەوەندیەکانیان بپارێزن و لەرێگای ئیدارەی حوکمی عورفی‌یەوە خزمەتی دوژمن دەکەن و ئەویش پێ‌بەپێی ڕێکیان دەخات و دەیانکات بە ئامرازی شەڕی تایبەتی وەك کۆنترا.

بێ‌گومان خەلکانێکی بەراستی خاوەن باوەڕ لە نێو «حزب الله»دا هەن بە پێی باوەڕی خۆیان بانگهێشتن بۆ ئیسلام دەکەن. ئەوانە لە خشتە براون، چونکە بە ڕاستی باوەڕ بە شۆڕشی ئیسلامی دەکەن. بێ‌گومان خەلکانێکی کۆمۆنیستی ڕاستەقینە لە نێو حیزبی کۆمۆنیستی تورکیا «T.K.P»شدا هەن. بۆ نموونە «حیکمەت کەفەلجەملی» کە ئەندامێکی ئەم حیزبە بوو و لە ساڵانی سی‌یەوە لەسەر کوردستانی دەنووسی. بەڵام ئەمە هەڵاواردەیە و مۆری سۆشیالیزمی شۆڤێنی لە حیزبی کۆمۆنیستی تورکیا ناکاتەوە. ئەمە مانای وایە، هەبوونی هێندێك موسڵمانی ڕاستەقینە لە نێو «حزب الله»دا مۆری نۆکەرایەتی ئەو حیزبە بۆ ئیدارەی شەڕی تایبەت لێ‌ناکاتەوە.

ئێستا هێندێك ئەندامی حزب اللە دەڵێن: بۆچی تا ئەم رادەیە زوڵممان لێ‌دەکەن؟ ئایا شایانی ئەوەین ببینە بابەتی ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە چەوتە؟ جا لەبەرئەوەی کە ئەوان لە ڕاستی‌یە بابەتی‌یەکانەوە دوورن، پێیان دەڵێم ئێوە خەلکانێکی خەیاڵ پلاون، بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندن لای ئێوە لارێیان گرتووە، چونکە باروودۆخی تایبەتی خۆتان بە سەر هەمووانیدا دەسەپێنن. پێویستە لەسەرمان پێشیان بڵێین: ئایا مێژووی ئاینەکان دەزانن؟ ئایا پێوەندی ئاین بە نیشتمانپەروەری‌یەوە دەزانن؟ دەزانن چۆن ئاین دژی میللەتی کورد بەکاردێت؟ ڕاستی ئاینزا و ڕێبازە سۆفینیەکان چی‌یە؟ پێوەندیشیان بە ڕژێمی تورکیاوە چی‌یە؟ ئایا گەوهەری شۆڕشی ئیسلامی دەزانن؟ ئەگەر وەڵامی ئەم هەموو پرسیارانەتان دایەوە ـ دیارە موسڵمانە ڕاستەقینەکان وەڵامیان ڕاست دەبێ ـ ئەوسا تێ‌دەگەن چۆن وەك ئامێر بەکارتان دێنن.

ی.ك: بەڵێ ئاپۆی برام.

س.پ: پێویستە بیرمان نەچێ کە هەموو ئەوانەی وا ئەم ماوەیەی دوایی کاری خافڵکوژی‌یان کرد و لە پشتەوە تەقەیان کرد، منداڵانێکن تەمەنی گشتیان لە نێوان ١٥ـ٢٠ ساڵیدایە و تووشی مێشك شوردن هاتوون و بەڵێنی بەهەشتیان پێدراوە و دۆلار خراوەتە گیرفانیان. هەتا لەو چوارچێوەیەشدا کە باسمان کرد. ئەم منداڵە کە تەمەنی لە ١٥ـ٢٠ ساڵ تێپەڕناکات چۆن و لە کوێ ئەم هەموو ئیسلامە فێربوو؟ ئەم منداڵە بێکارە و هەژارە و جل و بەرگی نی‌یە. کوردستان بێکاری‌یەکی ترسناکی تێدایە، تەنانەت دەوڵەت خۆشی گوتوویەتی: ئێمە دەرفەتی کار بۆ ١٥ هەزار کەس دابین دەکەین. ئەمە ئەو کارەیە کە دەوڵەت گفتی

پێدراون. واتە ئەم بێکار و کەسە خۆگونجێنانەی لێبڕدن و چۆنیەتی لێدان و خافڵکوژی و کەمێك لە ئایین و ئیسلامی پێفێرکردن و پێی گوتن: «ئەگەر لێرەدا ئەوا تۆ موجاهیدی. ئەگەر مردیشی شەهیدی. بەهەشت چاوەڕێت دەکات». پێشی گوتن: «پارە لەم دنیایەدا چاوەڕێتە». کابرا دەبینێ ئەگەر مرد یا زیندوو مایەوە شوێنی باشە. پۆلیسی تورکیاش پارێزگاری دەکات و چەکی پێدەدات، لە کاتێکدا پێشتر نرخی پەرە سیغارێکی لە گیرفاندا نەبوو. بەڵام ئێستا پارە و چەك و پارمەتی و پارێزگاری پۆلیس هەن و هەموو ئەمانە لە خزمەتیدان، ئایا ڕادەوەستێ؟

ی.ك: ڕاناوەستێ.

س.پ: بێگومان دوودڵ نابێ «بگرە و بڕۆ لە فلان بدە». کە ئەمە دەبیستێ، دەڕوات و دەست دەوەشێنێ، ئەمە ڕوودەدات. زۆر نیشتمانپەروەر بەم شێوازە و بە دەمامکی ئیسلامەوە خافڵکوژ کراون.

چاران پەلامارەکان بە کاریگەری سۆشیالیزمی شوڤێنی پشتیان بە چەند بنچینەیەکی ئایدیۆلۆژی دەبەست. چاروباریش ململانێ دەبوو بە زەبروزەنگ. وەختێك بڕیارماندا بە توندوتیژی بەرپەرچیان بدەینەوە، بوار لە بەردەم مشتومڕێکی فراواندا ئاواڵە بوو. هەمان شت لەگەڵ ڕێکخستنی «KUK»دا ڕوویدا کە میللیگەری سەرەتایی دەخوێند و هەمان وەڵامیان دایەوە. هەرچی ئەو شێوازە تازەیەشە کە خۆی لە ڕێبازی سۆفیێتی و ئاینزادا دەنوێنێ، ئەوە ئەوانە لە مێژبوو لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە خۆیانیان ساز و تەیار دەکرد. بەڵام ئێستا پەنایان بردووەتە بەر چەك و پێدەچێ لەوەدا هەر بەردەوام بن. بۆیە پێویستە لەسەرمان بە باشی تێبگەین ئەم کردەوانە چین. پێویستییەکی زۆرمان بە هۆشیارییەکی ڕیشەیی هەیە. ئەوە تەڵەیەکی گەورە و گەورەترین کەمەیە منداڵانێك دەگرێتەوە تەمەنیان لە ٧ ساڵ تێناپەڕێنێ و تووشی مێشك شۆردن دەبن. دەزگای ئیستخباراتی تورکیا «MIT» و ئەو پیاوە ئاینیانەی کە لەلای ئیدارەی شەڕی تایبەت کاردەکەن لە لوتکەی ئەم ئیشەن و چوار مشقی لێی دانیشتوون و هەوڵ دەدەن ئەو لاو و منداڵانە بە شێوازی فەلسەفەیی قەناعەت پێبکەن. دەمڕاستەکانی سوڵتانە عوسمانییەکان پیاوی ئاینی وەك ئەوان نەبوون؟ حاڵی حازر پیاوی ئاینی وا هەن وەك دەمڕاست ئیش بۆ کۆماری تورکیا دەکەن. بۆ نموونە «عەدنان خۆجە» چۆن پەیدابوو؟ هەروەها لەم ماوەیەی دواییدا نیشانیان لە ڕۆڵەی دەوڵەمەندان گرتەوە و چەندین پیاوی نەقشبەندی باش مەشق پێکراو و تا ڕادەی مردن پەیبەستەی هەم بەرژەوەندییەکانیان و هەم دەوڵەت بە پێی ئەم بەرژەوەندییانە هاتنە بەری مەیدان.

## زۆر ڕۆشنە کەوا ئیدارەی شەڕی تایبەت ئەندامەکانی «حزب الله» دەکڕێ و پێیان دەڵێت: ئەگەر گیرای، دەتوانم فوتارت بکەم!

دەتوانین بڵێین بنکەکەی لە لاوانی هەڵخەڵەتێنراو پێك دێت، بەڵام لوتکە پەاوانی ئاینی هەڵخەڵەتێن و ساختە و سەرۆکانی ڕێبازە سوفیتیەکانی لێیە کە سەرپاکیان لە پێناوی بنیاتنانی تورێکی دوژمنکاری ئایدیولۆژیدا یەکیان گرتووە تا ببکەنە بزووتنەوەیەکی چەکدار. ڕەنگە ئەوانە هێزیان سنووردار بێ و کاریگەرییەکی وا زۆریان نەبێ، بەڵام پێشینەیەکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی‌یان هەیە. لە هەموو ئەوانەش گرنگتر ئەو پشتیوانی‌یەیە کە ئیدارەی شەڕی تایبەت لێیان دەکات و پێیان دەڵێت: «دەست بوەشێنە، پاریزگاریت دەکەم». شتی سەلمێندراو ئەوەیە ئەوانە بە ڕۆژی ڕووناك لە «سیلوان و باتمان و دیاربەکر» دەست لە دەستی پۆلیسی تورکیدا ڕێ دەکەن. زۆر ڕوونە کە ئیدارەی شەڕی تایبەت ئەندامەکانی «حزب الله» دەکڕێ و پێیان دەڵێت: «ئەگەر گیرای دەتوانم بتشارمەوە». تۆ دەتوانی لە هەلومەرجی بێکاری بڵاوی کوردستاندا گەلێك کەس پەیدابکەی ئەم کارەیان پێ‌قبووڵ بێ. لەو بنچینەیە کە جووڵانەوەی فاشی تازەکورە پێی‌پشت ئەستوورە، بەکارهێنانی ناوی بێژەی مەزنایەتی‌یە لە کردەوە گڵاوەکانیدا. ئەوان ناوی «حزب الله» بەکاردێنن چونکە گەل ڕێزی «بێژەی مەزنایەتی» دەگرن. نەریتێکی لای باب و باپیریان بەکارهێنانی ناوی جوان و وشەی ڕازاوەیە بۆ چەند مەبەستێکی پڕوپوچ. ئەمە ڕێگای خەڵەتانی خەڵکانی دیکەیە.

ئەم هێزانە فریان بە سەر ئیسلامی ڕاستەقینەوە نی‌یە. خۆ «حزب الله» هیچ پێوەندی‌یەکی بە خوای گەورەوە نی‌یە و ئەمە چاوبەستێکی ئایدیولۆژی‌یە هەولدەدەن لە پشتیەوە گەلەکەیان بخەڵەتێنن. ئاخۆ دەبێ بارودۆخی ڕاستەقینەی مێژوویان چۆن بێ؟ لە ڕاستیشدا داوای چی‌دەکەن؟ زۆرمان لێ‌پرسین و هیچ وەڵامێکمان دەستگیر نەبوو. ئەوانەی وا تاوان دەکەن، بەرژەوەندیان لەگەڵ دەولەتدا هەیە و بەرژەوەندیەکانیان خواو باوەڕیانە.

دەشتوانین بڵێین: گشت چینە خیانەتکارەکان لە کوردستان، بە خیانەتی شەخسی و لەوانەشەوە کە چەپی کوردی بەکاردێنن، لەم سەدەیەی دواییدا بنکەیەکی بنچینەیی‌یان بۆ گەمەکانی میللەتی سەردەست پێکهێناوە. ئەو کاتەی کە میللەتی سەردەست لە بەرەکانی شەڕ بە سوپاکەی خۆی شەڕی کرد، ئەو خیانەتکار و جاشانەی کە ئامرازی ئیدارەی شەڕی تایبەتن لە پشتەوە دەستیان لە هێزە ڕزگاریخوازەکان دەوەشاند. هەروەها حیزبە سیاسیەکانی سەر بە ڕژێم وەك «DYP، SHP» و دەرزەنێکی دیکە لە حیزبی هاوشێوەی ئەم جووتە حیزبە، گەلێك لەو کەسانە وان لە نێو ڕیزەکانیاندا کە قایل بوون وەك خزمەتکاری ڕژێم ئیش بکەن و بۆیان دەرکەوت بەرژەوەندی شەخسی‌یان بە چوونە پاڵ ئەم جۆرە حیزبانە

بەدی دێت. بۆیە ئەوانە لە تاوانی حیزبەکانیاندا دژی گەلی کورد شەریکە بەشن. کەسانێکی دیکە هەن لە نێو سوپای دەوڵەتی تورکیادان و شەڕی گەلەکەیان دەکەن. ئەوانەش خیانەتکارن. بنکەی گوندپارێزان و چەندین هێزی فاشی ئاشکراش هەن. ئەو هێزە تایبەتانەش هەن کە لە بنەڕەتدا هێزی فاشین. هێزەکانی کوماندۆش هەن کە هێزی تایبەتن لە نێو سوپادا. هێزەکانی دەست نێوەردانی خێراش هەن. هەموو ئەوانە کە ناومان بردن لە بەرەی شەڕی ئاشکرادا شەڕ دەکەن. کەواتە ئایا پێویست دەکات چەندەها هێزی نهێنیش هەبن لە هێرشەکانیاندا بۆ سەر گەلی کورد، ئیسلام بەکاربهێنن و بەسەر دەست و نەستی ئاینییەوە مشەخۆر بن تا وەك دەمامكێك بۆ کردەوەی تاوانکارانەیان بەکاری بهێنن؟ ئەو پرسیارەی کە لە خۆیانی دەکەن ئەوەیە: «ئەگەر ئەم شێوازەمان بەکارهێنا و پشتمان بە لایەنی ئاینی بەست وەك پێشتریش کردوومانە، ئایا دەتوانین لە هەلومەرجی ئەمڕۆدا بە ئامانجەکانمان بگەین؟ وەڵامیان بۆ ئەم پرسیارە بنیاتنانی (حزب الله) بوو، چونکە هێندێك تاوان کردن بە دەستی ئەوانە دەکێشنەوە بۆ چەواشەکردنی بیرکردنەوەی گەل و ئەمانیش بێ کەم و زیاد ئەمەیان گرەکە. ئەدی ئایا (حزب الله)ی نێو باوەشی پۆلیس،بۆ حوکم بە دەستەوەگرتن تێدەکۆشن؟ نەخێر پیادەیەکی بچووکە بە دەستی ڕژێمەوە، پیادەیەکە لە پیادەکانی شۆڕشی چەواشە، ئێمە لەوانە دەپرسین: ئایا لە سایەی پارێزگاری پۆلیسدا بەهەشت دادەمەزرێنن؟ ئایا (حزب الله) بە یارمەتی پۆلیسی کەمالی و هێزە تایبەتەکان و بە پارێزگاری ئەوان ئامانجەکانی بەدی دەهێنن و دنیا دەبن بە بەهەشت؟ ئەمە چ ڕژێمێکە کە پۆلیس خزمەتی دەکات؟ زۆر ڕۆشنە ئەوانە لە خزمەتی زایۆنیزمدان.

ئەوانەی وا لافی ئاینداری ئیسلامی لێدەدەن بە خۆیان دەڵێن: ئێمە دژی زایۆنیزمین. ئەوی ڕاستی بێ ئەم سیستەمە بەرقەرارە لە ئیسلام زیاتر نوێنەرایەتی زایۆنیزم دەکات. «هێرتزوگ»ی سەرۆکی دەوڵەتی ئیسرائیل گوتوویەتی: «ئێوە چی لە دژی کورد دەکەن ئێمە قەرەقەبی لێدەکەین و ڕازی دەبین، بە مەرجێك ئێوەش بێدەنگ بن و ڕازی بن بەوەی کە بە فەلەستینییەکان و عەرەبی دەکەین!». بەڵێ ئایا هێرتزوگ ئەم شێوە بەڵێنەی لەسەر کورد بە تورك نەداوە؟ ئایا ئەمە وا ناگەیەنێ کە تورك فەرمانبەرداری هێرتزوگە؟ ئایا ئێوە پیادە نین بە دەستی شۆڤێنیزمی تورکییەوە و فەرمانبەرداری پۆلیسی تورك نین؟ بە هەمان مانا: ئایا خزمەتی ئیمپریالیزم ناکەن؟

تەواو ئاشکرایە کە «حزب الله» هێندەی خزمەتکردنی کەمالیزمی تورك خزمەتی زایۆنیزم دەکات. ئەوان لافی ئەوە لێدەدەن کە بەرهەڵستی ئایدیۆلۆژی ڕەسمین، کەچی لە سایەی ئەودا شەڕدەکەن. ئایا ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەوان خزمەتکاری ئەم ڕژێمەن؟ ئایا تا ئەم ساتە خوێنتان لە لووتی زایۆنییەك یا کەمالییەك هێنا؟ ئەگەر ئەو لایەنەی کە باربووی ڕژێمی تورکیا و کەمالیزم دەکات زایۆنیزم بێ، ئەمە وا دەگەیەنێ کە ئەو لایەنەی وا باربووتان دەکات

ئەویش هەر زایۆنیزمە، ئێوە بە چەندین ڕێگای ناڕاستەوخۆ نۆکەری زایۆنیزمن. ئێمە مەبەستمان لەو ئەندامە ڕاستەقینانەی «حزب الله» نیە کە ڕووبانکردووەتە خواو لە خشتەبراون. بەڵام پێویستە لەسەرمان بە ڕاشکاوی بۆیان ڕوون بکەینەوە کە (حزب الله) پیادەیەکی ناڕاستەخۆیە بە دەستی زایۆنیزمەوە. ئەمە ڕاستی‌یەکی بێ‌پێچ‌وپەنایە لای ئێمە و، (حزب الله)ش هیچ دوژمنایەتی‌یەکی ڕاستەقینەی نە زایۆنیزم و نە ئیمپریالیزم و نە کەمالیزمی نی‌یە. دوژمنی ڕاستەقینەیان ئەو بزووتنەوەیەیە کە پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK» ڕێبەرایەتی دەکات. ئەمە لە زیانی ڕۆژنامەکاندا ڕۆشنە کە دەیان شەهیدی تێدا دەدەین. بەم مانایە بەرگری ڕاستەقینە لە ئیسلام «PKK»یە و دوژمنانی گەلانی ئیسلامیش ناسراون و کە بریتی‌یە لە ئیمپریالیزم و داروودەستەکانی لە زایۆنیزم و کەمالیزم. ئەوە(PKK)یە کە بێ‌بەزەییانە شەڕێکی لێرە و لەوێ دژی ئەوانە دەکات. ئایا (حزب الله) هیچ شەڕێکی لەم چەشنەی شەڕی ئێمەی کردووە؟ بابێنە لامان و پیمان بڵێن شەڕ دەکەین. ئێمە تەواو ئامادەین چەکەکانی خۆمانیان بدەینێ.

بانگەوازێکمان ئاڕاستەکردن و پیمانگوتن: وەرن با بۆ بەرەنگاری ئیمپریالیزم و کەمالیزم و زایۆنیزم یەکبگرین و پێکەوە شەڕیان بکەین. لە بری ئەوەی کە نیشتمانپەروەرە بێ‌تاوانەکان بکوژن، چەندین دەستەوتاقمی ئیمپریالیەتێ و زایۆنیەکان هەن پەلاماریان بدەن. مادامێکی - بەپێی لاف و گەزافی خۆتان - دوژمنایەتی ئیمپریالیزم دەکەن، ئیدی بۆچی دەڵێن «PKK» کافرە و تاکە مەترسی «PKK»یە. پەیوەندی ئەم دروشمانە بە دژایەتی کردنی ئیمپریالیزمەوە چی‌یە؟ مادامێکی ڕاستیەکان تا ئەم ڕادەیە بێ‌پەردەن، بۆچی هەوڵدەدەن ڕووی خۆر بە بێژنگ بگرن؟

ئەوی ڕاستی بێ هیچ پێویست ناکات ئەم بابەتە بەم هەموو دووروودرێژی‌یە لێک‌بدەینەوە. بەڵام ئێمە ویستمان باروودۆخی ئەو مندااڵنە پیشان بدەین و بزانین ئەو بااڵدەستانە چۆن هەڵیان دەسووڕێنن، لەبەرئەوەی بوونەتە هۆی شێواندنی مێشکی خەڵکی، بۆیە خواستمان ڕەوشیان دیاری بکەین بۆ جەماوەر. لەبەرئەوەی ئەوانە کە میللەتی تورك دروستی کردوون ساختەن و کاری چەپەڵی زل زل دەکەن. دەبوو شی‌بکرێنەوە و ڕووناکی بخرێتە سەر لایەنە شاراوەکانی پێکهاتنیان. بێ‌گومان ئەو «ڕووڕەشانە» لە بەردەم گەلدا دەستیان دەکەوێتە ڕوو و گەل چەکیان دەکات و ناویان دەزڕێنێ. ئەمە لە ئێستاوە لە چەند جێگایەکدا ڕووی داوە کە باوەڕیان وابووە قەڵای خۆیانە. کاتێك دەکەونە چنگی جەماوەر، سەرکوتیان دەکات. پاش تێپەڕینی چەند ڕۆژێك و زیاتر کەوتنە ڕوویان. نە هێلانەیەك دەدۆزنەوە حەشاریان بدات و نە جێگایەك خۆیانی تێداوەشێرن.

جارێکی دیکە بەوانە دەڵێین کە دڵسۆزانە پێیان وایە ئەوەی وا دەیکەن لەبەرخاتری خوایە: دادپەروەری ئەو شۆڕش و ئیسلامە کامەیە کە دەیان تێ‌دەژەنن؟ ئەمە باش دەزانن. هەروەها شۆڕشی ئێران چی‌یە؟ ئیمامی عەلی «خوا لێی ڕازی بێ» کێ‌یە؟ ئەمەش باش دەزانن. زانینی ئەم مەسەلانە هەر بە قسە نابێ،

بەڵکو بە کردەوە دەبێ. بەتیۆریی هەموو ئەمانە دەڵێن، لە کاتێکدا بە کردەوە چەك و پارەتان لە پۆلیسی تورك و باوکە ئاغاکانتانەوە پێدەگات تا پاش ئەوە ـ بەقسەی خۆتان ـ «جیهاد دژی کافران !» بکەن. تا ئەم رادەیە خۆتان مەتەڵەتێنن. ئەمە ڕێگایەکی زۆر ترسناکە بۆ ئێوە. باش بیربکەنەوە. هیچ ئامرازێکی داکۆکی کردنتان بە دەستەوە نییە. ئێوە ناتوانن تەنانەت بەدوو وشەش داکۆکی لە خۆتان بکەن. ئەگەر درێژە بەم کردەوە گڵاوانەتان بدەن، مێژوو وا باستان دەکات کە ئێوە نەفرەتی‌ترین کەسانێکن هاتوونە بوون. بۆیە پێویستە لەسەر ئەوانەی کە پاش ئەم کردەوە گڵاوانە دەستیان پیس نەبووە، بێنەوە سەر ڕێی‌ڕاست و داوای لێبووردن لە خوا و گەلەکەیان بکەن و هەوڵ بدەن کاروکردەوەکانیان چاك بکەن. لێرەدا دەمەوێ بانگەوازێك ئاراستەی ئەوانە بکەم کە تێدەکۆشن ناوی ئێران بەکاربهێنن. هێشتا هەندێك لایەنی دژ بە ئیمپریالیزم و زایۆنیزم لە شۆڕشی ئێراندا هەن. بە ئێرانیەکانیشمان گوت: بەشداری کارێك مەکەن کە لەگەڵ ئەو شتانەدا کەوا بانگەوازیان بۆ دەکەن جووت نایەتەوە و... دوژمنایەتیمان دەکەن... هەوڵ بدەن لە نیزیکترین دەرفەتدا ئەم دۆخە دوایی پێبهێنن... وریا بن تا نەبنە نێچیری باروودۆخێکی لەم چەشنە. چاوتان بکەنەوە ئەگەر بە ڕاستی دەتانەوێ خەبات دژی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و کەمالیزم بکەن، لە ژێر ئەو ئاڵایەدا جێی خۆتان بگرن کە پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK» بەرزی کردووەتەوە و لە نێو ئەو ڕیزانەشدا کە جیهاد و خەبات دەکەن. تەنیا بەم کارەتان شێلگیری خۆتان دەسەلمێنن. گەلێك لاو هەن لە خشتە براون، ئەوانیش لەسەریانە چاو بکەنەوە و تێبگەن کە ئەوان باشترین خەڵکانێك دەکوژن. با دەست لەم تاوانانە بکێشنەوە و بزانن بەوە لێیان خۆش دەبین بێنەپاڵ هەڤاڵانیان لە شۆڕشدا و داوای لێبووردنیان لێبکەن. ئەگەر بە ڕاستی دەیانەوێ ببنە کەسانێکی سوودبەخش، بابێنە سەر ئەم ڕێگایە.

ئەرکی ئێمە ئەوەمان بەسەردا دەسەپێنێ بە ڕاستی ئەوانە هەڵبسەنگێنین و ناویان بزڕێنین و لای کۆمەڵگا ئاوڕووتیان بکەین. ئەگەر سوور بوون لەسەر چەك هەڵگرتن دژ بە گەل، ئەوا ئێمەش بێبەزەییانە بەرەو ڕوویان دەبینەوە و سەرکوتیان دەکەین و پەنادەبینە پێکهێنانی تیپی تایبەتی خائنکوژکردن و لەکۆی بوون لەوێ دایاندەنێین و مەقلی پیلانگێڕی ئەوان بە ئیشانە دەنێینەوە. هەروەها داوا لە گەلەکەمان دەکەین چاوکراوە و وریا و تاسەر پێملی ڕێنوێنیەکان بن، چونکە ئەوانە بە دزییەوە ئیش دەکەن و هیچ و پووچانە مرۆڤی بێتاوان و بێچەکمان دەکوژن. واتە ئێمە بەرمگاری ئەوانە دەبینەوە کە بێتاوانان بە شێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو و ڕێکخراو دەکوژن.

ئەمە ڕاستی (حزب الله)یە کە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی شۆڕشی ڕزگاری نیشتمانی پیرۆزی گەلەکەمان دروستیان کردووە. پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK»ش پێبەستەی هەم دابونەریتەکانی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و هەم

گەوهەری ئیسلامی شۆڕشگێڕ و پرنسیپی دادپەروەری و هاوسانیيە، زیاد لە هەر ڕێبازێکی سۆفیتی و هەر ئاینزا و ڕێکخستنێکی دیکە. جووڵانەوەیەکە لە ئاستی سەرکردایەتیدا بەرانبەر بە ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و کەمالیزم بەرخودان دەکات، ئەگەر چی گوزارەی ئیسلامیش بەکارناهێنێ. ئەمە گەوهەری ئێمەیە. جووڵانەوەکەمان لە ناخەوە ڕێزی ئاین دەگرێ و بە شێوەیەکی دیموکراتیانە لا لە تێکڕای ئاین و ئاینزاکان دەکاتەوە و بایەخ بەو لایەن و خاسیەتە باشانە دەدات کە زۆر خزمەتی لایەنە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکان و بەها مێژووییەکان دەکەن و پەرەیان پێدەدەن.

پێویستە هاوسانی گەلان و ئینتەرناسیونالیزم لە دەلاقەی ڕێنوێنیەکانی سەرجەمی ئەو ئاینانەوە ببینن کە گەلانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست باوەڕی پێیان هەیە. ئەگەر پێمان کرا ئەم لایەنە باشانە بە ڕاستی هەڵسەنگێنین، ئەوا دەتوانین ببین بەنابردنەبەر شۆڤێنیزم یا فاشیزم خزمەتی گەلان بکەین و تەبایییان بەدی بێنین. ئێمە بایەخێکی زۆر بەم لایەنانە دەدەین. ئەگەر ئەمە ڕاستی ئێمە بێ و حیزبمان لە پێناوی ئەم ڕاستیانەدا شەڕ بکات، پێویست ناکات خەباتمان بە شێوەیەکی دیکە لێکبدرێتەوە. ئێمە تەنیا شەڕی کەمایەتی داگیرکەری تورك دەکەین، لەگەڵ شەڕی زایۆنیزم و ئیمپریالیزمدا کە لەپشتیەوە ڕاوەستن. بۆیە هەر لێکدانەوەیەکی چەوتی خەباتمان، خزمەتی ئەوان دەکات. ئەگەر هەر لایەنێکی دیکەش پەلاماری «PKK» بدات بەبێ ئەوەی بیناسێ یان بە کۆسپی بەردەم خۆی بزانێ، ئەوە ئەم لایەنە بەم هەڵوێستەی لایەنگری ئەوان دەکات.

ئێمە لەلای خۆمانەوە چی لە دەستمانەدا بێ بەجێیدێنین و هەڵوێستمان بەم شێوازە ڕوونە شیدەکەینەوە و بەکردەوە و سیاسەتیش ئەوە دەکەین. بۆیە داوا لەو کەس و ناوەندانە دەکەین کە بوونەتە لایەکی ئەم قەیرانە، بە ڕاستی نەك هەر بە قسە ئەرکی سەرشانیان ڕابپەڕێنن. ئەگەر باوەڕیان بە پرنسیپەکانی ئیسلام هەیە سەبارەت بە ئازادی و هاوسانی و لە نیاز و کردەوەکانیاندا ڕاستگۆن، دەبێ کارێك بکەن ئەوە بسەلمێنن. ئێمە بە قسە و بە کردەوە هەڵوێستی خۆمانمان بۆ جیهان سەلماندووە. ئێستاش نۆرەی ئەوانە. ئەگەر نەیانکرد و پێداگر بوون لەسەر شەڕکردنمان ئەوا ئێمە تا هێزمان تێدابێ سەرکوتیان دەکەین.

## ئێمە بەرەنگاری ئەو ڕێکخستن و هێرش و سیاسەتانە دەبینەوە که دەوڵەتی تورکیا بۆ ئابلووقە سەپاندن بە سەر شۆڕشی ڕزگاری کوردستاندا پەرەی پێداون.

ی.ك: باشە ئاپۆی ئازیزم. گفتوگۆکەمان دەگاتە خاڵێکی سەرنجڕاکێش. دەوڵەتی تورکیا بە شوێن چەند چارەسەرێکی جۆراوجۆردا گەڕاوە بۆ لە ڕوودا ڕاوەستانی سەرکەوتنی پارتی کرێکارانی کوردستان و، حیزبە کوردیەکان و گوندپارێزان و ئەو چەپڕەوە کوردانەی کە لە نێو کۆنە سیاسیەکانەوە هاتوون و

دواجار بزووتنەوەی بارزانی و تالەبانی لە باشوردا خستروەتەکار. دەولەتی تورکیا هەموو ئەوانەی خستووەتە کار. تالەبانیش بۆ ئەم ئامانجە یارمەتیان دەدات. دواجار (حزب اللە)ش بەکاردێنێ. ئێوە دەلێن «سەرکوتیان دەکەین»، ئایا کوتایی چی دەبێ؟

س.پ: لەم بابەتەم بە دووروودرێژی روون کردووەتەوە. ئێمە بەرەنگاری ئەو رێکخستن و هێرش و سیاسەتانە دەبینەوە کە دەولەتی تورکیا بۆ ئابلووقە سەپاندن بەسەر شۆرشی رزگاری کوردستاندا پەرەی پێداون. لەم هەولانەش بە تایبەتی لەگەل هاتنی ئیدارەی رەوشی ئاوارتەدا پەرەیان سەند، چونکە زەحمەت نی‌یە لەوە تێبگەین کە دامەزراندنی رێکخستنی (گوند پارێزان) هەولێکە بۆ زیندوو کردنەوەی هێزە حەمیدیەکان، هەرچی کێشەی رێبازە سولیگەریەکانیشە، لە جوری رێکخستنی «گوند پارێزان» نی‌یە، بەلکو ئامانجی پرکردنەوەی بۆشایی ئایدیۆلۆژی نێو کەمالیزمە بۆ بەرەو رووبوونەوەی کۆمۆنیزم و پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK». لەم ئاراستەیەش بۆ لەم مەبەستە پەرەی پێدرا. جا کەشەری کەنداو دەستی پێکرد، دەولەتی تورکیا دەستی بۆ بارزانی و تالەبانی درێژکرد تا بۆ بەرەنگاربوونەوەمان بەکاریان بهێنێ. ئەم شێوازە لە کونەوە هەبووە، بەلام هەولیاندا بۆ پێشەوەی بەرن بۆ تۆستنەوەی لەو هەلە رەخساوە. هەروەها دەولەتی تورکیا هەولیدا حیزبێکی کوردی ساختە بنیات بنێ تا ببێتە درێژکراوەی خۆی و لە هەمان کاتدا درێژکراوەی تالەباتی یا بارزانی. لەم مەسەلەیە لە ناوەندەکانی ئیستخباراتی تورکیا «MIT»دا زۆر مشتومری لەسەر کرا، بەلام سیاسەتی راست و رەوانی پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK» نەیهێشت ببێ. ترسان ئەم حیزبە وەك حیزبی کاری میللی «HEP»ی لێ‌بێ و خزمەتی شۆرش بکات لە بری دوژمنایەتی کردنی. لەم حیزبانە وەك کەلەبەرێك وان دەولەت هەقاسەی ئایدیۆلۆژی لێوە دەدات. لەوان ئێستاکە هەولدەدەن پەرە بە (حزب اللە) بدەن و بەرەو پێشەوەی ببەن بە پێی سەرنەگرتنی ئەزموونەکانی پێشوویان کە تێکۆشان گوندپارێزان و رێبازە سولیگەریەکان و میللی‌گەری سەرەتایی بارزانی و تالەبانی پێ‌بخەنە کار. ئەزموونێکی هاوچەشنیش هەبوو، لە کاتێکدا دەولەتی تورکیا ویستی چەپی تورکیش بخاتە کار بەوەی کە هەندێك دەوری بداتێ. ئاپشارەوە لەم بابەتەدا وەك جاران کەمێك دوو دلیم هەیە.

ی.ك: دەکرێت بە کەمی ئەم لایەنەمان بۆ باس بکەن؟

س.پ: من باسی هەندێك حەسێبکاری و گرەو دەکەم کە شۆرشگێران و ریفۆرمیستانی چەپی تورك لەسەر بەرەنگاربوونەوەی (PKK) دەیانکردن. من ئالێم ئێمە بەلگەیەکی بێ‌ئەملاوئەولامان لەسەر ئەم حەسێبکاریانە پێیە. بەلام بە پێی لەو ئاکامە سیاسیانەی کە دەرکەوتن گومانمان زۆرن.

ی.ك: لەمەرەی (حزب اللە) لە کوردستان و لەمەرەی تالەبانی و بارزانی لە باشوری کوردستان، بەلام لە تورکیا ـ واتە بەرەی خۆرئاوا ـ یەکێك یا دووان لە چەپی تورك هەیە.

س.پ: دەتوانم وەك نموونەیەك بۆ گفتوگۆکەمان باسی مەسەلەی ڕێگای شۆڕش «DEV-YOL»ت بۆ بکەم. هێندێکیان دەڵێن: «DEV-YOL» تووشی ئابڕاسی ترۆتسکی بووە. بۆیە پەرشاستینی. هێندێکیشیان دەڵێن: زۆرلێکراو و سەرکوتکراوە و ناتوانێ سەری خۆی بەرزبکاتەوە. بەڵام وەك دەبینن ئەمە ڕاستی نییە.

تاکە هۆش بە ڕای ئێمە ئەوەیە کە «DEV-YOL» وردەبوورژوا لە ناو پێکهاتەکەیدایە ئەگەر خەباتی «DEV-YOL» شانبەشانی خەباتی «PKK» پەرەی سەند، ئەوسا شۆڕشێکی سەرتاسەری بەرپا دەبێ و ڕژێمی تورکیا ژێرەوژوور دەبێ؟ لەبەرئەوە حەزناکەن خەبات سەربخەن. پێویستە بەم شێوەیە لەوە حاڵی ببین. ئەوان حەز بە هەرەس هێنانی دەوڵەتەکەیان ناکەن و لەو کارانە پەشیمان بوونەوە کە پێشتر کردیانن و کشانەوە و لە جێی خۆیان دانیشتن. بۆیە پەرەسەندنی شۆڕشی تورکیا گرێدراوە بە سەرکەوتنی «PKK»ەوە، خۆ «DEV-YOL» یا حزبی (ڕێگای شۆڕش) حیزبێکی میللی بزر، بێدەنگی یەکجارەکی بەرخودانی شۆڕشگێڕانەی و پێنانیە سەر ڕێگای ڕاساختەی سەرلێشێوێن و ئەم شێوە جەماوەر خەڵەتاندنەی، چەند کارێکی جێی بیرکردنەوەن و دەبێ لەمە تێبگەین.

ی.ك: مەسەلەی «DEV-YOL» جێی مشتومڕە و هەمووان قسەی لەسەر دەکەن.

س.پ: ئەوانە مشتومڕی ساختەن. من بە تایبەتی بانگی شۆڕشگێڕە دڵسۆزەکان دەکەم و دەڵێم: ئەم مشتومڕەیان ساختەیە و «DEV-YOL» کەبەر دووچاری لەشکەنجەدان بوون یا لەبەر بێتوانایی خەباتی خۆی ڕانەگرتووە. نەخێر، بینینی بەرخودانی هەڵکشاوی «PKK» هەڵوێستی دەوڵەت شلوق دەکات و ئەوانیش ئەوەیان پێخۆش نییە و نایانەوێ خەباتیان ببێتە پشتیوانی خەباتی «PKK»، بەڵکو حەزدەکەن هێزی دەوڵەتی تورکیا ڕوو لە زیادی بکات. بۆیە لە کارەکانی پێشوویان پەشیمان بوونەوە و لە ماڵی خۆیان دانیشتن و دەستیان لە خەبات هەڵگرت. واتە ئەوان ئامانجیان دەست گرتن نییە بەسەر دەوڵەتدا بە شۆڕش. ترسی بنچینەییان لە سەرکەوتنی شۆڕشەوە بە ڕێبەری «PKK» سەرچاوە دەگرێ. من وای دەبینم کە ئەم ڕوونکردنەوەیە زۆر گرنگە و پێویستە پەرەی پێبدرێت.

ی.ك: سەرکردەی ئازیزم، بە ڕای من ئەگەر گوتتان بە تەنیا «DEV-YOL»ەوە زوڵمی لێدەکەن، چونکە هەموو چەپڕەوەکان نایانەوێ هیچ بکەن و ئێستا بۆ لەوە کەوتوونەتە مشتومڕ کردن.

س.پ: ئەمە ڕاستە. بەشێکی زۆریان بە خەیاڵی ئەو ترسەوە دەژین کە سەرکەوتنی «PKK» دەیخاتە دڵیانەوە و هەڵوێستیان بەرانبەر بە دەوڵەتی خۆیان لەو قەوزانە دەچێت کە ئاویان لێدەبڕێ. بۆیە پاشەکشەیان کرد و لە ماڵی خۆیان دانیشتن . ئەوان دەوڵەتی خۆیان ناترسێنن. بەڵکو «PKK» دەترسێنن. ئەم

تێبینییە زۆر گرنگە. ئەوان بە پێی ئەم چەمکە ئارەزووی شۆڕش ناکەن، لەبەرئەوە نا کە ناتوانن بەڵکو لەبەرئەوەی کە دەترسن شۆڕشەکەیان بە کردەوە خزمەتی پارتی کرێکارانی کوردستان «PKK» و خزمەتی گەلانی دیکە بکات. ئەوە بوو دەست بەرداری بوون. ئەوانە دەچنە نێو چوارچێوەی چەمکی سۆشیالیزمی شۆڤێنییەوە.

ی.ك: دەمەوێ لە ڕوانگەی دەوڵەت و هەڵوێستییەوە قسەبکەم. کاتێك زانکۆی ئازادمان دامەزراند و کەوتینە سەراخی جێگایەك بۆ تێدا گوتنەوەی وانەی کردنەوەی زانکۆ، لە جێگادۆزینەوەدا گەلێك دژواریمان تووش هات. بەو بەهانەیەوە کە ئیسماعیل بێشکچی دێت و پڕوپاگەندە بۆ میللەتی کورد دەکات و گوتەکەی دێتە سەر چەند مانا و چەمکێك کە بانگهێشتن بۆ دۆستایەتی لەگەڵ «PKK»دا دەکەن. جا هەر لەم گومانەوە جێگایەکیان نەداینێ. ئەمە لە کاتێکدا کە شتی وا ڕووی نەدا. دەوڵەتی تورکیا بەرانبەر بەوە ڕێیدا لە مەڵبەندی ڕۆشنبیری (ئەتاتورك) کۆڕێکی پرسە بۆ خاتوو (بەهیجە) بکرێت لە یادی کۆچی دواییدا و هەروەها کۆڕێکی پرسەش بۆ (عەبدوللا باشتورك) بکرێت لە هەمان مەڵبەند. دەوڵەت کاتێك هیچ ئاکەی توانایەکی گەورەت دەداتێ، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە قەرەتان ناکەون وەك مامۆستایانی زانکۆ و هونەرمەندانی شانۆ و هونەرمەندانی دەوڵەت کە لە کۆڕی پرسەی خاتوو بەهیجەدا قسەیان کرد.

س.پ: بێ‌گومان، ڕۆشنبیرانی تورك و چەپی تورك لە نێو خۆیاندا پێکهاتوون هیچ کارێك نەکەن زیان بە دەوڵەتەکەیان بگەیەنێ. دەوڵەتیش پێ بەپێ لەسەرئەوە پاداشتیان دەداتێ، لە کاتێکدا زۆر لەوانە بوونە خاوەن کار و وایان لێهات پارەیەکی زۆر و زەبەندیان هەبێ، لەوانە شۆڕشیان ناوێ. بەڵام هەر ئەوەیان لێ‌داواکراوە ناوی شۆڕش لەکەدار نەکەن و گەمە بە ناوی مەزنی وەك (شۆڕش و چەپ و سۆشیالیزم)یش نەکەن، چونکە ئەوە دەکەن و دەیانەوێ بەم کارەشیان چەندەها قەیران و کۆسپ لە بەردەم گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانەدا بخوڵقێنن.

ڕەنگە ئەم بارودۆخە بێ‌بانگەبەنێتە ڕادەی نوکەرایەتی کردن. ئەوان دەیانەوێ بەوە دەرگاکان لەسەر ئەو گۆڕانکاریە تازانەدا دابخەن کە لەوانەیە ڕووبدەن. ئەوانن لافی ئەوە لێدەدەن کە لەم مەسەلەیەدا پسپۆڕن و لەبەرئەوە دەوڵەت داوایان لێ‌دەکات ببنە کۆسپ لەبەردەم گۆڕانکاری تازەی چاوەڕوانکراودا و لەسەر ئەوە پاداشتیان دەداتێ.

ی.ك: باشە. ئایا دەتوانم پشت ئەستوور بە قسەکانتان ئەم ئەنجامانە بە دەست بێنم؟ ئەوە لە قسەکانتان حاڵی بووم کە پەیدا بوونی «PKK» ئەو چەمەڕوانەی گێڕایەوە نێو باوەشی دەوڵەتی تورکیا کە لە ساڵانی شەستدا لێی جوێ‌بوونەوە. ئەمە کێشەیەکی تێکهەڕیوە، «PKK» گەیشتووەتە قۆناغێك سنووری کوردستانی بەزاندووە و وای لێهاتووە کاردەکانە سەر هەڵوێست و ڕژێمی دەوڵەتی تورکیا لە ناوەوەی تورکیادا و هەڕەشەیەکی گەورەی بۆ پێکدەهێنێ. سەرئەنجام ئەو

چ چەمکێکی شۆڕشگێڕی لادەر پشت لەستوورە؟ چ شۆڕشگێڕییەك دەتوانێ بزاڤێکی شۆڕشگێڕی وەك «PKK» کە هەموو هەوڵێکی خۆی داوە و بەم قۆناخە گەیشتووە، بانگە بکات بۆ ئەوەی ببێتە حیزبێکی سیاسی ڕەوا لە نێو یەکێتی میللەتی تورك و یەکپارچەیی خاکەکەیدا؟ من گومانێکی زۆرم لەم هەڵوێستانە هەیە. من ناتوانم پێیان بڵێم: ئەوانە نۆکەرن و واو وا. بەڵام دەڵێم: دەبێ ئەم هەڵوێستانەیان باش شیبکرێنەوە و ڕەچاوبکرێن. من هەوڵدەدەم ئەو شۆڕشگێڕانە لەم مەسەلەیە وریا بکەمەوە کە ئەم بزاڤانەدان و پێیان بڵێم: ئەوەی کە دەیکەن باش هەقی خۆی بدەنێ. ئەگەر بەرهەڵستی دەوڵەتن و بیر لەوە دەکەنەوە بەرهەڵستیان هەڵبگێڕنەوە بۆ شۆڕش، ئەوسا پێویستە لەسەرتان بگەڕێنەوە و بە هەڵسەنگاندنی «PKK»دا بچنەوە، دەنا هەردووچاری هەڵسەنگاندنی جێی گومانی ئێمە یا کەسانی دیکە دەبن.

ی.ك: ئاپۆی برام، لەم گفتوگۆیەماندا تۆ قسە دەکەی و من گوێ دەگرم و هەوڵدەدەم هەموو قسەبەکتان لێکبدەمەوە. بەڵام ئەگەر ڕێم بدەن ئەم پرسیارەتان لێدەکەم. ساڵی ١٩٩٢ ساڵێکی گرنگ بوو لە مێژووی «PKK»دا، لە کاتێکدا توانی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و لە ئەورووپادا خۆبسەپێنێ و کارێك بکات هەمووان بە درێژی باسی بکەن. توانیشی بەشێکی گەورەی باکووری کوردستان بخاتە ژێر دەستی خۆی، بە ڕادەیەك دەوڵەتی تورکیا هەستی ون بوونی لەلا پەیدا بووە. ئایا دەتوانین بڵێین: ئەو بزاڤە چەپڕەوانەی کە لە ساڵانی شەست و حەفتاکاندا لە دەوڵەت دوورکەوتنەوە و دووبارە هاتنەوە و لەگەڵ دەوڵەتدا ڕێککەوتنەوە و هێندێکی دیکەیان چوونە نێو جوغزی ئایدیۆلۆژی دەوڵەتەوە. واتە لە لایەکەوە(PKK) وەك هێزێکی بنچینەیی بوونی خۆی سەلماندووە و لە لایەکی دیکەوە چەپی تورك خڕبوونەتەوە و ڕوو بە دەوڵەت پێشبڕکێیانە. ئایا ئەمە لە خاسیەتەکانی ساڵی (١٩٩٢)ە؟ ئێمە ئەم بارودۆخی دوورەپەرێزی و گوشەگیرییە ڕاستەقینەیەمان بەستووە و «HEP»یش بەستوویەتی. ئایا پێشبینییەکانتان چین کە لەوانەیە ئەم بابەتە ڕۆشن بکەنەوە؟ واتە چەپی تورك بە تێپەڕینی ڕۆژگار یا دەبێ بە تەماشاکەر یا وەك ئێوە بە نموونە ڕووناکتان کردەوە.

هەروەها هێندێك سیاسەتمەداری چەپ داوای ئەوە دەکەن (PKK) ببێ بە حیزبێکی یاسابەند. ئایا ئەمە ڕاستە؟ من ئەم داواکردنەیانم پێسەیرە!

## دەوڵەتی تورکیا لە مەسەلەی «PKK»دا تووشی هەژانێکی گەورە بووە و لە هەژانێکی گەورەدا دەژی نەك هەر لەم حەفتا ساڵەی دوایی، بەڵکو لە سەرتاسەری مێژوویدا بە قۆناخی عوسمانیەکانیشەوە.

س.پ: ئەمە لەگەڵ قسەکانی پێشوومانندا ناکۆك نییە. ئێمە بە گشتی بە چەپگران دەڵێین:(سۆشیالیزمی شۆڤێنی). هەرچی پێوەندی بە سیاسەتی

چەپڕەوانەی کە لە دوا دواییەکانی ساڵانی شەستدا لە دەوڵەت هەڵبڕان، گەڕانەوە و لەگەڵیدا یەکیانگرتەوە.

س.پ: بەڵێ. ماوەیەکی کورت لێکهەڵبڕان و لێکدووركەوتنەوە لە ئارادا بوو. بەڵام سەرکەوتنی «PKK» وای لێکردن بە خێرایی بگەڕێنەوە نێو باوەشی دەوڵەتەکەیان.

ی.ك: لەم بارەیاندا دەتوانین بڵێین ئێمە هاتینەوە بۆ بارودۆخی پێشوو، چونکە جاران چەپ بە پێیەکی پشتی بە دەوڵەت دەبەست.

س.پ: با لەم بارەیەوە بڵێین: کەرتی چەپڕەوی دەوڵەت، چونکە لایەنی چەپی دەوڵەت وەك یەدەك وایە. حەزدەکەم باسی هێندێك ڕەنگدانەوەی ترسناك بکەم. من وای دەبینم کە هێندێك لەو لایەن و ڕێکخستنانە کە هەڵوێستی بە ڕواڵەت توند بەرانبەر بە دەوڵەت دیاری دەکەن و وا خۆ دەردەخەن کە لە ڕیزی کێشەی کورددا ڕادەوەستن، ئەوی ڕاستی بێ هەوڵدەدەن گەمە بەو دەسکەوتانە بکەن کە «PKK» مسۆگەریان دەکات. دەکرێت ئەوانە بە ڕیفۆرمیست یان سەرپەڕگری وردەبۆرژوا یان هەر ناوێکی دیکە ناودێر بکەین. ئەو شتە ئاشکرایەی کە ئێمە لێی دڵنیاین ئەوەیە ئەوانە لەگەڵ «PKK»دا ڕاستگۆنین. بەڵکو هەوڵدەدەن بنیشنە سەر دەسکەوتەکانی «PKK» و بەری کاریگەری شۆڕش بخۆن. نموونەی ئەوانە، دەیگوت: (DEV-YOL) لەبری ئەوەی بکشێینەوە بۆ نێوباوەشی دەوڵەتەکەمان. بۆچی هەنگاوێك بۆ پێشەوە نانێین ئێمە دەتوانین لە (PKK) زیاتر چالاکی بکەین و لەوان باشتر بانگهێشتن بۆ میللەتی کورد بکەین. دەیانەوێ بەمانە دەست بەسەر هێندێك جێگای پێشەوەدا بگرن. ئەگەر ئەوانە لە بانگهێشتنەکەیاندا ڕاستگۆ بوونایە، بە ڕاستی لایان لە مەسەلەی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) دەکردەوە. لە کاتێکدا ئەوان لە هەموو ناوەندەکان کەمتر بە ڕاستی دەڕواننە (PKK) و سەرقاڵی ئەو حسابانانەن کە چۆن (PKK) لەناوبەرن. لەنێوبردنی (PKK) خزمەتی بەرژەوەندی دەوڵەت دەکات و بگرە ئامانجی یەکەمی دەوڵەتە. ئەوانە چەندە لافی شۆڕشگێڕی و چەپڕەوی لێبدەن، لەوا بیروڕاکەیان کە مەبەستی تەگەرەنانە ڕێی کاریگەری «PKK»یە لەگەڵ ئامانجی دەوڵەتدا یەکانگیر دەبێ. دەوڵەت دەیەوێ (PKK) لە پاشکۆدا بمێنێتەوە و هەر جەنجاڵی سیاسەت بێ، ئەمەش واتە لەبەر بەئعەلۆمشان و توانەوە. بەڵام ئەمانەی دوایی دەڵێن: «چالاکیەکانی (PKK) سەرپەڕگرن». لەوان بەم پێیە پەلامارمان دەدەن و بە خۆیان دەڵێن: «تاقەکەمان ئاوا شۆڕشگێڕن». هێندێك چالاکیش دەکەن، تا بتوانن ئەم قسەیە دەربهەڕێنن. لە کاتێکدا دەکرێت بە شێوەیکی چەپ شێوازی دژ بە «PKK»یان دابنێین. ئەوەی لەمەوە بە ئامانجی دێنین ئەوەیە: ئەوانە هیچ شکردنەوەیەکیان نە لەسەر کوردستان و نە لەسەر «PKK» نییە. با ئەمە بخەینە لاوە. ئەوانە تەنانەت یەك پەیاوی زانستی باش و شەرمەندیان لێیە، دەنا چۆن دەتوانین هەڵوێستی دژ بە شۆڕشی کوردستانیان لێكبدەینەوە و ئەم هەڵوێستە بە

پاراستنی جێ و ڕێی خۆشیانەوە هەیە لە لای دەوڵەت، ئەوە ئێمە ئەم وەزعەیان وا هەڵدەسەنگێنین کە سەلماندنی هەڵسەنگاندنەکەی ئێمەیە. ئێوە هەڵسەنگاندنێکتان هەیە ئێمەدا دەڵێن: تورکیا لە قۆناخێکی پاش کۆماردا ماوەیەك پێشکەوتنی بە خۆوە دی. لە ساڵانی پەنجادا پاشەکشەی کرد و لە دوادوایەکانی ساڵانی پەنجادا کەمێك پێشکەوت و لە ساڵانی شەستدا پاشەکشەی کرد. ئەو پێشکەوتنەش کە لە ساڵانی حەفتادا جێی خۆی کردەوە، لە ساڵانی هەشتادا پاشەکشەی کرد. لە ساڵانی نەوەدیشدا قۆناخی پێشکەوتن دەست پێدەکات. دەتوانن لەم لایەنەوە چاوەڕانی گۆڕانکاری پێشکەوتنخوازانە بکەن بە کاریگەری (PKK). ئەمەیان قۆناخی پێشکەوتنە. چەندین بەڵگەمان لەسەر ئەوە هەیە. لەوانەیە گەلێك گۆڕانکاری ڕادیکالی‌یانە لەو کەرتەدا ڕوو بدەن کە سۆشیالیزمی شوێنی کاری تێنەکردوون، چونکە نە چەپی پێشکەوتووخواز و نە هیچ هێزێکی دیکە پێی ناکرێ بە بێ کارتێکرانی بە (PKK) هیچ پەرەسەندنێك تۆماربکات. بۆیە من وای دەبینم ئەم قۆناخە تازەیە زۆر گرنگ دەبێ.

ی.ك: گەورەم.... ئەمە دەرچوون نی‌یە لە باسەکە، بەڵکو بۆ ئەوەیە چی لەسەر (PKK) هەیە بیسەلمێنم. ئێمە ئەو دۆخە بە ڕوونی دەبینین کە باستان کرد، چونکە لە ڕۆژنامە نووسیدا کاردەکەین. دەوڵەت لە ساڵانی پەنجادا زۆر ڕقی لە ستالین بوو. ئەوسا لە ئەستەمبوڵ لە دواناوەندی دەمخوێند. مامۆستایەکی بە توانامان هەبوو وانەی ئەستێرەناسی پێدەخوێندین. کتێبێکی دانا بوو. ڕۆژێکیان وێنەیەکی بە قەدەر سەری دەنکە شقارتەیەکیان لەلا دۆزییەوە. ئەو وێنەیەیان بە ستالین شوبهاند. هیچ جۆرە ئەشکەنجەیەك نەما کە ئەم داماوە بە هۆی ئەم وێنەیەوە نەیچێژێ! مەسەلەکە لەو ڕۆژانەدا ئاوابوو. ئێستا دۆخەکە لە تورکیا بەم شێوەیەی لێهاتووە: دەوڵەت دوژمنایەتی ئەو کەسە دەکات کە دوژمنایەتی (PKK) نەکات. بەو پێیە لەوەی وا دوژمنایەتی (PKK) دەکات لەلای دەوڵەتی تورکیا پلە و پایەیەکی تایبەتی هەیە.

س.پ: ئەمە لە ئایدیۆلۆژی دەوڵەتەوە سەرچاوەی گرتووە؟

ی.ك: بەڵێ، وەك لە قسەکاندا ئاماژەتان بۆ کرد، ڕەنگە ئەگەر یەکێکی دیکە بە دیمەنی (PKK)وە دەرنەکەوێ ئەوە کاریگەری‌یەکی زۆری هەبێ. لەوانەشە ئەمە چەند نەخۆشی‌یەکی ترسناکی لێبکەوێتەوە. پێویستە بایەخ بەوە نەدەین. منیش هاوڕای تۆم.

س.پ: ڕاستە، دەوڵەتی تورکیا لە مەسەلەی (PKK)دا دووچاری چەندین هەژانی گەورە دەبێ. لە گەورەترین هەژاندا دەژی نەك هەر لەم حەفتا ساڵەی دواییدا، بەڵکو لە سەرتاسەری مێژوویدا بە قۆناخی عوسمانیەکانیشەوە. ڕاپەڕینەکانی جەلالیەکان و شۆڕشی شێخ بەدرەدین گشتیان بنچینەکانی دەوڵەتیان تووشی ئەم جۆرە هەژانە نەکرد. ئاخۆ دەبێ ڕاپەڕینەکانی جەلالیەکان و بەدرەدین چەند ساڵی خایاند بێ؟ هیچ ڕاپەڕینێك نی‌یە توانیبێتی وەك ئێمە خۆی ڕاگرتبێ و نەیتوانیوە هێندەی شۆڕشەکەمان ببێتە موڵکی گەل.

ئێستاکە دەوڵەتی تورکیا لە سایەی هەڕەشەیەکی توندا دەژی و هەوڵدەدات لە ڕێگای هێندێك گەلەکۆمەی سیاسی و سەربازییەوە لە تەنگژەی خۆی دەربازبێ. بێلە ئەمەش بڵێم: دەوڵەتی تورکیا لە ساڵانی حەفتادا ـ زانیبێتی یان نا ـ هەوڵیدا تایبەکاری بۆ ئەوە بکات کە ئەمڕۆ ڕوو دەدات. بۆیە لەلایەکەوە حیزبی بزووتنەوەی نەتەوایەتی (MHP)ی بەسەر کورددا سەپاند و، لەلایەکی دیکەشەوە سۆشیالیزمی شۆڤێنی، لە کاتێکدا ئەو ڕۆژانە ڕێگە چارەی سەربازی لە گۆڕێدا نەبوو. پێی وابوو دەتوانێ بە چەند پۆلیسێك مەسەلەکە تەمێلێ، بە تایبەتی کە دەستی کردبوو بە پێوەندی کردن بە میللیگەری سەرەتاییەوە کە درێژکراوەی بارزانی بوو. دەوڵەتی تورکیا لەگەڵ ئەم تەوژمەدا هاوئاهەنگی دەکرد بۆ دەستگرتن بەسەر باشور و ناوەڕاستی کوردستاندا و بەوپەڕی وریاییەوە چاودێری گۆڕانکاریەکانی دەکرد. بەڵام دەوڵەت لە بەرەی چەپی کورددا، بە هۆی هێزەکانی سۆشیالیزمی شۆڤێنییەوە چاودێری دەکردن.(PKK) خەباتێکی لە پسان نەهاتووی دژی ئەم دوو هێزە بنچینەییە کرد. حیزب ئەوەندەی ڕووبەڕووی میللیگەری سەرەتایی بووەوە، لە ڕووی سۆشیالیزمی شۆڤێنیشدا ڕاوەستا و هەر لە ساڵی ١٩٧٥ بەدواوە خەباتێکی ئایدیۆلۆژی کرد. سەرەنجام کۆمەڵێك مناڵمان لە شێوەی کۆمەڵێکی ئایدیۆلۆژیدا بۆ پەیدا بوو. ئەم کۆمەڵە کەوتە ناوزڕاندن و ناوەڕووتکردنی میللیگەری سەرەتایی لە نێو جەماوەردا. هەروەها خەباتێکی دیکەی کرد دژ بە سۆشیالیزمی شۆڤێنی کە خۆی لە حیزبی کۆمۆنیستی تورکیا (T.K.P)دا دەنواند و بەربەرەکانێی ئەو تەوژمەی سۆشیالیزمی شۆڤێنی کرد کە چاوی لەم حیزبە دەکرد و پشتی پێدەبەست. ئەم کۆمەڵە ئایدیۆلۆژییە بە تێپەڕینی ڕۆژگار لە ڕادیکالیزم نێزیك دەبوەوە تا بووە بزووتنەوەیەکی ڕزگاری نیشتمانی. دەوڵەت بە کودەتای فاشی (١٢)ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ بەرپەرچی ئەم پەرەسەندنەی دایەوە. سەرباری ئەوەی کە چەند هۆیەکی دیکە هەن بۆ هاتنی ئەم ڕژێمە، بەڵام هۆیە سەرەکییەکەی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان بوو. هێرشی دەوڵەت بۆ سەر ئەو تەوژمە کە «PKK» پێشەوایەتی دەکرد زۆر سەخت بوو. ئەو کوشتارانەی کە لە (مەرەعش) کران هەر بەڵگەیەکی ڕوونن لەسەر ئەم دڕندایەتیە. دەوڵەت بەم کوشتارانە وا تێگەیشت ئەو هێزەی کە دەبێ سەرکوتی بکات (PKK)یە. بۆیە وای لێکرد ئەم حیزبە بە هۆی کودەتای (١٢)ی ئەیلوولی دابنێ!

بێگومان ناوەند و دەستەوتاقمەکان لە نێو چوون و سەرکوت کران و تەنها (PKK) بەرانبەر بە ڕژێمی (١٢)ی ئەیلوول مایەوە کە هێندەی نەبرد بە قەڵەمبازی پڕ سەروەری (١٥)ی ئاب وەڵامی درایەوە! ئەم قەڵەمبازە وەك هەنگاوێکی زۆر بەجەرگانە وابوو. دوژمن لە ئەنجامی ئەوەدا واتێگەیشت کە ئەیدی بوار لەبەردەم ڕوودانی گۆڕانکاری گەورەدا کراوەیە. لە کاتێکدا دەوڵەت پێیوابوو هەر لەساڵی ١٩٨٥ دا قەڵەمبازی (١٥)ی ئاب نائەنێلێ. ڕشکبوو دوژمن لە پلانەکەیدا

سەربکەوێ، ئەگەر لێهاتوویی(PKK) نەبووایە بۆ خۆتازەکردنەوە کە لەم هەلەی لە دەست دوژمن دەرکرد، بە تایبەتی لە کاتی کۆنگرەی سێیەمدا کە سالی ١٩٨٦ کرا و حیزب توانی پێداچوونەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و ڕێکخراوەیی و چەند شیکردنەوەیەکی نوێ بکات و کەوتە خۆ کۆکردنەوە تا بە کردەوە لە سالی ١٩٨٧ دا جێبەجێیان بکات. ئەمە وای لە دەولەت کرد ڕەوشی ئاوارتە لە کوردستاندا ڕابگەیەنێ و پەیوەندی لەگەل گوندپارێزاندا توندوتۆل بکات و جارێکی دیکە خێلەکان پڕ چەک بکاتەوە و لە بری پالپشت کردنی ئایدیۆلۆژی کەمالی پشت بە ڕێبازە سۆفیتییەکان ببەستێ و هەولیدا گەل بە وەرزش و هونەر....هتد. سەرقال بکات و لەمپەری ئایدیۆلۆژی لەبەردەم خەباتی حیزبدا دابنێ. ئەوە بوو دەستی کرد بە پێکهێنانی هێزی تایبەتی نوێ سەربازی و ڕووبەڕووی حیزبی کردنەوە. دوا نموونە لەسەر ئەوە (حزب الله) بوو کە بنیاتێکی نوێ سەربازی هەیە. ویستی لە ڕێگای ئەم ڕێکخستنانەوە لەمپەرێکی ئایدیۆلۆژی و سەربازی لەبەردەم خەباتی (PKK)دا دابنێ. دەولەت تا ئێستا پێڕەوی ئەم گەمارۆدانە دەکات و ئەم لەمپەرانە دادەنێ.

جا کە دەولەت بۆی دەرکەوت ئەم کارانە بەس نین، پەنای بردە بەر نۆکەرایەتی کوردی و پالی پێوەنا ڕاستەوخۆ پەلامارمان بدات، بە تایبەتی وەک ئەوەی لە باشور ڕوویدا. لە کاتێکدا بە جۆرێکی گومان هەلنەگر ڕوون بووەوە کە نەتەوایەتی کوردی بارزانی شێوەیەکی پەرەسەندووی سیستەمی گوندپارێزانە و لەم ڕەوتەدا دەوری خۆی گێڕا. دەولەت پەناشی بردە بەر بەکارهێنانی (حزب الله)، بە تایبەتی لە ناوچەکانی نێزیک بە دەسڕۆیی ئێران. ئەوەش تەکانێکی خێرای بە ڕووداوەکانی ئەو ناوچانەدا. جا کە ئەم هەموو ڕێ و شوێنانە بەس نەبوون، دەستی کرد بە خستنە گەڕی گشت هێزە چەکدارەکانی لە هەموو ناوچەکاندا، هەموو ئەمانە ئاماژە هەم بۆ ئەو تەنگانەیە دەکەن کە دەولەتی تورکیای تێ کەوتووە و هەم سەرنەگرتنی سیاسەتەکانی کە سەرنەکەوتنیان بە نسیب دەبێ.

ی.ك: باشە. ئایا ئەمە مەترسی ناگەیەنێ بۆ سەر ئەنقەرە؟ مەبەستم ئەوەیە ئەم شێوە پەیوەندییە توندوتۆلەیان لەگەل بارزانی و تالەبانیدا سەبارەت بە تورکیا گەمەیەکی ترسناك پێکناهێنێ؟

س.پ: بێ گومان دەولەت هێزی کەمەترسی لەم چوارچێوەیەدا پێ باشترە، دیارە تورکیا یەخەگیری مەترسییەکی گەورە بووەتەوە و بۆ خۆ لێدەرباز کردنی پێی باشترە پەیوەندی لەگەل هی کەم مەترسییاندا ببەستێ. هەتا (حزب الله)ش مەترسییەکی پەنهان بۆ تورکیا پێکدەهێنێ. بەلام مەترسی گەورەتر خۆی لە پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)دا دەنوێنێ. لەبەرئەوە مامەلەکردن لەگەل (حزب الله)دا دەردەبات.

ی.ك: لەوەندەی لە دوورڕا بەدووی بابەتەکەدا چووم و بەوپێیەی کە سەرکردەی (PKK)ی، تۆ پشت بە سیاسەتێکی زۆر نەرم و نیان دەبەستی. حکومەتی

ئەنقەرەش هەرگیز بیری لەوە نەکردووەتەوە کە ڕەنگە ئێوە لەگەڵ ئەوانە و بەتایبەتی تاڵەبانیدا لێکحاڵی بن.

س.پ: بێگومان ئێمە گەمژە نین و دەتوانین سیاسەتەکانمان بە پێی هەلومەرج بەرە پێشبەرین. دەوڵەت هەوڵ دەدات بە تەنازولی بچووك بچووك مەترسییە گەورەکان نەهێڵێ. بەڵام ئاکامەکانی ئەم سیاسەتە چۆن دەبن و زیانەکانی چین؟ بۆ دەوڵەتی بە جێدەهێڵین یا بیری لێبکاتەوە.

ی.ك: بەڵام با ئەم بابەتە لە گۆشە نیگای تورکەوە بخەینەڕوو. ئەگەر لەم گۆشە نیگایەوە بڕوانین دەبینین (حزب الله) حیزبێکی ئاینی سەرپەرگرە لەلایەکی دیکەوە «PKK» بەرانبەر (حزب الله) بەرخۆدان و شەڕ دەکات. ئەمەش پڕوپاگەندەیە بۆ «PKK». ئایا گەل بەم شێوەیە لەم کێشەیە تێناگات؟

س.پ: بارودۆخی قورسی دەوڵەت زۆر ڕوونە. ئەو مامەڵە لەگەڵ حیزبێکدا دەکات کە ئەگەر کەرەستە و کارسازی تەواو ببن، لەوانەیە شەڕ لە دژی خۆی بکات. مەبەستمان (حزب الله)یە. واتە دەوڵەت مامەڵە لەگەڵ ئەم حیزبەدا دەکات و هەموو پێداویستێکی دەداتێ بۆ بەرەنگاربیمان. گومانی تێدا نییە کە ئێران مەترسییە بۆ تورکیا. ئێستاش دەوڵەت ناچارە مامەڵەی لە تەکدا بکات، لەویش بۆ لەڕوودا ڕاوەستانی (PKK). ئەمە بەڵگەی ڕادەی ئەو مەترسییەیە کە (PKK) بۆ تورکیای پێکدەهێنێ. کاتێك دەوڵەتی فیدراڵی کوردییان لە باشور ڕاگەیاند، لە بەرەنگاربوونەوەماندا ڕایانگەیاند. واتە ئێمە هۆی لەوە بووین تورکیا دەوڵەتێکی فیدراڵی کوردی لێببێ.

ی.ك: بێگومان، ئەگەر «PKK» نەبووایە، دەوڵەتی تورکیا ئەم کارەی پەسند نەدەکرد؟

س.پ: ئەمە زۆر گرنگە. دەوڵەتی تورکیا سەردەستەی داواکارانی بنیاتنانی ئەم جۆرە دەوڵەتە بوو و کۆمەکی پێشکەش کرد. ڕاگەیاندنی ئەم فیدراڵییە هاوزەمانی هێرشی هاوبەشیان بوو بۆ سەر ئێمە. واتە پێکهێنانی ئەم دەوڵەتە فیدراڵییە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە (PKK)ەوە هەیە. بە واتایەکی دیکە ئێمە بووین دەوڵەتی تورکیامان ناچارکرد ئەم جۆرە دەوڵەتە بخاتەوە.

ی.ك: بەڵێ. بە پێی ئەو پرنسیپەی کە باوەڕی بە «یەکێتی دژەکان» هەیە لە دیالەکتیکدا، ئێوە بوون واتان لە دەوڵەتی تورکیا کرد دەوڵەتی فیدراڵی کوردی لێ ببێ.

س.پ: (حزب الله)ش بابەتێکی هاوشێوە دەنوێنێ. ئێمەین وا لە دەوڵەتی تورکیا دەکەین پێکهاتەیەکی کوردی ئیسلامی بخاتەوە. بگرە چەند گۆڕانکارییەك لەم بارەیەوە لە ئارادان. ئاڵێی هەموو ئەمانە کۆمەڵە مەترسییەکن لەسەر دەوڵەتی تورکیا؟ چەند پێمگوتن من باش دەوڵەتەکەتان دەناسم، ئێستاکە ئەو تەنازولە گەورە ناوبراوانە پێشکەش دەکات. بەڵام ئەوانە هێشتا نۆکەرن و دەتوانن لەگەڵ نۆکەرانی کورد و لەگەڵ ئەمریکا و ئەڵمانیادا لێك تێبگەن.

هەرچۆنێك بێ ئەم گۆڕانكارییە هەرگیز لە بەرژەوەندی گەلی توركدا نین. حیزبێكی كوردی لە شێوەی (حزب الله) یا لەشێوەی (حزبی ڕەفاە)دا لە بەرژەوەندی گەلی توركدا نییە. شۆڕشگێڕان و پێشكەوتووخوازە توركەكان هەست بە هیچ بەرپرسییەك ناكەن بەرانبەر بەم مەسەلە گەورەیە و گەلەكەیانیان بێچەك لە بەردەم ئەم مەترسیە گەورانەدا بە جێهێشتووە.

ی.ك: باشە، بڕوانن هەموو كاتێك بیردەكەینەوە بۆ كوێ بڕۆین.

س.پ: پێویستە بیر لەمە بكەینەوە. ئەم مەسەلانە ڕۆژانە هەزار جار نەخشەیان بۆ دەكێشرێت.

ی.ك: كێ بەرهەلستی (مسعود یەلماز) بوو؟ (محەمەد كەچە جیلەر و عەبدولقادر ئاقسو) و كەسانێكی دیكە. ئەی كێ لایەنگری (مسعود یەلماز)ی دەكرد؟ كچێكی گەنم ڕەنگ و توركووت ئۆزال! باشە لە كۆتایی ساڵی ١٩٩٢ دا چی قەوما؟ ئەمجارە توركووت ئۆزال خۆی كەوتە لایەنگری كردنی (محەمەد كەچەجیلەر و عەبدولقادر ئاقسو)و هەوڵیدا ئەم تاقمە ئاینداره بۆ پێشەوە بهات. واتە هەوڵیدا جارێكی دیكە حیزبی نیشتمانی دایك (ANAP) بخاتە ژێردەستی نەقشبەندی. ئایا ئەمە دەچێتە نێو ئەو چوارچێوەیەی كە نەخشەم بۆ كێشا؟

س.پ: با بەشێوەیەكی زیاتر واقیع بینانە لا لەم بابەتە بكەینەوە. لەوانەیە ئەم ناكۆكییە ئەنجامی جۆری پێوەندییەكان بێ لەگەڵ وڵاتە یەكگرتووەكان و ئەڵمانیادا. لەوانەشە بە هۆی سەركەوتنی (حزبی ڕەفاە)ەوە بێ. من بێ ئەملاو ئەولا ئاڵێم وایە. بەلام ئەمە چاوەڕوان دەكەم. ئۆزال كەسێكە مەسەلەی (PKK)ی بە قووڵی وردكردەوە و بە پێی ئەم وردكردنەوەیەی خۆشی، هەنگاو دەنێت. بۆ نموونە من ڕێگای تایبەتی خۆمم لە هەڵسەنگاندنی كادیرانی حیزبدا هەیە. ڕەنگە بە توندونیژی ڕێیان نیشان بدەم. بەلام سەرەڕای ئەوە من لەبنچینەدا پارێزگارییان دەكەم و هەمیشە وەزیفەیان پێ‌ئەسپێرم. ڕەنگە ئۆزال لەبەر ئەوە ئەمەی كردبێ كە ئەو كەسانە ئاقمی ئیشی خۆی دەڕوێنن و لە ماوەیەكەوە بۆ ماوەیەكی دیكە هێندێكیان پێش دەخات و هێندێكی دیكەیان پاش دەخات و بە پێی ئەو مەترسییەی كە بەرەو ڕووی دەبێتەوە هەنگاو دەنێت. پێم وانییە بیرای بیر دەنگی لە (مسعود یەلماز) بڕیبێ. لەوانەیە لەبەر هۆیەكی تەكتیكی مسعود بە تەنێ بە جێبهێڵێ. پێدەچێ مەبەستی ئەوە ڕاگرتنی سەركەوتنی (حزبی ڕەفاە) یان لانی كەم سوود وەرگرتن بێ لەو ئیشاوە ئاینیەی كە بەرێوەیە.

ی.ك: بەلام لەوە دەچێ ئەوانە لێك‌هەڵببڕێن. هەموو حیزبێك لە توركیا قۆناخێك حوكم دەكات و پاشان دابەش دەبێ. هەموویان دابەش دەبن.

س.پ: ئێستا لاتان لە بابەتی دروست بوونی حیزبە توركیەكان كردەوە. با لەم هەڵسەنگاندنەماندا بە كورتی بچینە سەر ئەم بابەتە. دروست بوونی حیزب لە توركیا هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا بە پێی بەرژەوەندی دەوڵەت بووە. دەوڵەتی توركیا بە هۆی ئەم حیزبانەوە ڕوو لە ڕاست یا چەپ دەكات بۆ پەروەش

بەسەرکردنی سیاسەتەکانی. ئەگەر بەرژەوەندییەکانی وای خواست ببێتە خۆرئاوایی یا بەسەر بابەتێکی دەست نیشانکراوەوە بگیرسێنەوە، لەوسا پەنادەباتە بەر داهێنانی ئەم حیزبانە. ئەگەر بڕوانینە مێژووی تورك، دەبینین ئەم حیزبانە بنکەی کۆمەلایەتییان نەبووە و کە دروست بوون نە پشتیان بە بنچینەی چینایەتی بەستووە و نە بە قازانجی کۆمەلایەتی و دەسکەوتی چینایەتی. هەر لە (جون تورك)ەکانەوە بۆ (نامق کمال) و تا دەگات بە (ئیتحادو تەرەقی)، هەموویان لە شەتلجاری دەولەتدا نەشونمایان کردووە. خۆ حیزبی کۆماری گەل (CHP) حیزبی دەولەتە و حیزبی دیموکراتی (D.P) حیزبێکی لە (CHP) هەلبڕاوە و ئەوی دیش لە (D.P) هەلبڕاوە و بەم پێیە تا بەم ڕۆژمان دەگەین. دەبینین حیزبی نیشتمانی دایك (ANAP) سوپای فاشی ڕژێمی (١٢)ی ئەیلولە. لێکهەلبڕانی ئەم هەموو حیزبانە چی دەگەیەنێ؟ ئەمە بەلگەی ئەوەیە کە سیستەمی حیزبی بێسوود بووە و ئەوەشی لەبەر یەکهەلوەشان هاتووە و ناتوانێ لەبەردەم سەرکەوتنی (PKK) خۆ ڕابگرێ. بۆیە ئەم حیزبانە لێکهەلدەبڕێن. واتە هەر کاتێك لە ڕوودا ڕاوەستانی دەولەت بەهێز بوو، سیستەمی سیاسی و سیستەمی حیزبەکان دووچاری ئیفلیجی دەبن و دەسەلاتیان بەسەر ئیشدا ناشکێ. سیاسەتەکانی دەولەت و بەتایبەتی سیاسەتی حیزبەکانی بە گشتی مایە پووچ بوون. با(ANAP) چونی دەوێ وا دابەش ببێ و (١٠) حیزبی ڕاستڕەوی لێ ببێتەوە. با(SHP)یش دابەش ببێ و (١٠) حیزبی چەپڕەوی لێ ببێتەوە. ئەم هەموو حیزبانە تووشی ئابووتی دەبن. تەنانەت پەراگەندەیی و لەبەر یەکهەلوەشانی ئەم حیزبانە گرێدراوە بەمەوە. واتە حیزب لە تورکیا بە ڕاستی دروست نابێ، لە کاتێکدا حیزبی پێویستەی چینە کۆمەلایەتییەکان و کەرتەکانی کۆمەلگا لە ئارادا نین. بۆیە لەمانە حیزبی ساختە و هەموو ڕۆژێك هەلدەوەشێنەوە. ڕەنگە بلێن هەلبژاردن دەکرێت! بەلێ دەکرێت، ڕەنگە بلێن شێوازی لانی کەمی دەنگەکانیش هەیە و دەولەت شتی خۆی دەسەپێنێ. بەلێ یەکێك لەو دووانە دەبیاتەوە. بەلام ئەمە بە هیچ شێوەیەك وا ناگەیەنێ کە دەولەت لە دیاریکردن و دەست نیشانکردنی سیاسەتەکانیدا پشتی بە یەکێك لەو حیزبانە بەستووە. بنکەی دەولەت پەرش و بلاوبووەتەوە و کاریگەری بەسەر گەلەوە کەم بووە. بۆیە هەولدەدات لە ڕێگای ئەم حیزبانەوە کردەوە شێوێندراوەکانی خۆی بسەپێنێ.

ی.ك: بە پێی تێڕوانینی من، ئەو پیاوانەی کە ئێستا وان لە گۆڕەپانی سیاسەتدا، زۆر بەم نزیکانە لە گۆڕەپان نامێنن.

س.پ: تورکیا لە مەسەلەی سەرکردایەتیدا قەیرانێکی توندی تێدایە و سەرکردایەتییەکی گەورەی گەرەکە. چوار ساڵ دەبێ ئەمەم لە چەند چاوپێکەوتنێکدا خستووەتە ڕوو.

# ئەو مشتومڕانەی کە لە سەر کۆماری دووەم دەکرێن ئاکامی هەلومەرجە دژوارەکانن.

ی.ك: دیارە، گومانی تێدا نییە.

س.پ: ئۆزال وەك سەرکردەیەك جوولایەوە. لام وایە ئۆزال لە چوارچێوەی سەرکردایەتی تەکتیکی تێنەپەڕاند و سەرکردەیەك بوو لەسەر ئانیشك دەڕۆیشت. هێندێکیان گوتیان: ئۆزال بەجەرگ و سەرچڵ و سیاسەتمەدارە و سیاسەت پەرە پێدەدات. بەلام من گومانی خۆمم لەسەر ئەم مەسەلەیە پیشاندا، بە سیاسەتە کوردیەکانیشیەوە. خۆ هێندێکیان ڕەچەتەیان دەدایێ و ئەویش چەند شتێکی بە پێی ئەم ڕەچەتانە دەگوت.

ی.ك: ئۆزال هەل قۆزەرەوە بوو. ئەم جۆرێکەرەوەیەش بەوە لێکنادرێتەوە بەجەرگی بێ.

س.پ: بەلێ، بەلام «ئینۆنو» فەرمانبەرێکە دەولەت ڕووتاندیەوە، چونکە ڕۆشنبیری باوکی هاوتای بەرژەوەندی دەولەتە. هەرچی مەسەلەی (دیمیریل)یشە، واتە پێبەندبوونی دەولەت بە بالی ڕاست، بەلام بە شێوەیەکی زۆر کۆنەپەرستانە. هاتنە سەر حوکمی بۆ بە جۆرێکی گونجاو ڕاکێشانی پیاو ماقوولان و بازرگانان و بەگەکانی ئەنادۆڵ بوو بۆ دەولەت. لەبەرئەوەی کە لە پاشکۆوە دەولەتی گرتووە، هەر لە پاشکۆوە هەلیدەسووڕێنێ. لەبەر ئەوەش کە دەولەت کەسایەتیە فێلبازەکەی ناناسێ، چەندەها جار بە کودەتای سەربازی خرایە پەراوێزەوە. ئەوی ڕاستی بێ توانای سەرکردایەتی کردنی نییە و پێم وا نییە زۆر لە مەسەلەکانی سەرکردایەتی و دەولەت تێبگات. پێی دەکرێ ببێ بە پیاوماقولێکی باشی ئەنادۆڵ. ئێستاش دەتوانێ بە شێوەیەکی هێمن و بنچینەیی نوێنەرایەتی بەرژەوەندی بازرگانان و پیاو ماقوولان و ئاغاکان بکات و بنکەی میللی تارادەیەك پەل بهاوێژێ.

ی.ك: دەست نیشانکردنەکەی ئێوە لە تێبینی شەخسی مندا هەیە ئەویش ئەوەیە سەرۆکایەتی وەزیرانی دیمیریل و سەرۆکایەتی زانکۆی ئەردال ئینەنۆ و وەزارەتی حیکمەت چەتین یەکتری تەواو دەکەن.

س.پ: دەلێن: «دیمیریل کەمێك دیموکراسی هەیە، دەتوانێ لە کۆبوونەوە گشتیەکاندا جەماوەر بورووژێنێ و ناکۆکی لەگەل دەولەتدا هەیە». بەلام من ناچمە پال ئەم ڕایە. کابرایەکی دیموکراتی نییە.

ی.ك: ئێستا دیمیریل بە تەواوکەری (عیصمەت پاشا ئینۆنو) دادەنرێت.

س.پ: ئەگەر ئۆزال لە ئەتاتورك بچێ، ئەوا دیمیریل لە ئینۆنو دەچێ. دەکرێت ئەم جۆرە لێکچواندنە بکەین. ئۆزال پیاوی دەولەت بوو زیاتر لە هەر کەسێکی دیکە ڕاستی ئیشی دەولەتی دەزانی و دەیتوانی خێرا لەگەل ئیشەکەیدا بگونجێت. ئاوا دەتوانین هەلیسەنگێنین.

ی.ك: ئۆزال توانی زۆر لەو قالبانە بشكێنێ كە كەسانێكی دیكە پێیان نەكرا بیكەن. بەڵام نەیتوانی شتێكی دیكە بخاتە جێگایان.

س.پ: شكاندنیان گرنگ نییە. ئەو باش میكانیزمی كاری دەوڵەت دەزانێ و دەتوانێ لەو میكانیزمانە تێكبشكێنێ كە لە كاركەوتوون و هەوڵبدات ئەم میكانیزمانە دروست بكات. بۆ نموونە، دەبینی گەلێك لە سیاسەتەكانی دەوڵەت پڕ بەپێستی سەرمایەداری نین. لۆمە دەكرێت چونكە هیچ ناكات.

ی.ك: پێم وایە ئێستا كۆڵەكەكانی ڕوو لە نەمانن و وەزعی شلۆقە، چونكە زۆر كەس باوەڕی پێناكەن.

س.پ: وەك تاوێك لەمەوبەر باسم كرد، سەركردایەتییەكی تەكتیكییە، تەكتیكی سوپا و تەكتیكەكانی ئەمریكا جێبەجێ دەكات. دەستبژە خێرا گیرفان پڕكەرەكانیش لە كەرتەكانی سەرمایەدا هەن، بە پەلە لەگەڵیاندا هاوجووت بوو و توانی بەكاریان بێنێ. مەسەلەی ئۆزال وا پێلدێت. ئێستاكە ئەم قۆناغەمان تێپەڕكرد و (ڕیگان ـ بوش) ڕۆیشتن و كلینتۆنی تازە هات و ئەمە تا ڕادەیەك جیاواز دەبێ. لەوانەیە سوپا بۆی دەربكەوێ پێویستییەكی زۆری بە ئۆزال نییە و لەوانەشە كەرتی دەستبژان بە بەرچاوەوە نەمێنن. مەبەستم ئەوەیە ڕەنگە ئۆزال دەوری نواندنی ئەوان نەبینێ، چونكە لەلایەكەوە ئیدی بەسوود نییە و لەلایەكی دیكەشەوە دیمیریل هاتووەتە ڕوو كە ڕەنگە قسە بەناویانەوە بكات و سەیر بكات ئەوانە زیاد لە پێویست دەستبڕن. بۆیە دەبێ بەربەستێك لەبەردەم (ANAP)دا دابنێ و بەوە بووە شتێكی گرنگ بۆ دەوڵەت. لەوانەیە بپرسی: (بۆچی سەرۆكایەتی وەزارەت بۆ دیمیریل گرنگە و هۆیەكانی ئەم پلەوپایە وەرگرتنەی چین؟». لە گەلێك ناوەندا بێزاری بەرانبەر بە ئۆزال و دەستبژەكانی دەوروپشتی هەبوون، سەرباری ئەو بۆشاییەی كە بە هۆی ئێمەوە پەیدا بوو. بەم پێیە دیمیریل توانی كەڵك لەم دوو هۆیە وەربگرێ، لەبەر ئەمە گوتم: «دیمیریل نازانێ چۆن بەم پلە و پایەیە گەیشت؟». وەختێك لە كۆنگرەی حیزبی داد (AP)دا قسەی دەكرد گوتی: «چەند جار لە حوكم لایانبردم، ئەوەتا جارێكی دیكەش هاتمەوە. من ڕێزی قسەی خۆم دەگرم». هەمووان دەزانن چەند داماو و گۆشەگیرە لە گوندەكەیدا (حەمزە ناكۆی) و ئەم شێوە دەركەوتنەوەی بە چاكەی وزە و تەمەن‌وتوانەكانیەوە نییە. ئەمەش مایەی شانازی پێوەكردن نییە وەك ئەو دەیكات كاتێك ئەوە دەڵێت، ئەمە وا دەگەیەنێ كە ئەو خاوەنی یادەوەرییەكی بێ‌هێز و سەرپێییە و هەوڵدەدات كەرتە سادەكان بخەڵەتێنێ. بەمە نایەوێ هۆی سەرلەنوێ بەم پلەوپایە گەیشتنەوەی تێبگات یا خۆی لێ گێل دەكات.

لێرەدا ڕەنگە بپرسی: «بەڵام كێ ئەم كاروبارانە هەڵدەسووڕێنێ؟». ئێستا سەرۆكی ئەركان لە بەری مەیداندا دەركەوتووە و قسەیەك دەجوێنێتەوە. ئەم قسەیەی شایانی تێبینی كردنە و هەندێك نیشانەی لەسەر سیاسەتە بنچینەییەكان تێدایە. ئەگەر لە هەندێك هاوسەنگی نێودەوڵەتیدا خۆپاریز نەبووایە، وەك گەورەترین

ماموستا دەکەوتەڕوو. بەڵام ئەمەش چارەسەری کێشەکە نییە. کێشەی سەرکردایەتی بەم ڕێگایە چارەسەرناکرێت و پەیوەندی بەمەوە هەیە: مەنتیقی کۆمار لای ئەوان ڕەگاژۆ بووە. ئەم ڕۆژانە دەم لە کۆماری دووەم دەژەنێت و ئەم دەم تێژەنینەش ئەنجامی چەند ناچارییەکی دەست نیشانکراوە و پەیوەندی بەو کۆمارەی یەکەمەوە هەیە کە بە دۆخێك گەیشتووە ناتوانێ کاروبارەکان بەڕێوە ببات و بووە بە بەڵا بەسەر گەل و سەرمایەدارییەوە. بەڵام سیاسەتمەدارێکی لەخۆڕادیو لییە بتوانێ وەلای بنێ. ئۆزال هەوڵیدا کەمێك بەربەرەکانێی بکات، بەڵام دەسەڵاتێکی پێویستی نەبوو. هەرچی چۆنێك بێگوتبایە: ئێمە کۆماری دووەم دادەمەزرێنین، من باوەڕم وابوو کە لە چوارچێوەی پڕۆپاگەندە تێی نەدەپەڕاند.

ی.ك: ئۆزال کارتێکی گرنگە لە گەمەکەدا و دەکرێت گەمەی لەسەر بکرێت. لەوەبوو دۆڕاندی. ئۆزال تاکە ڕێگایەکی هەیە، ئەویش ئەوەیە جارێکی دیکە دابەزێ و حیزبێکی تازە دابمەزرێنێ و جارێکی دیکە بەختی خۆی تاقی بکاتەوە.

س.پ: دیمیریل چارەسەرێکی ئەم قەیرانە نییە. لەوەتا(حیزبی ڕەفاه) بەربەرەکانێی دەکات. ئەگەر توانی دەستەبەری پشتیوانی ئەڵمانیا و کۆنەپەرستانی ناوچەکە بکات، لەوانەیە هەنگاوێك بنێت. بەڵام ئەمە چارەسەرێکی باشی قەیرانەکە نییە.

ی.ك: ڕێ بە (حیزبی ڕەفاه) نادەن بە تەنیا حکوومەتێك دابمەزرێنێ. لەوانەیە یەككەوتنێك بێت لەگەڵ (SHP) یا لەگەڵ حیزبێکی دیکەدا.

س.پ: بە دڵنیاییەوە وایە. لەوانەیە وەك پێشوو بەکاری بهێننەوە.

ی.ك: متمانەیەك بە حیزبی (ڕەفاه) نییە، ڕەنگە ئێوەش بڵێن کۆنەپەرستی ئەوان ڕێژەییە.

س.پ: ناتوانن هیچ بکەن، ئەوە نەبێ کە ئەم کۆمارە بکەنە داروبەردوویەکی زیاتر و ئەو تەنگانەیەش تووڵ بکەنەوە کە خۆیانی تێدان. وە هەر گۆڕانی گەورەی تورکی یان چاك کردنی دۆخەکەیان لەلا دەمێنێتەوە. ئەمەیان ئامادەکاری بۆ نەکراوە نە لە ناوەندەکانی سوپادا و نە لە ناوەندە مەدەنییەکان. دژوارییەکە لەم خاڵەدا چڕدەبێتەوە. ئێمە بەو کەسانەی کە دەپرسن: «ئایا PKK گفتوگۆی سیاسی دەوێ یان نا؟». دەڵێین هەتا ئەگەر بە گفتوگۆی سیاسیش پشت ئەستوور بین، کەسێك لەلاکەی دیکە نییە بتوانێ بە حیزب و سیاسەت و پێشەوایەتی و سەرکردایەتییەکەیەوە بەرپرسی دەربیات. لە ڕاستیدا کەسێك نییە بتوانێ دانوستاندنمان لەگەڵدا بکات. ئەگەر یەکێکیان گوتی: «بەڵێ»، چلی دیکە پەیدا دەبن بەرهەڵستی دەکەن. ئەوی ڕاستی بێ ئەوە کوا کە ئێمە دەتوانین سیاسیانە گفتوگۆی لەتەکدا بکەین؟ واتە تورکیا سەرکردایەتییەکی تێدا نییە. ئەم دۆخە زیانی گەورەی هەن. پێم وایە دەوڵەت بەرانبەر بەم دۆخە دەستەپاچەیە. ئەگەر ویستی گفتوگۆمان لەگەڵدا بکات، کادیری ڕاستەقینەی نییە. جا کێ ئەوە بکات؟

ی.ك: تەنانەت ئەگەر یەكێكیشیان هات و گفتوگۆی لەگەڵ كردن، چی دەگۆڕێت؟ كێ هێزی گۆڕینی هەیە؟
س.پ: لەبەرئەوەی قەیرانی سەركردایەتی و قەیرانی حیزب و قەیرانی ڕژێمیان هەیە. هەموو ئەمانە ناڵەبارن.
ی.ك: ئەمە كێشەیەكی زۆر گرنگە.
س.پ: بە دڵنیاییەوە. لە كۆنەوە ئەمە تێبڕوانینمە. مەبەستم ئەوەیە ئێمە بۆ گفتوگۆی سیاسی سازین، بەڵام دەوڵەت ساز نییە. بۆیە ناتوانین چەند بنچینەیەكی تازە بۆ پەیوەندی كورد و تورك دابنێین. هەتا ناوەندەكانی سوپاش بارودۆخەكەیان پەدڵ نییە.
ی.ك: چونكە لایەنی توركی ئامادە نییە. چارەسەری سیاسی ڕێگای خۆی ناگرێتەبەر.
س.پ: سوپا لە دڵەڕاوكێدایە. ئەنجوومەن و حكومەتیش لە دڵەڕاوكێدان. گەلێك ناوەندی دیكەش نیگەرانن و دەنگێكی بەهێز پەیدانابێ و ئەم دڵەڕاوكێیە نەهێڵێ. نە یەكێك دەبینین بۆمان بدوێت و نە سیاسەتی بنچینەییش، نە سیاسەتمەداری بەجەرگ و نە سەركردایەتیش هەن. هەموو ئەمانە بەڵگەی ئەوەن كە گەلی تورك قەیرانێكی قووڵ و ئاشكرای سەركردایەتی هەیە.
ی.ك: ئۆزال جارێكیان لە فیدراڵیزم دوا. ئەمجا هێندەی پێنەچوو قسەكەی قووت دایەوە، لە كاتێكدا قسەكەی لە ڕۆژنامەكاندا كەوتە ڕوو. ئۆزال ترسنۆكە، هەنگاو بۆ پێشەوە دەنێت و پاشان پێیدا دەگەڕێتەوە. ئێستاش لافی ئەوە لێدەدات كە كوردی لە میللەتانی دیكە زیاتر خۆش دەوێ و باشترین چارەسەری بۆ كێشەی بۆسنەو هێرزەگۆڤینا هەیە. لافی ئەوە لێدەدات هەڵۆیە، بەڵام توركیا پێویستی بە كۆترە و توركیاش كۆتری تێدا نییە.
س.پ: ئایا دەبینێت هەڵۆ ئەگەر پلانی بۆ ڕەشەكوژی داڕشت؟ ئەگەر ئەمە دەیكات بە هەڵۆ، با سوپەرهەڵۆ بێ. بەڵام ئەمە چارەسەر نییە. بە كورتی ئەوان لە قەیرانێكی ڕاستەقینەدان. حیزبێكی حازربەدەست نییە پێش ئەوەی كار لەكار بترازێت ڕێ و شوێن و چارەسەری دەست نیشانكراو دابنێ. ئەوان باسی هاوجووت بوونی نەتەوەیی دەكەن و ئەمەش شتێكی تازە نییە. بوونی ئەوان لە كۆنەوە لەسەر هاوجووت بوونی نەتەوەیی بنیات نراوە.
ی.ك: هەموو هاوجووت بوونەكان نیشانەی سەركەوتنن، وە لە ڕاستیدا ناوەندێكی سەركەوتوو هەیە، هاوجووت بوونێكیش لەسەر چارەسەرنەكردنی كێشەی كورد هەیە. ئەوان باش ئەم هاوجووت بوونە دەپارێزن.
س.پ: ئایا كێشەیەك هەیە بەم بارودۆخەوە بە چارەسەر گەیشتبێ؟ چ كێشەیەك زیاتر گرێ و گولاوی نەبووە؟
ی.ك: گوتی: من بانقێكی زەریایی دادەمەزرێنم و وەزیرێك بۆ ئەم مەبەستە دادەنێم. ساڵ و نیوێكە نەیتوانیوە یاسایەكی پێویست بۆ ئەوە دەربكات، سەرەڕای

ئەوە لە سێ دەقە زیاتری پێ ناوێ. باسی وەزارەتی ژینگەی کرد و ئەم کارەشی بە جێنەهێنا. ئەم ئەنجامە بەڵگەی بنبەست و کۆتاییە. کەس نەیتوانیوە ئەم دۆخەی کە باسم کرد ڕاست بکاتەوە.

## ئەگەر بەرەی خۆرهەڵات پەرە نەستێنێ، بەرەی خۆرئاوا پەرە ناستێنێ. بەرەی خۆرهەڵات هەرکاتێك پەرە بستێنێ، پەرەسەندنی خۆرئاواش زیاد دەکات.

س.پ: ئێمە دەوڵەتمان هەر لە ڕووی سەربازی و سیاسییەوە نەهەژاندووە، بەڵکو پەردەمان لەسەر گەلێك مەسەلەی دیکەش لاداوە. ئێوە ئێستاکە پەیمان دووبارە کەمالیزم و ڕژێمی کۆماری و سیستەمی حیزبەکان و باروودۆخی سەرکردایەتی هەڵسەنگێنینەوە و پەیمان چاو بە سیاسەتە بنچینەییەکاندا بخشێنینەوە کە دەکێشێتەوە نەك هەر بۆ گۆڕانکاری گەورە لە سیاسەتی کوردیدا، بەڵکو لە بواری دیموکراسی و سیاسەتی دەرەوەشدا و زۆر دەروو ئەکرێنەوە و بنگە پێویستەکان دادەمەزرێنەوە و ئێوەش پێداویستێکی ناچاریتان بەوە هەیە. ئەمە ئەو ئەنجامانەن کە لە هەژانی (PKK) دەکەونەوە.

ی.ك: تێزێك یا پێشنیارێکت هەبوو بۆ کەمێك ڕۆشنکردنەوەی مەسەلەکە. ئێوە دەتانگوت: «ئەگەر بەرەی خۆرهەڵات پەرە نەستێنێ، بەرەی خۆرئاوا پەرەناستێنێ و بەرەی خۆرهەڵات هەرکاتێك پەرە بستێنێ، پەرەسەندنی بەرەی خۆرئاوایش زیاد دەکات». وە دەتوانین هەمان تێ دووبارە بکەینەوە کە باسمان لێوەکرد و دەڵێین:«ئەگەر پەرەسەندن لەبەرەی ڕۆژئاوادا ڕوونەدات، ئەوە ناتوانین بەرەی کوردستان پەرە پێبدەین». ئایا ئەمە ڕاستە؟

س.پ: نەخێر، پێچەوانەی ئەوە ڕاستە، «ئەگەر پەرەسەندن لە بەرەی ڕۆژهەڵات ڕوونەدات، ئەوە بەرەی ڕۆژئاوا پەرەناستێنێ و هەرچەندە بەرەی ڕۆژهەڵات پەرە بستێنێ، ئەوا بەرەی خۆرئاواش زیاتر پەرە دەستێنێ». پەرەسەندنی بەرەی خۆرئاوا دەبێتە هۆی پەرەسەندنی ڕادیکاڵی زۆر گەورە لە شۆڕشدا و ڕاستی کورد زیاتر دەخاتەڕوو. ڕەنگە ئەمە شوێنەواری زۆر کاریگەری هەبن و بکێشێتەوە بۆ کێشەی کۆمارە تورك زمانەکان و کار لە چەند فیدراڵییەکی ڕیشەیی بکات. ئێمە چەندە ئەوە تێبپەڕێنین، لەوانەیە مەسەلەی(PKK) بێئەندازە ببێتە هاندەر بۆ فیدراڵیزمی کوردستان و یەکگرتنی کۆمارەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە ڕێژەیەکی گەورە. ڕەنگە کوردستان دەوری دەستەی ئەرکان لەم مەسەلەیەدا ببینێ. چارەسەری تورکی بەم حاڵەدا ڕەت دەبێ. ئەگەر باکووری کوردستان بوو بە فیدراڵی، ڕێی لێدەچێ کۆمارە تورك زمانەکان ببنە قەوارەیەکی فیدراڵی. ئەمە فیدراڵیزمی قەفقاس و فیدراڵیزمی ئێران و فیدراڵیزمی عەرەب دەگەیەنێ. ئەمە ئەو فیدراڵیزمەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە کە ئێمە دەدوێین. هەر لەم لایەنەوە،

ڕووداوی فیدرالیزمی کوردستان واتە زنجیرەی فیدرالیزمە تورکییەکان، بەباشووریشەوە. هەروەها فیدرالیزمی قەفقاس واتە فیدرالیزمی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست و فیدرالیزمی ئێران و فیدرالیزمی عەرەب. دەوڵەتانی عەرەبی ئێستا لە بنەڕەتدا لە بنیاتی فیدرالیزمەوە نزیکن.

ئەم جۆرە فیدرالیزمە فراوانە کە باسی دەکەین چەند دوورایەکی دیاری مێژوویی و جوگرافی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری دەبن و ئەم دوورایانە دەپارێزێ و ڕێش بۆ پەرەسەندنیان دەکات، لە باتی شەڕی ماڵوێرانکەر و تێکدان و یەکتربڕاندنەوەیان. بەڵکو دەبێتە سیستەمێك بۆ دەوڵەمەندکردنی یەکتری. ئەم سیستەمە شایانی بیر لێکردنەوە و ڕێش بۆ کردنە و ئەوە بەدی دەهێنێ کە ئیسلامییەکان بانگێشتیان بۆ دەکرد بەبێ ئەوەی هیچ بکەن. هەروەها ئەوەش بەدی دێنێ کە سۆڤێت بانگەوازی بۆ دەکرد بەبێ ئەوەی هیچ بنچینەیەکی بۆ دابنێ و ڕووبەڕووی ئەو ئەوروپاییانە دەبێ کە بە شوێن ئەم جۆرە یەکێتییەی نێوان وڵاتەکانیاندا دەگەڕێن. ئەگەر توانیمان بنیاتێکی شۆڕشگێڕانە بۆ ئەم فیدرالیزمە مسۆگەر بکەین، بگرە ئەوسا دەتوانین بە فیدرالیزمی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بگەین کە دەبێتە هێزێکی گەورەی بەرگر و دەیکاتە یەکێتییەکی مێژوویی لە پێناوی پەرەسەندندا.

ی.ك: بەڵێ من بە کەفوکوڵەوە گوێم لێیە. هەڵکشانی کورد درێژ دەبێتەوە تا دەبێتە هەڵکشانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. هەموو ئەوانەی کە چاویان پێت دەکەوێ لێت دەترازێن و ئەم بۆچوونەیان هەیە. ماوەیەك لەمەوبەر «یالچین دۆغان» دیدارێکی لەگەڵ ڕێکخستی و هەر ئەمە بۆچوونی ئەو بوو، چونکە پێی گوتم: «سەرکردەی(PKK) بیرکردنەوەی تەنیا لە بنیاتنانی کوردستاندا قەتیس نابێ، بەڵکو بە دوای ڕزگارییەکی گەورەترەوەیە». ئەمانە بۆچوونی من بوو هەر لە یەکەم چاو پێکەوتنمەوە بە تۆ لە ساڵی (١٩٨٩)دا. هەر لە چوارچێوەی ئەم باسەماندا لەسەر فیدرالیزم، ئەگەر ڕێ بدەن بۆچی لا لە ئەنجوومەن نەکەینەوە. ئەوە بابەتێکە گەلێك لە خوێنەواران بە پەرۆشن بیزانن. واتە مەسەلەی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان. وەك دەردەکەوێ ئەم ئەنجومەنە ساڵی ١٩٩٣ دەکرێتەوە و گەلێك ئامادەکاری بۆ ئەمە لە ئارادان. ئایا هیچ ڕوونکردنەوەیەك لەسەر ئەم ئەنجومەنە و ژمارەی ئەندامانی هەیە؟

## ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانە وەڵامی ئەو شتانە دەداتەوە کە هێزە سیاسیەکان لە ئەنجومەنێکی نیشتمانی چاوەڕوان دەکەن.

س.پ: لە باشوور ئەنجومەنێك دامەزرا و حکومەتێك بە پێی ئەم ئەنجومەنە پێکهات. باوەڕم وایە وەڵامدانەوەی ئەو حکومەتەیە کە بیر لە دامەزراندنی

دەکەینەوە لە بۆتان و بادینان. ئەنجومەنەکەش وەڵامدانەوەی ئەنجومەنە
نیشتمانییەکەی ئێمەیە. ئەوان مەیلەوی تەرزی کرێگرتە لە جێی تەرزی شۆڕشگێڕ
دادەنێن. تێنەگەیشتن لەم بابەتەش سوود بەخشە. وەڵا سەرنج دەدەین ئەم بزاڤانە چل
ساڵە لە باشوور هەن. بۆچی بە خەیاڵیاندا نەهات حکومەتێك و ئەنجومەنێك
دابمەزرێنن و هەموو خەبێکیان ئۆتۆنۆمی بوو؟ وەختێك لە حکومەتی بۆتان و
بادینان و لە ئەنجومەن دوواین، بە پەلە کەوتنە بنیاتنانی ئەنجومەن و حکومەت.
جا کە کاریگەرییمان لە ڕووی سیاسی و سەربازییەوە بەرەو زۆور چوو، حکومەتی
فیدراڵییان ڕاگەیاند. ئەم هەنگاوانە بە پشتیوانی ئیمپریالیزمی جیهانی دەنرێن و
تورکیاش پاڵپشتی ئەوە دەکات.

بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە دەبێ شۆڕشی کوردستان ڕوو بە حیزبایەتییەکی
واقیع بیناڵە گەشە بکات وا کە لە دەوری پارتی کرێکارانی کوردستان کۆببنەوە.
ئەمەش دەبێتە هۆی سوپا پێکهێنان و دامەزراندنی ئەنجومەن و حکومەت. ئەمانە
چەند هەنگاوێکی بێ گەڕانەوەن. لە لایەکەوە سیاسەتەکانی شەڕی تایبەت و ئەو
هەموو شێوازانەی لە گۆڕێدان کە مەبەستیان تێوو بڕاو کردنمانە و، لە لایەکی
دیکەوە هێزە ساختەکان بە پارێزگاری هێزەکانی چەکوشی ئامادە دەخرێنە بەری
مەیدان. واتە ئێمە دەتوانین بڵێین شەڕی کەنداو هێشتا بە شێوەیەکی دیکە
لە کوردستاندا بەرپایە و ئەم شەڕەش بۆ ماوەیەکی کورت خاپان لەگەڵ (صدام)دا
بوو، لە کاتێکدا ئێستا بە شێوەیەکی سەرتاسەری لەگەڵ ئێمەدایە. پێشتر
گووتومە: شەڕی کەنداو سەبارەت بە کوردستان شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە دووتوێیدا
هەڵدەگرێ. پاش ئەوەی لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر تێپەڕێندرا، ئەم شەڕە شۆڕشێکی
تازەی ئۆکتۆبەری لێ دەکەوێتەوە. بۆیە ئەم شەڕە بە شێوەیەکی ڕێکخراو دژ بە
ئێمە دەکرێت. سەرنج بدەن تورکیا توانی لە ڕێگای شەڕی باشوور هێنانیەوە بۆ
سەر ئێمە، یەککەوتنێکی تەواو بە دەست بهێنێ. ئەوەبوو ئەورووپا بە کۆمەڵ قایل
بوو.و ئەمەریکایش لە ڕاگەیاندنەکانیدا پشتیوانی خۆی پێشاندا و لە تورکیای
ئینتلێنزیکبوونەوەی نەتەوەیی بەدی هات. لە لایەکی دیکەوە، دووچاری هێرشی
ناوەندە چەپڕەوەکان بووین. ئەوە دەچێ ئەمەش بەشێك بووبێ لە یەککەوتنی نێو
دەوڵەتی دژ بە ئێمە. چونکە هەمان زمانیان بەکار هێنا کە دەوڵەت بەکاری
دەهێنا، ئەوان ناتوانن چاو لە بەرخودانە ڕەسەن و گەورەکانی «PKK» بپۆشن،
ئەدی بۆچی زمانی دەوڵەت بۆ هێرش کردنە سەرمان بەکاردێنن؟ دیارە
بەکارهێنانی هێندێك گوتەی شۆڕشگێڕانە هیچ بایەخێکی نییە. ئیازەکانی
دەوڵەت بەلای ئێمەوە لە هی ئەوان ئاشکراترن. چۆن چاو لە مەزنی شۆڕشگێڕانە
دەنوقێنن و پەلاماری دەدەن پاش ئەوە هەوڵدەدەن کارەکەتان بەهێندێك گوتەی
بریقەدار پەردەپۆش بکەن. کەس باوەڕ بەمە ناکات.

پێموایە هەوڵیاندا سووریا و ئێرانیش ڕابکێشنە نێو ئەم یەککەوتنە نێودەوڵەتییە.
هەوڵی ڕاکێشانی ئێران بێ ئەنجام لەولایە. دەسەڵاتدارانی ئێران (١٠) هەڤالی

بەرپرسیارمانیان گرت کە بۆ ئەوێ نێردرابوون. سووریاش هەندێك هەوڵی وەك گرتن و شتی لەم بابەتەی هەبوو.
زۆر ڕێی تێدەچێ ئەوان لەگەڵ توانییان (PKK) دەبینن، ئەوا لە ڕێگای پەککەوتنی نێودەوڵەتییەوە دەسکەوتیان دەبێ. بۆیە ڕاستەوخۆ پەنایان بردە بەر لوتکەی سێ قۆڵی و کۆبوونەوەیەك کرا ئێران و تورکیا و سووریای تێدابوون. تورکیا ئەنجامەکان و ئاماتجەکان و دوورایییەکانی هێرشەکەی لێکدابەوە و ڕاپۆرتێکی دوور و درێژی پێشکەش کردن. هەروەها تورکیا ڕاپۆرتێکی لەسەر ئەو ئەنجامانە پێشکەش کرد کە ڕێککەوتنی پێشوو خستبە ڕوو. لام وابێ ڕێککەوتنەکەیان هێشتا بەردەوامە.
ی.ك: بەڵام ئەو لوتکە سێ قۆڵییە هیچ ئەنجامێکی نەخستە ڕوو.
س.پ: هەر لەسەرەتاوە ئاشکرابوو کە هیچ ئاکامێکی لێناکەوێتەوە بە هۆی ئاکۆکییە توولەکانی نێوان ئێران و تورکیاوە کە پاشماوەی بابەتەکانی دیکەیان داپۆشی. ناکۆکی لەو چەشنە لەگەڵ سووریاشدا هەیە. ئەم ناکۆکیانە لەو جۆرەن کە بە ئاسانی لێبورنابڕێن. تاکە کارکردێش کە پێکەوە کۆی کردنەوە کێشەی کورد بوو کەوا گەڕەرەوەمە قوناغی پێکهێنانی دەوڵەت.
ی.ك: پێش پەیدابوونی «PKK» لە دەربڕینی (دەوڵەتی کوردی) دڵگران دەبوون، واتە هەر شێوەیەك بوو بێ فیدراڵی یا هی تر. وایان دەبینی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بەم مەسەلەیەوە هەیە.
س.پ: زۆر ئاساییە ئەم دەوڵەتە کار بکاتە سەر ئەم دەوڵەتانە، هەتا ئەگەر فیدرالیش بێ. کاریگەرییەکانی (PKK) لەوە گەورەترن بە یەك دانیشتن قسەیان لێبکرێت. بە چارەسەر گەیشتن یا لە گەیشتنیان مەسەلەیەکی دیکەیە پشت بە رادەی ناکۆکی تێوانیان دەبەستێ. جا چەندە لەسەر ناکۆکییەکانی دیکە یەکیەکیان، سەبارەت بە (PKK)ی ڕێکدەکەون. چەندیش لێك دوور بکەونەوە، لەسەر (PKK) ناکۆك دەبن. ئەو یەکەکەوتنە ناوەکی و نێودەوڵەتییەی کە کرا، نۆکەرایەتی کوردی و ناوەندە ڕیفۆرمیستە کوردییەکان و ناوەندە چەپڕەوە کوردییەکانی وەك ڕێگای ئازادی (ÖY)شی خستەلای خۆی. هەموو ئەوانەی کە چوونە پاڵ هاوپەیمانەتییەکە سیاسەتیان دەرهەق بە(PKK) و ئەو چینانەی وا نوێنەرایەتیان دەکەن دەرکەوت. ئامانجی هەموو ئەوانەی کە بەشداری هێرشەکەیان کرد نەهێشتنی پارتی کرێکارانی کوردستان و بەرخۆدانەکانی بوو لە ساڵی (١٩٩٢)دا.
بەڵام گومانی تێدا نییە کە (PKK) دەمێنن. ئەوان تا ئێستا قسە و قسەڵۆك لەسەر (ئەرهاد) عوسمان ئۆجەلان دەجوونەوە و مشتومڕ لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکەن و پرسیار دەکەن ئایا دیلە یان خۆی بەدەستەوە داوە؟ لەم مشتومڕانەیان وا دەگەیەنن ئایا ئەرهاد قابیلی ئەوەیە ببێ بە نۆکەر یان نا؟ ئەگەر قابیلی ئەوە بێ، ئەوا لە ڕێگای تاڵەبانی و بارزانییەوە دەستەمۆی دەکەن. بە هەمان شێوە دەڵێن ئاپۆ لە سووریایە. ئایا دەتوانین سنوورێك بۆ چالاکییەکانی دابنێین یان نا؟ یان: ئایا دەتوانین وای لێبکەین دەست بەرداری خەباتی چەکدارانە ببێ و ئەویش دەستەمۆ

بکەین یان نا؟ یان: ئایا پەیمان دەکرێت بە هێندێك دەسکەوتی سیاسی قەناعەتی پێبکەین یان نا؟ هەموو مشتومڕەکانیان لەم چوارچێوەیەدایە. لە لایەکی دیکەوە ئەم مشتومڕانە هێشتا لەو بارەیەوەن کە ئاخۆ (PKK) هەرەسی هێناوە یان نا؟ ئایا (PKK) دەتوانێ درێژە بە خەباتی چەکداری بدات یان نا؟ ئایا چالاکی و کێوماڵەکانی ناوخۆ سەرکەوتنیان بە نسیب دەبێ یان نا؟ ئامانجیان لەم هەموو پرسیارانە بەرپاکردنی شەڕێکی دەروونییە بۆ گەیشتنیان بە مەبەستەکانیان. هەوڵەکان تا ئێستا لەم ڕووەوە بەردەوامن. بەڵام خافڵگیرییەکە لەوە بوو ئێمە بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو پێوەندییمان لەگەڵ ئەنجومەن و بەرەی کوردستانیدا لە باشور و پێوەندیی سیاسیشمان لەگەڵ پێکهاتەی حکومەتی ئەوێدا دامەزراند. ئەم سیاسەتەمان تا ئێستا درێژەی هەیە. لە لایەکەوە پێکداهەڵپڕژان و لە لایەکی دیکەوە پێوەندی. ئەوان لە هەڵسانگاندن و بەخۆگرتنی ئەم گۆڕانکاریانەدا تووشی ناڕەحەتییەکی زۆر دەبن.

ی.ك: ئایا پێکداهەڵپڕژان بە توندی یان بە نەرمی بەردەوامە؟

س.پ: نەخێر، بەردەوامی پێکداهەڵپڕژانەکان بە توندی بن یان نەرمی گرنگ نییە. گرنگ پێکداهەڵپڕژانی سیاسەتەکانە. سیاسەت پارێزگاری جۆری پێکداهەڵپڕژان دەکات و هەمان کات بە دووی سادەترین خاڵی لێکنزیکبوونەوەدا دەگەڕێت. ئێستاکە بنکەیەکی جەماوەری و نیشتمانی فراوان بە تایبەتی لە ناوچەی (سۆران)دا هەیە بۆ یەککەوتن ئامادەیە. ئێمە ناتوانین ئەمە فەرامۆش بکەین. نیاز هەبوو لەگەڵیاندا ڕێك بکەوین. با بڕوانین ئاخۆ ئەم نیازە بەرەی پێدەدرێت؟ لە لایەکی دیکەوە پێشمەرگە هێزێکی تەواوی نەبوو بچێتە شەڕی دژ بە (PKK) و بەرژەوەندییان لەمەدا نەبوو. کاتێك باسی یەککەوتن دەکەین، مەبەستمان نەهێشتنی کاریگەری ئەم کارکردانەیە. هەرچی پێکداهەڵپڕژانەکانیشن هێشتا بەردەوامن، چونکە هێشتا درێژە بە سیاسەتی جارانیان لەگەڵ تورکیادا دەدەن کە سیاسەتەکانی دوژمنە. هێزی ڕەسمی لایەکی ئەم سیاسەتەیە. بەم پێیە پێکداهەڵپڕژان لەگەڵیاندا بەردەوام دەبێ. ئەگەر ئەم پێکداهەڵپڕژانە ئەگاتە ڕادەی چەك بەکارهێنان، ئەوا لەسەر پێیە لە هەر ساتێکدا بێ ئەم ئاڕاستەیە بگرێ و لەوانەیە لەوە لە کاتێکی دیکەدا بێ. گەوهەری مەسەلەکە لەوەیە دۆخی شەڕ هێشتا بەردەوامە، یا بە شێوەی دیکەش بێ. تا ئێستاش کاریگەرییەکی گەورەمان لە بەرەی باشووردا هەیە و ئەوە تا بەدەست هێنانی چەند ئەنجامێکی باش درێژەی دەبێ. بێگومان ئەم بارودۆخە وەك هێزێك وا دەبێ بۆ بەرەی باکور. ساڵی داهاتوو ئەنجامەکانی ئەوش دەبینین.

ی.ك: ئایا ئەمە وا دەگەیەنێ کە دوو ئەنجومەن لە ئارادا دەبێ، ئەو ئەنجومەنە کە لێی دووایین و ئەنجومەنی نیشتمانیش؟

س.پ: بەڵێ، دەچمە سەر ئەم مەسەلەیە. گومانی تێدا نییە کە ئەم پێوەندییانە دەکێشنەوە بۆ پێکهاتەی تازە لە ساڵی(١٩٩٣)دا. زۆر ڕێی تێدەچێ ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان «ئەو ئەنجومەنە بێ کە وەڵامی ئەو شتانە دەداتەوە کەوا هێزە

سیاسییەکان لە ئەنجومەنێکی نیشتمانی چاوەڕوان دەکەن. ئەمە بە پەرەسەندن دادەنرێت. لەبەر ئەم هۆیە ئەوانەیە باشور و باکور بێنە پاڵ ئەم ئەنجومەنە وا کە لە پەرلەمانی تورکیا و ئەزموونەکەی بچن، بەڵام لەو زیاتر دیموکراتی و سەرتاسەری دەبێ. بەڵگەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە دەکرێت چەند هەنگاوێکی باش بەم ڕێگایەدا بنێین نەك هەر لە باکوری کوردستاندا، بەڵکو لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیشدا. هەرچی ژمارەی نوێنەرانیشە گرنگ نییە. ڕەنگە ٣٠٠ یا ٥٠٠ نوێنەر بێ.

کەمێك هەڵوێستە وەرگرتن لەسەر بابەتی مێژوویی ئەم ئەنجوومەنە شتێکی بەسوودە، کورد بە قۆناخی حیزبایەتی (پێکهێنانی حیزبی سیاسی) و بە قۆناخی دروست بوونی بەرەدا تێپەڕیوە. بەڵام قۆناخی ئەنجومەن لە ڕووی ئەو قۆناخەوە کە پێیدا دەڕۆین پڕ بایەخە. کاتی ئەوە هاتووە ئەم جۆرە ئەنجومەنە بنیات بنرێت. لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسیشەوە گۆڕانکارییەکان بنیاتنانی ئەم جۆرە ئەنجومەنە دەخوازن. وا پێویست بوو ئەم ئەنجومەنە لە قۆناخی حیزبایەتیدا لە شێوەی کۆنگرەیەکدا دروست ببێ کە هەموو حیزبەکانی تێدابێ. بەڵام لەبەر گەلێك هۆ نەبوو. بۆ نموونە لای میللەتانی دیکە حیزبەکان لە کۆنگرەوە بنیات دەنرێن. کەچی لای ئێمە پێچەوانەکەی ڕاستە و پێویستە کۆنگرە بە کاریگەری حیزبەکان و بەرەکان ساز بدرێت. لەمەر گوشە نیگایەکەوە بڕوانین بۆمان دەردەکەوێ کە پێکهێنانی ئەنجومەن و کۆنگرە بۆ کورد زۆر گرێدراوی ژیانن، چونکە بۆشاییەکی سیاسی پڕدەکەنەوە. ئەوانەیە کۆنگرەیەکی هاوئاهەنگ و مەزن نەبێ، بەڵام بە تێپەڕینی ڕۆژگار لە ڕووی دیپلۆماتی و ژیانی مەدەنی و سیاسییەوە دەبێتە بنکەیەکی کاریگەر و دەشـ... ئامرازێکی کارا بۆ دەرباز بوون لەو قەیرانانە کە ... سیاسییەکان دەیانئێننەوە. لە پاڵ ئەمەدا کاریگەرییەکی ...یەتی دەبێ بۆ خەڵك ڕاکێشان بەرەو شۆڕش و هۆری ڕەوایی بە تەختی تەوێڵیەوە دەنێ. ئامەوێ لەم هەڵسانگاندنەمدا بۆ ئەنجومەن زێدەڕۆیی بکەم. بەڵام من دڵنیام کە لە حاڵی ئەبوودا نابێ و ئێمە تەنیا بۆ پڕوپاگەندە بنیاتی نانێین و هەر بە قسە ئەنجومەن نابێ.

ی.ك: لەو هەڵبژاردنانەی ئەورووپادا کە کران ناوی وا دەرکەوتن کە بە خەیاڵدا نەدەهاتن. مەبەست لەوە چییە؟

س.پ: بەلای منەوە ناو گرنگ نییە، بەڵام ئەرك و پێویستی خۆی زۆر گرنگن. لایەنێکی دیکەی گرنگیش هەیە، ئەویش ئەوەیە ئەم ئەنجومەنە یەك ڕەنگ نەبێ، بەڵکو نوێنەرایەتی تێکڕای چینەکانی کۆمەڵگا بکات و بیروڕا ناکۆکەکان و سیاسەتە جۆراوجۆرەکانی تێدابێ و ببێتە بنچینە و بڵندگۆیەك حیزبەکان بە ئارامی قسەی تێدا بکەن و فەرهەنگ و هەمەشێوە و ڕوخسار بێ تا لە یەك شوێندا پێك بگەن. پێویستە هێندەی بۆ پاڵێوراوی حیزبەکان کراوە بێ، دەرگای بۆ خێڵ و ناوەندەکانی دیکە ئاواڵە بکات و بگرە پشتیان پێ ببەستێت.

ی.ك: ئایا هەڵبژاردنی خێڵەکان بە هەمان شێواز دەبێ؟

س.پ: ئەوان پیاوی خۆیان دەدۆزنەوە و هەڵیاندەبژێرن و بۆ ئەنجومەنیان ڕەوانە دەکەن. پێم وانییە لەم حاڵەدا هەڵبژاردنێکی شێلگیر هەبێ. جا لەبەرئەوەی کە بناغەی میللی لە لای ئێمە پتەوە، دەتوانین هەڵبژاردن بکەین. بە هۆی ئەو گوشارانەشەوە کە دەیزانن، هیچ دەرفەتێك بۆ بەدیهێنانی ئەوە لە ئارادا نییە. لەبەرئەوەی کە گەل بە گشتی پشتگیری سیاسەتی حیزب دەکات، زەحمەت نییە گەل پشتگیری ئەندامەکانی ئەو ئەنجومەنانەی هەڵبژاردن بکات کە حیزب دەست نیشانیان دەکات. ئەوانەش کە ماون کاردەکەنە سەر ناوەندە خێڵەکییەکان. بۆیە دەتوانن نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن. هەروەها ناوەندە ئایینییەکانیش سەرباری کاریگەری سنووردارییان لە کوردستاندا، ئەوانیش دەتوانن نوێنەرانیان بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی بنێرن. مەبەستم ئەو ئەنجومەنە کوردییەیە کە هەلومەرجی مێژوویی دەیسەپێنێ. ئەگەر بەدی هات، شتێکی باش دەبێ.

ی.ك: سەرکردەم، لە گوتاری حەفتانەمدا نووسیومە: «ئەگەر بە کوردستانی لە دایك ببوومایە و ئەندامی پەرلەمانی ئێستای تورکیا بوومایە، ڕێگەی چوونە پاڵ ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانم هەڵدەبژارد». ڕاتان بەرانبەر بەم بیرکردنەوەیە چییە؟

س.پ: دەمەوێ سەرنج بدەی. ئەگەر ئەنجومەنەکەمان کەوتەڕوو، ئێوەش و مامۆستا ئیسماعیل بێشکچی دەتوانن تێیدا ببنە ئەندام. گەلێك هۆ هەن. هۆی یاسایی مەنمانەی ئەوەت دەداتێ بە کاوەخۆ بجوڵێی و وات لێدەکات بە زمان پاراوییەکی زیاترەوە گوتار دابدەی و سیاسەت بکەی. ئێوە لە بنەڕەتدا لە ناوەندی سیاسەتدان. ئامرازە سیاسییەکان بۆ ئێوە بەس نین. گوتم ئەنجومەن ئەم لایەنانە دەستەبەر دەکات. ئەگەر کەسانێکی وەك ئێوە کە داکۆکی لە کێشەی کورد دەکەن و لە کورد خۆی پتر ڕێز دەدەن حەزیان کرد لە ڕێگای ئەم ئەنجومەنەوە بکەونە کار، پێویستە ئەوە شتێکی سەیر نەبێ. تەنانەت ئەگەر لەو ئەندامانە ژمارەیەك تورك و عەرەبیشیان لە نێودا بوو، پێویستە پێمان سەیر نەبێ. تێڕوانینی ئایدیۆلۆژییان هەرچۆنێك بێ، من وای دەبینم هاتنە ڕیزیان شتێکی باشە. هەوڵ بدەن و ئیش بکەن تا لەوێ پێكبگەینەوە، چونکە جیاوازی تێڕوانین لەم جۆرە ئەنجومەنەدا و بەتایبەتی لە سەرەتاکانیدا دەتوانن بە باشی پێداویستییەکانی گەل لەو سیاسەتانە بە جێبهێنن کە خزمەتی بەرژەوەندی دەکەن و بۆ قازانجی گەلان دەبن. هەبوونی کورد لە پەرلەمانی تورکیا لە کاتی بنیاتنانیدا شتێکی خراپ نەبوو. بەڵام پاشتر بۆ مەبەستی خراپ بەکارهێنرا. دەکرا لەم ئەنجومەنە میللییەدا نوێنەرایەتی بکات، بەڵام شۆڤێنیزم نەیهێشت ئەوە سەربگرێ. ئێستاکە کورد لە گەلێك ئەنجومەندا هەن، دەوری خۆیان ناگێڕن. دەور نەگێڕانیشیان شتێکی زۆر خراپە. من ناڵێم بوونیان لەوێ خراپە. هەر بەو پێیە، بوونی تورکی باش باشترە لە نەبوونیان و پێویستە هەبوونی نوێنەرانی تورکیش بۆ گەلی تورك شتێکی پڕ بەها بێ.

ی.ك: زۆر درەنگە پێشنیاری ئێوەم بۆ خۆ پاڵاوتنم پێ گەیشت. من بۆ ئەو متمانەیەتان سوپاستان دەکەم. من خۆم ئارەزووم دەکرد ئەو کوردانەی کە لە پەرلەمانی تورکیادان بچنە پاڵ ئەو ئەنجومەنە.

س.پ: ئەمە شیاوە، هەندەچێ ئەم جۆرە کارە پەرلەمانی تورکیا بەهەژێنێتەوە، چونکە نوێنەرە کوردەکان هەر ئەو دوو وشەیە کە لەزاریان هاتەدەر کورسیەکانیان لەدەستدا. لەبەرئەوەش کە یەك یا دوو نیشانەیان هەڵگرتبوو، دنیایان هەڵساند و دانەنیشاندەوە. بێ گومان ئەوانە بەم ڕەفتارەیان پاڵ بەکوردەوە دەنێن لەئەنجومەنی خۆیان دابمەزرێنن کە هەرچی چۆنێك بێ مافی زۆر سروشتی خۆیانە.

## ئەو هەڵسەنگاندنانەی کە دەڵێن: «ئاپۆ بە ئامۆژگاریەکانی خۆی ڕێنوێنی HEP دەکات»، یان(HEP) سەر بە(PKK)یە هیچ بنچینەیەکی ڕاستیان نییە.

ی.ك: ئەوانەی وا حوکمی تورکیا دەکەن بیر تەسکییان هەیە. ئەوان وای دەبینن چوونە نێو پەرلەمانی تورکیا سەبارەت بە کوردستان و تورکیا شتێکی گرانە، یا بۆ خەبات ناچارییە، ئەم بارودۆخە پێچەوانەی ئەم چەمکەیە. وەك دەبینم حکومەت لەم قۆناخەدا لە داخستنی (HEP)دا بڕیاریە. پێشتر لەسەر داخستنی سوور بوون و ئیستاش بڕیاران. پێم وایە قسە و ڕاگەیاندنەکانیان کە لە ڕۆژنامەکاندا دەرکەوتن و باسی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان کردنیان، دەوڵەتی وا لێ کرد بەم جۆرە بڕیاربێ. ئەم بڕیاریە لە لای (HEP)یش هەیە. چۆن دەڕوانیتە ئەم کێشەیە؟ [illegible] (HEP)، بۆیە وەختێك دایدەخات ئەوە حیزبێکی کوردی داخستووە.

وەك دەبینم حیزبێکی کوردی لە نێو تەکتیك و ئامانج و بەرنامەتاندا نییە، بەڵام توانیوتانە بە هۆی بوونی ئەم حیزبەوە ئەنجامی باش وەدەست بهێنن. واتە (PKK) حیزبی (HEP)ی دانەمەزراندووە. بەڵکو (PKK) ناتوانێ چاو لە بوونی (HEP) بپۆشێ. ئێوە لە گۆشە نیگای سەرجەم جەماوەری کوردستان و تورکیاوە چۆن دەڕواننە (HEP) و ڕادەی بایەخ پێدانتان چەندە و چۆنی هەڵدەسەنگێنن و ئایا توانیویەتی ئەرکەکانی ڕابپەڕێنێ؟ ئایا لەمڕۆ بەدواوە دەتوانێ ئەرکەکانی ڕابپەڕێنێ؟

س.پ: بەسەرهاتی دروست بوونی(HEP) کەمێك ئاڵۆزە. ئەوە بوو نوێنەرانی کورد ویستیان بەرهەڵستی یەکی سادە لەنێو(SHP)دا پێكبهێنن. بەڵام لەبەرئەوەی کە لیبەنۆ کەسێکی زۆر شۆڕشێنی بوو، لە حیزب وەدەری نان. یەکەم: ئەم جۆرە ڕەگ و ڕیشەیە لای لیبەنۆ هەیە و، دووەم: ئۆزال چرای سەوزی داگیرساند بۆ دامەزراندنی (HEP) لە پێناو بێ هێزکردنی (SHP)دا و پشتیوانی دەوڵەتی بۆ حیزب مسۆگەر کرد. بۆشاییەکی سیاسی بە کاریگەری ئێمە لە ئارادا بوو، بۆیە

هێندێك ناوەند ویستیان کاریگەریمان بە خراپی بەکاربێنن. واتە دەست کرا بە قسەکردن لەسەر پێکهێنانی حیزبێکی کوردی نوێکەر و ڕەنگبوو لەم هەلومەرجەدا(HEP) بن. بەرمان لەوە کردەوە دەست لەم مەسەلەیە وەربدەین لەو ڕووەوە تا کە «ئەمە حیزبی ئێمەیە و سەر بە PKK یە»، بەڵکو لەبەرئەوەی کە پشتی بە بنکەی سیاسیمان ئەستوور بوو. هێندێکیان نزیك دەبوونەوە. وەك بڵێی دژی دەکەن و، هێندێکی دیکەیان وا نیزیك دەبوونەوە کە دۆست بن. بەم پێیە نەمانتوانی دەستەوەستان ڕابوەستین. واتە ناچار بووین دەست تێوەربدەین. مەبەستم لەو دەستێوەردانە دروست کردنی چەند پێوەندییەك بوو. لە ناوەوە و لە دەرەوە ڕەخنەمان لێ گرت و پشتگیریمان کرد. جا کە ڕێککەوتنیان بۆ هەڵبژاردن لەگەڵ(SHP)دا هاتە پێشەوە، پشتگیریمان کردن. چونکە ئامانجی تەکنیکەکانی دوژمن ئەوە بوو هێزی شاراوەی ئێمە بکرێتە پشتیوان بۆ حیزبی دیکەی ترسناکتر. نەمانتوانی بە تەماشەکەری بمێنینەوە و خۆدابڕین لە هەڵبژاردن، شتێکی گونجاو نەبوو. لە بارترین چارەسەر ڕێککەوتن بوو لەگەڵ (SHP) لەسەر هەڵبژاردن. وەك دەزانن یەکەم جارە ئەم جۆرە نوێنەرانەی کورد دەردەکەون و کە پەرلەمانیش بە شێوەیەکی شۆڤێنی لای لەم مەسەلەیە کردەوە، ئەوە وای لە ناوەندەکان کرد بێ ئەندازە بهەژێن و زەمینە بۆ مشتومڕی دوور و درێژ خۆش کرد وەك «PKK لە ناوەوە نەك لە دەرەوە. پێویستە ئەوانە دەربکەین» و ڕەفتاری دیکەی شۆڤێنی لەم چەشنە.

ی.ك: ئایا ئەم شێوە ڕەفتارەی نوێنەرانی تورك ڕەفتارێکی دەمەنگانە نییە؟

س.پ: بێ گومان، پێویستی نە دەکرد قیامەت هەڵبستێنن، چونکە دوو وشەیان لە دەم دەرهات یا دوو نیشانەیان دانا. سەرنج بدەن لە ئەنجومەنی هاوشێوەی وەك هی ئینگلتەرە و فەرەنسەدا دەکرێت هەموو شتێك بڵێن و، هەتا هێندێك ئەندام گوێ لەم جۆرە قسەیە ناگرن و بایەخی پێنادەن و پەلپی لێناگرن. ئەم ڕەفتارە بەڵگەی ڕادەی دەمارگیری شۆڤێنیانەیە. پەلپ و بیانو پیشاندان لەسەر یەك یا دوو وشەی هاکەزایی، بەسەریاندا هەڵگەڕایەوە. ئێمە کاتی ئەوەمان نییە ئاوڕ لەم مەسەلە بچووکانە بدەینەوە، چونکە زەحمەتە (HEP) بە ئامۆژگاری ئێمە ئیش بکات و تێبگات و لە دۆخێکدا نییە ڕێ بدات ئامۆژگارییەکانم بە ڕاستی جێبەجێ بکات. با (HEP) بخەینە لاوە، کادیرە ناوەندییەکانی (PKK)ش ناتوانن ڕێنماییەکانم بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان جێبەجێ بکەن و من بە ئاشکرا سکاڵا لە دەست ئەم بارودۆخە دەکەم. (HEP)ێك کە لە دەسەڵاتی ناوەندییەوە دوور و لە توانایی جموجووڵیش بێبەش بێ و ڕێکخستنەکەی هێزێکی تەواوی نەبێ، چۆن دەتوانێ ئامۆژگارییەکانم جێبەجێ بکات؟ ئەم حیزبە حیزبێکی یاسایییە و منیش بەرپرسی حیزبێکم شەڕ دەکات. چۆن دەتوانم ئامۆژگاری ئاشکرا بە حیزبێکی یاسایی بدەم؟ ئەمە زیندەڕۆیی تێداکرابوو. واتە ئەم پڕوپاگەندانە بە مەبەستی ئاوەژاندن و داماڵینی ئەم حیزبە دەکران. وە لەڕاستیدا هەندێك کەس لە

هەندێك مەسەلەدا ڕای منیان دەپرسی و ئێمەش ڕای خۆمان لە هەندێك ڕۆژنامەدا بڵاوەکردەوە، وە لەمەوە هەندێك پڕوپاگەندە بڵاوکرانەوە کە دەڵێت: ئاپۆ ڕێنمایی خۆی دەدات بە (HEP) و یان (HEP) حیزبێکی سەر بە (PKK)یە. ئەم پڕوپاگەندانە لەسەر خەیاڵ بنیات نراون و قریان بەسەر ڕاستیەوە نییە. بەڵام ئەوە قبوول ناکەین دەست لە (HEP) بەربدەین، چونکە ویستیان لەم حیزبە دژی ئێمە ئیش بکات و خەباتمان پاکتاو بکات. ئێمە هێزێکی گەورەی پەنهانمان هەبوو. دیارە ئێمە ڕێ نادەین ئەم هێزە پەنهانەمان بۆ قازانجی پەرلەمانی تورکیا بخرێتە کار، بە تایبەتی لەوان زۆریان گوتەوە کە هەتا کوردیش دەتوانن بچنە نێو ئەم ئەنجومەنە. دەبوو چەند هەنگاوێك بنێین. ئاوا ئەم گۆڕانکاریە تێکچڕژاوانە بوونە هۆی پێکهێنانی (HEP) و مەسەلەی (HEP)یش پەرەیسەند. ئەوان ئێستاکە هەوڵدەدەن بە بڕیارێکی دادگای دەستووری سنوورێك بۆ هەموو ئەمانە دابنێن و ئێوەش دەڵێن ڕاڕاییەك لەم مەسەلەیەدا هەیە. دەکرێت بیر لە هۆیەکانی ڕاڕایی بکەینەوە. لەمە ڕاستە. ڕەنگە لەمە هێندێك گۆڕانکاری لێبکەوێتەوە. لە ڕووی یاساییەوە دەکرێت حیزبێکی هاوچەشن بە تەواوی ئاراسی دابمەزرێت و داخستنی (HEP)ش تاو بەم جۆرە هەولانە دەدات و کردنەوەی حیزبێکی جێگرەوەش وا دەکات داخستنی لەوەی یەکەم بێمانا بێ. لە لایەکی دیکەوە پەرەسەندنێکی سیاسی گرنگ لە گۆڕێدایە و دەوڵەت کردەوکۆشیەتی لەم پەرەسەندنە تێبگات و بە خۆی بگرێ و بە خۆی دەڵێت: «ئایا HEP دەوری لەم پەرەسەندنەدا هەیە». پێم وایە دەوڵەت بەم ڕەفتارە خۆ دەخاتە بەردەم نیشانەیەکی پرسیاری گەورە. لەبەر ئەم هۆیە لە داخستنیدا ڕاڕایە. لەوانەیە هۆی دیکەش هەبن. باوەڕم وایە کە ئەمریکا و ئەوروپا ئەمەیان پێقبوول نییە و دەوڵەتی تورکیاش ئەم هەڵوێستە لەبەرچاو دەگرێ. ڕەنگە بیر لەوە بکاتەوە کە ئەو دەتوانێ لە ڕێگای (HEP)ەوە ئەم گۆڕانکاریانە هەڵسووڕێنێ. ئەم هەموو کارکردانە وا لە حکوومەتی تورکیا دەکەن ڕاڕابێ.

کاتێك دادگای دەستووری بڕیاری داخستنی (HEP) دەردەکات، مەبەستی ئەوەیە هەلومەرج ماوەی بنیاتنانی حیزبێکی کوردی یاسایی نادات و ڕژێمیش ئەمە قبوول ناکات. بەڵام ئەنجامەکەی چی دەبێت؟ ئەگەر ئەم ناکۆکیانە وردبوونەوە و هەڵیانسەنگاند، ئەوسا بڕیار دەدەن. دادگاش لەبەر ڕووناکی ئەم بڕیارانە و ئەو هۆ و پێداویستیانەی کە بەسەر دادگای دەستووریدا دەشکێنەوە، بڕیاری ڕەوایی داوای دەوڵەت دەدات.

ی.ك: وەك زانراوە بڕیار لە تورکیا لە لایەن دەستەی ئەرکانەوە دەردەکرێت. بەپێی گومانی منیش دادگای دەستووری چاوەڕێی ئەم بڕیارەیە. لە کاتێکدا دەستەی ئەرکان بیر لەوە دەکانەوە کە ئاخر (HEP) بە لای (PKK)وە ناچاری و گرنگە و ڕادەی بایەخی چەندە و چاوەڕوانی کاردانەوەی (PKK)ش لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکەن تا بە بڕیاری ڕاست و دروست دەگەن و دادگای دەستووری لێئاگادار دەکەنەوە.

س.پ: بەڵێ ئەمە ڕاستە. بەڵام ئەوەی کە دەڵێن (HEP) بە لای ئێمەوە شتێکی زۆر گرنگە و زیانییە، ڕاست نییە. لە کاتێکدا ئەم حیزبە پێی ناکرێ سیاسەت و پێوەندی دیموکراتیانە لەگەڵ بنکە یاساییەکاندا دابمەزرێنێ و جێبەجێ بکات. پێی ناکرێت پێوەندی دیموکراتیانە پەرە پێبدات و چالاکی دیپلۆماتی ئەنجام بدات و ناتوانێ نە پەرەبستێنێ و گەورە ببێ و نە ڕێکخستنەکەی بە باشی پەرە پێبدات و ناچار دەبێ یارمەتی لە لایەنگرانسان داوا بکات. ئەم بارودۆخە مایەی تەنگەتاوبوونە بۆ ئێمە و ئەوان. بۆیە ئەوەی کە گوتم ڕاستە. (HEP) بەلای (PKK)وە ئامرازێك نییە نەتوانێ دەستی لێهەڵبگرێ، بەڵکو ئەم حیزبە گەلێك نارەحەتی بۆ (PKK) پەیدا دەکات. ڕاستی ئەمەیە و دەبێ (HEP)یش ئاوا هەڵبسەنگێندرێت.

ی.ك: ئێمەش نەمانتوانی نە ئەو هەلومەرجە هەڵبسەنگێنین کە دەوڵەتی تورکیای پێداتێپەڕی و نە ئەو بڕیارانەش کە لەم ماوەیەی دواییدا بە دەستییەوە دەناڵێنێ. بەڵام دەوڵەتی تورکیا پاش هەڵبژاردنە نیوەچڵەکان کەوتە گەڕان بە شوێن ڕێگایەکدا بۆ دەرچوون، لە بری ئەوەی کە دەستەوەستان ڕابوەستێ. خۆ ئەو خوتبە باوکانەیەی کە دیمیریل دەیانخوێنێتەوە ناتوانن قەناعەت بە جەماوەر بکەن. لەوانەیە دەوڵەت هێندێك ڕۆشنبیری دەستەپاچە و چەپڕەوی کۆن و ڕۆژنامە نووس قەناعەت پێبکات، بەڵام ناتوانێ کەسی دیکە قەناعەت پێبکات. دەوڵەت باش ئەوە دەزانێ، بۆیە سوراخی دەروویەك دەکات. کێشەی (HEP)یش لە ئارادایە کە تاوێك لەمەوبەر لێی دوواین. پێویستە (PKK) لە ڕوانگەی هەست بە بەرپرسی کردنیەوە بایەخ بە (HEP) بدات. بەڵام هیچ پێوەندییەکی ئۆرگانیکی لە گۆڕێدا نییە و هەموو ئەوەی کە هەیە هەر کارتێکردنە.

س.پ: ئەوەی ڕاستی بێ دەوڵەت لە ئێمە پتر کاردەکاتە سەر (HEP) و هەوڵدەدات پتر بەکاری بێنێ بۆ کارکردنە سەر بنکەی جەماوەریمان و کە ئەوەی پێناکرێ دایدەخات.

ی.ك: بەڵام ئێستاکە ڕاپایە. ئایا ئەرکەکانی (HEP) دوایییان پێهات؟ ئایا ئێمە زوڵم لە (HEP) دەکەین؟ لە ماوەی سێ ساڵدا سێ سەرۆك گۆڕدران.

س.پ: نەخێر، کێشەکە کێشەی گۆڕینی سەرۆکی حیزب نییە. چەپ بە گشتی و ڕۆشنبیرانی کورد بە تایبەتی توانایی پەرەپێدانی سیاسەتە دیموکراتیەکانیان نییە. زۆر ڕوونیشە کە (HEP) بیر لەوە ناکاتەوە کە حیزبێکی کوردییە و دەرگاکانی بۆ دیموکراتییە پێشکەوتووخوازەکانی تورك خراونەتە سەرپشت. بەڵام هیچ دەست هەڵێنییەکیان بۆ خەباتی دیموکراتی پیشان نەداوە، بەڵکو خۆیان ئەوەیان ناوێ. ئەوان سەرباری ئەوەی کە بنکەیەکی جەماوەری بەرین هەیە، ناتوانن دەیەکی ئەوە بکەن کە (حیزبی ڕەفاه) دەیکات. بەو پێیە ئەگەر ویستمان هەر ئەرکێك بە (HEP) بدەین. ئەوە بنکەی جەماوەری کورد هەیە کە بنکەیەکی دیموکراتییە. ئەگەر ئەم حیزبە توانی بنکەیەکی جەماوەری تورکی دابمەزرێنێ،

ئەو کاتە لەوانەیە دیوارێکی دیموکراتی لەمپەر بە شێوەیەکی یاسایی لە پەرلەمانی تورکیادا هەڵبچنێت و دەبێتە دەسکەوتێکی گەورە بۆ دیموکراتی. ئەمەش پشت بە تورکە دیموکراتییەکان و ڕادەی هەڵسەنگاندن و ئامادەییان بۆ ئەش دەبەستێ. کورد ئامادەبییەکی باشی بۆ ئەم مەسەلانە هەیە.

ی.ك: بەشە کوردەکە زۆر چالاکە. پێم وایە تەنانەت کۆنە چەپڕەوە تورکەکانیش ناتوانن بچنە نێو ئەم جۆرە پێکهاتەیەوە.

س.پ: کەمێك لەمەوپێش باسی ئەمەم کرد. ئەوان حەز ناکەن هیچ چالاکییەکی یاسایی یا نایاسایی و ئاشتییانە یان پشت بە زەبروزەنگ بەستوو بکەن. ئەوان مردوون.

ی.ك: دەوڵەت بە شێوەیەکی سەیر بە خۆیەوە گرتی داون. ئەگەر دەوڵەت (HEP)ی داخستبا دایبخات، چونکە بەوە زیان بە خۆی دەگەیەنێ. لام وایە دەوڵەت ئەم جۆرە هەنگاوە دەنێت، چونکە ئێوە بە هیچیان نازانن.

س.پ: بەڵێ ئەمە ڕاستە. ئەوسا دەوڵەت حیزبێکی داخستووە کە هیچ کارێکی نییە.

ی.ك: ئێوە گوێ بە ڕێ و ڕەسم نادەن. دەتوانین بڵێین ئەوەی وا ڕوودەدات ئەوەیە مەسەلەی (HEP) ڕوون و ئاشکرا بووە. مەسەلەی (HEP) وەك ئێمە بۆی دەچین ئاڵۆز نییە. وەڵامەکەشتان زۆر ڕاشکاو بوو و مەبەستتان ئەوەیە ئەگەر (HEP) توانی ببێتە حیزبێك زەحمەتکێشانی گەلە جیاجیاکان بە خۆی بگری، ئەوە دەورێکی زۆر گەورەی دەبێ. بەڵام ئەوەی کە دەوڵەت حیزبێکی وەك (HEP) بەم وەزعەی ئێستایەوە دابخات، ئەوەیان هیچ زیان بە تێکۆشانی کورد ناگەیەنێ.

س.پ: بگرە بەردۆچکەیەکیش بەم تێکۆشانەدا ناکەوێ. ئێمە باش قایمکاریمان بۆ ئەم بابەتە کردووە. تەکتیکەکانی (PKK)ش لەسەر ئەم بابەتە یەکجار نەرمونیانن. ئەوەندەی بەرەو پێشەوە بچێ، دەزانێ چۆن بە باشی بکشێتەوە. تەکتیکەکانمان لە سەروبەندی شەڕی باشووردا بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو پەرەیان سەند، (HEP) ڕووی کرایەوە و ئێمەش دەتوانین پاشەکشە بکەین و شەڕ تا دوا پلە سەربخەین. لە ڕاستیدا پێویستە باسی سیاسەتە نەرم و نیانەکانمان بکرێت و لەم گۆشەنیگایەوە تێیان بڕوانن.

ئەگەر یەکێك پێی گوتم: «زۆر بە توندوتیژی هەڵیدەسەنگێنن وا کە خیانەتکارە و، ئەمڕۆش لەگەڵیدا پێکدێن. ئەمە ناکۆکی نییە؟». پێی دەڵێم: «بەڵێ خیانەتکارە، بەڵام پەیوەندی ناچارییە». دژ بەیەکدی نین. ئەوانەی وا دەیانەوێ بە قووڵی لە سیاسەت حاڵی بن، پێویستە هێندێك خاڵ بە باشی تێبگەن. ئەم هەڵوێستە هاوشێوەی ڕێککەوتنی (HEP)و(SHP)یە و بەسەریدا جێبەجێ دەبێ، من لە گەلێك سیاسەتدا پشت بە هەست و نەستی خۆم دەبەستم و کۆنتڕۆڵی ڕاستیان چەوتییەکانی دەکەم. ئینێنۆ گوتوویەتی: «ڕێککەوتنی HEP لەگەڵ SHP دا واتە ئێمە هێزە کوردییە شاراوەکان قووت دەدەین». من بە پێچەوانەی ئەوەوە

بیرم کردەوە و گوتم: «ئەم ڕێککەوتنە دەبێتە هۆیەکی قووتدانی SHP». ئەگەر چی (SHP) لە حوکمدایە، بەلاّم بە تێپەڕینی ڕۆژگار بەتەواوی دەبێ.

ی.ك: باشە، سەرکردەی ئازیزم درەنگ ئەم بڕیارەتاندا. وانییە؟

س.پ: ئەم مەسەلەیە بە لای منەوە گرنگ نەبوو تا بە پرسیاری بیری لێبکەمەوە. من دەڕوانمە خەلکانی دی و چاودێریان دەکەم تا بزانم داخۆ هیچ سیاسەتێك دەکەن یان نا، یا ئایا هیچ یارمەتییەکیان پێویستە؟ ئەگەر ئاوا بوون یاریدەیان دەدەم. دەنا ئەم بارودۆخانە هێنان و بردن و بیرکردنەوەیەکی درێژخایانیان گەرەك نییە.

ی.ك: بە قەناعەتی من هەلوێستی (PKK) بە لای (HEP)وە هەلوێستێکی زۆر دەگمەنە. جا لەکاتێکدا بیر لە بەکارهێنانی (HEP) دژی (PKK) دەکەنەوە، (HEP) دژایەتییان دەکات.

س.پ: بێگومان. با ئەوانیش هەولبدەن لەم تەنگانەیە دەربچن. وانییە؟ بارودۆخی بەرەی کوردستانی و دەولەتی فیدرالی کوردی کەمێك لەم بارودۆخە دەچێ کە پێکیان هێناوە. دایمەزراند...وە ناتوانن لەم تەنگانەیە دەربچن. هەردوو بابەتەکە لێکدەچن.

ی.ك: بەلێ، بێئەملاوئەولا وایە.

س.پ: دیمیریل خۆی پشتگیری دامەزراندنی دەولەتی فیدرالی کرد و ڕۆژی دووەم گوتی: «ئێمە دژی ئەوین». ئەو بەسەرپەرشتی ئێوە گەشە دەکات، ئیدی چۆن بەرهەلستی دەکەن؟ ئەنانەت بارودۆخیشیان تا ئەوپەڕی ناکۆکە.

ی.ك: سێ یا چوار هەفتە لەمەوبەر لە ڕۆژنامەی (یەنی ئورولکە)دا ئەمەم نووسی: «من باوەڕناکەم PKK یا ئاپۆ سەرپەرشتی HEP بکەن، چونکە ئەگەر ئەوە ڕاستبوایە بە شێوەیەکی زۆر باشتر بەڕێوەیان دەبرد». پێم وایە ئەم قسەیە جێیقەناعەت پێکردنە. نووسەرەکانی (یالچین دۆغان) و (تەمھا ئاتیپول)یش ئەم ڕاستەڕێیەیان گرتبوو، لە کاتێکدا پەیوەندی توندوتۆلیان بە ئیستخبارات و دائیرەکانی نەخشەکێشانەوە هەیە. لە ئێستا بەدواوە لیدارەی ئیستخبارات «MIT» وەك دائیرەیەکی نەخشەکێشان وا دەبێ. ئەم دەزگایە لە کێشەی کوردستاندا دەبێتە دائیرەیەکی سیاسی بۆ ئەوەی نەخشە و پلانی بۆ دابنێ. ئەوان باش دەخوێننەوە و هەلدەسەنگێنن. ئەگەر چەپ لە بار و کارا بێ، لە ڕێگای ئەوەوە ئیش دەکەن. کارێکی زۆریان کردووەتە سەر (HEP). لە جێیەکی دیکەدا ئەمەم گوتووە و لام وایە هەموو بەرپرسیێك ناکەوێتە ئەستۆی (HEP)، چەپەرەوە تورکە پێشکەوتووخوازەکان سەریان لێنەکرد و نەچوونە پالی. بەلاّم ئێستا جەماوەر چالاکییەکی بێئەندازەی هەیە. ئەو ناوەندانە چەندین ئارەزوویان هەیە. ئەوان ـ واتە سەرکوتکراوان و ڕۆشنبیران ـ بە لای بەهێزترینەدا دابەشدەبن. بە پێی باوەڕی من وادەڕوانە (HEP) وەك بلێی (PKK) بێ. ئەوان لە (PKK)وە دوورن و نایناسن. ئەو باوەڕەیان هەلەیە. کە گوایە (PKK) بەرای بەر کاریگەری نییە. لە

رووی یاسایەوە بەرنامەیەکی جیاوازی هەیە، بەلام ناکرێت (HEP) کارتێکراوی دەستی (PKK) نەبێ. خەلك هەموویان (PKK) کاری تێ کردوون.

س.پ: تەنانەت هێندێك ئەندامی ڕێگای ڕاست (DYP)یش بە پشتیوانی ئێمە هەڵبژێردران.

ی.ك: بێ گومان. من ئەم قسەیەم لە دادگای ئاسایشی دەولەت (DGM)دا کرد و پێی قبوولّ بوو. هەرچییەك کە ئاپۆ دەیلێت گوناح نییە، ئەگەر ووتی «ئەمرۆ سێشەممەیە» ئایا ئەمە تاوانە؟ (HEP)یش نەیتوانیوە جیاوازی بکات. هەتا ئەگەر گوتیشیان: «PKK هەیە. من لەو بارەیەوە دەخوێنمەوە و لەوانەیە کاریشم تێبکات». ئەمە بە گوناح دانانرێت.

س.پ: دیارە ئەگەر گوتیان: «دروست بوونی PKK جیاواز ترە، بزاڤێکی زۆر جیاوازە. هەرچی کار تێ کردنیشیەتی لە ئێمە ئەوە زۆر ئاساییە، لە کاتێکدا ئێمە خەباتێکی یاسایی دیموکراتی دەکەین»، ئەوە پەلیان لێناگیرێت.

دەلێم (PKK) لە بارودۆخێکدا نییە هەر کەسێك هەستا و ڕۆیشت ئەم پێوەندی پێوە بکات. ئەگەر پێوەندییەکی دروست کرد، ڕەنگە درێژەی پێنەدات. ئەم حیزبە پێوەندی تەنانەت لەگەلّ ئەو کادیرانەشدا دروست ناکات کە مەشقیان کردووە و لە ناوەندی ئاگرەوە دەرچوون. ئیدی چۆن پێوەندی لەگەلّ ئەو خەلکانەدا دادەمەزرێنێ کە لە ئێسکیەند دەچن. هەتا ئەگەر پێوەندیشمان لەگەڵیاندا دامەزراند، دەبنە کومەلە پاشماوەیەك. ئەوانە ناتوانن سیاسەتەکانمان بەرێوەبەن. تەنانەت دەولەتیش دەپرسێ ئاخۆ دەستمان لە (HEP)دا هەیە، یان پێوەندیمان پێوەی هەیە؟ و دەست بەم بێ عەقلییە دەکات.

ی.ك: ئاپۆی ئازیزم، چەپێکی تورکی و کوردی زۆر نین پێوەندییان بە حوکمەوە هەبێ و، هەموو ئیش و کاریکیان لە حیزبی کوماری گەل (CHP) و حیزبی سۆشیالیستی کۆمەلایەتی (SHP)دا قەتیسە. ئەوان لەو شتانە بێ ئاگان کە باستان کردن و ئەمەش هەر لەبەرئەمە نییە کە تەمبەلن، بەلکو مەشق کردنیش بەشێکی لەمەدا هەیە. جا لەبەر ئەوەی کە چەپی تورك نەچوونە پالّ (HEP)، ئێمە گومان کرنەوە و زۆرمان بۆ هێنان و خۆم ناوبژیکەری نێوانیان بووم. پاشتر ئەم پێوەندیانە لەلایەن (HEP)وە ڕاگیران. ئەگەر پێویست بێ ڕەخنە لە لایەنێك بگیرێت، ئەوە هەڤالانی(HEP) وا دەبانڕوانییە حیزب وەك بلێی کارگەی ناردنی نوێنەرانە بۆ پەرلەمان، بەو قسەیەی خۆیان: «ڕێژەی کەمیان لە حیزبدا دەرفەتی سەرکەوتنمان لە هەلبژاردندا و گەیشتنمان بە پەرلەمان زیاد دەکات». بۆیە دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان دەبێتە دەرسدادانێکی (HEP).

س.پ: ئەگەر یەکێك بیر لەوەبکاتەوە (HEP) بۆ مەبەستی شەخسی خۆی بەکاربهێنێ، ئەوە خۆی دەخەلەتێنێ، چونکە (PKK) شوانێکی جەماوەری بنکەکەی خۆی بەشێوەیەکی هەرزانبەها بەکارناهێنێ و ڕێ بە خەلکانی دیکەش نادات بەو بۆیە بەکاری بێنێ. ئەگەر دلنیان و وای دەبینن (PKK) پشتیوانی و کۆمەکی (HEP) دەکات، پێویستە لەسەریان باش بزانن ئەمە چی دەگەیەنێ و

پاشان دەزانن چۆن ئەم حیزبە بەکاردێنن.

لەڕووی مێژووییەوە گوتم: دەکرێت (HEP) ببێتە «بنکەیەك بۆ چارەسەرێکی سیاسی». ئەگەر دەوڵەت باوەڕی بە چارەسەری سیاسی هەبێ (HEP) دادەخات. ئەندامانی ئەم حیزبەش ئەگەر زانییان چۆن کەڵك لەم بنکەیە وەردەگرن، ئەوا دەوریان دەبێ بیگێڕن. بەڵام ئەگەر پێچەوانەی ئەمە بوو، واتە ئەگەر نەیانتوانی چی پێویست بوو بیکەن و هەستیان کرد لەبەر گوشار و سایەی (PKK) دان، ئەمە نیشانەی لێنەهاتوویی یانە لەم مەسەلەیەدا.

خۆ ئەگەر دەوڵەت لەچارەسەری سیاسی دوورکەوتەوە و بایەخی بە بچووکترین ئامرازی ئەم چارەسەرە نەدا، ئەوا دەیسەلمێنێ لە سیاسەتدا نەزانە و هیچ سیاسەتێك لە خۆیدا جێناکاتەوە. ئەم هەموو گۆڕانکاریانە بەڵگەی بەردەوامی کاریگەری سیاسی لە ڕادەبەدەری ئێمەن و ئەمەش هەرگیز نابێتە کۆسپ بۆمان.

ی.ك: پاش ئەمە... ئەگەر دادگای دەستووری، (HEP)ی داخست. ئەوسا بڕیار لەسەر چۆنایەتی ئیش و کار دەدرێت. بەڵام ئەگەر ئەم حیزبە زیندوو مایەوە، ناتوانێ لە نێو کوردستاندا ئیش بکات چونکە گۆڕەپانی شەڕێکی ناوخۆیە و دەبێ لە تورکیا ئیش بکات. بە هەر ئەندازەیەکیش لە ناوەندە دیموکراتییەکاندا بڵاوببێتەوە و هێزی خۆی بسەلمێنێ، بەوە خزمەت بە پاڵپشتی خەبات دەکات لە کوردستان. لە لایەکی دیکەوە، ئایا تورك پێویستییەکی زیاتری بە(HEP) نییە بۆ شۆڕشی تورکیا و ئازادی تورکیا؟

س.پ: بە دڵنیاییەوە. با(HEP) ببێ بە حیزبێکی تورکی (تایبەت بە تورکیا بێ)، ئێمە پشتگیری ئەم حیزبە دەکەین ئەگەر بەم شێوەیە بێ. با حیزبێك بێ زۆربەی ئەندامانی تورك بن، ئێمە پشتیوانی و پێشوازی لێدەکەین. هێندە بەسە ببێتە ئامرازێکی دیموکراتی و بتوانێ خەباتی دیموکراتی بکات. من بە تەواوی ڕاشکاوییەوە قسە دەکەم و قسەکەم دیوێکی نادڕوشنی نییە. پاڵپشتیان دەکەین. ئەگەر تاقمێك هەبێ ڕێزی خەباتی دیموکراتی بگرێ و ئەو بڕوایەیان هەبێ کە دەتوانن ئەم حیزبە بەکاربێنن، با بفەرموون و با ئەم حیزبە بۆ ئەوان بێ!

## بە ڕاستی شەڕی باشور.. شایانی ئەوەیە لە ڕووی سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازییەوە هەڵوێستەی لەلا بکەین و بە بایەخێکی زۆرەوە لێیبکۆڵینەوە.

ی.ك: ئازیزم سکرتێری گشتی، حەزدەکەم لا لە بابەتێك بکەمەوە کە حاڵی حازر لە ڕۆژنامەکانی تورکیادا مشتومڕێکی زۆری لەسەر دەکرێت و قسەی سەرکردەیەکی (PKK) ڕادەگوازن کە ئەمەیە: «ئەگەر PKK لەسەر شێوازی شەڕی بەرەیی سووربوو، دووچاری زیانێکی زۆر دەبێ». ئەمە دەنگای لەسەر مشتومڕکردن لە بارەی شەڕی بەرەیی و شەڕی گەریلاوە خستە سەرپشت.

بەڵگەنامەیەك لە نێو ئەو بەڵگەنامانەدا بوو کە هەتاڵان دابانمێ و گفتوگۆی ئێوەی بە بێهیم تێدابوو. لە ڕێنوێنییەکانتدا بۆ مەیدانی شەڕ لە سەرەتاوە جەخت لەسەر بەکارهێنانی شەڕی گەریلایی دەکەن و لە پەتابردنە بەر شەڕی بەرەیی ئاگادارمان دەکەنەوە. ئایا لە باشوردا شەڕی بەرەیی هەبوو؟ بەختەوەر دەبم ئەگەر لەم بابەتە باس بکەن.

س.پ: شەڕی باشور، شایانی ئەوەیە لە ڕووی سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازییەوە هەڵوێستەی لەلا بکەین و بە بایەخێکی زۆرەوە لێی بکۆڵینەوە. ڕۆژنامەکان بایەخێکی فرەیان بەم شەڕەدا. دەستەی ئەرکانیش ڕاپۆرتی هەمەجۆری لەسەر ئەم مەسەلەیە هەبوو. دەستەی ئەرکان لەم بەیاننامانەدا دەڵێت: (PKK) دوو هەزار کوژراو و هەمان ژمارە برینداری دۆڕاند. من دەزانم ئەمە ڕاست نییە. بەڵام باشتر وەختێك لەو ڕاپۆرتە دوور و درێژانە وردبوومەوە کە بۆم دەهاتن بۆم ساخ بووەوە کەوا بارودۆخێك هەیە وا لە دەستەی ئەرکان دەکات بەم جۆرە ژمارە زۆری مەزەندە بکات. بەڵام بە کردەوە ئەوە بەدی نەهاتبوو. ئەوی ڕاستی بێ شەڕکردن بە شێوازێکی نەگونجاو و پێلەسەر داگرتنی، بارودۆخێکی لەباری بۆ ئەگەری زیان لێکەوتنێکی گەورە خوڵقاند.

ماوەیەکی درێژ بەر لە شەڕ و تەنانەت لە سەرەتای شەڕیشدا ڕێنوێنیی پەیڕەو کردنی شەڕی گەریلایی هەبوو. چەند مانگێك پێش شەڕەکە هەم ئەوە ئاگادارمان کردنەوە کە لەوانەیە دەوڵەتی تورکیا بە هاوکاری خیانەتکاران و نۆکەرانی کورد هێرش بکاتە سەرمان و، هەم لەوەش کە پێویستە بە چ شێوازێك بەرەنگاریان ببینەوە. ئەم ڕێنوێنییانە ڕوون و ئاشکرا بوون، لە کاتێکدا تێیاندا گوتم ئەگەر هێزەکانمان لە بەرەی خۆرئاوا یا لە بەرەی خۆرهەڵاتدا تووشی نارەحەتی بوون، پێویستە درێژی و پانی زنجیرە چیاکان بەکاربێنن. هەروەها چەند مانگێك پێش شەڕەکە پێمانگوتن خۆ بۆ ئەم جۆرە ڕێ تێچوونە ساز و تەیار بکەن. دەمەوێ لایەنێکی دیکە لەم بارەیەوە ڕوون بکەمەوە، ئەویش ئەوەیە: دەبوو لە کاتی بەرخودانماندا لە (حیلوان و سویرك) بێننە سەر شەڕی گەریلایی. بەڵام سووربوون لەسەر شێوازی گوندنشینان و بەسەر شەڕدا سەپاندنی ئەم تەرزە، ڕێی لەوە گرت.

ی.ك: ئایا مەبەستتان لە شەڕی گوندنشینان شێوازی شەڕی تاکتیکییە؟

س.پ: نەخێر. شەڕی گوندنشینان واتە هەر لایەك بچێتە نێو سەنگەری خۆی و تا هەموو جبەخانەکەی دەبڕێتەوە لێی نەیێتە دەرێ. ئەم شێوازە بوو بەرخۆدانی (حیلوان و سویرك)ی خستە تەنگژەیەکەوە. دەبوو بۆ دەرهاتن لەم تەنگژەیە هەردوو زنجیرە چیاکە بگرین تا دەگەینە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان، ئەوەمان نەکرد. سەرەنجام کەوتینە دۆخێکی شلۆقەوە کە خەریك بوو ئاسەواری یەکەم هەنگاوی بەرخودانی زۆر گرنگ لە مێژووی کوردستاندا نەهێڵێ و ببێتە هۆی بەزینی. بەڵام لە نیشتمان چوونە دەرەوەمان و گەلەکۆمەکەمان بۆ بنیاتنانی حیزب

لەسەر چەند بنچینەیەکی تازە و جارێکی دیکە خۆ ئامادەکردنمان بۆ خەباتی چەکداری پارمەتیپان داین لەلایەکەوە لەم تەنگژەیە دەرباز ببین کە ئەم بەرخودانەی تێکەوت و، لە لایەکی دیکەوە لەو دژواریانەش کە لەگەڵ (١٢)ی ئەیلولدا هاتنەپێش. پاش ئەوە ئامادەکاری بۆ قەڵەمبازی (١٥)ی ئاب دەستی پێکرد.

وەخت بوو هەمان بارودۆخ لە قەڵەمبازی (١٥)ی ئابیشدا ڕوو بدات، کاتێك هەوڵی ئەوە درا ئەم قەڵەمبازە هەر لە نێو پڕوپاگەندەی چەکداریدا بهێڵرێتەوە، بە بێئەوەی بۆ شەڕی گەریلایی پەرەبستێنێ. ئەوە کێشەیەکی زۆر گرنگ بوو. ئەوسا چەند هەڵسەنگاندنێکی هەمەلایەنەی چۆنیەتی ئاڵوگۆڕکردنمان بۆ گەریلا کرد. ساڵی ١٩٨٦ لە سەروبەندی کۆنگرەی سێیەمدا چەند ڕێنوێنییەك لەسەر ئەم بابەتە هەبوون کە کێشاپانەوە بۆ خۆئامادەکردنی سەرتاسەری و دواتر نزیکبوونەوە لە شێوازی گەریلایی لە ساڵی ١٩٨٧ دا، ئەویش بە کاری بێوچان و پەرەپێدانی هەوڵ و کۆششەکان. وەك دەزانن گەریلا لەبەر ڕووناکی ئەوەدا دەستی بە پەرەسەندن کرد.

ساڵی ١٩٩٠ گەریلا پەرەسەندنێکی گەورەیان بە خۆوە دیوە، وامان لێهات سوپایەك گەریلای ڕاستەقینەمان هەبێت. وەك دەزانن هێزەکانمان گەورە دەبوون و بە فراوانی بە ناوچەکاندا بڵاودەبوونەوە. باشوور بۆ ئەم پەرەسەندنە زۆر لە بار بوو. بە هۆی شەڕی کەنداویشەوە باشوورمان بەکارهێنا و هەلومەرج زۆر گونجاو بوو. بەڵام مخابن دووچاری زەبری پڕ ئازار بووین. ئەوە بوو هێندێك لە هێزەکانمان تووشی نەخۆشی جێگیربوون لە ئیدارەکاندا بوون وەك بڵێی لە دێهاتدا جێگیر دەبن.

ی.ك: ئایا ئەم قسەیەتان تەنیا سەبارەت بە باشورە؟ یان تۆ مەبەستت بارودۆخی گشتییە؟

س.پ: بە گشتی هێندێك گۆڕانکاری هەن کە بوونە هۆی گەلێك دژواری بۆ ئێمە. بەڵام ئەم پەرەسەندە لە باشووردا بە شێوەیەکی فراوانتر بوو. دیارە ئێمە وامان چاوەڕوان نەدەکرد هەڵەکان بەم ڕادەیە بگەن. بە تایبەتی کە ڕێنوێنییەکان زۆر ڕاشکاوانە بوون. حوکمێکمان هەبوو وای بڕیبووەوە: «دەکرێت بە هۆی هێزی گەریلای بزاوتووەوە بچینە نێو شەڕی بزاوتوو. بەڵام نابێ لە هیچ هەلومەرجێکدا بچینە نێو شەڕی بەرەیی». لەو ڕێنوێنیانەشدا کە بۆمان ڕەوانەکردن گوتمان: «پێویستە بێئەملاولەولا بە تەرزی گەریلا خۆ ڕێکبخەن». وەڵامیان بۆ ئەم ڕێنوێنیانە ئەمە بوو: «باش خۆمانمان ئامادەکردووە».

بەڵام ئەو ئاکامانەی کە پاش چل ڕۆژ شەڕ بەدەرکەوتن، بەڵگەی ئەوە بوون کە دەست لە هێندێك جێگا گیرکرا، سەرەڕای ئەوەش شەڕ لەو جێگایانەدا بە سەرکەوتوویی لەگەڵ بەرەی کوردستانیدا درێژەی کێشا، بە تایبەتی لەگەڵ هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان (KDP)دا کە سەرکەوتووانە پاشەکشە بە

پەلامارەکانی کراو نەك هەر تووشی زیانی گەورە گەورە بوو، بەڵکو بەزێندرا و ئەمەش حاشا هەڵنەگرە.

ی.ك: تا ئەو کاتە ئایا هێزەکانی تورکیا لەوێ بوون یان نا؟

س.پ: نەخێر. تەنیا هەلیکوپتەر لە ئارادابوون، لەگەڵ کومەکی لوجستیکیدا. دوژمن هێشتا بە تانك و هێزەکانی کوماندوو، نەچوو بووە ناوەوە و، هێزەکانی ناوچەی سوورانیش بەرپرسبوون بو پاڵپشتکردنی هێزەکانی بەرەی کوردستانی. جا کە دڵنیابوون سەرناکەون، بارزانی خوی بانگی تورکیای کرد، فریای بکەوێ. کە هێزەکانی پیادەش سەرنەکەوتن، تانکەکان هاتنە نێو مەیدانی شەڕ.

ی.ك: ئایا لەم قوناغەدا لەسەر شەڕی بەرەیی پێداگر بوون؟

س.پ: نەخێر، کێشەکە کێشەی پێداگرتن نەبوو. بەڵکو هاتنی تانکەکان دۆخێکی چاوەڕوان نەکراو بوو. هاتنە ناوەوەی تانکەکان و ئامادەکاری پێویست نەکردن، بووە هوی باروودۆخێکی حسێب بونەکراو و دۆخێکی هاوشێوەی گەمارۆی هێزێکی گرنگ بەدیارکەوت. هێرشی چەکدارەکان لە باشورەوە و هی هێزەکانی تورکیا لە باکورەوە و پەلاماری ئاسمانی چڕوپڕ بە هەلیکوپتەر و فڕۆکەی جەنگی و هەندێك لە هێزەکانمان کە بە شێوازە کونەکان ڕاهاتبوون نەیانتوانی بە خێرایی بێنە سەر شێوازی شەڕی گەریلایی. ئەمەش پاڵی بە دەستەی ئەرکانەوە نا باسی ئەم باروودۆخە بکات و لافی ئەوە لێبدات کە ئەوان هێزەکانمانیان گەمارۆداوە و لە خوکوشتن یا خوبەدەستەوەدان زیاتر هیچی دیکەیان لەبەردەمدا نەماوەتەوە. بەو پێیە بەشێك لە هێزەکانمان کە ژمارەی دەگەیشتە سێ هەزار کەوتنە نێو داوی ئەم جورە باروودۆخەوە. واتە هەموو هێزەکانمان لە هەمان باروودۆخدا نەبوون. ئەگەر هێزەکانی تورکیا بەجەرگی‌یەکی تەواویان هەبووایە وبە ڕێکخراوی هێرشیان ببردایە، ئەوسا لەوانەبوو زیانەکانمان گەورە بن.

بێ‌گومان لەبەر ئەوەی کە هێزەکانمان بەرخودانێکی دلێرانەیان پیشاندا، هێزەکانی تورکیا زاتیان نەکرد بەرەو ڕوویان بچن. لەهەمان کاتیدا دۆخی یەککەوتن پەیدا بوو. بەدیهاتنی یەککەوتن لەو خاڵەدا نارەحەتی‌یەکی زۆری بو بەرەی کوردستانی نایەوە. ئەوە بوو بەم یەککەوتنەوە لە گوڕەپانی شەڕ چووەدەری. ئەوەش کوسپێکی دیکەی بو جێبەجێکردنی ئەو نەخشەیەی تورکیا پێکهێنا کە ئامانجی تەفروتووناکردنی گەریلا بوو.

## دەوڵەتی تورکیا دەست بەرداری گشت پرنسیپە ماف ئامێزەکان دەبێ، تەنانەت پرنسیپەکانی مافی خۆشی لە ڕووی سەربازییەوە و هەوڵدەدات لە باشوری کوردستاندا سوپایەك لە گوندپارێزان پێکەوە بنێ.

ی.ك: ڕێککەوتن لەگەڵ (بەرەی کوردستانی)دا کرا و بەهۆی ئەم ڕێککەوتنەوە هێزەکان پێکەوە دەکەونە جووڵە. ئایا هێزەکانتان جبەخانەی خۆیانیان بە جێهێشت؟

س.پ: نەخێر جبەخانەکانی خۆیانیان بە جێنەهێشت، بەڵام هێندێك ئوتومبیل و ئامێریان لە نێو برد، هێزەکانی دەوڵەتی تورکیاش دەستیان بەسەر بڕێك کەرەستەی خواردەمەنیدا گرت. هەرچی چەك و چۆڵیشە، دەستیان بەسەر هیچیدا نەگرت. بەشێك لە هێزەکان بەرەو ئۆردووگای باشور کشانەوە و بەشێکی دیکەیان بەرەو باکور و، ئەو بەشەش کە مایەوە شێوەی گەریلایی وەرگرت و درێژەی بە تێکۆشانی خۆیدا. لە کاتێکدا زیانەکانمان خۆی لە نێزیکەی سەد شەهیددا. بەم پێیە هێزەکانمان توانییان لەم هێرشە تێبپەڕێنن و پووچەڵی بکەنەوە و لە دۆخێکی هەڵەوە بۆ دۆخێکی بگوازنەوە کە سەرکەوتنی تا ڕادەیەك گرنگی تێدا بەدیهات.

ی.ك: لێکتێنزیکبوونەوە و ڕێککەوتن بەدی هاتن. باشە، سەرکردەی ئازیزم. لەمەودوا چی ڕوودەدات پاش ئەوەی حکوومەتی تورکیا لەگەڵ هێزەکانی پێشمەرگەدا بڕیاریاندا چەندین پاسگەی سەرسنوور دابمەزرێنن؟ وەك بیستوومانە پرۆژەیەك هەیە بۆ بەستنەوەی ئەو پێشمەرگانە بە مووچەی مانگانە. ئایا ئەمە پاش پاسگە دامەزراندن دەبێ؟ بە تایبەتی کە ئێوە ڕایەکتان هەبوو و دەتانگوت: «ئەگەر بەرەی باشور پەرەبستێنێ، بەرەی باکور پەرەسەندن بە خۆوە نابینێ». ئایا تورکیا بیری لەم مەسەلەیە کردووەتەوە و بڕیاری داوە ئەم پاسگانە دروست بکات و مووچە بدات لە ترسی ئەوەی نەبادا بەرەی باشور پەرە پێبدەن و پاشان ڕوو بکەنە بەرەی باکور؟ ئایا لەم هەنگاوە بۆ کۆسپ خستنەڕێی ئێوە نەنراوە؟

س.پ: سوپای تورکیا لەم چەند مانگەی دواییدا لە ڕووی خۆڕبوونەوەوە، تووشی چەندەها گۆڕانکاری گرنگ هاتووە و بەشێکی گەورەی لێ کشاوەتەوە و گەلێك پاسگەی خۆی بە جێهێشتووە و لە بنکەی گەورەتردا جێگیربووە. پێم وایە ئەمە گۆڕانکارییەکی تازەیە لە بارودۆخی سەربازیدا ڕوودەدات، لە کاتێکدا دوژمن دەستی لە سەدان پاسگە هەڵگرتووە و هێزەکانمان لەم شوێنانەدا مانەوە و کردوویانن بە ژمارەیەك بارەگای سەرکردایەتی کردن.

ی.ك: ئایا مەبەستتان ئەوەیە لە کوردستانی تورکیادا پاسگەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە هی دەوڵەتی تورکیا زۆرترن؟

س.پ: بێگومان. لەبەر ئەوەی بالادەستی سەربازیمان لە هی سوپای تورکیا

فراوانتره.

ی.ك: لەم بارەیاندا پاسگەکانی سەرسنوور چ سوودێکیان دەبێ؟

س.پ: ئەوان لە هەولی ئەوەدان پەل بە سیستەمی گوندپارێزان بهاوێژن بۆ باشور، بۆیە بیر لە دانانی سیستەمێکی تازە بۆ پاسگەکان دەکەنەوە. پێشتر هێندێك پەیوەندی لەم جۆرەیان لەگەل (KDP)دا هەبوو و دەولەت پارەی بە سەرکردایەتی دەدا و لەو رێگایەوە پارە بۆ پێشمەرگە خەرج دەکرا. کەچی ئێستاکە ئەوان شێلگیرانە ناڕوانە لایەنی رێکخستنی (KDP) و تێدەکۆشن کاروبارەکانیان راستەوخۆ لەگەل سەرۆك خێلەکاندا هاوئاهەنگ بکەن بۆ بنیاتنانی سیستەمی گوندپارێزان کە ئاماژەمان بۆ کرد، بنگرە بەشێکی گەورە لەو پێشەوایانە هەن کۆچیان بۆ تورکیا کردووە و چوونەتە ریزی نۆکەرایەتی‌یەوە. ئەمان بە هۆی ئەوانەوە کارەکانیان رادەپەرێنن.

پێم وایە توانیویانە گەلێك پێشمەرگە بە خۆیانەوە گری بدەن لەو کاتەوەی کە ئەوانە لە چادرگاکانی تورکیادا بوون. ئەوە بوو دەولەت توانی زۆریان لێبکڕێ و بۆ باشوریان رەوانە بکات. لام وابێ مانگانە وەك گوندپارێزانی تورکیا نێزیکەی (۲۰۰) دۆلاریان دەست دەکەوێ، ئەو هەوالآنە کە لەم دوایەدا پەیمانگەپشتی دەلێن: دەولەتی تورکیا دەستی کردووە بە تۆمارکردنی ناوی خۆبەخشەکان تا ببنە گوندپارێز. هەوالەکان باسی ناونووس کردنی (۷۵۰۰) کەس لەخێلی (دۆسکی) دەکەن. ئەوانە لە ناوچەی خواکورك و حەفتانێن جێگیر دەکرێن. واتە دەولەتی تورکیا توانیویەتی (۷۵۰۰) کەس لە گوندپارێزە چلکاوخۆرەکان بۆ خزمەتی خۆی پڕ چەك بکات و مووچەی مانگانەیان دەداتێ تا بێ‌بانخانە پاسگەکانی سەر سنوور و ناوچەیەکی دابڕاو دروست بکات. لە هەموو ئەمانەوە لەم راستی‌یەی خوارەوە دەردەکەوێ: «دەولەتی تورکیا دەست بەرداری گشت پرنسیپە مافناسیەکان دەبێ، تەنانەت پرنسیپەکانی مافی خۆشی لە رووی سەربازی‌یەوە و هەولدەدات لە باشوری کوردستاندا سوپایەك لە گوندپارێزان پێکەوە بنێ.

ی.ك: ئێمە کە تا ئێستا باسی گوندپارێزان لە باکور دەکەین و سەرەرای ئەوەی کوردیشن ، ئەوا دەولەتی تورکیا دەتوانێ بلێت ئەوانە هاونشتیمانین لای من و دەرووپەك بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. بەلآم دەولەتی تورکیا دەتوانێ چی لە بارەی ئەوانەوە بلێت کە لە چوارچێوەی گوندپارێزاندا لە باشوردا چەکدار دەکرێن، با بە رواڵەتیش بێ؟ ئەوانە هاونیشتمانی عێراقین. بەمانەی لەم مەسەلەیەدا چی دەبێ؟ ئایا دۆخێکی ناوازە نی‌یە دەولەتێك هاونیشتمانانی دەولەتێکی دیکە لە سیستەمی گوندپارێزاندا چەکدار بکات تا خۆی پێ‌بپارێزێ؟

س.پ: بەلێ ئەمە روودەدات. دۆخێکی بە کردەوە ناوازەیە. من لەسەر ئەم دۆخە لە بەرپرسە سیاسیە تورکەکان دەپرسم و دەلێم: ئەوانە با بە رواڵەتیش بێ بە راستی هاونیشتمانی دەولەتێکی دیکەن و ئێوە هەزارانیان وەك هێزێکی پەدەك بۆ سوپای تورکیا لێ‌پڕ چەك دەکەن. ئەگەر سەرباز (پێشمەرگە)ی دەولەتی فیدرالی

کوردی بن، ئەمە وا دەگەیەنێ ئێوە سوپایەك بۆ ئەم دەوڵەتە پێکەوە دەنێن. ئەم دوو دۆخەش لەگەڵ دەستوری تورکی و لەگەڵ مافەکانا ناکۆکن. ئایا سوپای تورکیا سوپا بۆ دەوڵەتی فیدرالی کوردی پێکەوە دەنێ؟

ی.ك: ئەوەی دەردەکەوێ دۆخەکە وا بەڕێوە دەچێ وەك (جەنگیز چاندار)ی ڕۆژنامەنووس لەسەری نووسیوە و دەڵێت: «ئەوە دەوڵەتی تورکیایە دەوڵەتی فیدرالی کوردی بنیات دەنێت».

س.پ: لەم بارەدا دەوڵەتی تورکیا دەوڵەتی فیدرالی کوردی بنیات دەنێت. ئێستاش دەوری سوپای تورکیا هاتووەتە پێش تا سوپای ئەم دەوڵەتە پێکەوە بنێ.

ی.ك: سوپاکەی دادەمەزرێنێ. ئەمە واتا جارێکی دیکە گران بوونی گوزەران و قەیرانێك لە دەستووردا.

س.پ: دەتوانێ بە ناوی خۆیەوە دایبمەزرێنێ، لەوسا وای لێدێت: هەزاران کەسی لە هاونیشتمانانی دەوڵەتێکی دیکەی ڕێکخستووە و کردوونی بە ڕێکخستنێکی هاوتای سوپاکەی خۆی. ئەمە شتێکە بۆ یەکەمجار لە جیهاندا جێبەجێ دەکرێت. ئەو کاتە ئەم کێشەیە دەبێتە کێشەیەکی دەستووری و وا دەخوازێ بە پێی دەستوور ڕوون بکرێتەوە.

ی.ك: ئەگەر مەسەلەکە پێویستی کرد لە مافناسەکانمان دەپرسم. بەڵام سەرکردەی گەورەم لەوە دەچێ دۆخێکی دیکەی شایانی بایەخ پێدان هەبێ. مەبەستم لەوەیە ئەو زانیاریانە کە لە لاێ و ئەوانەش کە لە لای تورکیان وەکو یەك وان و بەو پێیە دەوڵەتی تورکیا پاسگەکانی لە کوردستانی تورکیا دەکێشێتەوە و پاسگەی تازە لەسەر سنوور دروست دەکات. ئایا ئەمە واناگەیەنێ: ناوەوە پاسگەی نەبێ و دەرەوەی هەبێ؟

س.پ: ناوچەیەکی دابڕاو لە نێوان لوبنان و ئیسرائیلدا هەیە. ئەمەش ئەزموونێکی گرنگ پێکدەهێنێ، ئەم پشتێنە سنوورییە نموونەیە بۆ ئەوان و درێژی ئەم نموونەیە دەگاتە (٢٠ کم) و سوپای ئیسرائیل کونترۆڵ و سوپایەکی ساختەی لوبنانیش چاودێری دەکات. ئەم دوو نموونەیە لەم خاڵەی خوارەوەدا لێکدەچن: ئەم پاسگانە لە ژێر دەستی خودی ئەفسەرە تورکەکاندا دەبن بە قووڵایی نزیکەی (٢٠ کم) و درێژی دەوری (٣٠٠ کم) و ئەم ناوچەیە دەکەنە ناوچەیەکی لە چەك داماڵراو و نزیکەی (١٠٠) پاسگە بنیات دەنێن. پێویستە لەسەرمان لە گۆشە نیگای گەلی کوردەوە بڕوانینە بایەخی ئەم ناوچەیە و بزانین بۆ ئەوان چی دەگەیەنێ. ڕاستییەکەی ئەم ناوچەیە وەك خەنجەرێکی وەشێنراو وا دەبێ لە جەستەی نیشتماندا و دەیکات بەدوو بەشەوە. ئەو ناوچەیەی لوبنان کە باسمان کرد هیچ نەبێ ناوچەیەکی جیاکەرەوەی نێوان عەرەب و ئیسرائیلە. بەڵام ئەم ناوچەیەی ئێمە جەستەی گەلی کورد دەکات بە دوو کەرتەوە و ناوچەیەکی جیاکەرەوە پێکدەهێنێ.

ئێمە پێمان سەیرنییە ئەم ناوچەیە بە سەرکردایەتی بارزانی دروست بکرێت. ئەگەر مێژووی بنەماڵەی بارزانی لە هەموو ڕوویەکەوە پێشان بدەین. دەبینین

ئەوانە پێوەندی لەم چەشنەیان لەگەڵ ئێرانیشدا دامەزراند و ئەمە مەترسی بۆ کوردی ئەوێ پێکهێنا و بووە هۆی کوژرانی هەزاران نیشتمانپەروەری کورد و ڕێکخستنێکیان بە سەرپەرشتی (ئیستخباراتی ئێرانی) بنیات نا چەند ساڵێك بەردەوام بوو، لە کاتێکدا زۆر ئێش و کاری لە باتی ئیستخباراتی ئێرانی دەکرد. کوڕەکەی بارزانی بە هەمان شێوە لەگەڵ (صدام)یشدا ڕێکدەکەوت، بەلام بە زۆری وڵاتە یەکگرتووەکان کە پەلی لەوە گرت هاتە دواوە. ئێستاکە بە هاوبەشی تورکەکان فەرمانەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان جێبەجێ دەکات و لە پشتەوە خەنجەر لە گەلی کورد دەدات. واتە ئەم بزاڤە بزاڤێکە ئامانجی دووکەرت کردنی جەستەی کوردستانە. ئەمە لەڕووی مێژووییەوە گەورەترین خیانەتی بارزانیەکانە. بێ گومان (تاڵەبانی)ش داکۆکی لەم بزاڤە دەکات. ئەوەبوو چەند جارێك لەگەڵ (ئەشرەف بدلیسی)دا لە سلۆپی کۆبوونەوە. مەسەلەی گرنگ لەم بابەتەدا ئەوەیە ئەوانە هەوڵدەدەن کوردستان بە شێوەیەکی خیانەتکارانە دابەش بکەن و بناغە بۆ ئەم دابەش کردنە دابنێن. ئۆزال خۆشی ڕایدەگەیەنێ و دەڵێت: با ٣٠ـ٤٠ ملیۆن دولار بڕوات، ئەمە گرنگ نی یە. باوەڕم وایە ئەوان چەکیشیان دەدەنێ و مەشقیشیان پێدەکەن. ئاوا سوپایەك لە کاسەلیسان پێکەوە دەنێن. ئەمە حسێب و کاروباریانە.

ی.ك: لێرەدا بەرلەوەی لە هەڵوێستتان بپرسم، دەمەوێ ئەو پرسیارەی خوارەوەتان لێبکەم: ئەگەر دەوڵەتی تورکیا هێزەکانی لە دیهاتی کوردستانی تورکیا بکێشێتەوە، لە تورکیا بووین زانیمان پاسگەکانی هەڵدەوەشێنێ و ڕانیاریەکانی ئێوەش جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، بەلام کاسەی ئەم کارە ژێر کاسەکەی چییە؟ کاتێك دەوڵەتی تورکیا بەم شێوەیە هێزەکانی دەکێشێتەوە، ئایا خۆی ئامادە ناکات بۆ بەکارهێنانی چەکی ئانیزامی؟ ئایا لەم بارەیەوە هیچ خەم یا نیگەرانییەکتان هەیە؟

س.پ: سوپای تورکیا لە بنەڕەتەوە لە سیستەمی دەستووری چووەتە دەرێ و هەموو مافێکی مرۆڤایەتی و پەیماننامە و ڕێککەوتنێکی بنچینەیی نێودەوڵەتانی پێشێل کردووە و بوونیشی لە باشووردا بەڵگەی ئەم پێشێلکارییە. لەم ماوەیەی دواییدا چەندین گەلەکۆمەی چڕوپڕی کێوماڵ کردنی کرد و کەوتە بۆردومان کردنی سێگۆشەی (دیاربەکر ـ بیسکۆل ـ موش) و ئەم بۆردوومانە گەیشتە ناوچەکانی (دێرسیم و بوتان)یش. ئێستاکەش دەستی کردووە بە چۆڵکردنی گەلێك گوندی ئەم ناوچانە و کوشتنی دێنشینان و ناچارکردنیان تا لە گوندەکانیان کۆچ بکەن. ئایا مەبەست لە کۆچ پێکردنی دێنشینان زەمینە خۆشکردنە بۆ بەکارهێنانی چەکی ـ لەنێودەوڵەتاندا ـ قەدەغەکراو؟ پێم وایە لە ئێستاوە ڕێ و شوێنی خۆی دادەنێت و تا ئەم ساتە ئاگامان لەوە نییە. بەلام گومانی تێدا نییە کە هێزێکی گەورەتری ئاگر بەکاردەهێنێ. دووەم ئامانجی گوند چۆڵکردن و کۆچ پێکردنی دانیشتووانەکەی لێکجوێ کردنەوەی گەریلا و دێنشینانە. بەلام

لایەنی گرنگتر ئەوەیە سوپاکەی ناتوانێ لە ناوچە شاخاویەکان بمێنێتەوە.
ی.ك: بەڵام دانیشتوانی کوچ پێکراوی گوندەکان بۆ خورئاوا ناچن. هەموویان دەچنە شارەکانی کوردستان.
س.پ: بەڵێ وایە، چونکە گەل حەزناکات نیشتمانی خوی بە جێبهێڵێ.

## دەوڵەتی تورکیا کار بۆ ئەوە دەکات کە باڵادەستی خۆی بەسەر باشوری کوردستاندا لە چوارچێوەی نەخشەی(موسڵ ـ کەرکوك)دا بسەپێنێ.

ی.ك: باشە جەنابی سکرتێری گشتی بەرێز، وەك تێگەیشتووم جێبەجێکردنی پرۆژەی ئەم پاسگایانە لە بەهارەوە دەست پێدەکات. ئایا هەڵوێستتان چی دەبێ؟ ئایا پەسەندی دەکەن؟
س.پ: سیاسەتمان سیاسەتێکە پشت بە یەکێتی نەتەوەیی دەبەستێ و ئەوە دەکەین بنچینە بۆ خومان. بۆیە ناتوانین بە هیچ شێوەیەك ئەم پرۆژەیە قبووڵ بکەین کە ئامانجی دەست وەشاندنە لە هیوا کانمان بۆ یەکێتی، دوژمن رەنگی بۆ دەرێژێ وە هەروەها بە هیچ جورێکی تریش قبوڵی ناکەین. گومانی تیدا نییە کە ئێمە بە هەموو هێزێکمانەوە لە رووی ئەم پرۆژەیەدا رادەوەستین. پێشتریش حەزیان دەکرد ئەم کارە بکەن، بەڵام رێمان لێگرتن و ئێستاش رێیان لێدەگرین. کێشەکە لەوەدا ەتیس نییە کە لە باشوردا دەمێنینەوە یان نا. بەڵکو کێشەی خستنە کاری گەلەداشە دژ بە گەلەکەمان لە باشور، واتە دژی گەلی کوردستان، ئێمەش دژی ئەم جۆرە کارەین، جا لە باشور بێ یان باکور، بە تایبەتی کە (٣٠) ساڵە پشتێنەی بوتان لە لایەن (KDP) و جاشەکانی خۆیەوە لە بەرەنگاری باکوردا بەکاردەهێنرێت. خۆ سەرجەم سەرۆکانی گوندپارێزان و جاشەکان لەو ناوچەیەدا دەچنە نێو هێزەکانی (KDP).
ئەم کارەیان پەرە پێدا و(١٠) ساڵە دەستیان بە بەربەرەکانی کردنمان کردووە، لەوسا نیشانپەرومرەکانیان دەکوشت و ئێستاش باشور بەکاردێنن. بەم شێوەیە ئامانجیان ئەوەیە ناوچەکانی بۆتان و بادینان بخەنە نێو چوارچێوەی کونترۆڵ و باڵادەستی سوپای تورك. تورکەکانیش هەوڵدەدەن بە هۆی سوپایەکی جاشەوە شەڕ بکەن. ئێمە ناتوانین بڵێین ئەم سوپایە سوپای بەرەی کوردستانییە. ئەمە سوپایەکی تورکییە و رێکخستنێکی لاوەکی ئەم سوپایەیە. دەوڵەتی تورکیاش ئیش بۆ ئەوە دەکات باڵادەستی خۆی لە چوارچێوەی نەخشەی (مووسڵ ـ کەرکووك)دا بە سەر باشوری کوردستاندا بسەپێنێ و، دەیەوێ ئەم ناوچەیە وەك پردێك بە هۆی سوپای جاشانەوە بەکار بێنێ تا تەگەرە بخاتە بەر پەرەسەندنی هێزی میللی رزگاریخوازمان لە ناوچەی بۆتان.

ی.ك: وانە حکومەتی تورکیا ئەو ئیشە دەکات کە باپیرە عوسمانیەکانی دەیانکرد و سوپایەك لە جاش بۆ چینی دەسەڵاتداری تورکیا پێکدێنێت. ئایا مەبەستەکە ئەمەیە؟

س.پ: بێگومان وەك سوارەی حەمیدی. لەزموونی هێزە خێڵەکیەکان بە درێژایی مێژووی کۆماری تورکیا بە باشی بەکارهاتووە. هەر کاتێك دەست خرابێتە بینی، پەنای بردووەتە بەر هێزی خێڵەکی بە تایبەتی لەو ناوچانەدا کە هێشتا پێوەندی خێڵەکییان تێدا بەهێزە وەك بۆتان. بۆیە هەوڵدەدات پێکهاتەی تازە لەسەر بنچینەیەکی خێڵەکی بنیات بنێت. ئەو هەموو هێزە سەربازییەکان لە گشت زەمانێکدا هێزەکانی میلیشای ناوخۆیان لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئیسلامیەکان و ڕێکگراندا بەکاردەهێنا، ئێستاش بە ڕەچاوکردنی پەرەسەندنی شەڕ هەوڵدەدەن ئەوە بکەن بە دۆخێکی گشتی و هێزێك لە میلیشیای چلکاوخۆر دژ بە ئێمە و بە گەلی کوردستان پێکەوە بنێن. گەلی کوردستانیش چونکە گەیەنراوەتە لێواری برسێتی. ئەگەر بڕێك پارەیان پێدا و لەم تەنگانە ئابووریەیدا یارمەتییاندا، لەوانەیە هەموو شتێك قبووڵ بکات. بەو پێیە ڕەنگە سیستەمی مووچەی مانگانە بە شێوەیەکی دیاریکراو گەلەکەمان لە باشوور تا ڕادەیەکی دەست نیشانکراو لە خشتە ببات. دەوڵەت وەختێك ڕێ بە بازرگانی سنوور دەدات، پێم وایە هەوڵدەدات لە ڕووی ئابووریەوە یارێدەیان بدات. بۆیە جووڵەیەکی چڕوپڕی هاتوچۆی بازرگانی لە ئارادایە و دەیەوێ بەم شێوازە بازرگانییە یان هێندێك پاشماوەی بازرگانیان بۆ فڕێ دەدات تا دەسکەوتیان بکات. مەبەست کردنی هێزی پێشمەرگەیە بە جاش. وەك پێشتر گوتم ئەوان بۆ ماوەیەکی درێژخایان ئەمە لە پێناوی باشوری کوردستاندا یا بۆ بەرەنگاربوونەوەی (صدام حسێن) ناکەن، بەڵکو بۆ لە ڕوودا ڕاوەستانی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان و لەو ئامانجەش کە حاڵی حازر لەبەردەمیاندایە (PKK)یە. ئەگەر هێزێکی تازەی جگە لەم حیزبە لە پاشەڕۆژدا سەری هەڵدا، ئەوا ئەم هێزە لە دژی بەکاردەهێنن. ئەوە هەر لە لەشکرەکانی حەمیدی دەچن و ئێمە پەخەگیری دۆخێکی هاوچەشن بووین. وەك دەزانن ئەم لەشکرانە دژی گەلی کورد بەکارهێنراون، وە بوونەتە بەربەستێك لە بەردەم بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی ئەرمەندا. دەیانەوێ جارێکی دیکە ئەم شێوازانە بخەنەوە گەڕ و پەلی پێ بهاوێژن و جێبەجێی بکەن. بێگومان دەبێ بە شەڕێکی گەریلایی هەمەلایەنە بە گژ ئەم کێشانەدا بچینەوە. دەشبێ لەم مەسەلەیەدا گەلی کورد لە باشوور هوشیار بکرێتەوە و بگرە لەوە کارێکی پێویستە. وڵاتپارێزان لەوێ وایان لێهاتووە دەتوانن ڕووداوەکانی دەوروبەریان وەربگرن و ـ با کەمێکیش بێ ـ لەم مەسەلەیە تێبگەن. پێم وایە ئەوە بە تێپەڕینی ڕۆژگار و شانبەشانی شەڕ پەرە دەستێنن. ئەم هێزانە لە چوارچێوەی سەربازی تێپەڕ ناکەن. تورکیاش هەوڵدەدات پشت بەوانە ببەستێ و لەوانەیە بتوانێ کەسانێکی وا لە جەماوەر پەیدابکات بۆ ماوەیەکی

دەستنیشانکراو پێبەستەی بن. بەڵام ئەگەر هەلومەرج بە خێرایی گۆڕا، ڕەنگە ئەم جەماوەرە وازی لێبهێنن. بێگومان ئەم جۆرە پێکهاتەیە زیان بە گەلی کوردستان دەگەیەنێ. بەڵام ئەگەر بڕوانینە دەرئەنجامی ڕووداوەکان و پێکهاتەکان، بە قەناعەتی من دەوڵەتی تورکیا هەوڵەکانی مایە پووچ دەبن. بارزانیەکان ئەم سیاسەتانەیان تاقی کردووە و لە چل ساڵ لەمەوبەرەوە تا ئێستا بەکاری دەهێنن. ئەگەر خەرجی ئەم سوپایە (٢٠) ملیۆن دۆلار بێ، ئەوا ئەم بڕە پارەیە دەچێتە گیرفانی بارزانی. خۆ پارەی بارزانیەکان سەرپاکی لە بانکەکانی لەندەنە و، ڤێلا و منداڵەکانیان لەوێن. بەو چەند سەد ملیۆن دۆلارەی کە خڕیانکردووە، پاشەڕۆژی خێزانەکانی خۆیانیان دەستەبەرکرد. دیارە گەدەی پێشمەرگە کەمێك پڕ دەبێ، بەڵام کارەساتەکە بەسەر بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستاندا دێت. دەوڵەتی تورکیاش ئێش بۆ پەرەپێدانی ئەم ڕەنگە گلاوە دەکات و شەڕەکەی گەشە پێدەدات. مەبەستی ئەمە زانراوە. ئەو تێدەکۆشێ سیاسەتی کۆنی خۆی بژێنێتەوە بەوەی کە کورد و کورد، کورد و ئەرمەن، ئەرمەن و کورد لەیەك بکات و، بۆ کەمکردنەوەی باری سەرشانی خۆشی بڕوار بۆ ململانێی نێوان گەلانی کوردستان و دراوسێکانیان بکاتەوە.

ی.ك: بەڵێ سەرکردەی ئازیزم. لە تورکیا باسی ئێوەم کردو گوتم: «سیاسەتمەدارێکی شێلگیرو گەورەیە، بەوە جوێ دەکرێتەوە کە هێمنە». من لە ئەنجام و پێشبینییەکانتان ناپرسم، بەڵام مۆڵەتتان لێوەردەگرم لەم پرسیارە بکەم: مادامێکی باسی (KDP) دەکەین، پرسیارەکەم لە گۆشەیەکی دیکەوە دەبێ. وام بەخەیاڵدا دێت کە ئێوە وا بڕوانە (KDP) وەك بڵێی بەشێك بێ لە دەوڵەتی تورکیا. ئایا من هەڵەم؟

س.پ: بە تایبەتی ئێستا. لەوە دەرچووە حیزبێك بێ و بووە بە هێزێکی نیوە سەربازی سەر بە دەوڵەتی تورکیا. واتە ڕێکخستنێکی میلیشیای مەدەنییە و لە ڕادەبەدەر گرێدراوی دەوڵەتی تورکیایە. دەکرا ئەم پێکهاتەیە لە تورکیاشدا ڕەنگ بداتەوە. وەك «KDP.T»، بە تایبەتی ئێمە دەزانین ئەم حیزبە هەر لە ساڵی ١٩٧٢ بەدواوە لە ڕێگای (دەروێش سەعدۆ)وە بە ڕاوێژکاری ئیستخباراتی تورکیا (MIT)وە لە دیاربەکر گرێدرا بوو. هەروەها دەزانین ئەو ڕێکخستنە پیلانگێڕە کە بە ناوی (ئەستێرەی سوور)ەوە کەوتەڕوو، هەر لە پشتی ئەم حیزبە کەوتەوە. ئەو ڕێکخستنە بوو کە بووە هۆی شەهیدکرانی هەڤاڵ (حەقی قەرار). دەشزانین ڕێکخستنی (KUK) کە لەفێکی بۆ ئەوە دامەزرا تا شەڕێکی لێرە و لەوێ دژ بە ئێمە بکات. ئەمە ئەرکی بوو. ئاشکرایەکە (MIT) لەم کارانە بێئاگا نەبوو.

بەڵام ئێستا ئەوان تەنیا پەل بە پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا (KDP-T) ناکوتن. بەڵکو هەوڵدەدەن پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق (KDP-I) و هەموو ڕێکخستنەکانی سەر بەم حیزبە لە پارچەکانی کوردستاندا وا لێبکەن یەکبگرن و ببنە نۆکەری دەوڵەتی تورکیا. پێشتر لە کاتی گفتوگۆکانی

بەرەی کوردستانیدا لە ئەنقەرە مشتومڕیان لەسەر ئەم باسە کرد.
گوتارێك هەیە لە گۆڤاری (خاڵ)دا بڵاوکراوەتەوە، دەڵێت: «HEP» لە دەست دەرچووە و دەستی کردووە بە چوونە ژێر باڵی (PKK). ئەم گوتارە لەسەر مشتومڕێك بوو کە لە نێوان نوێنەرانی بەرەی کوردستانی و بەرپرسانی ئیستیخباراتی تورکیا (MIT)دا بەناوی (چۆن حیزبێکی کوردی دادەمەزرێنرێت)وە کرا. ئاشکرا دامەزراندی حیزبێکی کوردی کرێگرتە لە دۆخی لێکۆڵینەوەدا بوو. جا کە نەیانتوانی بە تەنێ ئەم جۆرە حیزبە دابنێن، پەنایان بۆ (KDP) هێنا لە بەجێهێنانی ئەم کارەدا یارمەتییان بدات. پێم وایە ئەم جۆرە پێکهاتانانە لەگەڵ شەڕی ئەم دواییەی باشووردا گۆڕیان تێکەوت و لەوانەیە ڕەزامەندی ئەمەریکاشیان بە دەست هێنابێ. سەرئەنجام مشتومڕ لەسەر توانای سەرکەوتن و سوودی ئەو سیاسەتە کرا کە ئۆزال لە کێشەی کورددا جێبەجێی کرد. هێندێك لەم مشتومڕانەش لە ڕۆژنامە و پەرلەمانی تورکیادا ڕەنگیان دایەوە و ئاگامان لەوەیە. ئەوەی کە پێویستە تێیبگەین زانینی تایبەتمەندی کەسایەتی کوردی کرێگرتەیە کە لە سەدان ساڵ لەمەوبەرەوە زۆر پەرەیسەندووە، هەر لە (ئیدریسی بدلیسی) و لەشکرەکانی حەمیدییەوە تا نۆکەراتی مستەفا کەمال و تا ئەم کارانە دەگات کە لە بارزانیەکاندا بەرجەستەبوون.
ناسینی تێکڕای ئەوانە زۆر پێویستە، هەرچی کۆنابیشیانە هەر بە دەستی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان دیاری دەکرێت. تەنانەت (تاڵەبانی)ش هەوڵیدا ئەم دەورە ببینێ، بەڵام ـ وای بۆ دەچم ـ بەختێکی کەمی دەبێ. ئێمە ئاگامان لەوەیە کە دەوڵەتی تورکیا بانگی چەند ڕێکخستنێکی وەك ڕێگای ئازادی (ÖY) دەکات. نووسینگە بۆ خۆیان دابنێن و ببنە حیزبی دیموکراتی یاسایی بە تاکە مەرجی پاکتاو کردنی(PKK). ئەورووپاش مەرجی لەم چەشنەی دەخستە بەرچاو. ئەم باسەش لە لاپەڕەی ڕۆژنامەکاندا ڕەنگی دایەوە و گەلێك هێز خۆیانیان بۆ ئەم مەبەستە ئامادە کرد. ئەگەر پاکتاوی ئەو بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانییە کرا کە (PKK) ڕێبەری دەکات، ئەوسا بە ڕەسمی دان بە حیزبە نۆکەرەکاندا دەنرێت و وەك هێزێکی زیادە بەشداری سیاسەتی تورکی دەکات بۆ خزمەتکردنی ئەم سیاسەتە. لەم حاڵەشدا چەند هەوڵێك هەبوون بۆ سەپاندنی بژاڵێکی پاکتاوکەر بەسەر (PKK)دا، لەمێژە ڕەنگیان بۆ ڕشتووە و ویستوویانە جێبەجێی بکەن. دەیانویست ئەم پیلانگێڕییە هەر بە تیرۆر و زەبروزەنگ جێبەجێ نەکرێت، بەڵکو بەوە کە (PKK) بکەن بە حزبێکی سیاسی و دەستەمۆی بکەن. لەم مشتومڕانەیان لە لاپەڕەی ڕۆژنامەکاندا ڕەنگی پێدایەوە کە وای کرد هێندێك لە کەسانی نیازپاکیش تێهەڵکێشی ئەم مشتومڕانە بن. بەڵام ئەوانی دیکە نیازیان جیاواز بوو. کاك (دوغو پرینچەك) لەو کۆنگرەیەی (HEP)دا کە باستان کرد گوتی: «پێویستە PKK بکرێت بە حیزبێکی یاسایی». ئەمە هەڵسەنگاندنی شەخسی ئەو بوو. چەند بەڵگەیەکیش هەبوون ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە ئەوان

دەیانویست ئەم بیروکەیە بگەیەننە نێو (PKK). باوەڕم وایە کە ئێوە هەواڵی گەلەکۆمەکانی ئێمەتان بۆ سەر ئەو پیلانە ئاشکراوانە بیستووە کە هەوڵیان دەدا (PKK) لەشەڕی گەریلایی و خەباتی چەکداری دووربخەنەوە و بیهێننە سەر ڕێگای چالاکی سیاسی.

ئەم پیلانگێڕیانەش ساڵی ١٩٨٣ لە خودی (سەمیر)ی پیلانگێڕدا بەرجەستە بوون، چونکە ئامانجی ئەو شتە بوو کە کەمێك لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کرد. (پیلانگێڕی پارێزەر)یش لە خودی (حسێن یلدرم)دا خۆی نواند، لە کاتێکدا ئامانجی ئەم پیلانە هەمان ئامانجەکانی پێشوو بوو. سەمیر (چەتین گونگور) دروشمێکی هەبوو دەیگوت: «پێویستە هیچ یەکێك لەو پیاوانە ڕەوانەی ناوچەی هەکاری نەکرێن». ئامانجیش کۆسپ خستنە ڕێی ئەم خەباتە چەکداریە بوو کە(PKK) نەخشەی بۆ دەکێشا بۆ ئەوەی دەست بکات بەو چالاکی‌یە سیاسیەی کە ڕێکخراوەکانی دیکە لە ئەورووپا دەیانکرد و دیاریکردنی چالاکیش بوو لەم چوارچێوەیەدا یان مانەوە وەك ئاقمێکی پەنابەر. ئەمە سروشتی ئەو کاتەی شەڕ بوو. هەرچی کابرای پارێزەریشە گوتی: «ئاپۆ ڕوو لە ئەمانە و ئێمە لە ئەورووپا دەستمان بەسەر(PKK)دا گرتووە و بویان زیندانی کردین و دەست بەسەر چیاکانیشدا دەگرین». بەم شێوەیە پیلانەکەی هەڵسەنگاند. ئەمجا کەوتە باس و خواس لەسەر کودەتایەك لە ئەورووپا و هێندێك چالاکی نەخشە بۆ کێشراویان لە بەندیخانەکاندا ئەنجامدا. هەر ڕاست لەم کاتەدا ئۆزال ڕایگەیاند لەوانەیە لێخۆشبوون بۆ (PKK) دەربکرێت. ئەمەش لە ڕۆژنامەکاندا ڕەنگی دایەوە و تاکە مەرجی چەك دانان بوو.

ی.ك: بە پێی ئەوەی کە لە ئەنقەرە بیستوومە: تاڵەبانی لە کاتی گەڕانەوەیدا لە واشنتۆنەوە گوتی: «ئەگەر PKK دەستی لە چەك هەڵگرت و ڕایگەیاند حیزبێکی مارکسی ـ لینینی نی‌یە، وەك حیزبێکی باش قبووڵمانە».

**نەجمەدین بیوك قایا نیشتمانپەروەرێکە بەرانبەر بە دوژمن بەرخۆدان دەکات تا لە پاڵ محەممەد شەنەردا شەهید دەبێ، لە کاتێکدا شەنەر لەگەڵ دوژمندا ڕێکدەکەوێ و هەوڵدەدات ئەم ڕێککەوتنە بەسەر پاڵەوانانی بەرخۆدانی بەندیخانەکاندا بسەپێنێ.**

س.پ: ئەمە شیاوە. بانگم دەکات بۆ ئەنقەرە پاش ئەوەی(PKK) دەست لە مارکسیزم ـ لینینیزم و لە چەك هەڵدەگرێ و دەبێتە حیزبێکی کۆمەلایەتی دیموکراتی. با لە ئەنقەرە بە ئازادی دەست بە کار بکات. گوتیشی: «دەکرێت لەسەر یەك مێز دابنیشن و پێکەوە مشتومڕ لەسەر ئەم مەسەلانە بکەن». بە توندی وەلامی ئەم قسەیەمان دایەوە. سەرباری ئەوەی کە لەم بابەتە چەندین دوورایی هەبوو بەسەر بەندیخانەکاندا شکایەوە.

لە کاتی گفتوگۆدا کۆنفرانسی بەرخودانی بەندیخانانتان لێ‌پرسیم. ئەم ڕووداوە

که له ڕۆژنامەکاندا بە «ڕووداوی محەممەد شەنەر» ڕەنگی دایەوە، وپێشیان دووراییەکی گەورەی هەبێ بە ڕادەیەك هێندێکیان (PKK)ی تاوانبار کرد بەوەی کە ئەم حیزبە پاکتاوی بەرهەڵستانی نێوخۆ دەکات و ماوەی هیچ بەرهەڵستییەك نادات. گۆڤاری (بەرەو ساڵی ٢٠٠٠) کە (دۆغو پەرینچەك) سەرۆکی نووسینەیتی، ئەم باسەی بڵاوکردەوە. ڕووداوی محەممەد شەنەر بە فراوانی لە بنکە و دەستەکانی حیزبدا مشتومڕی لەسەرکرا. جا بۆ ئەوەی ڕۆژنامەکانیش باش لەم باسە ئاگاداربن، پێم خۆشە ڕوونی بکەمەوە کە پێشنیارەکەی ئۆزال بۆ دەرکردنی بڕیاری لێبوردن لە (PKK) بە چەند مەرجێك، ئەم لێبوردنە و هەوڵەکانی محەممەد شەنەر کە دەیویست شتێکی لە بابەتی سیاسەتی ئۆزال تێبهەرێنێ، جووتێك هەوڵی هاوشێوە و پێکەوە بەستراون. تەنانەت لە دیداری ڕۆژنامەنووسیشدا (محەممەد عەلی بیراند) پرسیارێکی لێکردم تێیدا دەڵێت: «دەوڵەت حەز دەکات هەنگاوێك بنێت، ئایا ناتوانن چەکەکانتان بێدەنگ بکەن؟». ئەوسا پێمگوت: «ناکرێت ئەمە لەیەك لاوە بێ». مەبەستی لەمە ئاگربەستە و ئەوەش کە ئەوان ئارەزوویان بوو ئاگر بەست بوو لە یەك لاوە. بەم پێیە محەممەد شەنەر لە کاتی کۆنگرەی چوارەمی حیزبدا دەرکەوت و بۆ ماوەی ساڵێك پێوەندییەکی توندوتۆڵی پێمانەوە هەبوو. هەموو جموجووڵ و هەڵسوکەوتێکی بەڵگەی ئەوە بوون کە گەریلای پێفووت ناچێ و ڕەتی دەکاتەوە و تێدەکۆشێ بەوە بارودۆخەکە ڕزگار بکات کە (PKK) بە دروشمی خەباتی سیاسییەوە بکاتە حیزبێکی پاکتاوکەر. گشت هەوڵەکانی ئاڕاستەی ئەم ئامانجە کرابوون، لە کاتێکدا لە بەندیخانە دەرچوونی هاوجووتی پاسا نەبوو، دەبوو لە ناو تاقمەکەی (پاتمان)دا حوکمی لە سێدارەدانی بدرێت، بەڵام ئەم حوکمەیان بۆ دەرنەکرد و ماوەیەکی درێژخایانتر لە بەندیخانە مایەوە تا لە ساڵی ١٩٨٨ دا بەرەڵایان کرد. بە کورتی بەسەرهاتەکەی درێژە، دەبوو لە مانگرتنەکەی (کەماڵ پیر و محەممەد خەیری دورموش و مەزلووم دۆغان)دا لە خواردن لەگەڵیاندا بێ، بەڵام ئەو پاش ١٥ ڕۆژ لەوە دەستی بە مانگرتن کرد. دیارە ئەوەی وا لە ڕۆژی (١٥)مدا دەست پێبکات دەتوانێ (٥٠) ڕۆژ دەرببات بە بێئەوەی هیچی خراپی لێبەسەر بێ. ئەوانی دیکە شەهید دەبن، لە کاتێکدا ئەویش هەوڵدەدات لەسەر میراتەکەیان دابنیشێ. سەرنەگرتنی بەرخۆدانی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٤ لە ژێر سەری ئەودا بوو کە ئامانجی ڕەتکردنەوەی گوتنەوەی سروودی نیشتمانی و لەبەرکردنی جلوبەرگی یەك ڕەنگ بوو. لەوەتا نەجمەدین قایا نیشتمانپەروەرێکە بەرانبەر بە دوژمن بەرخۆدان دەکات تا لە پاڵ محەممەد شەنەردا شەهید دەبێ، لە کاتێکدا ئەو لەگەڵ دوژمندا ڕێکدەکەوێ و هەوڵدەدات ئەم ڕێککەوتنە بە سەر پاڵەوانانی بەرخۆدانی بەندیخانەکاندا بسەپێنێ. ئەمەبە بەر ڕووداوی توندوتۆڵی دیاربەکریشدا جێبەجێ دەبێ کە لە ڕۆژنامەکاندا ڕەنگی دایەوە، لە کاتێکدا کشایەوە و بەشێوەیەکی ناخافڵ بڕیاری خۆی گۆڕی و ڕازی نەبوو نیوسەعات بەر لەو وادەیە بچێتە دەری

که بۆ بەجێهێنانی هەوڵێکی هەڵاتنی بە کۆمەڵ لە بەندیخانە دیاری کرابوو و چل کەس لە کادیرانی هەرە پێشکەوتووی حیزب خۆیانیان بۆ ئامادەکردبوو. دەورێکی سەرەکی لەم هەموو ڕووداو و مەسەلانەدا بینی، بەڵام سەرباری ئەوە لە بەندیخانەی دیاربەکر مایەوە، لەکاتێکدا کادیرەکانمان بەسەر هەموولایەکدا دابەش کرد. هەروەها هەندێك چەمکی لادەر لە نێو بەندیخانەدا بە سەرکردەیی ئەو پەرەیان سەند. جیا بە بیانووی مافی مرۆڤ و پێداویستەکانی وەك زیادکردنی بەشە خواردنەکەی و پەیداکردنی تەلەفزیۆن و ئەوەی کە پێویستە ژیان لە بەندیخانەدا ئازاد و ئارام بێ، وازی لە حیزب هێنا و پەیبەندی مافی پەتی خۆی بوو. سیاسەتەکانی بە ڕێگای ئارامی شەخسیدا بۆ خۆی تێدەپەڕین.

سەرەنجام وەکو زانراوە بوو بە کابرایەك کە هیچ پەیوەندییەکی بەو گیانی سەرخۆدانەوە نەبوو کەوا (PKK)ی پێجۆش دەکردەوە و، هەوڵیدا ئەوەی کە لە نێو بەندیخانەدا دەیکرد لە دەرەوەی بەندیخانەشدا بیسەپێنێ بە سەر هەڤاڵانیدا. ئەوەی کە دەیویست، حیزبێکی لە (PKK) جیاواز بوو. پاشتر تێگەیشتین هەوڵیدەدات (PKK) بکاتە حیزبێکی یاسایی و بۆ گەیشتن بەم جۆرە حیزبەش شێلگیرانە و بە چڕوپڕی و بەوپەڕی نهێنییەوە ئیشی دەکرد و بە شێوەیەکی ئارەوا هەربەرەکانێی دەکردین، لە کاتێکدا لە نێو باوەشی خۆماندا بوو. هەوڵێکی بێوچانیدا دیاردەی حیزبایەتی(التحزب) و دەستەبەندی لە نێو حیزبدا بڵاوبکاتەوە و، بۆ ئەم مەبەستەش پەنای بردە بەر شێوازەکانی پیلانگێڕانی نهێنی. چەندین بەڵگەنامەمان لە لایە جەخت لە سەر هەموو ئەوانە دەکەن. ئەمە (حسێن بلدرم)ی پارێزەریش دەگرێتەوە کە خۆی خەڵەتاند کاتێك گوتی: «ئێمە کودەتامان کرد». هەرچی محەممەد شەنەر بوو دەیگووت: «ئێمە دەستمان بە سەر کۆنگرەی چوارەمی حیزبدا گرت» و بەم وەزعەوە قەناعەتی بە خۆی یا قیلی لە خۆی کرد.

ئەگەر هەموو ئەمانەمان لەگەڵ ڕاگەیاندنەکانی ئۆزالدا بەراورد کرد، ئەو قەناعەتە پەیدا دەکەین کە ئەوە نەچووە سەر لە دەرەوە دوایی بە (PKK) بهێنن، بۆیە پەنایان بردە بەر ناوەوە تا لەنێوبردن و سڕینەوەی دەستەبەر بکەن. خاوەنەکانی پیلانی پاکتاوکەرانەی ساڵی ١٩٨٨ لە ئەورووپا ئامانجیان هەمان شت بوو و دەیانگوت: «ئەوەمنا دەستمان بە سەر ئەورووپاو بەندیخانەکاندا گرتووە و چیاکانمان کۆنترۆڵ کردووە». ئاوا لافیان لێدەدا، چونکە کەسانێکی وەك (هۆگرو مەتین) لەوێ کاری پاکتاوکەرانەیان جێبەجێ دەکرد. هەوڵێکی یەکگرتوو لە هەر سێ گۆرەپاندا هەبوو. ئێمەش لە حیزبدا دەمانزانی دووچاری هەوڵی پاکتاوکردن دەبین لە سێ بەرەوە. بێگومان ئێمەش هەوڵمان دەدا ئەم پیلانگێڕانە نەهێڵین و لە هەر سێ بەرەکەوە پەلامارماندا. وەك دەزانن گەیشتینە کۆنگرەی چوارەمی حیزب، لە کاتێکدا کۆنگرە بە پلانی بەرخۆدان و پەل پێهاویشتنی هێزی گەریلا و پەنابردنە بەر سەرهەڵدان پشت ئەستوور بوو و جارێکی دیکە پێمان نایە قۆناغی

ڕێکخستنی شۆڕشگێڕانەی ڕاست و دروست. لەم ئان و ساتەدا کۆتایی بەم پیلانگێڕە «محەمەد شەنەر» ناوە هێنرا و هەوڵەکانی سەریان نەگرت. بۆیە نەیتوانی کاریگەر بێ و هەر تەواو لەم مێژووەدا خۆی و چەند کەسێکی دیکەی هاوچەشنی خۆی وەك (ساری باران) بەزین و هەڵاتنە باوەشی بەرەی کوردستانی تا پشت بە تاڵەبانی و (KDP) ببەستن، چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە ئێمە لەلایەن (KDP)ەوە سەرکوت دەکرێین و دەسڕێینەوە. تەنانەت مەسعوود بارزانی خۆشی لەم شەڕەی دوایی باشووردا ڕایگەیاند و گوتی: «PKK لە ماوەی یەك یا دوو ڕۆژدا دەبڕێتەوە». هەوڵێکی بێوچانیشدا (PKK)یەکی ساختە لەو خۆ بە دەستەوەداو و ساختەکارانە پێکەوە بنێ، وا کە ئەم حیزبە ساختەیە حیزبێکی یاسایی و مافناس بێ. هەروەها هێندێکی دیکەیان بە بێ ئەوەی بزانن بە دەستیانەوە بوون بە ئامراز و ئێمەش ئاگادارمان کردنەوە. ویستیان (HEP) لەم مەسەلەیەدا بەکاربێنن، بەڵام ئاگادارمان کردنەوە و یارمەتیماندا تا (HEP) وەك دۆستێکی (PKK) بمێنێتەوە نەك ببێتە ڕێکخستنێکی ناحەز. چەپی تورکیشمان ئاگادار کردەوە و گوتمان: «وریای PKKی یاسایی و ئەوانە بن کە دەوری پاکتاوکەرانە دەگێڕن». ئەم قسەیەمان ئاراستەی (دوغو پرینچەك) کرد و پێمانگوت: «ئێوە بانگهێشتن بۆ ئەوە دەکەن بێئەملاوئەولا دوژمنایەتی ئەمریکا بکرێت و لە پاڵ بەرەی کوردستانیشدا ڕادەوەستن کە هێزێکی ئەمریکایی پەتییە، بگرە لە باتی پیلانگێڕەکانیش قسەدەکەن. هەتا ئێوە دەڵێن گوایە (سەلیم) و (ساکینە) زیندانی کراون یان کوژراون. ئەم قسانە تێکڕایان ڕاست نین. واز لەم شێوازە بهێنن». ئاوا (دوغو پرینچەك)مان ئاگاردار کردەوە.

ی.ك: گەورەترین هەواڵ لە بارەی (محەمەد شەنەر)ەوە بڵاوکرابێتەوە لە گۆڤاری (بەرەو ساڵی ۲۰۰۰)دا بوو.

س.پ: ئێمە هیچ بایەخێکمان بەم مەسەلەیە نەداوە. ئەگەر بە بێ هیچ مەبەستێك لەوەیان نووسیبێ، دەبوو لێمان بپرسن تا دڵنیا ببن ئاخۆ ئەمە ڕاستە یان نا، چونکە (سەلیم جوروك کایا) ئەمڕۆ لە ئەورووپایە و بە نوێنەر هەڵبژێردراوە و (ساکینە جانسز)یش ئێستا لە گۆڕەپانی باشووردایە و بەرپرسی ئوردووگایە.

پێیاندەکرا سۆراخ بکەن و لێیان بپرسن: «بۆچی کوژران؟ و بۆچی باوەڕیان بەم قسەیە کرد و باوەڕیان بە ئێمە نەکرد؟». دەبێ ئەم پرسیارە لە «بەرەو ساڵی ۲۰۰۰» بکەین. ئەگەر ئەمە هەواڵێك بێ بڵاویان کردبێتەوە بەبێ ئەوەی لێیدڵنیا بن، ئەوسا پێویستە لەسەریان ڕەخنە لە خۆیان بگرن. بەڵام ئەگەر ئەم هەواڵە بە مەبەستی پشتگیری کردنی ئەو هەوڵانەی کە بۆ (PKK) کردن بە حیزبێکی یاسایی دراون یان بۆ پشتگیری کردنی حیزبایەتی(التحزب) لە نێو حیزبدا بڵاوکرابێتەوە، ئەوا ئەم ڕەفتارە دوژمنکارانەیەو سیاسەتێکە لەگەڵ ئەو لاف و گەزافانەیاندا جووت نایەتەوە کە گوایە ئەوان دژی سیاسەتەکانی ئەمریکان و سۆشیالیستین.

ی.ك: باشە. ئاپۆی برام ئایا سەرنجی ئەم خاڵە وردە دەدەن؟ لەم هەموو

بەسەرهاتەدا لەو کاتەدا (دوغو پەرینچەك) دوو مانگ لە بەندیخانەی دیاربەکر مابەوە. ئایا دەبێ ئەمە بۆ پەیوەندی بەستن بوو بێ؟

## کۆنفرانسی بەندیخانان کردەوەیەکی دژ بەو پاکتاوکردنە سەپێندراوە بوو و ئەم کۆنفرانسە و ئەنجامەکانیشی لە سەددا سەد سەرکەوتوو بوون.

س.پ: پێم وانییە چووبێتە بەندیخانەی دیاربەکر بۆ پەیوەندی کردن بە پاکتاوکەرانی ئەوێوە. لەم حاڵە خانە بەگومانم. بەڵام ئەوە سەرنجڕاکێشە کە ئەوان لەو قۆناغەدا بە کردەوە هەوڵیان دەدا دەست بۆ بەندیخانەکان درێژ بکەن. گەلێك نامە لە لایەن محەممەد شەنەرەوە بۆ بەندیخانە دەنێردران. (قەرەسۆ)ی هەڤاڵمان هەڵوێستی لەسەر ئەم بابەتە هەبوو و لەو کاتەوە دەیزانی محەممەد شەنەر لە چ باروودۆخێکدایە و بەو پێیە دەجوڵایەوە. هەرکاتێك بابەتەکە بهاتبایە ئاراوە هەڤاڵانمان هەڵوێستێکی بەهێزیان بەرانبەر دیاری دەکرد و بە هیچ شێوەیەك دەرفەتی ئەم پاکتاوکردنەیان نەدەدا.

ی.ك: لە باسەکەی پێشوومدا گوتبووم من هەڵوێستی ئێوەم لە کۆنفرانسی بەندیخانەدا زۆر بەجەرگانە بینی.

س.پ: کۆنفرانسی بەندیخانان کردەوەیەکی دژ بەو پاکتاوکردنە سەپێندراوە بوو و ئەم کۆنفرانسە و ئەنجامەکانیشی لە سەددا سەد سەرکەوتوو بوون. بگرە دەکرێت بڵێین ئەو دەورەی کە لە مێژووی تورکیادا بە سەر زیندانیەکانیاندا دەسەپاند بەم کۆنفرانسە تێکشکا. بەوپێیە ئەو هەوڵانە پەراگەندە بوون کە بۆ (PKK) کردن بە حیزبێکی یاسایی دەدران. پێویستە روونی بکەمەوە کە هێندێك کەس بە نیاز پاکییەوە لای لەم بابەتە کردەوە و پێم وانییە هەموو ئەوانە پێوەندییان بە دەوڵەتەوە هەبێ. بەڵام پێداگری دەکەین کە کەسانێك لە ناوەوە و دەرەوە بەشدارییان کرد و تەنانەت هەوڵیشیاندا لە رێگای بەرەی کوردستانییەوە بەسەرمانیدا بسەپێنن، هەموو ئەوانە بۆ ئەوەی بمانکەنە حیزبێکی یاسایی. بەو مانایەی کە: «وەرن چەکەکانتان فڕێ بدەن تا لەگەڵ ئەنقەرەدا لێك‌حاڵی ببن». ئەوە کارێکی هەڵە و ترسناك بوو. ئەوانەی کە بە ئاگایانە بەشداری ئەم پیلانگێرییەیان کرد، نۆکەری دەوڵەتن. هەرچی ئەوانەشن کە بێ‌ئاگایانە بەشدارییان کرد سادە و دەبەنگن. سەرەڕای ئەوەی ئێمە ساز و ئامادەین بۆ هەر ئاگربەستێك، بەڵام هەلومەرج هەرچۆنێك بێ لە یەك لاوە دەست بەرداری چەکەکانمان نابین و ئامادەی ئەمە نین. وانییە؟

ی.ك: قسەکەتان زۆر راستە و من لە سەددا سەد لایەنگیری دەکەم.

## دەمەوێ لە سەرباز و ئەفسەری تورك بپرسم: دەوڵەتی تورکیا وێرای خۆبەختکردنتان لە ئیش و کارتاندا مانگی دووسەد دۆلارتان دەداتێ؟ ئەی بۆچی دەوڵەتەکەتان هەوڵدەدات مانگی دووسەد دۆلار بەو پێشمەرگانەی(KDP) بدات کە شایانی پێنج قرۆش نین؟

س.پ: دەمەوێ هەر لەم خاڵە خۆیدا بە کورتی ئەوە ڕوون بکەمەوە کە دەبێ نۆکەرایەتی کوردی لە ڕووی مێژوویی و لە ڕووی کاری ڕۆژانەوە زۆر بە باشی بناسین. لەمڕۆژەدا هەریەکە لە تاڵەبانی و بارزانی و ئەنجومەن و دەوڵەتە فیدرالیەکەیان هەوڵدەدەن لەسەر میرات و دەسکەوتەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) دابنیشن و بەهەوی (PKK)وە ئەم مووچانە وەربگرن. جاران ئەوەیان لە ئەمەریکاوە پێدەگەیشت و ئێستاش لە تورکیا و دەوڵەتانی دیکەی وەردەگرن. هەموو ئەمانە مانای ئەوەن: شۆڕشی کوردستان شۆڕشێکی زۆر گەورەیە و بگرە شۆڕشی نوکتوبەری تازەیە و، شۆڕشێکی لەم جۆرەش مەترسییەکی گەورەیە بۆ ئیمپریالیزم و سەرمایەداری. جا بۆ لە ڕوودا ڕاوەستانی ئەم مەترسییە نوکەران ڕادەسپێرن هەناسە لەم شۆڕشە ببڕن و لەنێوی ببەن.

پێویستە لەبەر ئەم هۆیە زۆر وریای ئەو دەورە بین کە نۆکەرانی کورد دەیگێڕن. هەروەها لەوانە وریا دەکەمەوە کە بە ناوی چەپڕەوییەوە دەچنە نێو ئەم چوارچێوەیە و دەوری دەستکێشی ئەو نوکەرانە دەبینن و، پێیاندەڵێم ئەم کارە هەرگیز شایستەی چەپڕەوەکان نییە. ئێمە پێوەندیمان بە تاڵەبانی و بارزانییەوە هەیە، بەلام ئەوان تێناکۆشن ئەم پێوەندیانە پەرە پێبدەن، بەڵکو دەڵێن ئەوانە تەسلیم بە ئێمە بوون و دیلن. ئێمەش دەڵێین ئەگەر دیل بین ئەوا باش دەزانین چۆن بەرخۆدان بکەین وەك لە بەندیخانەکانی دوژمندا دەمانکرد و، بە بەرخۆدانی خۆمان سنوورەکان و ئەو ناوچە ئارامە تێدەپەڕێنین کە بیری لێدەکەنەوە و دادی دادری دەکەین. ئەمە شتە پێویستەکانی شۆڕشی گەلی کوردستانە.

هەروەها ڕوودەکەینە چەپڕەوانی کورد و تورك تا پێیان بڵێین: فێربن چۆن پێوەندی دەبەستن و فێربن چۆن و کەی دژی دەبن. ئێمە پێوەندی بەستنمان گەرەکە، بەلام ئەوان دەیانەوێ تەسلیمی دەوڵەتی تورکیامان بکەن یا لە بری ئەو دیلمان دەکەن. چۆن ئەمە ناوبنێین پێوەندی؟ دەیانەوێ ناوچەیەکی ئارام بە سەرپەرشتی ئەفسەرانی تورك دابمەزرێنن. بە پێی ئەو هەواڵانەی کە بۆمان هاتوون هەموو پاسگەیەك ئەفسەرێکی تورکی تێدا دەبێ. ئایا ئەم کردەوەیە بۆ قازانجی گەلی کوردستانە؟ چۆن دەتوانین بەو کەسانەی کە بەشوێن پێوەندی گومان لێکراودا وێڵن بڵێین کوردن و نەتەوەیین و وەك نیشتمانپەروەر پیشانیان بدەین. پێویستە وریا بین، چونکە نۆکەرانی کورد قۆڵیان لێهەڵماڵیوە تا نغرۆترین

تاوان لە مێژوویاندا بکەن و بەدترین گەمە ئەنجام بدەن، پێویستە ئەم گەمانە ببینین و تێیان بگەین و پەردەیان لەسەر لا بەین بۆ رای گشتی.

لە لایەکی دیکەوە من دەمەوێ پرسیاری ئەو باجانە بکەم کە لە گەلی تورك وەردەگیرێن و لە پڕ چەك کردنی سوپادا بەکاردەهێنرێن. باشە پێوەندی بەرژەوەندییەکانی گەلی تورك بەم کارەوە چییە؟ لە لایەکی دیکەوە رایدەگەیەنن کە شەڕی باشور (١٢) تریلیۆن لیرەی تورکی لەسەریان کەوتووە. ئەگەر ئەو مووچەی سالانەیەشی بخەینە پاڵ کە بە سەربازان دەدرێت، ئەو کاتە دەتوانین لە هۆی گرانی گوزەران تێبگەین کە بەشێوەیەکی شێتانە بەرز دەبێتەوە بە رادەیەك گەلی تورك چیتر ناتوانێ لە ژێر ئەم بارەدا هەناسە بدات. ئایا درێژەدانی دەوڵەت بەم شەڕە بە قازانجی گەلی تورکە؟ ئێوەش باش دەزانن کە شەڕی بەردەوامی کوردستان هۆی بنچینەیی ئەم گرانی گوزەرانەیە و وا لە گەلی تورك دەکات لە ژێر قورساییدا بناڵێنێ. ئایا پێوەندی بەرژەوەندییەکانی گەلی تورك بەمەوە چییە؟ ئایا رۆژنامەکان دەوەستن تا بایەخ بەم بابەتە بدەن؟ کەچی لە پەستا دەڵێن بڕبڕەی پشتی (PKK) شکاوە. پێم وایە ئەوەی کە بڕبڕەی پشتی دەشکێت گەلی تورکە. ئەگەر راستە بڕبڕەی پشتی (PKK) شکاوە، با چۆنیان دەوێ وا بنووسن. بەڵام پێویستە کەمێك لەسەر شکانی بڕبڕەی پشتی گەلی تورك بنووسن. ئایا ئەمە شتێکی خراپە؟ من ئەم پرسیارە ئاراستەی رۆژنامەکان دەکەم: ئێوە زۆر رۆشنبیرن و شارەزاییەکی درێژخایانتان لە بواری رۆژنامەنووسیدا هەیە. ئەی بۆچی لەم بابەتە ناکۆڵنەوە و پەردەی لە روو هەڵناماڵن.

ئەم سوپایە هەموو ئەو سەرچڵیانە دەکات کە لەگەڵ دەستووردا هاوجووت نین و هاونیشانانی دەوڵەتێکی دیکە پڕ چەك دەکات و دەیانکات بە جاش. بۆچی گوێ بەم بابەتە نادەن؟ دەمەوێ لە سەرباز و ئەفسەری تورك بپرسم: ئایا دەوڵەتی تورك سەرباری خۆبەختکردنتان لە ئیش و کارتاندا دووسەد دۆلاری مانگانەتان دەداتێ؟ ئەی بۆچی دەوڵەتەکەتان هەوڵدەدات مانگی دووسەد دۆلار بەو پێشمەرگانەی (KDP) بدات کە شایانی پێنج قرۆش نین؟ ئەگەر ئێوە بەرپرسی ئەمە نەبن، ئاخۆ دەبێ کێ بەرپرس بێ؟ ئەوانە بخەنە روو.

مەبەستم ئەوەیە ئەم برە پارە زۆروزەبەندە نابێت بەو نۆکەرانە بدرێت. ئەگەر ئەم برە پارانە بۆ گەلی تورك و ئەفسەران و سەربازان و سوپای تورك بگێردرێنەوە، ئایا لەوە باشترنییە بۆ ئەوانە بێ؟ ئەو پێشمەرگە ساختانە تا چ رادەیەك دەتوانن گەلی تورك بپارێزن؟

## مامۆستا ئیسماعیل بێشکچی هەڵسەنگاندنێکی هەبوو تێیدا دەڵێت: «پێویستە هەموومان ببینە ئابۆجی تا بەردەوامی لە رزگاری نیشتمانیدا بەدی بێنین».

ی.ك: رۆژنامەکان لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی دیکە ناونیشانی لەم شێوەیە

دەنووسن: «ئاپۆ ئارام ناگرێ و ئیش ناکات و واو وا». لە لایەکی دیکەوە ئێوە دەڵێن: من زیاد لە تێکۆشانم دژی تورکیا، دژی پێکهاتەی خۆم تێدەکۆشم. حەزدەکەم بپرسم: مەبەست لەوە چییە؟ ئایا هەر یەکێك لەم حیزبەدا چاوتان لێبکات دەبێ بە ئاپۆیەکی چکۆلە؟ یان پاش ماوەیەکی کورت دەبێتێ بووە بە سەرکردە؟ ئایا چی بۆ ئەوە پاڵیان پێوە دەنێت؟ ئەگەر لە گۆشەیەکی دیکەوە بڕوانین و وەك من تێبتان دەڕوانم: تا ئێوە هەموو شتێك هەڵبسوڕێنن خۆشەویستیتان بە تێپەڕینی ڕۆژگار زیاد دەکات و لە فەیلەسووفەکان دەچن. کەواتە ئەم هەموو کاروبارانە بۆچی؟ ئەو پیلانگێڕانەش چۆن دەردەکەون؟

س.پ: هەموو ڕۆژێك گەلێك ناونیشانی گەورە لە ڕۆژنامەکاندا دەکەونەڕوو، پێوەندییان پێمەوە هەیە. لەم دواییەدا گۆتارێك بە ناونیشانی «ئاپۆ دەست دەخرێتە بینی» بڵاوکرایەوە. پێم وایە لەوەی کە نووسەریەتی (ئۆزقتای ئەکشی)یە، دەڵێت: «ئاپۆ ئەمجارە بە ڕاستی لە تەنگژەیەکدایە ناتوانێ هەناسە بدات». ناونیشانێکی دیکە کەوتەڕوو باسی ئەوەی دەکرد کە: «تا چ ڕادەیەك دیکتاتۆرم و چۆن بەرهەڵستانی خۆم دەکوژم». کتێب لە دوای کتێبیش پەیدا دەبن. هەموو ئەمانە گرنگ نین. سەبارەت بەو حاڵەی کە پرسیارتان لێ کردم: مامۆستا ئیسماعیل بێشکچی هەڵسەنگاندنێکی هەبوو تێیدا دەڵێت: «پێویستە هەموومان ببینە ئاپۆچی بۆ بەدیهێنانی بەردەوامی لە ڕزگاری نیشتمانیدا». بوون بە ئاپۆچی چی دەگەیەنێ؟ وەك هاوبەشییەك هێندێك هەڵسەنگاندنمان لەسەر ئەم باسە و لەسەر ئەوەش کرد کە ئاپۆ خۆی چییە، هەوڵمدا بەوپەڕی ئاشکراییەوە هەموو زانیارییەك لە بارەی خودی خۆمەوە بدەم، هیچ سەرکردەیەك بە ئاسانی ئەمە ناکات. هۆی ئەوەش ئەوەیە تا ماوە بە هیچ کەسێك نەدەم نە قەناعەتی چەوتی لەلا پەیدا ببێ و نە هەوڵی لاسایکردنەوەم بدات. وەك دەبینن ئێوە دێنە لام و قسەم لەگەڵدا دەکەن و دەبینن ڕێزی هەمووتان دەگرم و هەڵوێستی خۆم هەیە. نامەوێ کەس وەك مرۆڤێکی سادە لام لێبکاتەوە. بە چاوی خۆتان بینیتان لە ڕاستیدا من دیکتاتۆر نیم، یا کابرایەك نیم ڕەفتارەکانم کۆنترۆڵ بکەن. دەمەوێ کورد و تورکیش باش بمناسن و من لەوە ناپرینگێمەوە بکەومە باسی هەم گشت لایەنەکانی تێکۆشانم و هەم پێوەندی ئەم تێکۆشانەش بە میللەتانی کورد و تورك و سۆشیالیزمەوە، هەموو ئەمانەم بۆ ئەوەیە ناسنامەکەم بە ڕاستی لێك بدەنەوە و دەرگا لەسەر حیسابکاری هەڵە دابخەم، سا ئیتر ئەم حساباتانە لە بەرژەوەندیدا بن یان دژ. من دەمەوێ بەوپەڕی ڕوونییەوە لێم تێبگەن و هەڵوێستی بەرانبەریشم وەهابێ. بەمە دەڵێی کەوتوومەتە ڕاستکردنەوەی تێگەیشتنی پێوەند بە خۆم، ئێستا گەورەترین خواستم ئەوەیە بە ڕاستی لێم تێبگەن و ئەمە لە زەحمەتکێشانی تورکەوە تا دەگات بە سەرکردەکانی تورك و بگرە لە هەمووان داواکارم. ئەو قسەیەی کە دەڵێت: ئاپۆ پەتی خۆی پچڕاندووە و خەبات لە پێناوی گەلدا دەکات بۆیە بەم پلەیە گەیشتوە، یان گەل سەرتاسەر بووە بە ئاپۆچی و وەك

سێلاوی ڕامالکەر پشتگیری دەکەن و، پەرە دەستێنێ و دەبێتە زانا. ئەم هەموو
قسانە گرنگ نین. من هەست بە شانازی ناکەم و نایکەم بە هۆیەك بۆ ئەوەی کە
دەسەڵاتم بەسەر خۆمدا نەشکێ. بەڵام ئەوە چەند ئەنجامێکی دەبێ. تەرزی ئاپۆ لە
سەرکەوتن و پەرەسەندندا شتێکی بێوێنە نییە و پەیوەندی بە کەسێکی دەست
نیشانکراوەوە نییە. سەرکردایەتی گەلی کورد بە ڕواڵەت دادەمەزرێت. هەر لە
ئێستاوە ئەمە بووەتە ڕووداوێکی گرنگ و گەورە بە گشت دوورایەیە ئایدیۆلۆژی
و سیاسی و سەربازی و فەلسەفەیی و ڕۆشنبیرییەکانیەوە. لەبەرئەوە هەموو پەیوەندی
تەوژمی ئاپۆچیین. دوژمن ئارامی لێبڕاوە و پیلانی ڕۆژانە سازدەکات و
دەستەکانی خافڵکوژکردن لە کوێ بە دووم دەکەون. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گرێدرانی
گەل وەك سێلاوی ڕامالکەر زیاد دەکات. لەوەمان لێداوا کراوە لە ئاستی
بەرپرسیدا بین. جا بۆ ئەوەی ئاشکرا و جێی تێگەیشتن بێ، چەندین بەرگی یەك
لە دوای یەکم نووسی و هەموو بابەتێکم شیکردەوە و هەڵسەنگاندن، بە ڕادەیەك
هەر خوێندەوارێکی کەم یا فرە ڕۆشنبیری دەتوانێ تێبگات ئاپۆ کێیە و چی
دەوێ. بەڵام سەرەڕای ئەوە، دوێنێ نوێنەرێکی (PKK)یان خنکاند. من خۆم ئەم
کابرایە دەناسم، نوێنەری (PKK)یە و تا سەر ئێسقان ئاپۆچییەکی پلە یەکەمە
کەواتە بۆچی خنکاندیان؟ با سۆراخی ئەوە بکەین. کابرا دووزمانی بە سەر
هاوڕێکانیەوە دەکرد بە بێ ئەوەی یەك زللەی لێبدرێت و لە هەموو درشت و
وردێکدا سیخوڕی بەسەرەوە دەکردن. هەڤاڵانی هەڵیانسەنگاند. پاش ئەوە چی
پێویست بوو کردیان. چاوەڕوانی ئەمەمان دەکرد. ئەم لاوە چی لێبەسەرهات تا لە
ئاپۆچییەکی زۆر توندوتیژەوە ببێتە نۆکەری پۆلیس؟ ئەمە وا دەگەیەنێ کە
گۆڕەپانەکە گەلێك ئاپۆچی ساختەی تێدان و گەلێك کەسیش لە شوێنانی دیکە
هەن دەسەڵات و هێزیان لە ئێمەوە وەردەگرن. یەکیان لە دڵی خۆیدا دەڵێت: من
بەرزدەبمەوە تا ببمە پیاوی دووەم و دوا ڕێگر (ئاپۆ) لەبەردەمدا دەمێنێتەوە. ئەم
کەسە هێزی خۆی لە پیاوی یەکەمەوە وەردەگرێ و ئەم پیاوی یەکەمەش ناهێڵێ ئەو
ببێ بە پیاوی یەکەم. جا بۆ ئەوەی ئەم کۆسپە تێبپەڕێنێ، دەست دەکات بە
نەخشە کێشان بۆ پیلانگێڕان. من نامەوێ زۆر باسی ئەوانە بکەم، چونکە
زۆرن:(شەنەر، چەتین، فلان و فلان...هتد). ئەوەی دەکرا بگوترێت لەم بابەتەدا
گوترا. هەموو کەسێك دەتوانێ چۆنی دەبینێ وا هەڵسەنگاندن بکات.

بە قەناعەتی من مرۆڤی ئێمە چەمکی پێبەند بوونی بە سەرکردایەتییەوە هەیە.
سەدان ساڵە لە نێو بۆشایی سەرکردایەتیدا دەژی، بە تایبەتی لە ئاستی میللیداو
تەنانەت سەبارەت بە چینە دەسەڵاتدارەکانیش. هەروەها لە ژێر باری سەرکردایەتی
ساختەی وەك ـ بۆ نموونە ـ سەرکردایەتی خێڵەکیدا دەناڵێنێ. ئەگەر لە
سەرکردایەتی دووایین، ئەوا یەکەم شتێك بە خەیاڵیدابێ سەرخێڵ و ئاغای گوند و
شێخ و سەرۆکی ڕێبازی سۆفیتییە و ئەم چەمکانەش بە خوا و پێغەمبەرەوە شەتەك
دەدات. هێندێك چەمکی دیکەش هەن وەك مستەفا کەمال ئەتاتورك یا چەمکی

ئوزال کە ویستیان پەل بهاوێژن. ناگرێت بیر لەوە بکەینەوە کە هەموو ئەمانە کارناکەنە سەر گەل. لەم سەروبەندەدا (ئاپۆ)ش دەردەکەوێ. (ئاپۆی سەرکردە و سەرۆك). ئەم چەمکانە خەریکن پەرەدەسێنن و پەل دەهاوێژن. باوەڕم وایە کە بۆشایی مێژووی سەرکردایەتی و کاریگەری سەرکردایەتیە ساختەکان لەم ڕۆژەماندا کارێکی زۆر دەکەنە سەر گەلەکەمان. ئەم کاریگەریە پەرە دەستێنێ سەرباری هەموو کۆششێکی بزووتنەوەکەمان کە بەوە دەناسرێتەوە ڕوون و ئاشکرایە و هێزێکی گەورەی تێگەیشتنی هەیە. بەڵام سستی گەل لە ئاڵ و گۆڕی حیزبیدا و لە حاڵی بوون لە دەسەڵات و بە خۆگرتنی لە ڕووی ئایدیۆلۆژی و سیاسییەوە و لە ئاستی کرداردا، وای لێدەکەن خۆی بە ئاپۆچی ڕابگەیەنێ بە بێئەوەی هەوڵێك بدات یا کارێکی دیار بکات. ئەوەی وا بە تەلەفۆن قسەم لەتەکدا دەکات، دەڵێت لێی نیزیك بوومەوە. ئەوەی وا کەمێك لێشم لەگەڵدا دەکات، دەڵێت: وەك ئەوم لێهاتووە. بە گشتی ئەو نەزانانەی کە وەك شوان لە گوندەوە هاتووە. یەکجار بەرز دەبێتەوە ، خۆ بە ئاغا دادەنێ تا هەموو گوندنشینان فەرمان بەرداری بن. ئەوەی وا دوێنێ نەیدەتوانی دوو بەرد لەسەر یەکدی دابنێ، دەبێتە سەرکردەی هێزێکی گەریلا ژمارەکەی سەدان کەسە. جا کە هەست بە هێز و تین و توان دەکات. عەقلی لە سەردا نامێنێ. لە کاتێکدا ئەگەر جاران چاوی بە پیاوێك بکەوتایە نەیدەتوانی تەنانەت وشەی «مەرحەبا»ش بڵێت، کەچی ئەمڕۆ بە وشەی «کورم» قسەی لەگەڵدا دەکات. گوتەیەك هەیە دەڵێت: «کوردیان بە پاشا بۆ یەك ڕۆژ، چوو پێش هەموو شتێك باوکی خۆی لە سێدارەدا» ئەم قسەیە ئێمە دەگرێتەوە. ئەوانە ئامادەن لە پێناوی یەك ڕۆژی پاشایەتیدا ژیانیان بکەن بە قوربانی و ئەگەر ئەو ڕۆژەش هات لە پێش هەموویاندا باوکی لە سێدارە دەدات. هەوڵێکی بێهیوانەوەم داوە ئەم بارودۆخە قەدەغە بکەم و پێمگوتن: «ئاپۆ وا نییە وەك ئێوە دەڵێن، ئەو پێش ئەوەی هەنگاوێکی بنێ چل جار دەیپێوێ و، ئەوەی تا ئێستا دەیکات دەچێتە چوارچێوەی ئیشی خزمەتکارەوە. ئاپۆ ڕوو دەکاتە خاوێنترین خەڵك و لەوێڕا ڕوو بە پیسترینیان دەست پێدەکات تا چەند سەعاتێکی درێژخایەن قسەی لەگەڵدا بکات و لە پێناوی ئەوەدا کە بیکات بە مرۆڤێکی سوودبەخش چی لە توانادایە بیداتێ. ئاپۆ پشتی بە کۆنترۆڵ و فەرمان ئەستوور نییە تا ئیشی خۆی بکات». ئەگەر چی ئەم ڕوونکردنەوە نائاساییانە لە هەموو شیکردنەوەیەکماندا هەن و ئێوەش دەیانخوێننەوە و سەرەڕای ئەوەش تەنە لە سەریانەوە دێت.

ی.ك: بەڵێ ئەوەم خوێندووەتەوە، کرانەوەیەکی گەورە هەیە.

# کاری من کاری ئەو مرۆڤەیە کە هەوڵی بەدیهێنان و پەرەپێدانی ئازادی خۆی دەدات.

س.پ: کەمێك لەمەوبەر باسی بەکارهێنانی کادیرانتان کرد. ئەوی ڕاستی بێ کادیرەکانم بە شێوەیەکی نائاسایی بەکارم دێنن.

ی.ك: ئاپۆی برام شتێکی لەوە زیاتر ئاسایی نییە، ئیدی بۆچی گلەیی دەکەن؟

س.پ: نەخێر، ئەوە سکاڵا نییە. من قسەت بۆ دەکەم بەڵکو تۆ لە هەڵسەنگاندندا یارمەتیم بدەی. ئەوان بە چەشنێکی سەیر بەکارم دێنن و من هەست بە خۆم دەکەم وەك بلێی ئەو جەللادەم کە شەڕ دەکات. بۆیە دەیخەنە نێو یاریگایەك و ئاژەڵێکی درندەی بۆ بەرەڵا دەکەن. منیش لەم یاریگەیەدام و بیست ساڵە خەبات دەکەم و تاقەکەم یاریگەیەکیان لێپڕکردووم و هاواری وەك «بڕاڤۆ و بژی»م لێدەکەن و چەپڵەم بۆ لێدەدەن و هەندێکیان ناوبەناو هەوڵدەدەن فریام بکەون. ناتوانم بڵێم تا ئەمڕۆ یارمەتییان داوم. ڕەنگە لەوانە بێنە نێچیری شێر و گورگ و باڵندەی گۆشتخۆر، بەڵام شەڕی من خەباتێکی لەوە گەورەترە. ئەگەر بیرمان لە سەروبەری کێشەی کورد کردەوە، دەتوانین بەمجۆرە نموونانە شەڕ لێكبدەینەوە. من ناڵێم هەموو شتێك ئاوایە. وەك باستان کرد: «تۆ دوژمن دەخەڵەتێنی و کادیرانت بەڕێوەدەبەی». نەخێر، نەخێر من پێم خۆش نییە تەنانەت دوژمنیشم بخەڵەتێنم، ئەوەی کە پەنا بباتە بەر خەڵەتاندن دەدۆڕێنێ. زیانی کادیرانمان لە شەڕی باشووردا سەرئەنجامی خۆهەڵخەڵەتاندنیان بوو. ئەوان بوون لە ڕاپۆرتەکانیاندا دەقاودەق نووسیبوویان: «ئێمە بەرخودانێکی کارا دژی سەرکردایەتیمان دەکەین، ئێمە سەرکردەی تەکتیکین و لەمێژە شەڕ بۆ سەرنەکەوتنی ئێوە دەکەین». ئەم قسەیە ڕاستە ئێستا سەرجەم کادیرانی (PKK) کارێکی شێلگیرانە دەکەن بۆ شکست پێهێنانی سەرکردەکەیان.

ی.ك: ئەمە شیاو نییە و پێم ناکرێت باوەڕ بکەم!

س.پ: ئێستا گوێم لێبگرە. دیارە تۆ بیر لەوە دەکەیتەوە ئەگەر ئاوابێ سەرکردە چۆن لای خۆی دەیانهێڵێتەوە و چۆن بەو وەزعەیانەوە وازیان لێدێنێ. ئەمە هێزی سەرکردایەتی ڕوون دەکاتەوە. تۆ لە چوارچێوەی گشتییەوە لە مەسەلەکان دەڕوانی، خولیای ناکۆکییان لەلا بەدی ناکەی. سەبارەت بە گرێدرانیانەوە بە من، ئەوان لە خۆیان پتر بیر لە من دەکەنەوە و ئەم گرێدرانە نموونەی لە جیهاندا نییە. بەڵام سەرەڕای ئەوە من دەڵێم ئەوانە دژی منن.

ی.ك: لە ڕۆژنامە و کارەکانی دیکەدا بینیم و دەزانم هەموو ئەوانەی کە ئاپۆ دەیانڵێت جێبەجێ نابن. بەرهەڵستی دەکەن و جێبەجێی ناکەن. ئەوی ڕاستی بێ سەرباری خۆشەویستی زۆرتان لەم بزووتنەوەیەدا، پێداگرتنێك لەسەر تێڕوانینی بەرهەڵستان هەیە. ئەمە شتێکی باش و دروستە بە مەرجێك نەکێشێتەوە بۆ ئەنجامی خراپ.

س.پ: بێگومان. دیموکراسیەکمان هەیە زەحمەتە باوەڕی پێبکرێت. کاری من کاری ئەو مرۆڤەیە کە ئازادی خۆی بەدی دەهێنێ و پەرەی پێدەدات. دەمەوێ ڕاستییەك بزانن و ببینن: ئەوەندە هێزم هەیە بەسە بۆ پەرەپێدانیان بە مەرجێك گرێدراو بن. واتە پێیان وابێ ئەم مرۆڤە بە ڕاستی پەرەی پێداون و بەم پێیەش خۆیان گرێ بدەن.

ی.ك: ئەمەم دیوە و لە ڕۆژنامەی (یەنی ئولکە)دا نووسیوەمە و گوتوومە: «PKK بە تەواوترین شێوە کادیران دەخاتەکار». ئەوەی دیومە (PKK) بەرپرسییەك بە کادیرێك دەسپێرێ، ئەگەر سەرنەکەوت ئەم بەرپرسییەی لێدەسێنێتەوە. بەڵام ناوی ناسڕێتەوە، بەڵکو ئەرکێکی دیکەی پێدەسپێردرێت. دەرگای لە بەردەمدا کراوە دەبێ بۆ خۆپەرەپێدان و کارەکانی هەڵدەسەنگێندرێن.

س.پ: دیارە من هەڵسەنگاندنێکی زۆر جیاوازم بۆ مرۆڤ هەیە. هەروەها خستنەکاری کادیران بەتەواوترین شێوە دەکرێت. ئەم هەڵسەنگاندنەتان لە جێی خۆیدایە، بەڵام هێندەتان پێبەسە ئەم مەسەلەیە جێگیر بکەن و بیڵێن. پێویستە تێبگەن کادیران لای من چۆن ئیش دەکەن. هەوڵ بدەن باش لەم خاڵە تێبگەن.

ی.ك: ژیانی ڕۆژانەتان هیچ گرێکوێرەیەکی تێدانییە، واتە پرۆتۆکۆلی نییە.

س.پ: پرۆتۆکۆل بەلای منەوە قورسترین شتە. ئەوەی واتە دەبێ دیپلۆمات و ڕەسمی بێ. جارناجارێك لە دڵی خۆمدا بیردەکەمەوە و دەڵێم: ئایا ئەم خەسڵەتەم بۆ گەلی کورد بەسوودە یان زیانبەخشن؟

ی.ك: زۆر بێگەردیشن.

س.پ: بەڵێ من زۆر بێگەردم.

ی.ك: وەك ئەوەی بڵێن: ئەگەر داواکراو ئەمە بێ پێم دەکرێت بیکەم. بەڵام وای دەبینم نەیکەن و بەو شەقڵە بێگەردەی خۆتان بمێننەوە، ئەوە باشترە.

س.پ: من نازانم داخۆ ئەمە باشە یان خراپە، چونکە هێندێکیان دەڵێن: پێویستە سەرکردە بێگەرد و لەسەرخۆ نەبێ، بەڵکو دەبێ ئاوا بکوژێ و ئاوا لە سێدارە بدات و ئاوا ڕەسمی بێ و ئاوا بایەخ بە مەسەلە سادەکان نەدات. ئەم هەموو شتانە شوێنەواریان لە ژیانمدا نییە و من بایەخ بەم جۆرە ڕێ و ڕەسمانە نادەم. بە کورتی لەوەدا زەحمەتی بەدی دەکەم و حەزناکەم دەسەڵات بە شێوەیەکی ڕەسمی یا بە فەرمان دەرکردن بەکاربهێنم و ناتوانم بیرۆکراتی بم. ئەوەی وا لە ژیانمدا پێم باشە ئەوەیە بێگەرد و وەکو خۆم بم. ئەوە بەلای منەوە باشترین تەرزی ژیانە. بێگومان ئەمە دەرگا بۆ چەند مەسەلەیەکی دیکە دەخاتە سەرپشت، وەك ئەوەی منداڵێك هەستێ و بڵێت: ئەگەر ئاپۆ ئاوایە، ئێمە بۆچی ئاوا نەبین؟ ئەمە دەچێتە چوارچێوەی ئەو شتانەی کە کەمێك لەمەوبەر باسم کردن. واتە هەموو یەکێك خۆ بە ئاپۆ دەبینێ و دەبێتە هۆیەکی بڵاوبوونەوەی ئەم تێڕوانینە. واتە بڵێت: «ئەگەر کابرایەکی ئەوەندە سادە و بێگەرد بووبێ بە سەرکردە، ئێمەش ئەگەر هەوڵ بدەین دەبینە سەرکردە»و بەم تەرزە بیر بکاتەوە. بۆیە ئەندامانی

( PKK ) زۆربەیان سەرکردەن، بەلام من وانیم. جارێکی دیکە جەختت دەکەم و بە تایبەتی کە ئێوە دەڕۆن و چیتان دیوە دەینووسن و گەلێك شیکردنەوەی لەسەر دەکەن، بە هەمووان بڵێن: «بە شێوەیەکی چەوت کارتێکراوی من نەبن و هەڵوێست لە دژم یا بۆ پشتگیریم دیاری مەکەن». من ئەم قسەیە بە هەڤاڵان و دۆستان و تەنانەت دوژمنانیش دەڵێم. ئەگەر کەمێکیش ڕێزم بگرن، تکاکارم هەوڵبدەن بە ڕاستی لێم تێبگەن. من بیر لەوە ناکەمەوە زیان بە تورکیا بگەیەنم و، پێویستە دوژمن قسە بیست بێ و کارێك بکات لێم تێبگات. هەروەها بە دۆستان دەڵێم: هەوڵبدەن کەمێك لێم حاڵی بن. من مرۆڤێکی سادە و ئاسایی نیم، بەڵێ ئامەوێ کەس لەسەر بنەمایەکی خەیاڵی هەڵمبسەنگێنێ و بەپێی خەڵکدا بڵاوی بکاتەوە و دەرهەق بە من خۆ تێهەڵکێشی مشتومڕی درۆزنانە و چەوت بکات. ئەگەر یەکێك هەبێ و بیەوێ مشتومڕ لەسەر ئەوە بکات، دەبێ پشت بە ڕاستی ببەستێ و ڕاستی دەوری لەم مشتومڕەدا هەبێ و مشتومڕێکی هەرەمەکی نەبێ. یا لەسەر بنچینەی ڕاستییەکان چەند دەتوانن مشتومڕ بکەن. ئەگەر کەمێك ڕێزی منیان لەلایە. یا باش لێم تێبگەن. گەلێك شیکردنەوە هەن، یا بیانبەن و بیانخوێننەوە و وردیان بکەنەوە و لێی حاڵی بن، ئەوسا دەکرێت پەرە بە مشتومڕ بدەن.

ی.ك: دەکرێت سەبارەت بەم بابەتە «هەموو شتێك بە کۆشش پەیدابکرێت» و ئەمە ناونیشانێکی کارەکەتان بوو.

س.پ: سەرجەمی کتێبەکان نموونەی ئەوەن. پێشەکوتن: من بە جوانی پەموو چنینم کرد و پەموم بە شێوەیەکی جوان کۆکردەوە.

## بانگەوازێك ئاراستەی ئەدیبان دەکەم:
## با لە خۆمان بپرسین، دەبێ ئەدەبی شۆڕشگێڕی کوردی چۆن بێ؟

ی.ك: ئاپۆی ئازیزم بێڵە ئەم پرسیارە بکەم: لە قسەکەتاندا سەرەداو بە دەستەوە دەدەن وەك بڵێی خەیاڵ بۆ ڕۆمانێك دادەنێن.

س.پ: ئەمجارە حەز دەکەن باسی ئەدەب بکەین؟ مەبەستم ئەوەیە دەتانەوێ سەرەداوەکە بگرن. ئەمە ڕاستە. ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین گفتوگۆکەمان لە خەیاڵی ڕۆمانێك دەچێ. بە قۆناخی منداڵی دەستمان پێکرد و گەیشتینە ئەو ڕووداوە سیاسییانەی کە قەوارەی دەوڵەت دەهەژێنن. لامان لە گەلێك گۆڕانکاری کردەوە. تا گەیشتینە باری دەروونی و کەسایەتی ئاپۆ و بارودۆخەکەی و چۆنییەتی لێتێگەیشتنی. دەکرێت هەموو ئەمانە بە چاوی ئەدیبێك هەڵبسەنگێندرێن، دەنا چۆن دەتوانرێت هەڵبسەنگێنرێت؟

ی.ك: لەوانەیە خەیاڵێکی جێی قەناعەتی ڕۆمانێکی ئەدەبی بێ.

س.پ: بەڵێ، لەوانەیە ڕۆمانێك بێ بەربەرەکانێی کەڵە ڕۆمانەکان بکات.

ی.ك: ڕاستە و بەو تەرزە دەینووسم. بۆ ئەم مەبەستە پێویستیم بە پرسیاری جیاجیا هەبوو.

س.پ: من بەم بۆنەیەوە ئەم بانگەوازە ئاراستەی ئەویان دەکەم: با ڕۆمانێك لە بارەی ڕاستیی کوردەوە بە گشتی بنووسین و بیکەینە دەروازەیەك بۆ ئەدەبی شۆڕشگێڕی و بزانین دەبێ چۆن بێ. یا لە خۆمان بپرسین: پێوەندی ناوخۆیی لە ڕاستیی کورددا چیین بوە مێژوو و لایەنە هاوچەرخییەکەی چیین و چۆنیەتی لێ تێگەیشتنی. با بە چرووپڕی ئیش بۆ ئەوە بکەین. لینین لە ڕووسیا باسی ڕۆمانی «چی بکەین؟»ی چێرنشێفسکی نووسەری کردووە. پاش ئەوەی هێندێك لە هەڤاڵان خوێندبیانەوە ـ من هێشتا نەمخوێندووەتەوە ـ پێیانگوتم: ئەوەی وا لەم کتێبەدا هاتووە ئێمە لەگەڵ ئیشەکانی ئێوەدا بەراوردیان دەکەین، لە زۆر ڕووەوە لێك دەچن. پێم وایە ئەو ڕۆمانە ساڵی ١٨٦٠ ـ واتە لە سەروبەندی ڕزگار بوونی کۆمەڵگای ڕووسیدا لە دەست سەردەمی تێکشکان ـ نووسراوە و لام وابێ باسی کەسایەتی ڕۆشنبیری ڕووسی دەکات کە پەیدابوونی کەسایەتی دیموکراتی و سەردەمی سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزمی ڕووسی دەستی پێ کردووە. هەڤاڵان دەڵێن: تۆ تا ڕادەیەك لەمە دەچی. دیارە لەبەر ئەوەی کە نەمخوێندووەتەوە، ناتوانم هیچی لەبارەوە بڵێم.

ی.ك: ئەمەم پێ سەیر نییە. ئێوە بە پێی ڕۆژگار دەبن بە کەسێکی ڕۆمانسی.

س.پ: سەرباری ئەوەی زۆر واقیعبینم. بەڵام لەوە دەچێ من بووبم بەوەی کە ئێوە دەیڵێن. لەم ماوەیەی دواییدا کەوتوومە بیرکردنەوە لە خۆم و دەڵێم: ئایا دەبمە ڕۆمانووس؟ هەروەها وشەی هونەرمەند زۆر دووپات دەکەمەوە.

ی.ك: تۆ زۆر بایەخ بە مرۆڤ دەدەی.

س.پ: بێگومان. من مامەڵە لەگەڵ کچان و کوڕانی لاودا دەکەم و لەو شتە دەکەم کە گەورەترین هونەرمەند پێی ناکرێ تا کەسایەتییەکی گونجاویان بۆ پەیدا بکەم. یا بە واتایەکی دیکە بۆ ئەوەی ببمە ئەکتەری سەرەکی.

ی.ك: دەرهێنەر یا ئەکتەر؟

س.پ: من دەرهێنەر و ئەکتەریشم. من یەشار کەمال و ڕۆمانەکانیم بیر دەکەونەوە، بە لای منەوە زۆر سادەن.

ی.ك: باشە ئاپۆی بڕام با لە لایەکی دیکەوە بڕوانینەوە سەری. لووتکەی ڕۆمانووسانی تورك (یەشار کەمال)ە کە ڕۆمانووسێکی تورکە و بەڵام کوردە. لووتکەی شاعیرانی تورکیش ماوەیەك لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد، (جەمال سوریا)یە و ئەویش کوردە. پاش ئەوە با بێینە سەر سینەما، دیارە لەوێ «یەڵماز گوونای» هەبوو ئەویش کورد بوو. ئەوانە سەرجەم کورد بوون.

س.پ: (ئیبراهیم تاتلیس) لە گۆرانیدا و (هولیا ئاڤشار) لە سینەمادا دەخەمە پاڵ ئەوانە.

ی.ك: ئایا ئەوانە كوردن؟ ئەمە تورك چ داوەبەندەرێكیانە بە دەست میللەتەكەتەوە؟

س.پ: دیارە ئەمە ڕووداوێكی سەرنجڕاكێشیش دەنوێنێ. با ئەم بابەتە كەمێك ڕۆشن بكەینەوە.

ی.ك: ئایا (زیا گوك ئالپ) بخرێنە پالیان؟

س.پ: بێ‌گومان. خۆ (زیا گوك ئالپ) تیۆرەیكی نەتەوەی تورك دەنوێنێ. من لەو باوەڕەدام كە قۆناخی ئەدەبی شۆڕشگێری دەبێت لە كوردانەوە دەست پێبكات و، دەستیش بە بەكارهێنانی زاراوەی درەوشانەوەی كوردی كراوە لە ناوەندەكاندا و لەوانەیە ئەم زاراوەیە ڕاست بێ. ڕۆشنگەری كوردی بە پەرەسەندنێكی ڕاستەقینە و گرنگ دادەنرێت. ئێوە دەزانن ڕۆشنگەری سیاسی و ڕۆشنگەری كۆمەلایەتی و فەلسەفەیی دەچنە خانەی ڕۆشنگەری كوردییەوە. بەلام لایەنی گرنگی ئەم ڕۆشنگەرییە مەیدانی ئەدەبە. من دەمەوێ باسی بایەخی ئەدەب و هونەر بە گشتی بكەم. وە بۆچی ئێمە پێویستمان پێی هەیە. سیاسەت چالاكییەكە پشت دەبەستێ بە هێندێك ئایدیۆلۆژی و هێندێك زانستی سیاسی و، بە پەرەسەندنی ئەوان پەرەدەستێنێ. هەرچی زانستی سەربازیشن تەواوكەری سیاسەتن بە ئاگر و زەبروزەنگ. بەلام سەیرم كرد ئەمە بۆ ئێمە بەس نییە. واتە ئێمە هەر ناتوانین ئالوگۆڕ لە مرۆڤدا بەدی بهێنین، وەك ئەوەی تۆ ئێسكبەندی بێ‌گۆشت هەلبەنگێنی. وە ئەگەر گۆشتیش هەبێ، ئەوا گیان نییە. دۆخەكە تەواو هاوشێوەیە. وە بەتایبەتی لەم خالەدا هەست بە پێویستی هونەر دەكەین و لێرەشەوە گرنگی و پێویستی كوردان بە وێنەكێشان و ئەدیبان دەبینین. هەستم كردووە كە پەرەسەندنی ئەم لایەنە پێوەندییەكی زۆر لە پاش نەهاتووی بە پرۆسەی شۆڕشگێڕییەوە هەیە، گۆرانییە كوردییەكان لەگەل پەرەسەندنی چالاكی شۆڕشگێڕانەماندا بلاوبوونەتەوە، وەك تیپی هونەری هونەركۆم HUNERKOM و هاوچەشنەكانی. ئێستا ئەمە لە توركیاشدا بلاوبووەتەوە. پاش ئەوە ـ وەك دەزانن ـ نووسەران و وێنەكێشانی كورد دەركەوتن و كتێب و ڕۆژنامە دەركران. هەمووشیان لەبەر پێوەندی توندوتۆلیان بە تێكۆشانی شۆڕشگێڕانەوە گەشە دەكەن، دیارە ئەمە بەس نییە. ئەوەی كە هەیە حالی حازر كەم شارەزا و پیشەدار نییە و لە جۆرە زۆر هەرزان بەهاكەیە.

ی.ك: بە لای ئاسانیدا دایدەشكێنن.

## یەشار كەمال پێبەستەی پەیماننامەی میللی بوو و چالاكی ئەدەبی لەسەر ئەم بنچینەیە بنیات ناوە.

س.پ: من وای دەبینم مەترسی ئەو ئەدەبەی كە بەرەو ئاسانی هەلدێت زۆر

گەورەیە. بەو پێیە باشترین کەسێك بۆ دەربڕینی ئەدەبی هەر کارێك ئەوەیە کە چالاکی شۆڕشگێڕانە بکات و پێویستە لەسەری هەست بەم بەرپرسییە بکات، وام گوت. من زۆر لەمێژە بیر لەم مەسەلەیە دەکەمەوە و چ شیکردنەوەیەك پێویست بێ دەیکەم و دەمەوێ لە شێوەی ڕۆماندا بێ. جاروبار لە ڕۆمان تێدەپەڕێنێ. ئەگەر خوێندتەوە هەستی پێدەکەی وەك بڵێی لە ڕۆمانەوە نزیکە. واتە لە چوارچێوەی هەڵسەنگاندنی سیاسی دەردەچێ. ئەگەر سەرنج بدەن هەموو هەڵسەنگاندنەکانم بۆ ئەوەن پشت بە سنووری ئەدەب ببەستن. وەك لە دەربڕینەکەتاندا ئاماژەتان بۆ کرد «ئاوا جوانە، ئاوا باشترە» بۆ ئەم شێوەیە دووپات دەکەمەوە. ئەم وشانە دەچنە نێو دنیای ئەدەبەوە. ئێوە پەنا بۆ ئەدەب دەبەن تا ئێمە هەڵسەنگاندن بکەین. من تێبینی ئەوە دەکەم ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ڕووی سیاسی وئایدیۆلۆژییەوە بەسەر مرۆڤی کورددا دێن ، بە وشە دەرنابڕدرێن. بۆیە پێویستە لایەنی ئەدەبی و هونەریش گەشەیان پێبدرێت و من بە پێویستیان دەبینم.

ی.ك: من زۆر بەختیارم کە ئەم قسەیە لە ئێوە دەبیستم.

م.پ: بێگومان بەرپرسی زیاد دەکات. بە تێروتەسەلی بیرم کردووەتەوە و گوتوومە: ئەگەر لایەنی ئایدیۆلۆژی و سیاسی و سەربازی پەرە پێبدەین و ڕێبەری ئەم هەموو چالاکیانە بکەین، ئەوسا کێ سەرکردایەتی هونەر و ئەدەب بکات؟ ئەم لایەنانە چییان لێبەسەر دێت؟ ئایا یەکێکی دیکەی جگە لە ئێمە ئەم کارە دەکات؟ ئەو کوردانەی کە لێیان دوایین سەرکردایەتی ئەدەب و هونەری تورکییان کرد. لەگەڵ خۆمدا چاوم پێیم کرد یەکێکیان یەك هەنگاو بنێت. بەڵام بینیم کەسیان لە نێودا نییە ئەوە بکات. ئەگەر ڕوانیمانە یەشار کەمال بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو لە (وان)ەوە کۆچی کردووە. ساڵی ١٩١٥ کۆچی بۆ «چوقورور ئۆڤە» کرد. ئەمە لە پاشماوەی کوشتارەکانە. مخابن لە بنەڕەتی مێژوویی خۆی لادەکات و هۆی سیاسیش لە پشت ئەم ڕەوشەیەتی و بەخودا ڕانابینێ بیرەوەریەکانی و بەسەرهاتی بنووسێتەوە و بە شێوەیەکی ئەدەبی دایانبڕێژێتەوە. تەنانەت بەرهەمی ئەدەبی بە تورکی دادەنرێت، چونکە ئەم ئەدەبە هەوڵدەدات تێڕوانینی کەمالیزم گەشە پێبدات. ئەم یەشار کەماڵە لەو جۆرە نییە کە ناتوانێ درندایەتی کۆلۆنیالیزمی تورکی و کوشتاری ئەرمەنی ببینێ، بەڵام نایەوێ لا لەو بابەتانە بکاتەوە چونکە لە چوارچێوەی پەیماننامەی میللی و لەسەر بنچینەی پێوەگرێدانی ئیش دەکات. (ئەحمەد عارف و جەمال سورەیا)ی جووتە شاعیریش، پێم وایە یەکێکیان ڕۆڵەی دیاربەکر و ئەوی دیکەیان ڕۆڵەی دێرسیمە. کوڕی دیاربەکر لە (جان کایا) جێگیر دەبێ و بیست ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە و یەك هەنگاو بەرەو (ئامەد) نانێت. هەرچی (جەمال سورەیا)شە، ئەوا ئەو لە منداڵەکانی کوشتارەکانی دێرسیمە، بەڵام لە شیعرەکانیدا یەك وشە لەسەر دێرسیم نالێت و باشترین شیعرەکانی بە تورکی و لەسەر بنچینەی ڕاستی تورکی دەنووسێ.

ی.ك: لوتکەیەکە لە لوتکەکانی شیعری تورکی. ماوەیەکی کورت بەر لەوەی

بەری و ڕۆژێکیان لە شوێنێکدا کۆبووینەوە، لە پەنامەوە دانیشت و ماچی کردم و بە گوێمدا چرپاندی و گوتی: «بالچین منیش کوردم».

س.پ: بەدزی‌یەوە گوتی. وانی‌یە؟

ی.ك: با بلێین شاعیرانە گوتوویەتی!

س.پ: هەڵسەنگاندنێکی منیشی کردبوو. وەختێك گۆڤاری (بەرمو سالی ٢٠٠٠) دیدارێکی لەگەڵدا کردم، گوتی: ئەو دیدارە زۆر کاری تێ‌کردم. پێم وایە ئەگەر ماوەیەکی درێژتر بڕبیایە، هەولی نزیکبوونەوەی دەدا. پێویستە بە ڕێزەوە یادی بکەینەوە. سەبارەت ماسازی (پەلماز)یش هەیە، پێویستە کەمێك ڕوشنی بکەینەوە. ئەوەی مەبەستمە: من یەکێکم لە نێو هونەرمەندان نەدیوە بە دروستی لای لە ڕاستی کوردی کردبێتەوە. هەموویان هەولیاندا چەمکە کولۆنیالیەکان پووش بەسەر بکەن، یا هەقی خوی نەدەن. تەنانەت ئەوانەش کە هەقی خوبانیان دابێ هەولەکانیان نەڕژاندە نێو کەناڵە شۆڕشگێڕەکانەوە. ڕەنگە لەبەر هۆی یاسایی یا لەبەر بێ توانایی‌یان بووبێ، چونکە دەبوو هەست بەم ڕاستی‌یە بکرێت و گەرمی تێکۆشان بە گوشت و ئێسقان بکەیەندرێت. پێم وانی‌یە ئەم هێزەیان هەبێ و ناتوانن ئەو دژواریانە تێ‌بپەڕێنن کە ڕووبەڕوویان دەبنەوە.بێ‌گومان ئەم بەمانانە نە بەرپرسی لەسەر مرۆڤ هەڵدەگرن و نە کێشەکەش چارەسەر دەکەن و دەبێ چارەسەرەکەی بە ڕێگایەکی شۆڕشگێڕانە بێ. ئەم بەرپرسی‌یە بە تێپەڕینی ڕۆژگار دەکەوێتە ئەستۆمان. بە هۆی ئەم پێویستییەوە وەلامی پرسیارێکم دایەوە دەڵێت: «ئایا هەڵوێستی چاوەڕوانکراومان سەبارەت بە ئەدەبی شۆڕشگێڕی کوردی، یا بە گشتی سەبارەت بە هونەر لەکوردستاندا چی‌یە؟».پرسیارەکانی تۆ لە دەوری ئەم خاڵە دەخولێنەوە. پێوەندی کوردیتان لەم مەسەلەیەدا بۆ باس دەکەم. ناوبەناو لە دلی خومدا دەمگوت ئەگەر من بیرم لە نووسینی ڕۆمانێکی کوردی کردەوە، ناوەکەی چی دەبێ؟ خومم دەخستە شوێنی ئەو ڕۆمانەی کە چنینەکەی لەسەر پێوەندیەکانە و ڕووداوەکانی بەهێی ئەم شیکردنەوە و هەنگاوە گەورانە پەرە دەستێنن کە لە ڕێگای ئازادی بەدی‌یان دەهێنن. جاروبار بیرم لەوە دەکردەوە ناوی ڕۆمانەکە (لە ڕێگای ئازادیدا) یا(پێوەندیە ئازادەکان) بێ، ئەمجا دەهاتمە سەر ئەوەی کە بلێم ناوی ڕۆمانەکە (گرێی کوردی) بێ، یا تاو نا تاوێك دەمگوت (کەم شەرمی کورد)، دەکرێت هەموو ئەمانە ببنە ناوی ڕۆمانەکە. جاروبار بیر لەناوی دیکە دەکەمەوە. بەلام ڕاستی‌یەك هەیە لەم هەموو ناوانەدا بە دوویدا دەگەڕێم و ئەویش ناسنامەی کوردی‌یە یا ناسنامەی ون بوو. تۆش دەڵێی: (کورد). بەلام شتێك نی‌یە کورد خاوەنی بێ. ئایا کورد لە کەم شەرمی و خیانەتکاری بەدەر هیچی هەیە؟ لەوە بترازێ چی دیکەی هەیە؟ ئایا بلێین ڕۆمانی خیانەتکاری یا ڕۆمانی کەم شەرمی ئەمە ڕۆمانێکی تازە نابێ و شایانی نووسین نییە.

ی.ك: بێ‌گومان نانووسرێت. پێویستە ڕۆمانەکە ئومێدی تێدابێ.

س.پ: بەڵێ ئەوسا دەڵێم: ڕۆمانی شەڕ دژی بێ‌شەرمی و خیانەتکاری ڕۆمانێکی

بەرچاوی دەبن. لە دەستپێکی ئەم بیرۆکەیەوە ئەو مەودا سۆزاوییانەم بە خەیاڵدا دێن کە شەڕی ڕزگاری نیشتمانی بە سەرکردایەتی (PKK) لە مرۆڤی کوردەوا خولقاندوونی، دەکرێت ئەوە لە ڕێگەی پەیوەندی (PKK) بە ئەدەبەوە لێکبدرێتەوە. دوورایییەکی سۆزاوی هەیە، لەوانەیە لە بنیاتی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)دا هەستی پێبکەین کە لە پەیوەندی گوندنشینییەوە سەرچاوە دەگرێت. مرۆڤێک هەیە لە هەموو ڕوویەکەوە شێوەیەکی تازەی وەرگرتووە و کەسایەتییەکی پەرەسەندووە بە تەواوی کەسایەتییە کۆنەکەی ڕەتدەکاتەوە. تەنانەت چەمکی خێزان و چەمکی کۆنی شەرەف و ڕەتکردنەوەی دەوڵەتی تورکیا ڕوویان لە دیاریکردنی دوورایی گەورە کردووە. بەڵام هەر ئەمە و هیچی دیکەنا. لە کاتێکدا سەدان کەس لەو کچە گوندنشینانە دێنە لامان کە خوێندنەوە و نووسین نازانن و سەر بۆ ئاسمان بڵند دەکەنەوە و کە لێیان دەپرسین ئاخۆ هیچ دەزانن؟ وەڵامەکەیان «نا»یە، واتە ڕەتکردنەوەیەکی توندی واقیع.

ی.ك: بەڵام من ئەمەم بینی و زۆر پێی دڵخۆش بووم.

س.پ: هەتا ئەو شوانەش کە کتوپڕ واز لە مەڕ و ماڵاتەکەی دەهێنێ و خێرا دێتە پاڵ(PKK) ئەوە ئازادی (PKK)و ئەو ئافرەت و شوانەی کە دەچنە پاڵ (PKK)و مۆرکی جۆراوجۆری گوندنشینان، وە کۆکردنەوەی ئەم هەموو خەڵکانە لە یەك سوپادا و هەزاران هەستی سەرهەڵدا و لەم سوپا پێکەوەنانە و بیری بەرهەمی شۆڕش و سەرجەم تەرزەکانی ژیانی تازە بە لایەنە تراژیدی و کۆمیدیەکانیەوە و بە خۆشی و ناخۆشییەوە.... ئەم هەموو مەسەلانە بە کەڵکی ئەوە دێن ببنە ڕۆمانێك یا شانۆنامەیەك یا فلیمێکی سینەمایی.

ی.ك: ئەو جەماوەرەی کە زمان و نەتەوایەتی خۆی دەشاردەوە، بووە بە جەماوەرێك بیست وچوار سەعات بە کوردی گۆرانی دەڵێت.

س.پ: ئەوە لە کردار و ڕواڵەتی دەرەوەشیاندا ڕەنگ دەداتەوە. ئەوان لە من پتر ڕەنگی سور و زەرد و سەوز هەڵدەواسن و هوڕا و دروشم دەڵێن، ئافرەتان هەلهەلە لێدەدەن و کوڕی پرسە بۆ شەهیدان دادەنرێت و دەڵێن: ئێمە کوڕمان یا کچمان وەك زاوا و بووك بە خاکی نیشتمان بەخشی و هەردوو زاواو بووکی کوردستانن و لەمەستییەکی بێوێنەدا دەژین.

ی.ك: نەریتی ڕەنگی سەوز و سور و زەرد لەگەڵ پەیدابوونی (PKK)دا دەستی پێ کرد.

س.پ: بەڵێ، ئەوە لە ڕۆژنامەکانیشدا ڕەنگی داوەوە. لە هەموو ئەوانەش گرنگتر ئەو خەڵکانەی کە جاران یەکتری‌یان بۆ مریشکێك دەکوشت و نەیانئەهێشت کوڕەکانیان یەك سەعات لەگەڵماندا بمێننەوە، گەیشتە پلەیەك چەند کوڕێکیانی تێدا بە کوردستان دەبەخشن و دەڵێن: من کوڕەکەمم بە کوردستان بەخشی، یا من کچەکەمم کرد بە بووکی کوردستان و بۆ ئەمە هەلهەلە لێدەدەن. هەموو ئەمانە مزگێنی ژیانی تازەن.

دیاره ئەم گۆڕانکاریانە بە لای ئێمەوە سەرینین. پێویستە بە شێوەیەکی فۆرڵتر حاڵی ببین و بۆ یەکەمجار ڕۆمان و هەروەها شیعر و گۆرانی کوردی دەربکەونە دەبێ لەو قۆناغەدا بژین و پێی بکەین. دەبێ ئەدیب و ڕووناکبیری شۆڕشگێڕ گشت لایەنێکی ئەم قۆناغە هەڵبسەنگێنێ. ئێمە لەم قۆناغەدا سەرلەنوێ مێژوومان ژیاندەوە. مێژووی خیانەتکاری لووشی ئەمان دەبێ و دیسان مێژووی ئازادی سەرهەڵدەداتەوە. با بڕوانین لەناوەوە و دەرەوەدا چی بەسەر خیانەتکاراندا هاتووە با بڕوانینە مەزنی شەهیدبوون و بەرخودان، لە کاتێکدا دەکرێت پێوەندی تێکهەڵیوی ئەم هەموو مەسەلانە لە ڕۆمان یا شیعر یا گۆرانییەکدا دەربڕێت و دەکرێت ئەوە بە فلیمێکی سینەمایی ڕوون بکرێتەوە. شیکردنەوەی سیاسیم و ڕێکخراو دامەزراندنم و سوپا پێکهێنانم لەم مەسەلەیەدا بەس نین. بۆیە دەبێ ئەدەب و هونەر لەم قۆناغەدا بچنە نێو شۆڕش. بەڵام ئەگەر تەماشای هونەرمەندی خۆمان بکەین، بۆمان جوێ ناکرێتەوە کە داخۆ هونەرمەندە یان خیانەتکارەوە لەلایەنی پراکتیکیەوە دەرهەق بە گەل و ڕاستی خۆی دەوری خیانەتکاری دەبینێ.

ی.ك: بەشێك لەوانەی کە ناچنەپاڵ خیانەتکاران، پەنا دەبەنە بەر ئاسانی و کاتێك لاسایتان دەکاتەوە. پێیوایە بووە بە ئەدیب.

س.پ: ئەگەر بەهرەی ئەدەبیشی هێندەی دەیەکێکی لەوەی کە من هەمە نەبێ، خۆی بە کۆڵەکەیەکی ئەدیبان لە قەڵەم دەدات. ئەدەب بەم شێوازە نابێ. با بچینەوە سەر کتێبەکەی چێرنشێفسکی «چی بکەین؟» و با بڕوانە ئەو دیموکراسییە شۆڕشگێڕییەش کە گەیشتووەتە کرۆکی لینسقان و با نیشتمانپەروەرانە گوێ بگرن و دۆستۆیفسکی بناسن و ئەوە بە کوردستان بگرن. من «تاوان و سزا لە کوردستاندا»م بە مانای سیاسی نووسی. ئەگەر ئەدیبێك لەجیاتی من بینووسیبایە، بە شێوازێکی ئەدەبی دەینووسی، دەکرێت تاوان و سزا لە کوردستاندا بکرێتە بابەتی چەند ڕۆمانێك. خیانەتکاری و بەرخودانی گرنگ لە کوردستاندا و سەدان وڵاتپارێزیش هەن لە نێو ڕیزەکانماندا تێدەکۆشن و ئەو هەڤاڵانەی کە دوا بۆمبیان بە خۆیاندا دەتەقێننەوە و ئەوەیان لە تەسلیم بوون بە دوژمن پێباشترە. هەر ئەم ساڵە نزیکەی پەنجا کچی شۆڕشگێڕ دوا گوللەی خۆیانیان بە خۆیاندا تەقاند. تا خۆ بە دەست دوژمنەوە نەدەن. دەشێت هەر یەکێك لەوانە ببێتە بابەتی گەلێك ڕۆمان. هەروەها ژمارەیەك کچمان لە نەورۆزدا ئاگریان لە خۆیان بەردا. دەشێت و دەبێ هەموو لەوانە بابەتی چەند ڕۆمانێك پێك بهێنن. نموونەی دیش هەن وەکو گەمارۆی پێنج هەڤاڵ لەلایەن ۱۰ هەزار سەربازەوە بۆ چەند مانگێك و بەرخودانی مەزنیان لەم ئابلووقەیەدا. هەروەها سەدان هەڤاڵ لەچیاکاندا ڕەق بوونەتەوە. ئەوانەش هەن کە بە چەکی کیمیایی سووتان و گوندەکان چۆڵ کراون. بە تەنێ لە(شەرناخ) نزیکەی سێسەد ئاژەڵ لەنێوبران. ئەم هەموو بابەتانە دوورایی ئەدەبییان هەیە. گەلێك گوند چۆڵ کران و گەلێك شاری تازەش بنیات نران. دەبوو ئەم هەموو ڕووداوانە دوورایی ئەدەبییان هەبێ. بۆیە من دەپرسم: ئێوە بە ناوی ڕۆژنامەی

«ئۆزگوور گوندەکەوە دێن. ئەی بەڕێزە گوندییەکان: تا چ ڕادەیەك ئەم ڕووداوە سیاسی و ئەدەبیانە بڵاودەکەنەوە و لە ڕۆژنامەکەتاندا ڕەنگی پێدەدەنەوە؟ هەروەها دەپرسم و لەو تورکانەش دڵگرانم کە لافی ئەوە لێدەدەن دیموکراتی و شۆڕشگێڕن. زۆرتان لەسەر ڤێتنام و سلفادۆر و نیکاراگوا نووسی و دوو بستی زەویتان لە هیچ خاڵێکی دنیادا بە جێنەهێشت تا لەسەریتان نەنووسی! ئەی بۆچی لەسەر ئەو کوردستانە نانووسن کە هەزار ساڵە کوڵەکەی بنچینەیی ئێوە پێکدەهێنێ؟ دەکرێت لەسەر ناوەکەی بنووسن... باروودۆخەکەی و شێوەکەی، بۆچی وتارێ؛ یان دووان لەسەر کوردستان نانووسن!... کوا ڕۆشنبیری و دیموکراتیەتتان؟ گەلێك شاعیر و ڕۆمانووستان هەن یا بە حسێبکاری خۆیاندا بچنەوە. نالێم هەر لەسەر کورد بنووسن، بەڵکو پێویستە لەسەر تورکیش بنووسن. ئەگەر چارەنووسی کوردو تورك پێکەوە گرێدراون، لەمتر بۆچی نانووسن؟ سیاسەتمەدارانی تورك هەموو ڕۆژێك بێشەرمانە هاوار دەکەن: هەزار ساڵ پێکەوە لەسەر ئەم خاکە بە برایانە ژیاین. ئەگەر وایە، بۆچی یەکێك لە براکان بە دەست برسێتییەوە دەناڵێنێ و کوا زمان و ژیان و ڕۆشنبیریەکەی؟ ئایا داروباری باشە تا بڕوانینە وەزعی؟ ئەگەر بە ڕاستی برای ئەویت و خاك و پارەی نادەیتێ، لانی کەم لە داروباری بپرسە، وانییە؟ ئەمە وا دەگەیێنێ کە کارێکی دووڕووانە لە ئارادایە. ڕۆشنبیری تورك لە بەردەم ئەم باروودۆخەدا لە جێی گوناحباری گەورەدایە. بۆچی لە قسە دەترسێت هێندەی ئەوەی کە سیاسەتمەداران لە کورد دەدوێن؟ ئەدیب و هونەرمەند دەم هەڵناهێننەوە. هونەرمەند لەم مەسەلەیەدا لە سیاسەتمەداری تورك کۆنەپەرستترە.

ی.ك: لەم کاتەدا وایە.

س.پ: بێگومان وایە. پێش هەر کەسێك.. لەو مامۆستایانە... مامۆستاکانی زانکۆکان کۆنەپەرستییەکی ترسناکیان هەیە لەمەی هونەرمەند و سیاسەتمەدار تێدەپەڕێنن. سەرباری ئەوە، خۆیان بە نوێنەری زانست دەزانن. ئەوە چۆن وا دەبێ؟ ئەی مامۆستایان چۆن بەم باروودۆخە قایل دەبن؟ ئایا خیانەتکردن لە زانست دەگاتە ئەم پلەیە؟ چۆن ئەوەتان بۆ خۆتان پێقبووڵە؟ من وەك مرۆڤێکی پەیبەستەی زانست، ئەگەر هەزار هەر هەزار بێ من دەڵێم هەزار. چۆن وای حسێب دەکەن کە هەزار بوونی نییە؟ لەوانە بە ڕاستی بە نەبووی دادەنێن، ئەو پیاوانەی زانست بە چی ناوبنێین؟ تەنانەت پیاوانی کلێسەش تا ئەم ڕادەیە باوەڕیان بە گەندەبێژی یان نییە.

دەبێ بە ڕاستی لەو پەیوەندیانەی کورد یا سیستەمی ئەم پێوەندیانە کە لێیان دەدوێن، تێبگەن. ئێوە لە پرسیارەکانی پێشوودا باسی مەسەلەی خۆشەویستیتان کرد. لەوانەیە ڕێگای ڕوو بە خۆشەویستی ببێتە بابەتی ڕۆمانێکی باش. من هێشتا لە ڕیزەکانی (PKK)دا شەڕ دەکەم تا بە چەمکێکی ڕاستی خۆشەویستی بگەم.وە شەو و ڕۆژ لەم ناوەندەدا دەژیم و ناتوانم وا لەخۆم بکەم باش لێم تێبگەن.

ئەگەر تووانیم، ئەوە لەسەر حسێبی ئەم دژوارییانە دەبێ. گەلێك ڕووداو لەم بابەتەدا هەن ڕۆژانە لەگەڵیاندا دەژیم تا ڕێگای ڕوو بە خۆشەویستی دیاری بکەم. جا هەر چۆنێك تیۆری ئەوە دابنێم و بەکردەوە ئەنجامی بدەم، ڕۆژی دوایی سەیر دەکەم دەبانەوێ چیم کردووە لێم هەڵبگەڕێنەوە.

ئەگەر بوونی یەکێکی (ئاپۆ) ناو ئەبووایە، ڕۆژی (١٠) تاوانم لە دەست دەقەوما و خەڵك خوێیانیان بزر دەکرد. لێرە دەمەوێ بۆ ڕوونکردنەوە باسی ڕووداوی (پەلماز گونای) بکەم. بە باوەڕی من ژن دەورێکی گەورەی لە دوایی پێهێنانی (یەلماز)دا هەیە. ئەمە بۆ خراپە کردن دەرهەق بە (فاتووش) نالێم. وەك دەڵێن (فاتووش) پێوەندییەکی بە (کەندال)ەوە هەبوو و، (یەلماز) هەوڵیدا کەندال و فاتووش و خۆی بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل بکوژێ. من ئەمە دەڵێم تا ڕوونی بکەمەوە ئەوان چۆن ئەم مەسەلەیەیان کرد بە کەرستەیەك بۆ دیماگۆگییەت. ئەگەر دۆخەکە ئاوابێ، یا بەختیاری ئوشی گیانیان بێ. بەڵام دەزانن (یەلماز) حاکمێکی لە پێناوی ئەم ژنەدا کوشت و ماوەیەکی درێژخایەن لە بەندیخانەدا مایەوە و پاش ئەوە بۆ (پاریس) هەڵات. پێم وایە ئەو ئەخۆشی شێرپەنجەیەی کە تووشی بوو، سەرئەنجامی بەندیخانە و ئەو باروودۆخانە بوو کە باسم کردن. بەو پێیە ئاکامەکەی زۆر تراژیدی بوو.

ی.ك: ئایا پیاوی کورد لە دۆخێکی ئاوادا خۆی دەکوژێ؟

## پێویستە لەسەر مرۆڤی کورد
## خێزان لە گشت لایەنێکییەوە بە باشی شیبکاتەوە.

س.پ: پێموایە ئێمە ڕووبەڕووی دۆخێکی سەیری مرۆڤی کورد دەبینەوە. (یەلماز) لەکتەر بوو و پێوەندییەکی زۆر و زەبەلاحی بە ئالەرمەکانەوە هەبوو و دواجار کچی کابرایەکی خاوەن کارگەی هێنا. لە ئەنجامدا ژنە باروودۆخێکی قورسی بۆ خولقاند. بەڵام نەیتوانی مەسەلەکە چارەسەر بکات. لەوانەیە (یەلماز) جەربەزە و لە شۆڕشگێڕییەوە نزیك بووبێ، کەچی زۆر دوور بوو لەوەی کە خودی خۆی شیبکاتەوە نە مەسەلەی کوردی شیکردەوە و نە توانی هونەر بە باشی شیبکاتەوە. ئەوە بوو (یەلماز) ئالەرمێکی حازر بە دەستی ئەو ئاوەندە دامەزراوە برد و ژیانی لە پێناوی ئەو ئالەرمەدا بە قوربانی کرد. دەری ئەبرد و ڕۆیشت. واتە قوربانی دەستی ئەو بوو.

ی.ك: ئاوا ئەم مەسەلەیە هەڵدەسەنگێنن؟

س.پ: بێگومان. یەلماز ڕۆمانێکی نووسیبوو و لە گەلێك فیلمدا دەوری دیبوو، پێویستە فیلمێکی خەمناك لەسەر ژیانی بەرهەم بهێنن. دەبێ فیلمی (یەلماز) هەر خۆی شیبکاتەوە. ئەمە دەڵێم چونکە یەلماز ڕووداوێکی ئاوازە بوو.

ی.ك: باشە ئاپۆی ئازیزم. ئایا ئەوە چارەنووسی ڕۆشنبیری کوردە؟ خۆ (یەشار

کەمال)یش ژنێکی جوولەکەی بەکچار کراوە و دەوڵەمەندی هێناوە کە بە چەند زمانێك دەدوێت.

س.پ: جوولەکە بە گشتی، ئەو مرۆڤانەی کە بەهرەمەندن بە ڕێگەی ژنهێنانەوە کۆنترۆڵیان دەکات.

ی.ك: (یەشار کەمال)یش لەگەڵ (تیلدا)ی ژنیدا دەچوورە بۆنە ئێودەوڵەتییەکان.

س.پ: هەموو کوردێك پارێدەرێکی لەم جۆرە و خولیایەکی واشی هەیە. باسی ئەزموونی خۆمم بۆ کردن. بەڵام بۆ ئەوەی زۆر و ستەم لە هاوڕێکەم نەکەم، زۆر بە وریاییەوە لام لە بابەتەکە کردەوە. کورد چەمکێکی تایبەتی لەبارەی ئافرەتەوە هەیە. ئەرکی ئەدەبی شۆڕشگێڕیش ئەوەیە پێوەندی شۆڕشگێڕانەی نێوان کورد و ئافرەت و خێزان ڕۆشن بکاتەوە. دەرخستنی ئەم پێوەندیانە ئەرکێکی زۆر گرنگە، پێویستە ئەدەب و هونەر ئەنجامی بدەن. لە ڕێگای ئەزموونی شۆڕشگێڕانەی خۆمەوە ئەوەم بە ئەنجام هێناوە: ئەگەر خێزان و ئافرەتم شیەکردبایەوە، ئەوسا (ئاپۆ) بەم سەرکەوتنە نەدەگەیشت، یان هەزارجار تووشی پاکتاوکردن دەبوو.

ی.ك: ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە.

س.پ: بە وریایی و بێئەملاولەولا دەڵێم: پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێکی کورد خێزان لە ڕووی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و جنسییەوە شیبکاتەوە. شیکردنەوەیەکم لەسەر جنس هەیە، پێویست ناکات لێرەدا وردەکارییەکەی باس بکەم. وەك گوتم دەکرێت ئەمەش ببێتە بابەتی کتێبێکی ئەدەبی. شیکردنەوەی جنسی شتێکی لە خۆیدا گەورەیە. ناکرێت بە بێشیکردنەوەی بابەتە جنسییەکان، پیاو و ژنی کورد بە شێوەیەکی بنچینەیی بناسین و زەحمەتە خێزانی کوردی بدەینە ناسین. هەروەها زەحمەتە لە تاوانەکانی نێو کوردستان و خیانەتکاری و نۆکەرایەتی حاڵی بین. بەوپێیە زەحمەتە لە نۆکەرایەتی و کۆلۆنیالیزم حاڵی ببین.

ی.ك: پێم وابێ لە گفتوگۆی پێشوومانا گوتتان: پێوەندیم بە ئافرەتەوە ئەوەیە من بە خولقاندنی «هەزار گەریلا لە ئافرەتان» تۆڵەی لێدەسێنمەوە.

س.پ: ئەزموونێکی پێکەوە ژیانم لەگەڵ ئافرەتدا هەبوو. ئەو کاتە هەڤاڵانم دەیانگوت: «ئێمە زۆرمان پێسەیر بوو کە پێوەندیت لەگەڵ ئافرەتێکی لەم جۆرەدا بنیات نا، بە تایبەتی کە لە پشتی خێزانێکی نۆکەرەوە کەوتووەتەوە. گوتمان: با بڕۆین لەنێوی ببەین، چونکە سووکایەتی بە سەرکردەی ئازیزمان دەکات و بەوەش گوناحەکانی زیاد دەبن. ئێمەش بڕیارماندا لەنێوی ببەین». ئەم ئافرەتە یەکجار چەپەڵ بوو، وا خۆی دەردەخست وەك بڵێی بە پەتێك بەستوومیەوە و بە دووی خۆیدا بەکێشم دەکات. وای لە هەڤاڵان کرد بەم شێوەیە لە بارودۆخەکە تێبگەن و ئەوەش زۆر تووڕەی کردن. تەنانەت شەڕی لە دژمان دەکرد و دەیگوت: «ئەگەر منیەتی منت دەوێ، دەبێ کوردستان و حیزب (PKK) بە منەوە گری بدەی». دیارە ئاشکرا بوو ئەو گرێدانە پاش ئەوە ڕووی لە چ لایەك دەکرد.

لەوانەیە ئەم خاڵە بووبێ وای لێ کردبم لە کاتی مامەڵەی سیاسیدا زۆر قایمکاری بکەم. ئەمەش وای لێ کردووم لە پیاوی ئاسایی کورد تێبگەم بکەم. لەوان ئەم جۆرە ئافرەتە تەڵاق دەدەن یا دەیکوژن. کورد و تورك ئەمەیان هەیە. بەڵام من ئەوەم نەکرد. نە کوشتم و نە پێمگوت: «تۆ تەڵاقدراوی»و تەواو لێ کرد هەڵبێت و نە خستمە بەر دەرگا، بەڵکو بە پێچەوانەوە من ناو بنناو لە ماڵ هەڵدەهاتم. مەبەستم ئەوەیە من دەستم کردووە بە پەیداکردنی خاسیەتێکی باش. من ملم کەچ نەکرد و لە بارودۆخەکە ڕازی نەبووم. لەبری ئەوە، زۆر قایمکاریم دەکرد و دانم بەخۆدا گرت تا گوڕ و تینم تێ بێنێتەوە.

لە خۆمم دەپرسی: «ئەم ژنە دەیەوێ بۆ کوێم ببات؟» و «ئایا دەتوانرێت ئەم ژنە چاك بکرێت؟» و «ئایا دەتوانین ئەم ژنە لە بزووتنەوەکەماندا ڕێکبخەین؟». لەبەرئەوەی من سەرسەخت بووم بۆ ئەوەی یەکێك بێنمە ڕیزی بزووتنەوەکە، ئەویش سەرسەختانە بەرەنگارم دەبووەوە. منیش سەرسەختانە بەرانبەری ڕادەوەستام. تەنانەت ناونیشانێك لە ڕۆژنامەکاندا خرایە ڕوو دەڵێت: «پیاوەکانی فلان کەس ئاپۆیان کوشت». ئەمە دەزانن. ئەمە لە بنەڕەتدا دەمەقڕەی نێوانمان بوو. پاش قوناخێك کە ١٠ ساڵ درێژەی کێشا، لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی تووڕمان دایە دەرەوەی بزووتنەوەکە.

دیارە هەڤاڵان بە هۆی ئەو کێشە و گیروگرفتانەوە کە بۆی خولقاندین، هەزار جار داوایان کرد لە سێدارەی بدەین تا دوژمن سوودی لێوەرنەگرێ و نەڵێت نێزیکترین کەسی خۆی لە سێدارە دەدات و ناهەقی لە خەڵك دەکات. بە جەستە لە سێدارەمان نەدا، بەڵکو لە ڕووی سیاسی و مرۆڤایەتیانەوە کردمان. گەلێك دەرسم لەم ئەزموونەوە بە دەست هێنا. ئەو بارودۆخەی کە هەڤاڵانم بۆ (٢٤) سەعات دەری نایەن، من (١٠) ساڵ دەرمبرد. ئەمە زۆر گرنگە. توانیم لە ڕێگای ئەم پێوەندییەوە شیکردنەوەی خێزان و ئافرەت بە تەواوی بە ئەنجام بگەیەنم. ئەم شیکردنەوانە هەزاران کچی ئازاد دەهێننە دەرێ. ئەو ئافرەتەی کە مانای نێزیکبوونەوەی نەدەزانی و ئەو کیژە کوردەی کە نەیدەتوانی دوو هەنگاو لە دەرەوەی ماڵ بنێت، بوو بە پاڵەوان و هەموو ئەمانەش بەهۆی ئەم شیکردنەوانەوەیە. دیارە ئەمە پێوەندی بەو نەخشەکێشان و جێبەجێکردنەوە هەبوو کە کردمن. ئەوەبوو پاشکەوتوویی بێ ئەندازەی ئافرەت و هەوڵی خۆسەپاندنیم لە ژێر پەردەی (ئازادی ئافرەت)دا هەڵوەشاندەوە. کارێکی گەورە و سەرتاسەریم لە پێناوی ئافرەتی ئازاددا کرد. وەك چۆن ئێوە قوتابخانەی تایبەتتان هەیە ئافرەتی پرۆتۆکۆل و خانمان و کچانی باڵادەست دەردەچوێنن. هەروەها خانەی سینەما و قوتابخانەی هونەرپیشەتان هەیە. ئێمە قوتابخانەیەکمان هەیە ناوی (ئەکادیمیای مەعسووم قورقماز)ە، لەوێ دەرسم دەگوتەوە. کچانی دەرچووی ئەو قوتابخانەیە بێئەملاولەولا لە هەموو کچێك بەجەرگترن و ئەوەیان بە کردەوە سەلماندووە. وەك گوتم هەزارانیان لە گۆڕەپانی کاردان و گەورەترین پاڵەوانیەتی و بەرخۆدانیان پیشاندا و سەدانیان لە ماوەی

ئەم ساڵەدا گەیشتنە قۆناخی شەهید بوون. پێموایە دەستەی ئەرکانی تورکیا دەستی کردووە بە لاسایکردنەوەمان، چونکە ئەم ساڵ کەوتوونەتە وەرگرتنی کچان لە کۆلێژی جەنگ. سەرنجتان بۆ ئەوە ڕادەکێشم کە ئەم بارودۆخە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە ئێمەوە هەیە، لە کاتێکدا دوژمن تەماشای کردین و بینی ئافرەت نەخشێکی پڕ بایەخ لە بزووتنەوەکەماندا دەگێڕێ و توانای چەك هەڵگرتنی هەیە و ئەوانەیە لە خەباتی چەکدارییدا و لە ڕووی سیاسییەوە هاوبەشی بکات و جێوڕێیەکی بەرز داگیر بکات. بۆیە بە خۆی گوت بۆچی منیش نەیهێنمە پاڵ سوپا؟

ی.ك: بێگومان تورك دەیەوێ لە کورد دوانەکەوێ.

## لە ئێستا بەدواوە نە پیاو دەتوانێ لە کوردستاندا بە ئاسانی ئافرەت پەیدا بکات و نە ئافرەتیش دەتوانێ بە ئاسانی پیاو پەیدا بکات.

س.پ: لێرەدا سەرنجتان ڕادەکێشم. بەڕێز و وردبینەوە، بۆتان دەردەکەوێ کە دەستەی ئەرکان بیرۆکەی بە سەربازکردنی ئافرەتی لە ئێمەوە وەرگرتووە، یان دەستەی ئەرکان دەیەوێ لەم ڕووەوە هاوسەنگییەکمان لەگەڵدا دروست بکات. بەڵام ئەمە گرنگ نییە. پیاوی کورد ئەگەر لەگەڵ ئافرەتدا تووشی کێشە ببوایە، تەڵاقی دەدا و ژنێکی دیکەی دەهێنا یان دەیکوشت. کەچی من پەنام نەبردە بەر ئەم شێوازانە بەڵکو شێوازێکی دیکەم دیاری کرد و بیرۆکەی ئافرەتی ئازادم سەپاند. لە کاتێکدا ئەو هەوڵیدا بە شێوازی کۆن بمخات. بەڵام من بە شێوازێکی کارخولقێنەر وام لێهات باسی ئەوە بکەم ئازادی ئافرەت چییە و ئافرەتی ئازادیش کامەیە. بەوە دەستم کرد بە ئافرەت کۆکردنەوە لە خۆم. هەر کاتێك کۆم بکردایەتەوە، ئەویش هەوڵیدەدا پیاو کۆبکاتەوە. دیارە سەرکەوتنی لە چارە نەنووسرابوو. ئەوسا هەوڵیدا کچان کۆبکاتەوە و بیانکات بە بەرفەرمانی خۆی و ئەوەشی بۆ نەچووە سەر. پاشان شێتگیر بوو، چونکە نەیدەزانی چی بکات و دەیگوت: ئایا ئەو حەرەمسەرا دادەمەزرێنێ و کەنیزەك کۆ دەکاتەوە؟

هەوڵیدا دۆخەکە بشێوێنێ. وەك دەزانن ئەمەش لە لاپەڕەی ڕۆژنامەکاندا ڕەنگی دایەوە. مەبەستم ئەوەیە تێکڕای پیلانگێڕەکان هەوڵیاندا سوود لەم مەسەلەیە وەربگرن. بە چەکی ئافرەتی ئازاد بەرەو ڕووی سەرپاکیان بوومەوە. ئەوانیش شێتگیر بوون. پێیانگوتن: «ڕەنگە مرۆڤ پەیوەندی بە یەك یا با بڵێین (١٠) ئافرەتەوە هەبێ. بەڵام چۆن دەتوانێ پەیوەندی بە (٣٠) ئافرەتەوە هەبێ. ئەوەتا هەزاران ئافرەت هەن. ئایا شەرم لە خۆتان ناکەن؟». بێگومان کێشەی سەرەکی لێرەدا ئەوەبوو کە من ئافرەتی ئازادم پێش دەخست و ئەوەش دەبووە هۆی شێتگیرکردنیان و پێویستیش ناکات بە شوێن بەهانەیەك یا ڕێگایەکی دیکەدا

بگەڕێین.

ئایا کەس هەیە نەزانێ کیژانی ئێمە لە هەموو ڕوویەکەوە چەندە پاك و ئازادن؟ وێڕای ئەوە کە ئەزانن باشن و بە باشی بەڕێ دەکەون و لای ئێمە هاوشانی مرۆڤی باشن و دەتوانن خۆشەویست بن و بە باشی خۆشەویستی بکەن. ئەم شتە مایەی شانازییە. دیارە لەم مەسەلەیەدا من شارەزایانە و بە شێوەیەکی تەکنیکی جوولاومەوە. بەڵام کۆنەپەرستانی کورد خەریك بوو بمخنکێنن. ئەگەر پەنام نەبردایەتە بەر ڕێگای توندوتیژی سەربازی، خولیای ئازادیەتی و چەمکی لادێیانە لەنێو (PKK)دا تەشەنەیان دەکرد و ئەوەش دەیگەیشتایەوە بۆ پەیدابوونی چەمکی هەڵەی یەکلایەنە لە نێوان پیاو و ژندا. ئەگەر یەك وشەمان لەسەر کێشەیەکی تایبەت بە ئافرەت بگوتبایە، دەیانگوت: «ئەمە کێیە؟» ئەوە زۆر لەسەرمان دەکەوت. بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە بەجەرگانە هاتینە ناوەوە و شیکردنەوەی گرنگمان لەسەر ئافرەت و خێزان کرد و لە خولقاندنی کادیری ژناندا پێشکەوتنێکی بایەخدارمان بە تایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا تۆمارکرد.

ئەمە وەکو دەستتێوەردان وابوو لە دەزگای خێزان و ئافرەتدا کە سەدان و بگرە هەزاران ساڵە بۆگەنی کردووە. ئێستا کچان و تەنانەت هێندێك ژنی شووکردووش واز لە ماڵ و کەس‌وکاریان دەهێنن و وەك لافاو دێنە پاڵ ڕیزەکانی شۆڕش. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە پەیوەندی کۆنی نێوان ژن و مێرد دووچاری هەژانی گەورە دەبێ و ئەمەش سەرگەرە. هەتا پیاوانیش ڕۆژانە بەهۆش خۆیان دێنەوە. گوتەیەکم هەیە هەمیشە دووپاتی دەکەمەوە، ئەویش ئەوەیە: «لە ئێستا بەدواوە نە پیاو دەتوانێ لە کوردستاندا بە ئاسانی ئافرەت پەیدا بکات و، نە ئافرەتیش دەتوانێ بە ئاسانی پیاو پەیدا بکات». ئەمە کارێکی گرنگە. وەختێك دەڵێم: بە ئاسانی پەیدای ناکات، مەبەستم ئەوەیە کە ژن و پیاو پێبەستەی بەها بنچینەییەکان بوون و هەریەکێکیان ئیش بۆ ڕزگارکردنی نیشتمان و ئازادکردنی گەلەکەی دەکات و دەبێتە کەسێکی حیزبی و ڕێکخراو. سەرەڕای هەموو ئەمانە جوان دەبێ. ئەمانە ئەو کارکرد و مەرجانەن کە بوار بۆ خۆشەویستی دەکەنەوە. ئەم مەرجانە جوانن.

بەبێ ئەمە نە نان و نەماڵ و تەنانەت نە بستە زەوییەکیش بۆ گۆڕ لە ئارادا دەبێ و، زەوییەکت نابێ تا بتوانی وەك باڵندە هێلانەیەکی بۆ خۆت تێیدا دروست بکەی. ئەو کاتە لە کوێ خانووەکەت دروست دەکەی و لەکوێ خۆشەویستی دەکەی؟ ئەم هەموو مەسەلانە پێداویستی مێژووییین. ئەگەر یەکێك گوتی: من جەربەزەم و شۆڕشگێڕم، ئەوسا دەڵێین: ئەگەر وەهای، نیشتمان ڕزگاربکە و لە پێناویدا بەشەر بێ و حیزب دابمەزرێنە و، با هەموو جوانییەك و پیرۆزترین پەیوەندیش بۆ تۆ بێ. بەڵام ئەگەر گوتی: لە نیشتمانم هەڵدێم و گەلەکەم ناناسم و هیچ زانیارییەکم لەسەر حیزب و ڕێکخستن و جوانی نییە؟ ژنێك یا پیاوێکم دەوێ. ئەو کاتە پێی‌دەڵێین: گیانت بە دۆزەخدا بچێ.

ی.ك: واتە تۆ دەڵێی نە ژنێك هەیە بۆ پیاوی وا دەست بدات و نە مێردێکیش بۆ

کچی وا.

س.پ: بێگومان نییە. ئەمە لەم مەسەلەیەدا بیرای بیر ئەدەفەیە.

ی.ك: بۆ ئەوانیش نییە کە بە بارەکەی دیکەدا دەڕۆن، وانییە؟

س.پ: بێئەملاولەولا بەڵێ. خۆ مەرج و باساکانمان زۆر ڕوونن. لەگەر ئەرکی خۆی بە جێهێنا، با مەزنترین جوانی و عەشق و پەیوەندی و هەست و نەست بۆ ئەو بن. بەڵام ئەگەر بە جێینەهێنا، ئەوسا کەم شەرەف دەبێ و دەبێتە هاوتای کەمی کوردی. بەم واتایە مێژوونووس لە بارەی کوردەوە بۆ دەستەی ئەرکان دەنووسێ و دەڵێت: «کورد هیچ لە هونەر و خۆشەویستی و عەشق و شارستانەتی تێناگات». ئەمە وا دەگەیەنێ کە ئەو بەم شێوەیە حوکمی لە سەنتارەدانی (کوردی)دا. ئەگەر بمانەوێ ئەم حوکمە لابەبێن، دەبێ ڕێگای ڕاست تاقی بکەینەوە. من ئێستاکە بەربەرەکانێی گرێی خولیا و پەیوەندی کۆنەپەرستانەی ئافرەت و پیاو دەکەم. وەك ئەوەی یەکێك لەوی دیکە بتەکێنمەوە. بەربەرەکانێی هەست و نەست و پەیوەندی جنسی هەرزانیەکانی دەکەم و توانیومە ویرانیان بکەم. بۆیە من ئێستا بەهێزم.

ئەمە بەشێکی ڕۆمانێك دەخوێنێ. وەك دەزانن هەموو ڕۆمان یا هونەرەکان بە دەوری پەیوەندی پیاو و ئافرەتدا دەخولێنەوە. بەڵام ئەم ڕۆمانە تەنیا تایبەت بە کوردستانە و ئەمە هێڵەکانیەتی. ئەگەر بێینەوە سەر ئەزموونی (PKK) بەتاقی تەنیا، بەسە بۆ نووسینی چەندین بەرگ کتێب کە دەیان ڕۆمانیان تێدا دەبێ. ئەمە یەکێکە لەو دووراییە زۆرانەی کە هەن.

بۆ نموونە خۆشەویستی مێژوو لای من خولیایەکە. شوێنەوارەکانی نەمرووود و ئاوی دیاربەکر و حەڕڕان و ئوورفە و دەوروبەری نزرگەی (خليل الرحمن) زۆر هەستم دەوروژێنن و من بە شێوەیەکی سروشتی بە هەموویانەوە بەستراوم، سەرباری بەسترانەوەم بە خاکەوە. بەسەر خاکدا ڕێ کردن بەلای منەوە شێوەیەکە لە ژیان، وەك بڵێی بۆنی ئەو خاکە دەکەم و، بۆنی شوێنەوار و ئەو گژوگیایانەی کە لەوێ نەشونما دەکەن، هەڵدەمژم. ئەو باڵندانەی کە دەفڕن ـ بەلای منەوە ـ جوانییەکن، بێهۆشم دەکەن. من لەسەر ئەم بنچینەیە بە نیشتمانپەروەری گەیشتم. بۆیە کاتێك لە گوندەکەم جوێ بوومەوە، چاوەکانم پڕ لە فرمێسك بوون.

ی.ك: کە جوێ بوونەوە چاوتان فرمێسکی ڕشت، وانییە؟

س.پ: بێگومان، چاوم فرمێسکی ڕشت. بەڵام من هەڵیشدەگەڕامەوە. هەڵگەڕانەوە و فرمێسك هۆی خۆیانیان هەیە. لەوانەیە ئەم جۆرە مەسەلانە چەند دوورایییەکی ڕۆمانێك پێك بهێنن کە پاش شەڕ دەنووسرێت، لەبەرئەوەی ـ وەك دەبینن ـ من ڕووبەڕووی شەڕ و جەنجاڵی هەڵسووڕاندنیم.

ی.ك: بەڵام تۆ وا باسی جوێ بوونەوەی پاش (١٠) ساڵی خۆتت لەو ئافرەتە کرد وەك بڵێی شەڕ بووبێ.

س.پ: گوتم پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان شەڕ و سۆزدا هەیە. ئێمە لە

شۆڕشی کوردستاندا لەگەڵ لامان لە پەیوەندی جنسی هەرزانبەها و خێزان و جۆرەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی کردەوە. بۆمان دەردەکەوێ گشتیان بە شێوەیەکی سەرتاسەری دەچنە خانەی گۆڕانکاریە سیاسیەکانەوە و دەورێکی گرنگ و گەورەیان هەیە. ڕۆمان لەم لایەنانە بە تایبەتی دەخاتە ڕوو. من ئێستا ناتوانم وەك سەرکردەیەك باسی کاریگەری خراپی پەیوەندیە جنسیەکان بۆ سیاسەت بکەم و ئەوە کە چۆن دەبێتە هۆیەکی پاشکەوتن بە هەموو ڕوویەکەوە و چوونە نێو ورد، کاریەکانیشی. بەڵام ڕۆمان دەتوانێ هەموو شتێك بڵێت. من ناتوانم بە دوورودرێژی و وردی باسی ئەوە بکەم کە پەیوەندی سۆزاوی چۆن کار دەکاتە سەر سیاسەت و چۆن دەگاتە بێئاگایی. بەڵام ڕۆماننووس ئەوەی پێدەکرێت. هەروەها ناتوانم خولیایەك لە خولیاکان لێكبدەمەوە و بە شێوەیەکی سیاسی شیبکەمەوە، چونکە گرنگ هەڵسەنگاندنی سیاسیە. کەچی ئەدیب دەتوانێ زۆر بە توندی ئەوە بخاتە بەری مەیدان. ئەمە ئەو ئەدەبەیە کە کەس لای لێنەکردووەتەوە و، ئەمە ئەو بارودۆخەشە کە ئەدیبە ساختەکارەکان لێی حالی نابن. کورد ئەو ئەدەبە شۆڕشگێڕ و ڕاستەقینەیەی گەرەکە کە بەم شێوەیە بێ. لەم ڕووەوە تێڕوانین و سامانێکی فیکریم هەن. بەڵام ئەرکی من ئەوە نییە ئێستا ڕۆمان بنووسم. بەڵام پێمدەکرێ هاوبەشی چارەسەرکردنی هێندێك کێشەی پەیوەند بە ڕۆمان بکەم و شێواز و بنچینە و ئەو تەوەرانەی کە پێویستە لە دەوری بخولێنەوە دیاری بکەم و ڕوونکردنەوەی پێویست بۆ ئەم مەبەستە بەرچاو بخەم. جەخت دەکەم کە سەرجەمی ئەم مەسەلانە لای من جێگیر بوون و گەشەیان کردووە و بە هۆی کاری شۆڕشگێڕانەوە پەرەیان سەندووە. ئەدەب لە کاری شۆڕشگێڕانەوە دەست پێدەکات. پێویستە ئەمە باش ببینین. بە پێی قەناعەتی من. ئەدیبی باش ئەو کەسەیە کە بە گەرماوگەرمی هەست بە پەرەسەندنی شۆڕشگێڕانە دەکات. بەڵام بەداخەوە هێندێك کەس هەن لافی ڕۆژنامە نووسی لێدەدەن و لەوەندەی پەیامنێری ڕۆژنامەی (حوریەت) ناچنە کوردستان تا ببینن لەوێ چی ڕوودەدات. چی لەم ڕۆژنامە نووسە کوردانە بکەم؟ لەوێ درامایەکی سەرسوڕهێنی مرۆڤایەتی لێیە. شیعر دەنووسن بەبێ لەوەی بڕوانێتە ئەم درامایە. چی لەم شیعرە بکەم؟ دیارە من هەرگیزاوهەرگیز نایخوێنمەوە. ئەمجا خاوەنەکەی دێت و هاشەوهووشەی ئەوە دەکات کە هەست و نەستی هەیە و شووری پێدەکەن. دەمەوێ بەوانە بڵێم کە بەم شێوە هەرزانبەهایە ژن دەهێنن: وا تەماشایان دەکەم وەك بچنە نێو گۆڕەوە. لە منداڵییەوە ئەمە بیرکردنەوەم بووە. ئەو جلانەی کە بووك لەبەریان دەکات بە کفن دێنە بەرچاوم، ئاهەنگی بووك گواستنەوەش لەبەرچاوی من گۆڕی پرسەیە. لە منداڵییەوە ئەم هەستەم لەگەڵدایە. من ئێستا وا تێدەگەم کە ڕاست ئەمەیە.

ی.ك: هەتا بە منداڵیش دژی ئەمە بوون.

س.پ: بێگومان دژی بووم، چونکە پێم وابوو دەبێ شایی بەم شێوەیە نەبێ. من بۆم قووت نەدەچوو و وام هەست دەکرد کە شایی کردن کۆتایی پێهاتنە. ئەمە

دوا شت بوو که پێی گەیشتم. پیاو و ژنی کورد کاتێك هاوجووت دەبن دەگەنە خاڵی بەرانەوە. پێم وایە ئەمە ڕاستە. لەوانەیە لە پاشەڕۆژدا شیکردنەوەی ئەم بارودۆخە پەرە پێبدەم. ئەو ژنهێنانەی کە بەم مەرجانە دەکرێت لە کەسایەتی و بنیاتی فیزیایی و گیان و جوانیدا کۆتایی بە هەموو شتێك دەهێنێ. ئەو پێش تەمەنی (٣٠) ساڵی دەبێتە دایکی (١٠) منداڵ، بەبێ ئەوەی بڕوانێتە ڕەفتاری پیاوەکە. ئەمە گەورەترین سووکایەتی و هیچ و پووچی یەکی نەبڕاوەیە. ئایا ئەم ژنە شتێکی تێدا دەمێنێ ناوی ژن بێ؟ دیارە هیچی تێدا نامێنێ. پیاوی کورد بۆ ئوتارکردنی ژن و منداڵەکانی کاری مەحاڵ دەکات. تەنانەت بۆ ئەم مەبەستە نۆکەرایەتیش دەکات. ئەمەش بەلای پیاوی کوردەوە کۆتایی دەگەیەنێ.

ی.ك: لە کتێبەکەشتاندا ئەم ژنهێنانە بە هەڵاتن هەڵدەسەنگێنن.

س.پ: ڕژێمی(١٢)ی ئەیلوول هانی ئەم جۆرە ژنهێنانەیدا. بگەڕێنەوە و لەو ژنهێنانانە وردبینەوە کە ڕژێمی(١٢)ی ئەیلوول هانیداون. بۆتان دەردەکەوێ کە پیاوەکە تەمەنی ١٥ ساڵان و کچەکەش ١٢ ساڵانە و تووشی ئەمەیان کردوون. ئەمە بووەتە یاسایەکی ژنهێنانەکانی(١٢)ی ئەیلوول. ئەم هەموو ژنهێنانانە بۆ بەرەنگاری (PKK) کراون، ئیدی چۆن چاوپۆشی لەم مەترسی یە دەکەم؟

مخابن لەم بۆنانەدا دەڵێن «شاییەکی ئاوا بوو و پیرۆزە و ئاواتی بەختیاری دەخوازین». کوا بەختیاری و کوا ئارامی؟ خۆت هاویشتووەتە نێو گۆڕ و ئاگات لەوە نی یە. پێویستە ئەمە بڵێین.

ی.ك: لە ئەوروپا هەموو شاییەکی لەم جۆرە پەنجا هەزار مارکی تێدەچوو. بەڵام ئەوەتی (PKK) لە ئەوروپا سەرکەوتووە. لەم ئاهەنگانە خواردنەوەیان تێدا نابێ و پارەیان تێناچێ و بە خۆشی و شادی یەکی زۆرترەوە دەکرێن.

س.پ: بەڵێ، بۆ ئامانجی سیاسی بەکاردێن و دەگۆڕێت بۆ خزمەتکردنی ئەو ئامانجە.

## ئەوانەی کە متمانەیان بە شارەزایی یان هەیە و خۆیانیان وەك مامۆستا دێتە بەرچاو با بفەرموون و بە شێوەیەکی شایستەی هونەرمەندان مامەڵە بکەن.

ی.ك: خەڵك دڵخۆشن بەبێ ئەوەی هیچ خواردنەوەیەك بخۆنەوە.

س.پ: ئەمە پەرەسەندنێکی ئاساییە. هەموو شوێنێك گۆڕانکاری تێدایە. ئاهەنگەکانی ژنهێنان دەبنە خۆپیشاندان بۆ قازانجی حیزب.

ی.ك: دەوڵەتیش دەزانێ ئاوایە. بۆیە خەڵك دەستگیر دەکات و دەیانخاتە زیندانەوە.

س.پ: بەڵێ گەلێك شایی ئەوە ئەنجامەکەی بووە.

ی.ك: ئایا ئێستاكە دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ شیعر؟
س.پ: هەموو كارێكم لە دیاریكردنی بابەتی هونەر و ئەدەب و ئەركیشیان لە تێكۆشانی شۆڕشگێڕانەدا و لە دیاریكردنی نیزیكبوونەوەی ڕاست و بەردەست خستنی پشتیوانی پێویستدا قەتیسن. وەك سەرەتا گوتم: پێویستە لەسەر ئەوانەی كە لەم بوارەدا ئیش دەكەن بە شێوەیەكی ڕاست بیزانن و دەروازەی ڕاست بۆ بابەتەكە دابنێن، چونكە زۆر گرنگە. من بە سادەیی دەستی بۆ نابەم و ناوی كەس وەها دەستی بۆ ببات. نە من و نە شۆڕش پێویستیمان بەو ئەدیبە دەستەپاچانە نییە، بەڵكو ئەوانە زیانمان پێدەگەیەنن. ئەدەب كارێكی زۆر شێلگیرە، پێویستە بایەخی پێبدرێت. حەزدەكەم پێتان بڵێم: ڕەنگە ئەم گۆڕەپانەمان ببێتە گەورەترین پاڵپشت بۆ هونەرمەند و ئەدیبی كورد و تورك. من پێم وایە ئەم گۆڕەپانە دەتوانێ ڕۆڵی گرنگ لە هەموو چالاكیە هونەریەكانی وەك ڕۆمان و شیعر و مۆسیقا و سینەما و وێنەكێشی... تێدا ببینێ.
ی.ك: لەم لایەنەوە هیچ گومانێكم نییە. بەڵام وێڕای ئەوە بێڵە بپرسم: كاتێك دەڵێی «ئەدەب و شیعری كوردی» مەبەستت ئەوەیە ئەمە لە لایەن كوردەوە و بە زمانی كوردی بنووسرێت. ئایا مەبەستتان ئەمەیە؟
س.پ: بێگومان. دەكرێت بە توركیش بێ و ئەوسا بۆ گشت زمانێك وەربگێڕدرێت. ئێمە دەزانین زۆر لە كارە ئەنجامدراوەكان بۆ هەموو زمانانی جیهان وەرگێڕدراون. بەڵام ئەمە ڕاستە پەرەسەندنی زمانی كوردی پشت بە ئەدەبێكی كوردی بەهێز دەبەستێ و نووسینی ڕۆمانی كوردیش وەك هاوبەشییەكی گەورە وا دەبێ لە پەرەپێدانی زمانی كوردیدا و پەرەسەندنی زمانیش گرێدراوی پەرەسەندنی ئەدەبە. ئێستاكە ئەم مەسەلەیەش بە دەربڕینی شۆڕشگێڕانەی ئەدەبەوە گرێدراوە. بۆیە ئەوانەی كە دەیانەوێ زمانی كوردی گەشە بكات، پێویستە لەسەریان دەست بە ئەدەبی شۆڕشگێڕی بكەن كە چاوەڕوانی خاوەنەكانی دەكات و ئێمەش سەرچاوە و شێواز و بناغە و جۆرەكانیمان داناوە.
ی.ك: واتە ئێوە دەڵێن كەرەستە خاوەكان حازر بەدەستن.
س.پ: بەڵێ حازر بەدەستن با كەسانی متمانە كردوو بە شارەزاییان، بە شێوەیەكی پڕبەپێستی هونەرمەند بن و ڕاستی بفەرموون. هەندێك ناو هەن باست كردن، پێم وایە داوای هەندێك هەڵسەنگاندن لە بارەیانەوە دەكەی.
ی.ك: بێگومان.
س.پ: دەمەوێ دووبارە بڵێم: من بە دوور و درێژی لام لە بابەتی (PKK) و پێوەندی بە ئەدەبەوە نەكردووەتەوە و زۆر لێكم نەداوەتەوە. هەروەها هەموو وردەكارییەكم لەسەر پێوەندی شۆڕشی ڕزگاری كوردستان و باروودۆخی لەگەڵ ئەدەبدا باس نەكردووە. بەڵام هەوڵم داوە بە گێڕانەوەی چەند نموونەیەك چۆنایەتی نیزیكبوونەوە لەم بابەتە بنوێنم. ئەوەندەی پێوەندی بەو هونەرمەندانەوە هەیە كە لە گۆڕەپانەكەدان كەمێك باسی (یەشار كەمال)مان كرد. ئەگەر ئەم نووسەرە وێستی، بەختی خۆی تاقی بكاتەوە و لەسەر پێوەندی خۆی بە ئەدەبی

کوردییەوە بنووسێ و هەوڵەکانی هەڵبڕێژێتە نێو ڕۆمان، یان هەتا ئەگەر ڕۆمانەکەشی بە شێوەیەکی سزاوی نووسی، بە پێی قەناعەتی من ئەو کاتە ناوبانگێکی جیهانی دەبوو و بەها و دەوری زیاد دەکرد. بەڵام مخابن ئەمەی نەکردووە.

ی.ك: بەڵام لەسەر (چوقوور ئۆڤە)ی نووسیوە.

س.پ: بەڵام کوردی بە شێوەیەکی زۆر خراپ پیشانداوە و ئەو کوردەش کە پیشانیداوە بە باشی رادەی دوورکەوتنەوەی لە ڕاستی نیشتمانێتی خۆی و پێوەندی بە کوڵۆنیالیزم و کۆنەپەرستی و جۆری ئەو پەیوەندیانە ڕوون نەکردووەتەوە. مەبەستم ئەوەیە ئەو کوردەی کە لەوێ پیشانیداوە داماڵراوە. کورد لە هێندێك ڕۆمانیدا هەن. بەڵام بێدەسەڵاتن و فریان بەسەر ناکۆکیەکانی کوردەوە نییە. ئەمەش گوناحێکی گەورەیە. ئەگەر دیتان یا مشتومڕتان لەگەڵدا کرد، لە زمانی منەوە پێی بڵێن: دەبوو ئەوە نەکات و ئەو گوناحەی لە دەست نەفەوتێ. من هەست بە ئازار دەکەم چونکە ئەو گوناحەی کردووە.

ی.ك: وەختێك ئەم قسەیەت بڵاودەکەینەوە، داوا لە یەشار کەمال دەکەم خۆی وەڵامەکەی بنووسێ.

س.پ: بڕوانن مرۆڤی کورد خاوەنی گەلێك ناکۆکییە و ئازاری گەورە گەورەی هەن بە هۆی هەوڵی لەهێشتن و ڕیشەکێش کردنی لە مێژوودا و قەدەغەکردنی زمانیەوە. وای بەسەردا سەپێندراوە نە هەست بکات و نە ئازار بچێژێ. ئەگەر ئەم هەموو لایەنانە ڕوون نەکاتەوە، چۆن بە ناوی کوردەوە قسە دەکات؟ چۆن دەڵێت من (یەشار کەمال)ی کوردم و ڕەخنەم هەیە؟ من هیچ بەربەستێك لە بەردەم ڕۆمان نووسیندا بە زمانی تورکی نابینم و ئاڵێم خزمەتکارە یا کرێگرتەیە. بەڵام ئەمە ناتەواوییەکی گەورەیە. لەمە شەرەف نییە بۆی و هەڵوێستی بەهێز ناکات و ئەمەم پێ بەسە. ناڵێم پێویستە بە کوردی بنووسێ، بەڵام دەتوانێ بەهرەکانی بۆ دەرخستنی پێوەندی بە کوردەوە بەکاربێنێ. ئەمە ڕەخنەی منە.

هەوڵمدا کەمێك باسی (یەڵماز) بکەم. یەڵماز لە دوورایی کوردییەوە نزیکتر بوو، کەچی نەیتوانی بەهۆی کەم ڕۆشنبیری و کۆنەپەرستی (یشیل جام*)ەوە ڕەخنە لە خۆی بگری. بەڵام لەم پێناوەدا خەباتی کرد و سەرقاڵی ئەدەبی شۆڕشگێری بوو.

ی.ك: بەڵام (یەڵماز)یش بەهۆی ناسنامەی سیاسی خۆیەوە لە ناسنامەی کوردی نزیك بووەوە، کەچی نەیتوانی بە سینەماسازی خۆیەوە نزیك بێتەوە.

س.پ: بەڵێ نزیك نەبووەوە. لەم ماوەیەی دواییدا بە کوردەوە حەزی لەوە کرد، بەڵام لەوە بەس نەبوو و بە ناتەواوی مایەوە. بە کورتی کۆتاییەکەی جەرگبڕ بوو.

ی.ك: بەڵام لەو پێشنیارەتان کە (یەڵماز) خۆی بێتە فلیم، واتە ژیانی بکرێت

---

(*) یشیل جام جێگای کاری هونەری ئەکتەران و هونەرمەندانی تورکیایە.

بە فلیم، یەکجارە ئەم پێشنیارە دەبینم.

س.پ: بەڵێ لە پاشەڕۆژدا ئەگەر دەرفەتی ئەوەم ببێ بە شێوەیەکی هەمەلایەنە بیر لە شیکردنەوەی (یەڵماز) دەکەمەوە، بە تایبەتی لە ڕووی خێزان و ئافرەت و سیاسەت و باروودۆخی سینەماسازی ئەوەوە. ئەوانە ئاکۆکییەکی کوردانە پێکدەهێنن. دەتوانم لەسەر ئەم بنچینەیە لێکی بدەمەوە. بەڵام کابرایەکی خاوەن بەرخوودان بوو، بە خێرایی خۆی بە دەستەوە نەدەدا.

ی.ك: مرۆڤێکی جەربەزە بوو.

س.پ: بەڵێ جەربەزە بوو. بە کورتی بە پلەیەك پێش هاوڕێ هونەرمەندەکانی دیکەی کەوتبوو.

ی.ك: لایەنێکی پاڵەوانێتی تێدابوو.

س.پ: پاڵەوان و جەربەزە و خۆگربوو. بەڵام نەیتوانی بگات بە ئەنجام. باسی شاعیریەتی (جەمال سورەیا)م کرد و لە باروودۆخی خۆی بێداربووەوە. تەمەنی بەس نەبوو و کۆچی دوایی کرد.

ی.ك: بەڵام ئەم هەموو بێداربوونەوانە پاش ساڵی ١٩٨٤ و هاوزەمانی سەرکەوتنی کورد بوون. ئەگەر ڕوانیمانە سەرلەبەری دنیا، دەبینین باشترین ڕۆمان لەگەڵ سەرکەوتنی کۆمەڵگاکاندا دەنووسرێن.

س.پ: بەڵێ. بە کورتی دەمەوێ بێمە سەر دیاردەی (ئیبراهیم تاتلیس). لەو ساڵەدا کە (PKK)مان تێدا ئاشکرا کرد، خەڵاتی لەسەر دەنگی وەرگرت. بە تێپەڕینی ڕۆژگاریش بەناوبانگیان کرد. دەزانین ئۆزال بۆ گەلێك ئاهەنگی شەوانە بانگی کردووە و خودی خۆی ئامادەی زۆر لە ئاهەنگەکانی بووە و، هەر خۆی بانگهێشتی کرد بۆ (جان کایا)و لەگەڵیدا چوو بۆ کۆمارە تورك زمانەکان و ناردی بۆ ئەوروپا تا لەوێ چەندین شەونشینی هاوچەشن و هاوزەمانی شەونشینیەکانمان سازبکات. بە ڕای من ئیبراهیم کەسێکە ڕژێمی(١٢)ی ئەیلوول ویستی لە ڕەمزیەکێکی دیکە پتر بیخاتەکار. پێویستە باروودۆخەکەی بە پێی پێوەندی بە ئیدارەی شەڕی تایبەتەوە هەڵسەنگێندرێت. گەل و بەتایبەتی لاوان بەهۆی ئەو مۆسیقای (ئارابێسك)ەوە پەنا دەکات کە بێ ئەژمار دەیخاتە بازاڕەوە. بەوە، ئەو لە هەموو کەسێکی دی زیاتر بۆ ئەم مەبەستە بەکاردەهێنرێت. سەرباری ئەو گوشارە سیاسیانەش کە دووچاریان دەبوو نەزانیان چۆن بە باشی بەکاری بێنن چونکە خاڵەکانی بێهێزی ئەویان دیاری کردبوو. لەویش پارەمەتیدان و قەوقەڵۆکی لە خۆی ورووژاند. ئێمە ناوبەناو ئاگادارمان کردەوە و بانگمان کرد تا لە مەسەلەی کورد و مۆسیقای کوردی نزیك ببێتەوە. ئەوە بوو کەوتە بایەخ پێدانیان. بەڵام پێم وایە بەهۆی ئەو گوشارە سیاسیانەی کە لەسەرین زۆر ناکرێتەوە. یەکێکە لەوانەی کە گیروگرفتی گەورەی هەن، بە تایبەتی لاکردنەوەی لە مۆسیقای کوردی و ڕەوشەکەی بە کەم شەرمێی دەناسرێتەوە. لەویش کەسایەتییەکی کوردی دەنوێنێ، بەڵام ماوەیەکی دوور لە پشت یەڵماز دەمێنێتەوە.

ی.ك: دیاره هەر چونێك رەخنە بگرنە یەڵماز، ئەو ناوی خۆی بە خۆپەرستیەتی و پاشاو پاڵەوانە.
س.پ: بۆرژوازی ویستی ئیبراهیم تاتلیس بە شێوەیەکی ساختە بەکاربێنن و بەسەر (یەڵماز)یدا بسەپێنن. واتە بەسێبەری ئەو ناوبانگی یەڵماز دابپۆشن. رژێم بە ئاشکرایی پشتگیری ئەوی کرد و ئەویش بوو بە ئامراز بۆ ئەمە. ئێمە بە توندی بەئاگامان هێنایەوە. بەڵام لەگەڵیدا بە ئەنجامێك نەگەیشتین. (هولیا ئەفشار)یش هەیە و ئەویش کوردە.
ی.ك: ئەوەی کە لەم دواییەدا ناوبانگی دەرکرد!
س.پ: بەڵێ. ئەوان هەوڵدەدەن بە کاری بێئابڕوویی و دیمەنی ڕووت وای لێبکەن بەناوبانگ بێ. خۆشی گوتی من کوردم.
ی.ك: میللەتی کورد بووە بە تەریشێك (تەرزێك). ئەو پەیوەندی بە میللەتی کوردەوە نییە.
س.پ: بەڵێ. دەیانەوێ بەکاری بێنن، چونکە شێوەی سەرنجڕاکێشە. من پێم وایە (بشیل جام)یش لە لایەن لیدارەی شەڕی تایبەتەوە بەکار دەهێنرێت.

## باشترین ڕێبەرانی تورکی لەنێو کورددا دەردەکەون و ئەمەش پێوەندیەکی توند و بەتینی بە کوشتنی نەتەوایەتی کوردەوە هەیە.

ی.ك: هەمیشە ئاوایە.
س.پ: پێویستە شیلگیرانە هەڵوێستە لەلای باروودۆخ و دەوری (بشیل جام) بکەین، چونکە بۆ بەنج کردنی کۆمەڵگا و بەدبارخستنی کەسایەتی ساختە لە بری ئەو کەسایەتیە پایەبەرزانە بەکاردەهێنرێت کە لەوانەیە بەسەر کۆمەڵگادا باڵادەست بن. با لە ڕوانگەی ڕەخنەگرتنەوە لەم مەسەلەیە، تێبی بڕوانین و وای بۆ بچین لاپەڕەیەکی هونەر لە ڕۆژنامەی «نوزگوور گوندەم»دا هەیە و هەموو ڕۆژێك دەنووسێ: «ئەو فلیمە هەیە و فلیمی فلانەکەس هەیە و ...هتد» و پڕوپاگەندەی بۆ دەکات. بەڵام ئەدەبی شۆڕشگێڕی وای لێرادەبینرێت ئاگای لەم مەسەلانە بێ و، بە گشتی دەوری سینەمای ئەمەریکایی و کارتێکردنی لە گەلان بزانێ، بە تایبەتی ئەم ئەدەبە دەبێ بزانێ دەوری (بشیل جام) چییە. کورتەیەکی مێژوویی لەسەر لەم بابەتە هەیە. ئەم دوو بنکەیە دەیانەوێ تەرزێکی دەست نیشانکراو لە کەسایەتی و پێوەندی بخولقێنن. بەم شێوەیە گەلی ئەنادۆلیان تواندەوە و فەوتیاندا. هەمان شتیان دەرهەق بە کچ و پیاوی کورد و کچ و پیاوی تورك و تێکرایان کرد. واتە ژیانی کۆمەلایەتییان زێبروزوور کرد و هەموو فلیمێکیان نەخشێکی تێکدەرانەی وا دەبینێ وێنەی نییە. یەڵماز تارادەیەك لەم بنکەیەی تێپەڕاند و پێیدەکرا ڕەخنەیەکی توند ئاراستەی ئەم کردەوانە بکات، وا کە ئەو

ڕەخنانە لە پێناوی سینەما و هونەری ڕاستدا بن. ئەو خۆی هاوبەشی بەدیهێنانیانی دەکرد. ئەم کارە هەر لە سینەمادا قەتیس نییە، بەڵکو ڕۆمان و شیعریش دەگرێتەوە. دەتوانن لە لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکەتاندا ڕەخنەی لێبگرن. بەم شێوەیە هونەری تازە لە باتی هی کۆن سەرهەڵدەدات. کەس ناتوانێ لافی ئەوە لێبدات کە پێویستیمان بە هونەر و ئەدەبی شۆڕشگێڕی جێگرەوە نییە. لەمخێر پێویستییەکی لە ڕادەبەدەرمان بەم جۆرە کارە هەیە. لاپەڕەی ڕۆژنامەکان بۆ کاروباری خراپ دەخرێنە کار. تۆ خۆت گەلێك هەڵسەنگاندنت هەیە؟ دەبێ پیشان بدرێن. مەبەستم ئەوەیە بابەتەکە هێشتا ناتەواوە. زۆر نووسەری سینەما و ئەدەب هەن نەخشی خۆیان لە مەسەلەی ئەدەبی شۆڕشگێڕیدا نابینن. بە کورتی ئەو خەڵکانە تین و توانی خۆیان بەکارناهێنن.

سەبارەت بەوەی کە کورد بەرایی لقەکانی ئەدەبی گرتووە، نموونەی ئەوە «زیا گووك ئالپ»ە کە لەم باسەدا و لەناو هێنانیدا مەبەستمان هەیە. تەریتی تورك لە گشت دەورانێکدا ئەوەیە: زۆربەی ناوداران بە سەرکردایەتی سەربازیشەوە سەرجەمیان بنەچە شێوێنراون. مەبەستم ئەوەیە بە بەردێك لە دوو چۆلەکە دەدەن، ئەوانە لقێك لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵدەکێشن و لەسەر لقێکی دیکەی موتوربە دەکەن. ئەمە وزەیەکی زۆری پێدەوێ، چونکە ئەم هەڵکێشراوە دەیەوێ بژی. جا لەبەر ئەوەی کە لە خێڵ و کۆمەڵگاکەی هەڵکەندراوە، ناتوانێ پشتیان پێببەستێ و سوراغی شتێکی تازە دەکات بیکاتە پاڵپشت. بەرەو سوپای ئینکیشاری دەبێرن تا پێی پشت ئەستوور بێ و هێزی لێوەربگرێ. هەڵکەندراو پێبەپێ هەموو کۆشش و وزەیەکی خۆی لە شەڕدا خەرج دەکات. ئەو لە ڕاستی کوردی هەڵکەندراوە و لە بۆشاییدایە. لە تورکیا بەدەر شتێك نییە پشتی پێببەستێ، بۆیە ئەوە دەکات. ئەوە تورکیایە کە کۆمەکی دەکات و، ئەویش هەموو هەوڵێکی بۆ پەرەپێدانی ڕژێمی تورکیا دەخاتەگەڕ.

ی.ك: لەبەر ئەوەش کە تورکی زمانی دووەمیەتی، هەوڵدەدات زۆر بە باشی فێری ببێ.

س.پ: نەخێر، ئەو لە بنەڕەتدا زمانی کوردی و میللەتی کوردی بیر چووەتەوە. ئەمە بۆشاییەکی گەورەی لەلا پەیدا دەکات. بەوپێیە ڕێبەرانی تورکایەتی و گەورەترین ئەدیب و باشترین سەرباز و شەڕکەر لە نێو کورددا دەردەچن. هەموو ئەمانە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە کوشتنی میللەتی کوردەوە هەیە. ئەگەر باسکێکت بڕی و ئەم باسکە ویستی بژی، پێویستە بە جێی باسکێکی دیکەوە بلکێنی، بۆ ئەوەی ئەم باسکە زیندوو بمێنێتەوە و چالاکانە ... بکات. شەڕی زیان سەرکردایەتییە.

ی.ك: ئاپۆی بەڕێز، ئایا بەم قسەیەتان بێ هێندێك ڕکوشوێن و بنچینە بە تایبەتی بۆ توێژەرەوە کوردە لاو و ڕۆشنبیرەکان دادەنێن؟ مەبەستم ئەوەیە ئەوانەی کە خزمەتی زمان و ڕۆشنبیری تورکییان کردووە، دەمێك بۆیان دەکەوێتە ڕوو

کوردن، کت و پڕ هەست بە پاپەخی خۆیان دەکەن. بۆ نموونە (عەبدوللا جەودەت) یەکێک بوو لەوانە و کۆمەڵەی (جۆن تورك)ی دامەزراند. بەڵام من وای دەبینم کە ئەو چاروبار کوردە و چاروباریش تورك و جاری واش هەبووە بووە بە ئینگلیز. کاتێك لە چوارچێوەی ئەو شیکردنەوەیەدا کە کردوومە دەڕوانمە ئەوانە، ئەوا ئەم بەشە ـ واتە ئەوانەی وا لەنێو کۆمەڵگای تورکیدان و لەخاك و ڕەگ و ڕیشەی کوردییان هەڵکەندراون ـ ئەم ڕێ و شوێنەیان بەسەردا جێبەجێ‌دەبێ: کوتایی بۆ (کمال) نییە. ئایا ئەمە ڕاستە؟

س.پ: میللەتی تورك یەکجار تێکەڵە. بە دووی مێژووی تورکە سەرپەرگرەکاندا بگەڕێن، بۆتان دەردەکەوێ ئەوانە لە گەلانی دیکەن و تێکڕایان لە چەند مەیدانێکی دیکەوە هاتوون. پێمەوەکرێت گەلێك نموونە لەسەر ئەوە بدەم. زۆربەی تورکانی بۆ میللەتی تورك دەمارگیر لە (بالکان)ەوە هاتوون، لە کاتێکدا ڕیشەکێش کراون و بوونەتە کۆچەر و لە کۆمەڵگای ڕەچەڵەکی خۆیان هاتوونە دەرێ هەر لە مستەفا کەمالەوە تا بە کەنعان ئێڤرین دەگات.

ی.ك: لە لایەکی دیکەوە ئەم مەسەلەیە لە ڕووی تیورییەوە ڕاستە، وەك (ئاکچوورا یووسف) و (ئاغایێف ئەحمەد).

س.پ: حالیم، تۆ مەبەستت ئەوەیە لە سیاسەتیشدا ئاوان. کێشەکە ئەوەیە ئەوانە بە کەڵکی گەلی ئەناتۆڵ نایەن. ئەمە خاڵێکی گرنگە. ئەوانە نوێنەرایەتی خاڵە توندڕەوەکان دەکەن، چونکە هەوڵی پێکەوە لکاندن دەدەن و لەبەرئەمەش پەنا دەبەنە بەر سەرپەرگری. سەرپەرگری هەمیشە زیان بە ڕیشەی گەلان دەگەیەنێ. ئەمە ڕاستە و لای کورد و تورکیش هەیە. تورکی ڕیشەکێشکراو لە کورد متووربە کراوە و پێچەوانەش ڕاستە. ئەو هەست بە دڵپەستەیی دەکات و دەبێ بە بەشێك بەسەر کەسانی دیکەوە. ئەمە هۆی نەخۆشی و قەیرانەکەیە. پێویستە ڕاشکاوانە بە هۆی ڕەخنەی شۆڕشگێڕانەوە ئەوانە بەدیار بخرێن. من سەرەداوەکە دەردەخەم. بێ‌گومان ئەگەر لەسەر بنچینەیەکی مەبدەئی لەوانە نزیك ببوینەوە، گەلێك ڕاستی زۆر گرنگ دەکەونە ڕوو و کورد دەبێتە کوردێکی ڕاستەقینە و تورکیش دەبێتە تورکێکی ڕاستەقینە.

ی.ك: لەم گفتوگۆیەماندا هەردوو پرسیارم ماوە. ئاهۆی ئازیزم ئەم گفتوگۆیە کە کردمان زۆر بەسوود و باش بوو و دەبێتە مایەی بایەخی کەسانێکی زۆر و هاوبەشی پەرەسەندن دەکات. پرسیاری یەکەم ئەمەیە: کەی نموونەی مرۆڤی کوردی تازە دەبینین؟ پرسیاری دووەمیش: ئایا باسی گەڕانەوە بۆ نیشتمانم بۆ دەکەن، جا لە ئەورووپاوە بێ یان تورکیا. ئایا ئەوەم بۆ ڕوون دەکەنەوە؟

## چیرۆکی من ئەو چیرۆکەیە کە «کوردی تازە دەبێ چۆن بێ؟»

س.پ: ئێستا هەموو شتێك لە تورکیا بێ‌ئەندازە تێکەڵ بوون. هەر بە تەنێ

کەسایەتی کورد نا، پێویستە تەرزی تورکیش شیبکرێتەوە. تورکیش تووشی شێواندن بووە و ئادگارەکانی بزر بوون. سەرنجتان بۆ ئەوە ڕادەکێشم کە داخورانێکی زۆر لە ئارادایە و لەمەش ڕاستییە. با بێینە سەر پێکهاتنی کورد. چیرۆکی من لەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤی کوردی تازە دەبێ چۆن بێ؟ ئەگەر بوو بە ڕۆمان، دەبێ کەسایەتی من پێشان بدات کە پێویستە کەسایەتی کوردی تازە وەهابێ. خۆ دەیان هەزار مرۆڤ لە شەڕێکی قورسدا خوێنیان دەڕژێت و هێشتا دەپرسن: ئایا تەرزی مرۆڤی کوردی تازە دەرکەوتووە؟ هەموو ئەمانە لە چوارچێوەی پێناسینی سەرتاسەری مرۆڤایەتیدان «مرۆڤ کێیە؟»، هەر لە وەڵامی ئەم پرسیارەوە تا دروست بوونی مرۆڤایەتی کە بە قۆناغەکانی خێڵەکایەتی و گەلایەتی و پەرەسەندنی نەتەوەییدا تێپەڕیوە و هەمووشیان هەڵوێستن. هەروەها تا پێوەندی ئەم هەڵوێستانەش بە پێکهاتنی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتییەوە ـ مەبەستم کۆمەڵگاکانی کۆیلایەتی و هۆزایەتی و سەرمایەداری و سۆشیالیستییە ـ کە تا چ ڕادەیەك هێز دەبەخشن و لە هێندێکیاندا وەریدەگرن. مەبەستم ئەمەیە: خێڵەکان لە قۆناغی کۆیلایەتیدا و ئەمجا نەتەوایەتی لە قۆناغی دەرەبەگایەتیدا و نیشتمانپەروەری لە قۆناغی سەرمایەداریدا. هەموو ئەمانە ناکۆکی و پێوەندییەکی سەرسوڕهێنیان هەبوو تا بەم ڕۆژمان گەیشتن. مێژووی دنیاش لەسەر ئەم بنچینەیە دەنووسرێتەوە و شەڕی سەربازی و سیاسیش ئاکامی ئەم ناکۆکیانەن. سیاسەت و شەڕی چەکداری کە تەواوکەریەتی، ئامرازێکن بۆ بەرەو پێش بردنی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی یا بۆ دواخستنی پەرەسەندن و بگرە بۆ دوارە گێڕانەوەشی بەکاردەهێنرێن. ئەدەب و هونەریش دەوری خۆیان لەم شەڕەدا تارە دەکەنەوە. ئاین و ئایدیۆلۆژیەکان ئەمە دەکەن و فەلسەفەش ئەم ململانێیە دەخاتە قالبی مرۆڤایەتییەوە و زانستیش هەموو ئەمانە بە باشی دەردەبڕێ.

ئێستا با بێینەوە سەر کورد و پرسیارەکە بەم شێوەیە دووپات دەکەینەوە: جێ و ڕێی کورد لە نێو ئەم پێکهاتە و چەمکانەدا چییە؟ بۆ دیاریکردنی ئەوە بەم پرسیارەمان دەست پێدەکەین: ئایا کورد هەیە یان نا؟ ئەو تێکۆشانەی کە ساڵانێکی دوورودرێژە دەیکەم بۆ ئەوەیە بڵێم: «کورد هەیە». ئەمە وەك ئەو قەیەمان وایە کە «خۆر هەیە»، یا ئەم پرسیارە «ئایا دنیا دەوراندەور دەکات یان نا؟» ساڵانی درێژی بەندیخانە و مرۆڤ کوشتن و هەموو ئەمانە توانیویانە تا ڕادەیەك ئەوە بسەلمێنن کە «کورد هەن». پرسیارەکانی دیکەش وەك: «ئایا کورد گەلە یان نا؟». قۆناغێکی گرنگیان پێچووە. تەنانەت حاڵی حازر هێندێك کەس ئەوەیان پێقبووڵە کە کورد گەلە و هێندێکی دیکەش نا. وریای زمانی ڕەسمی بێ دەڵێت: «کۆمەڵگا ئەتنییەکان گەل نین». «کەمەنەتەوەی گەلان»یش زاراوەیەکی دیکەیە. گریمان ئەوان ئەو ڕاستییەیان پەسند کرد کە کورد گەلە، ئەوسا نۆرەی ئەم پرسیارە دێت: «ئایا دەتوانێ خۆی بڕیاری چارەنووسی خۆی بدات یان نا؟». زۆریان پێیت دەڵێن: «لەبەر ئەوەی زۆر پارچە پارچەیە ناتوانێ. بەم پێیە

ئۆتۆنۆمی بەسە. بگرە پێویست بەوەش ناکات و سەربەخۆیی رۆشنبیری بەسە».
ئاوا مشتومڕ بەردەوام دەبێ. لە کۆی ئەم پرسیارانەش: ئایا کورد پێویستی بە حیزبە یان نا؟ بە رەسمیش حیزب لە کورد قەدەغەیە. لە سەرچاوە سۆشیالیستییەکانیشدا هاتووە کە: «ئەگەر رێکخستنێکی سەربەخۆ دابمەزرێت، لەگەڵ پرنسیپەکانی مارکسیزم - لینینیزمدا ناکۆك دەبێ». تا ئێستاش کەسانێك هەن داکۆکی لەم هەڵسەنگاندنە دەکەن. خەڵکانی سۆشیالیست و دەوڵەت پێکەوە داکۆکی لەم پرنسیپە دەکەن. هەڵوێستی حیزبی کرێکارانی تورکیا یان حیزبی سۆشیالیستی جاران هێشتا ئەم هەڵوێستەیە. واتە تێڕوانینیان دەڵێت: حیزب دامەزراندن سەرپێچی کردنە لە مارکسیزم - لینینیزم و دەوڵەتیش دەڵێت قەدەغەیە.
ئیتر جیاوازی نێوان ئەو جووتە هەڵوێستە چییە؟ ئەمە بابەتی مشتومڕێکی دیکەیە. ئێمە حیزبمان دامەزراند، بەڵام ئەمجارە «ئایا ئەم حیزبە هیچ خەباتێکی دەبێ یان نا؟ ئەگەر دەستی بە خەباتیش کرد و چەکی هەڵگرت، چی ڕوو دەدات؟». مشتومڕەکە بە فراوانی درێژە دەکێشێ.
ئەوەی وا تا ئێستا کردوومانە وەڵامێك بووە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە «کورد هەیەو گەلێکە دەتوانێ حیزبێك دابمەزرێنێ و دەتوانێ شەڕێکی سیاسی و سەربازی بکات». شەڕمان لە پێناوی ئەوەدا کرد تا بەم قۆناغە گەیشتین. کورد چی لێبەسەرهات؟ کەمێك دەرکەوت و هێندێك خەسڵەتی کەوتنە ڕوو. واتە تەختێك لە ڕەمزەکانی حاڵی بوون. ئەوەی بیری لێدەکەمەوە ئەوەیە کە داخۆ: ئێمە کوردمان هێنایە بوون یا بەدیارمان خست یان خولقاندمان، کامیان ڕاستە؟
مشتومڕێکی دیکە هەیە دەبێ هەڵوێستەی لەلا بکەین، ئەویش ئەوەیە دەستەی ئەرکان دەڵێت: لە بنەڕەتدا کێشەیەك لەگۆڕێدا نەبووە، بەڵکو خولقێندراوە. لەمە تێڕوانینە، نابێ هەڵوێستی دەستەی ئەرکان فەرامۆش بکەین. «کێشەیەك لەگۆڕێدا نەبووە، خولقێندراوە». مەبەستی لەمە ئەوەیە «کورد نەبووە، بەڵکو خولقێندراوە»، وانییە؟ سەرچاوە ڕەسمییەکان تا ئێستا ئەوە دەجوونەوە. ئێمە ئەم هەڵوێستە پشت گوێ ناخەین. بەڵام میللیگەری سەرەتایی دەڵێت: «لە کۆندا کورد هەبوون و مەزن بوون». بە پێی هەڵوێستی دەستەی ئەرکانیش: «کورد نەبوون، بەڵکو خولقێندراون». دەستەی ئەرکان بەم هەڵوێستەی داکۆکی لە هەڵوێستی کەمالی دەکات کە دەڵێت: کورد هەبوون، بەڵام لە دێرسیم و ئاگری بڕانەوە و گۆڕبەگۆڕمان کردن و بە چیمەنتۆ شاردمانەوە. کەچی میللیگەری سەرەتایی دەڵێت: بە درێژایی مێژوو لە سۆمەرییەکانەوە دەستیان پێکردووە و سەدان دەوڵەتیان دامەزراندووە و ئێمەش نوێنەرایەتی ئەو مەزنانە دەکەین. خێڵی ئێمە لە دەوڵەت گرنگترە. کوردێك هەیە بەم تەرزەیە...بارزانی... چوو بۆ ئەنقەرە و پشتێنی پانی لێبەست و شەرواڵی کوردی نەخشداری لە پێکرد و لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەرکەوت و گوتی: ئەوەتا من «ئەو کوردە مەزنەم». ئەمەش ناساندنی کوردە. ئێستا هێندێك کەس دەڵێن: کورد نییە. هێندێکی دیکە دەڵێن: هەیە.

گەورەترین وێنەکێشی کاریکاتێر ناتوانێ وێنەی شێوەیەکی لەم کوردە حازرەیە باشتر بکێشێ.

بەڵام ئێستا کوردێکی تازە دەردەکەوێ ئەویش (ئاپۆ)ی کوردە دێتە بەری مەیدان. ئەم ئاپۆ کوردە کێیە؟ دەستەی ئەرکان دەڵێت: نییە و من باوەڕ ناکەم، کورد نییە. ئەوسا بارزانی بە شەرواڵە نەخشدار و پشتێنە پانەکەی و جامانەکەیەوە ڕووی کردە لای ئەوان و گوتی: «کورد ئاوا دەبێ». بەڵام کوردبوونی من هێشتا جێی مشتومڕە. هێندێك دەڵێن: ئایا ئەرمەنییە؟ هێندێك دەڵێن: بەڵکو تورکی ڕەسەنە. هێندێکی دیکەش دەڵێن: گومان لە کوردبوونی دەکرێت. واتە هێشتا لە ناسکردنم نەبوونەتەوە. وانییە؟

ی.ك: بەڵێ، بێئەملاوئەولا.

س.پ: بەڵێ، هێشتا ناسکردنم تەواو نەبووە. ئەنجامی هەموو ئەمانەش ئەمەیە: ئەو ناسنامەیە چییە کە ئەوی پێ دەناسین؟ ناوێك لەمەوبەر لە گەرمەی مشتومڕی سەرکردایەتیدا گوتم: ئاپۆچییەکی سەرسوڕهێنی لە من ئاپۆچیتر سەرهەڵدەدات و دەڵێت: من گەورەترین ئاپۆچیم. هەموو ڕۆژێك گەلێك نموونەی هاوشێوەم بە تووشەوە دەبن و وەختە بتەقمەوە. پێی دەڵێم: «کورد بوونی خۆتم بۆ بسەلمێنە لە ڕێگای ئیش و ڕێکخستن و کۆشش و خزمەتەوە». دەبینین ئەمانە هیچیان نین. بەڵام لە ڕووی ناوبانگ و ناوەوە کەس سەراوردی ناکەوێ. ئەگەر وازیان لێبهێنی، هەریەکەیان لافی ئەوە لێدەدات کە چەند گەرمێنێك لێمی تێپەڕاندووە. تێکڕایان لەو جۆرەن کە دەڵێن: من دەکوژم، من خەڵکی لە سێدارە دەدەم. لەو ئەرمەجە دەچن کە باوکی لە سێدارەداوە. چۆن ئەوانە دەبن بە کورد؟

دەتوانم گەلێك نموونە بگێڕمەوە. دەبێ ناساندنی کورد لا لە زۆر لایەنی وەك مێژوو و سیاسەت و کۆلۆنیالیزم و میللیگەری سەرەتایی و هەڵوێستی بکاتەوە. لە هەموو ئەمانەش گرنگتر، دەکرێت ئەم ناساندنە لە ڕێگای (PKK) و ڕاستییەکەیەوە ببینین. پێویستە هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی ئاپۆچی و کەسایەتی ئاپۆچی لەم چوارچێوەیەدا بکرێت. لەوانەیە کەسایەتی ئاپۆ جیاواز بێ کە کەسایەتییەکی زۆر ڕەتکەرەوەیە. هەوڵمداوە ڕەوشی ژیانم بە کورتی بگێڕمەوە. ڕەوشی ژیانم لە سادەوە بۆ ئاڵۆز دەست پێدەکات، لە ئاساییەوە بۆ ئەو کۆسپ و تەگەرە دژوارانەی کە لەو ڕێگا دوور و درێژەدا هەن و دڵی مرۆڤ دەریانناهات و، لە چەمکی لادێیی سادەوە بۆ ئاڵۆزترین و هەمە لایەنەترین هەڵوێستی فەلسەفەیی و ئەوەش هێزێکی گەورەی گەرەکە و پەرەسەندنێکی نائاسایی پێکدەهێنێ. بەو پێیە چەندین کتێب دەنووسرێن. ئەو کاتە پێویستە لەسەرمان بە شێوەیەکی سەرتاسەری و لە گەلێك ڕووەوە بڕوانینە بابەتەکە و بە باشی هەڵیبسەنگێنین. ئێستا ئاپۆی کورد و (PKK) بەلای تورکەوە شتێکی سامناکن، وانییە؟ ئەمە گەورەترین مەترسی سەر گۆڕەپانەکە پێکدەهێنێ. وانییە؟

ی.ك: بەڵێ ئاپۆ و PKK سەبارەت بە تورکیا گەورەترین ترسن.

س.پ: تورك. ئەمە بۆ كۆلۆنیەكانی دیكەش ڕاستە. هەروەها بۆ ئەمریكا و ئەورووپاش. ئەوانە دەڵێن: ئێمە ئەم تەرزە كوردەمان پێ قبووڵ نییە، بارزانی كابرایەكی هاوچەرخە و بۆینباخ دەبەستێ. ڕاستیەكەی ئەو لەو شتە كۆنە لە ژێر زەوی دەرهێنراوانەیە كە چوار هەزار ساڵە ملونەوە، بەڵام بەلای ئەوانەوە نوێ و هاوچەرخە، هەرچی (تاڵەبانی)شە لە بۆینباخدا مامۆستایە و بازیداوەتە مەیدانی دیپلۆماتی. بەڵام ئاپۆ، نازانین چییە و ناودار نییە. ئاوا دەڵێن و جارانیش بە منیان دەگوت: «ئاغایەكی نەناسراوە و خێڵی نییە».

ی.ك: بەڵێ كوردێكی بێ خێڵە.

س.پ: بەڵام ئێستا ـ وەك باست كرد ـ ئەوان لە ئایدیۆلۆژیەكەی دەپرسن. ئایا كۆمۆنیستە یان نەتەوەپەرستە؟ ئەم جۆرە لێكۆڵینەیان هەیە. ئەمە لە بنەڕەتدا و بە پێی پرنسیپ چۆن كورت دەكرێتەوە؟ لە مەسەلەی كورددا ئەگەر ناساندنی (PKK)و ئاپۆ ڕوون بوونەوە، ئەمە وادەگەیەنێ كە هەوڵ و كۆشش لە ئارادان بۆ سوراخكردنی ڕاستی. ئێمە كورد نە لەسەر بنچینەی ئەتنۆگرافی و نە نیشتمانی تەواو و نە ئینتەرناسیونالیزم هەڵناسەنگێنین. هەروەها بە پێی فەلسەفەی تەواو یا لەوەی كە كەسایەتییەكی خاوەن ئاینە هەڵیناسەنگێنین. لە ڕێگای ئەم بابەتانەوە دەبینین كورد لە بارودۆخێكدایە دەبێ بە شت. هەمان كات لە بارودۆخێكدایە ڕەنگە هیچ نەبێ. كورد تا ڕادەیەك لە ڕووی ئەتنۆگرافی و نیشتمانییەوە هەیە و لە دۆخی نەبوونیشدایە. بەڵام لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە كەمێك هەیە نەك زۆر. لە ڕووی فەلسەفەیشەوە زۆر كەم هەیە یا هەرگیز نییە. كەچی لە ڕووی ئاینەوە هەیە، گەرچی ناتوانین بڵێین سەرجەمی كورد لەم یان لەو ئاینەن. ئەمە جێی مشتومڕە. ناوی موسڵمانە، بەڵام لە ئیسلام نەبێ لە هەموو شتێك دەچێ. ڕاستی ئیمامەكان و ڕێبازە سۆفێتیەكان ئەوپەڕی ئاڵۆزن. لە هەموو شتێك گرنگتریش نەبوونی پاكی و پوختەییە كە بە چەند ئاستێكی پێشكەوتوو داخراون. ئەوە خیانەتكاری كوردە كە سنورێكی بۆ نییە. پێتان دەڵێم: ناكرێت لە سەرتاسەری بەسەرهاتی كورد و لە گشت بابەتە كوردیەكاندا خیانەتكارییەكی كورد نەبینی. بۆیە دەتوانین ئەم دەربڕینەی بەسەردا ببڕین: «گەلی هەرە خیانەتكار دەرهەق بە خۆی» و لەوەی كە زۆر نەفرەت لە خۆی دەكات و ئەو كەسایەتیەی كە سەری خۆی دەخوات. ئەم هەموو سیفەتانە چۆنایەتی نیزیكبوونەوە لە ناسنامەی كوردی دیاری دەكەن و بیرۆكەیەكی لەبارەوە بەردەست دەخەن. واتە ڕێگا و شێواز دیاری دەكەن. لەبەر ئەوە ئێمە ناتوانین خۆ تێهەڵكێشی هەڵسانگاندنی سادە و هەرزانیەها بكەین، بەڵكو دەبێ نەڵێین نییە. كورد هەیە و هێندەی مێژووی مرۆڤایەتی دێرینە و تا مێژووی ئەمڕۆ لێكنەپچڕاوە. واتە كورد گرنگترین چیرۆكی مرۆڤایەتییە. هەموو ئەمانە لە چی دەچن، دەزانن؟ لە مرۆڤی موومیاكراو و مرۆڤی بەندیخانە و مرۆڤی لەدامێندا ژیاو و مرۆڤی ون و لەگۆڕنراو. بەڵام ئەو مرۆڤە ڕاستەقینەییە كە خاسیەتە بنچینەییەكانی مرۆڤایەتی پێوەیە و بە بارودۆخ لە مرۆڤی زیندوو

دەچێ. ئایا ئەمە ڕوونە؟
ی.ك: هەر زۆر ڕوونە..

## دەکرێت ئەم مەسەلانە
## بە بێ ڕشتنی خوێنێکی زۆریش چارەسەر بکرێن.

س.پ: کورد ئەمەیە. بە واتایەکی دیکە شیکردنەوەی کورد شیکردنەوەیە بۆ مرۆڤایەتی و ڕزگاری کورد، ڕزگارییە بۆ مرۆڤایەتی. تۆ کوردم بە تەواوی بۆ ڕزگار بکە، من پێت دەڵێم هەموو دنیا ڕزگاری بووە. بەڵام ئەگەر کورد بەم داروبارەوە مایەوە، ئەوە ئەم دنیایە هەموو خراپی و خەوشێکی تێدا هەیە. کورد بە واتایەکی دیکە پوختەی سەرجەم لایەنە خراپەکان و ژان و زوور و مەرگەساتی مرۆڤایەتییە. واتە ئاوێنەی هەموو ئەوانەیە و بەڵام هەر بە مرۆڤی دەمێنێتەوە، چونکە دەستی لەم خراپیانەدا نەبووە. خەڵکانی دیکە دەستیان تێدا هەبووە و بەسەر ئەمدا دەشکێنەوە. ئەگەر کورد ئەم هەموو دزێوی و کۆلۆنیالیزم و زەبرو زەنگ و قڕکردنەی هەبووبێ، ئەوە غەیرە کورد ئەوانەی کردوون. جا لەبەرئەوەی کە هەموو ئەوانە بەدن، بۆیە غەیرە کورد دەبێتە بەدکار نەك کورد.

ئەگەر وا بە قووڵی لاتان لە شیکردنەوەی کورد کردەوە، دەتوانن پێناسەیێکی ڕاستی مرۆڤایەتی بەدەست بهێنن. من ئەوە ناڵێم لەبەرئەوەی کە کوردم، یا لە کەسانی دیکە پتر پێوەندیم بە کێشەی کوردەوە هەیە، بەڵکو وەك ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی دەیڵێم. دەتوانن ئەنجامی زۆر گرنگ دەستگیر بکەن. مەبەستم ئەوەیە نکووڵیکردن لە کورد هەڵەیەکی قورسە. پێم وایە توێژینەوە و پەردە هەڵماڵین لە ڕووی بارودۆخی کورد زۆر گرنگە. ڕووداوی (ئاپۆ) لە ئارادایە. ئەم خاڵەش بەربەرەکانێی چارەسەر دەکات. سەرنج بدەن من مشتومڕ دەکەم و تێدەکۆشم بۆ گەیشتن بە چارەسەری ڕووداوی ئاپۆ. ئەم مەسەلەیەش پێوەندی بە گشت ڕژێم و سیاسەتە ئیمپریالیەکان و بە تەرزی کۆنی کوردەوە هەیە و لەگەڵ ئەم هەموو مەسەلانەدا لام لێکردووەتەوە، سەرباری تەرزی تورکیش کە زۆر زەبروزەنگ بەکاردێنن و هەوڵی نەهێشتنی کورد دەدات. هەروەها لەگەڵ ڕژێمی تورکیا و پێوەندییەکانیدا و لەگەڵ ئەم شەڕە سامناکەدا لام لێکردەوە. هەموو ئەمانە خۆم بووم. من بووم گوتم و کردم و بەتی خۆمم پچڕاند و بەم پلەیە گەیشتم. ئایا ئەم تەرزە کوردییە چۆن دەبێ و منیش چۆن دەبم؟ چۆن دەمخەنە نێو قاڵبێکی کۆمەڵایەتی و وەڵامم بۆ کێشەی ناسنامە چی دەبێ؟ من تەمەنم چل و چوار ساڵە و بە سەرگەرمی منداڵانەوە لە ناوەندی کاردا دەژیم و پەلەم لێیە و زۆر دان بەخۆدا دەگرم. بەڵام ئەگەر سەرنج بدەن چرکەیەکی وەختەکەم بەهۆپەڕی چڕوپڕییەوە تێدەپەڕێ. هەوڵدەدەین شتێکی تازە و جوان و دادپەروەرانە بخەینە ڕوو کە

هاوسانی و ئازادی و ڕێز لە کوشش گرتنی تێدابێ و بۆ سروشت و ژینگە بێوەی بێ. لەوانەیە بڵێن تۆ ئایدیالیستانە بیر دەکەیتەوە. بەڵام ئەوی ڕاستی بێ ئێمە هەوڵی خولقاندنی شت و تەرزێکی نێزیك بە بەهەشت دەدەین.

ی.ك: بەڵام ناچێتە بەهەشت.

س.پ: ناچێتە ناوی. بەڵام وەك عەرەفات «واتە عەرەفەی بەهەشت»ی دەهێنێتەوە. هەرچۆنێك بێ ئێمە ئەو جوانی‌یە دابین دەکەین کە بۆ چوونە نێو بەهەشتی سازدەکات و وای لێدەکەین خاوێن بێ، مەبەستی ئەو شەڕەی کە دەیکەین ئەوەیە، ئەمە شیکردنەوەی مرۆڤە، ئەگەر سەرنج بدەی من هەوڵدەدەم لە چوارچێوەی شیکردنەوەی مرۆڤایەتیدا بچمە ناخی کوردەوە. ئەگەر سەرکەوتین ئەوە کارێکی باش دەبێ. من وای دەخەملێنم کە کارێکی بەمانادار و مرۆڤانە و ئینتەرناسیۆنالانەیە. هەرچۆنێك کورد فەرامۆش بکەن و لەبەرچاوی نەگرن، کاری کورد هەروا ئینتەرناسیۆنالی دەمێنێتەوە و هێندەی مێژووی (مرۆڤایەتی کۆن) دەبێت و هێندەی پاشەڕۆژی مرۆڤایەتیش شتی تازە لە دووتوێیدا هەڵدەگرێ و ناسنامەکەی دەنوێنێ. ئێمە لەسەر بەجێهێنانی ئەم کارە پێداگرین.

دەمەوێ ڕوونی بکەمەوە کە شیکردنەوەی ناسنامەی کوردی تا ئەندازەیەکی زۆر یارمەتی شیکردنەوەی ناسنامەی تورکیش دەدات. بەوپێیە پێویستە لەسەر تورك خۆی بناسێنێ تا بتوانین پێکەوە ئیش بکەین، چونکە گەلێك شت هەن پێویستی‌یان بە یەکێتی و برایەتی هەیە. حەزدەکەم بڵێم و بانگیان بکەم بۆ بنچینەیەکی ڕاست و نکوولی یەکتر نەکردن بەهۆی شیکردنەوە و تێگەیشتنی ڕاستەوە تا بەبێ خوێنی زیاتر ڕشتن بگەینە چارەسەرێکی لەبار. لەمەوە بانگی کەسایەتی ڕەسمی و ناڕەسمی و کرێکار و بورژوازی و لاو و ژن و پیاو دەکەم و بە گشتیان دەڵێم: بە حسێب و حسێبکاری خۆتاندا بچنەوە دەرهەق بە بێداربوونەوە و ناسنامەی کوردی کە لەبەردڵتاندا گرانن. کورد هیچ زیانێکتان پێناگەیەنێ. ئێوە هێزتان لەیەك لاوە دەبرد. لە ئێستا بە دواوە لە دوولاوە دەیبەن. ئەمە شێوەیەکی ڕاستی هێز و توانایی‌یە. کورد هەوڵەتی جێوڕێیەکی پایەبەرزی لە نێو مرۆڤایەتیدا هەبێ.

ی.ك: بەڵێ، بە شێوەیەکی زۆر باش گوتت.

## مرۆڤی ئێمە پێویستی بەوەیە بە بیر و مشتومڕ و هەڵسەنگاندن نیشتمانی خۆی بناسێ و بە گیان تێیدا بژی. کە ئەوە بەدی هات، دەتوانین باسی گەڕانەوەیەکی ڕاستەقینە بۆ نیشتمان بکەین.

س.پ: هەرچی مەسەلەی گەڕانەوەشە بۆ نیشتمان، وای تێدەگەم ئەم گەڕانەوەیە مانایەکی زۆر فراوانی هەبێ. ئەگەر بە تەنێ گوتمان گەڕانەوە، ڕاست لێیە. واتە وەك ئەوەی تۆ بۆ شوێنێك بگەڕێیتەوە کە پێشتر هەبوە و تۆ لێی‌دابڕاوی. ئەوی

ڕاستی بێ دیاردەکانی ڕیشەکێش کردن و ڕۆیشتن و گەڕانەوە زۆر تێکچڕژاو و نادیارن. ئەگەر هەر دەبێ باسی گەڕانەوە بکەین، ئەوە ـ وەك کەمێك پێشتر کردمان ـ گەڕانەوە ناساندنی گەڕەکە. پێویستە لەسەر سەرکردە بپرسێ: من چیم و لە چ مێژوویەکەوە هاتووم. بۆیە دەبێ لەگەڵ مێژووی خۆیدا بگەڕێتەوە. ئەمە گەڕانەوە لەگەڵ بەشێکی ئەم مێژووەدا دەگەیەنێ. ئێمە ئەم جۆرە گەڕانەوەیەمان دەوێ. ئەوەتێ هەڵکەوتووین بۆ ئەوە، لەسەر ئەم شێوازە دروستە سوورین بۆ شیکردنەوە و داکۆکی لێدەکەین و کردوومانە بە شێوازێك بۆ حاڵی بوون لە ڕاستی ڕۆژانە. ئەو زیانەی کە کورد دەیگوزەرێنێ، لە هەردوو ڕووی ئابووری و سیاسییەوە چی دەگەیەنێ؟ پێویستە لە باروودۆخی ڕاستەقینەی ڕۆژانە تێبگەین. واتە بیکەین بە بوونەیەك بۆ خۆناسین. دەبێ گەڕانەوە بەم شێوەیە بێ. هەر ئەمە بە کەمی ڕوودەدات. بەڵام ئەوەی کە تۆ مەبەستتە گەڕانەوەی فیزیاییە لە دەرەوەی نیشتمانەوە.

ی.ك: نەخێر، من لە چۆنییەتی ڕوودانی ئەوە دەپرسم. ئایا وەك مەشق وا دەبێ، یان لە شێوەی بەرنامەدا دەبێ؟

س.پ: لە هەموو شتێك گرنگتر گەڕانەوەیە بە گیانەوە. مرۆڤی ئێمە لە گیاندا لە نێو ئامۆییەکی گەورەدا دەژی.

ی.ك: مەبەستتان گەڕانەوەیە بۆ بنەماکان؟

س.پ: ئامۆییەکی گەورە لە گیاندا هەیە و ئەم ئامۆییەمش زۆر گرنگە. ئەو مرۆڤەی کە بە گیان ناگەڕێتەوە بۆ لای خودی خۆی، ناتوانێ بە بیر بگەڕێتەوە لای. ئاخۆ گەڕانەوە یەکجار لە گیاندا دەبێ یان لە بیردا؟ ئەمە گرنگ نییە. گەڕانەوەی بە گیانی و فیکری هەردوو پێویستن. ئەمە چی دەگەیەنێ؟ بیرکردنەوە و هەست کردن بە ڕاستی خۆی. ئەو لە نیشتمانەکەی هەڵدێت، چونکە ئەم نیشتمانە داروپەردووە. پێی دەڵێی: هاوڕێم نیشتمان داروپەردوو نییە، دەگەنجینەیەکی تێدایە. بگەڕێوە بۆ نیشتمانەکەت. بەڵام ئەو وا وەڵام دەداتەوە: نیشتمان و جوگرافیا بووەتە ئازارمایی و ماریش هەن، هەڵدێم. ئەوە دەڵێت.

پێی دەڵێی: نەخێر، ئەوەندە خواردەمەنی و خانووبەرەی لێیە بەشی سەدانی وەك تۆ دەکات. کابرا بیر لەوە ناکاتەوە و لێی هەڵدێت و گیانی تەنگ دەبێ و درێژە بە هەڵاتن دەدات. دەبێ لەم بارەیاندا گیانی خۆی بۆ نیشتمان هەڵبگرێ. ئەمە کارێکی گرنگە. مرۆڤی ئێمە پێویستی بەوەیە بە بیر و مشتومڕ و هەڵسەنگاندن نیشتمانەکەی بناسێ و بە گیان تێیدا بژی. کە ئەوە بەدی هات دەتوانین باسی گەڕانەوەیەکی ڕاستەقینە بۆ نیشتمان بکەین. عەقڵی کوردی بە تورکی و عەرەبی و فارسی بیردەکاتەوە، یان وەك ئەو حیکایەتانە بیر لە خەڵکی دیکە دەکاتەوە. بەڵام بیر لە خۆی ناکاتەوە. لەبەر ئەم هۆیە دەبێ گەڕانەوەیەکی مەزن لە بیردا هەبێ و ئەم گەڕانەوە فیکرییەش بە ئامراز و کەرەستە و هەڵسەنگاندنی ئەو بێ. ئەمە گەڕانەوە دەگەیەنێ بۆ چیاو بەرد و گورگ و باڵندە و مێژوو و زەریاچە و

دەشت و ڕۆشنبیری و زمانی سوی و هەموو جۆرە ڕاستییەکی دیکەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و دامەزراندنی بیروڕاکانی بە ئەندازەی ئەوارەی شۆڕشەکەی. بە کورتی دەبێ پێچکەی بیرکردنەوەی بسووڕێنەوە و ئەوە گرنگترین ئاڵوگۆڕە کە ئەوانەیە ڕووبدات. وەك گوتم: ڕەنگە گەڕانەوەش گیانیش لەگەڵ ئەم گەڕانەوەیەدا بێ. پێویستە لە خۆی نەترسێ و بەو شێوەیە ئەبێ کە دوژمنەکانی داوای لێدەکەن. تەسکردن و خۆشەویستی بە پێی خواستی دوژمنان کتومت نامۆییە و مەترسییەکی گەورەیە. کورد پێویستییەکی زۆری بەم گەڕانەوەیە هەیە. مەبەستم ئەو کوردەیە کە پاشماوەی کوشتارە بە کۆمەڵەکانە. ئەگەر لێمت بپرسیایە پێتم دەگوت: کورد پاشماوەی کوشتاری بە کۆمەڵە و لە ڕووی فیزیاییەوە بە هەموو ناوچەکانی جیهاندا پەرشوبڵاو کراونەتەوە بەشێکی گەورەیان بە ئەنادۆڵ و ناوەڕاستی ئێران و حەلەب و ئەورووپا و چەند ناوچەیەکی دیکەدا بڵاوەیان لێکردووە، بەشە کەمەکەیان لە نیشتمانیدا ماونەتەوە و چوار هێندەی خۆشی لە دەرەوەن. لە ڕاستیدا ئەوە وەك بازرگانی کۆیلە وایە. ئەوانەش کە ماونەتەوە سەرەتایی و پاشکەوتوون و وەك شوان بۆ کۆلۆنیالیزم کاردەکەن و زەوی بوورە دەکێڵن. ئەوان بۆ ئەم مەبەستە ـ واتە خزمەتکردنی داگیرکەران ـ لەوێ بەجێ هێڵراون. گەلێك کەس بە بازرگانی کۆیلە ڕۆیشتن. ئەوانەش کە ماونەتەوە شوانی و کشتوکاڵ دەستیان ماچ دەکەن و لەوێ ئەهێڵراونەوە خزمەتی خۆیان بکەن. بەو پێیە پێویستە کاروبارەکانی بگێڕدرێنەوە سەر ڕاستە ڕێی خۆیان. نموونەیەکی هاوشێوە لە مێژوودا هەیە. جوولەکە بە هەموو پارچەکانی جیهاندا وەربوون، بەڵام ئێستا و پاش تێپەڕینی دوو هەزار ساڵ بۆ فەلەستین دەگەڕێنەوە و لێرەش چڕوپڕی ئەم گەڕانەوەیە دەبینن.

ی.ك: ئەرمەنەکانیش.

س.پ: ئەرمەن باروودۆخێکی هاوشێوەیان هەیە و ئەوانیش پەیبەندی گەڕانەوە بوون. وەك نموونەیەك لەسەر جوولەکە، گەلێك جوولەکە دووهەزار ساڵێك بوو لە حەبەشە بوون و کەس نازانێ چۆن گەیشتنە ئەوێ. جا کە گەڕانەوە بۆ فەلەستین و لە فڕۆکە دابەزین، خاکیان ماچ کرد و باوەشیان پێدا کرد. بەڵام کورد تا ئێستا ڕادەکات، لە کاتێکدا بازارچق و دێرسیم و بستان و بینگۆل و ئوورفە سەرتاسەر لە دانیشتوانی خالی کراونەوە و تەنیا هەکاری مابوو، وا ئێستا ئەویش چۆڵ دەکرێت.

هەمان کات خەڵکانی دیکە بۆ نیشتمانیان دەگەڕێنەوە و تێیدا چەقبەستە دەبن و دەست بە ئیشتمانپەروەری خۆیانەوە دەگرن. کورد لە کۆچێکی بەرفراواندا دەژین. بۆیە دەتوانین لەسەر (PKK) بڵێین: بزووتنەوەی ڕاگرتنی کۆچکردنە و، ئەگەر (PKK) لەم دواییەدا نەگەیشتبایە جێ، کورد هەموویان کۆچیان کردبوو و کەسیان لێنەمابووەوە. کودەتای (١٢)ی ئەیلوولیش جوڵانەوەیەکی کۆچ پێکردنی کوردە. ئەو کوردانەی کە لە قۆناخی (١٢)ی ئەیلوولدا دووچاری کۆچ پێکردن

بوون، لەو ژمارەیە زۆرترن کە بە درێژایی مێژوو کۆچیان کردووە. زۆربەی گوندە کوردنشینەکان ئێوە چۆڵن. هەموو یەکێك دەتوانێ ئەمە ببینێ. بەشێکی زۆری گوندەکان لە ماوەی ١٢ یا ١٣ ساڵی ڕابردوودا چۆڵ کراون و ئەوانەش کە ماون یان منداڵی چکۆلەن یان پیر و پەککەوتەن. ئەگەر دواجار (PKK) نەهاتبایە ناوەوە، بڕابوونەوە. لەو شوێنانە کە چۆڵ کراون لە بری ئەوان کۆچەرانی تورکی لە دەرەوە هاتوویان تێیدا نیشتەجێن. بە تورك کردن هەمیشە بەردەوامە. چالاکی نیشتەجێ کردنی تورك هاوشانی چالاکی کۆچ پێکردنی کوردە و لەو کارانە دزێوتر و درندانەترە کە تورك بە ئەرمەن و ڕۆمی کردوون. هەمان شتیش بە کورد دەکرا. تیرۆریی دەوڵەتی تورکیا لە (PKK) لەم خاڵەوە سەرچاوە دەگری وەك ئەوەی بڵێت: چۆن بۆت هەیە ببیتە سۆنگەی ڕاگرتنی ئەم کارە مێژوویییە گەورەیە و چۆن وەك بەربەست لە ڕووی ئەم کۆچ پێکردنەدا ڕادەوەستی؟ جا بە بێ ئەوەی کە هیچ چالاکییەکی سیاسی بکەن، ڕوودەکەنە گوندنشینی کورد و یەخەگیری ئەشکەنجەدانێکی ترسناکی دەکەن بۆ ئەوەی کۆچ بکات. ئەگەر سەرنجتان دابێ، ئەوان هەمان شێواز لەگەڵ گوندنشینانی ناوچە شاخاوییەکاندا بەکار دێنن و ناچاریان دەکەن بچنە (شەڕناخ و جزیرە و نوسەیبین)، ئەوەش لە ڕێگای ترساندن و ئەشکەنجەدانیانەوە. لەو ڕاپۆرتانەی کە ڕۆژانە پێمدەگەن دەڵێن: ڕۆژانە بۆردومانی فڕۆکە و ئەشکەنجەدانی ترسناك هەن بۆ کۆچ پێکردنی دانیشتوانی گوندەکان و ئاوارە و پەراگەندەکردنیان. ئەمە تا ئەمڕۆ بەردەوامە و مەترسییەکی گەورە پێکدەهێنێ.

بایەخدانی لە ڕادەبەدەرمان بە گەڕانەوە بۆ نیشتمان گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ بەرەنگاری کردنی ئەم پەرتپەلاوییە. ئەگەر بە سوود وەرگرتن لە ڕاستییە مێژوویییەکان ئەم گەلەکۆمەییمان نەکردبایە بۆ گەڕانەوە بەرەو نیشتمان، ئەوا تێکۆشان دوایی پێهاتبوو و کورد تەواو بوو بوو. ئەگەر دلێرانە بەرخۆدانمان نەکردبایە، ئەوا داگیرکەر بە بەشداری خیانەتکاری میللیگەری سەرەتایی، کوردی دەبڕاندەوە. ئەو نۆکەرانە بۆ دوایی پێهێنانی کورد لەگەڵ دوژمندا ئیش دەکەن. ئەمە لە بیرەوەری مەلا عەبدوڵلای شێخی گەورەماندا دەڵێم کە تەمەنی خۆی لە ٩٨ ساڵ دەدا، دەیگوت: کێشەی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ دا کۆتایی هات. لە دواساتدا پەی بەوە برد کە «بارزانی کورد نییە، بەڵکو نۆکەرە». پێویستە ببرای ببڕ بەوانە نەخەڵەتێین کە جلی کوردی (شاڵ و شەپك) لەبەردەکەن، چونکە نۆکەرانیش جل وبەرگیان دەگۆڕن. پێویستە ئەمە بزانین. بە کورتی کورد و کێشەی کورد خەریك بوو دوایییان پێ بێ. ئایا قەرتێنخستنی کورد شتێکی باش دەبێ؟

وەك بۆم باس کردن، ڕزگاری کورد ڕزگاری مرۆڤایەتییە. بێداری و ژیانەوەی کورد، بێداری و ژیانەوەی مرۆڤایەتییە. گوتیشم: با ئەم خاڵە فراوان بکەین. بەڵام درندایەتی (١٢)ی ئەیلوول و درندایەتی کەمالیزم کە لە ڕووی درندەیی و هیچ و پووچییەوە لە قۆناخی عوسمانیەکانیشی تێپەڕاند، هەردوو بەرەو ڕوومان

بوونەوە. پێویستە هێندێك كردەوە لێك جیا بكرێنەوە. عوسمانییەكان جووڵانەوەیەك نەبوو بۆ سڕینەوە و نەهێشتنی گەلان و نكووڵی لە زمان و نەتەوەیان نەدەكرد. بەڵام مستەفا كەمال و ڕژێمی توركیا وانین. بەو پێیە ئەوانە هەڵخوڕ و زۆردارن.

ئایینی ئیسلام سەرباری هێرش و فتوحاتەكانی، نە هیچ گەلێك و نە ڕۆشنبیری ئایینی و نە زانستەكەی لەنێو نەبرد، كەچی ئایدیۆلۆژی نەتەوەیی كەمالی بڕیار لەسەر سڕینەوە و نەهێشتنی بێ ئەملاوئەولای گەلان دەدات. پێویستە لە چوارچێوەیەكی زانستیدا لا لەم بابەتە بكەینەوە.

ئەرمەن و ڕۆم و كەمە نەتەوەكانی دیكەش ڕۆیشتن و، هەر كورد مایەوە. ئێمە باش دەزانین جووڵانەوەی (١٢)ی ئەیلوول لەم ڕووەوە ڕەنگی بۆچی دەڕشت. هێشتا هێندێك كورد هەن بەم بارودۆخە قایلن. ئەڵەیەك نراوەتەوە و پێمان دەكرێت مەسەلەكە دوایی پێبهێنین. لەم دەستپێكەوە دەستم بە گەلەكۆمەی گەڕانەوە كرد، لەبەر ئەوە نا كە كوردم، بەڵكو لەبەرئەوەی كە كێشە و مەرگەساتێكی مرۆڤایەتییە و كوشتارێكە لە مرۆڤ دەكرێت. بۆیە پێویستە لەسەرم بەهرەكانم و بەرهەڵستی و بەرخودان بە پێی دەسەڵاتی خۆم بەكاربهێنم. سەرباری دژوارییە گەورەكان ئەوەم كرد و دنیا و ژیانم بۆ ئەوە ڕاگرت تا سنوورێك بۆ ئەم كوشتارە دابنێم. دیارە من شێوەكەی دیكەی ژیان و خەسڵەتە كۆنەكانی خۆمم لە ساڵانی هەشتاوە فەرامۆش كردووە و گوتم: نابێ ئەم بەشە پڕ بەهایەی مرۆڤایەتی ون بێ، چونكە بەلای منەوە ئەمە ون بوونی سەرلەبەری مرۆڤایەتی دەگەیەنێ. ئەگەر وەڵامێكتان بۆ ئەو كەسە دەوێ كە دەپرسێ خەباتی ئاپۆ چۆنە و بۆچی ئاپۆ لە سیاسەتدا كار دەكات؟ پێویستە لەسەرتان ئەم بابەتە ببینن. ئەگەر گەردێك مرۆڤایەتیت هەیە، ئایا دەتوانی دەستەوەستان ڕابوەستی؟ من ئەم پرسیارە لە هەمووان دەكەم بە حیزبییەكانیشەوە. لێرە لە قۆناخی قڕتێكەوتندان، بۆچی ڕازی دەبن مرۆڤایەتیتان كۆتایی پێبێت و، تەنانەت بە باشیش داكۆكی لە خۆتان ناكەن و چۆن بانگهێشتی مرۆڤایەتی دەكەن و بەهرەكانتان ناخەنە گەڕ؟ من لەوە بەتێنم كە هەڵوێستتان نەرمە و لە من حاڵی نابن و نازانن داوای چی دەكەم. با ڕێ بدەین بە كەسانی دیكە. هەتا ئەندامانی (PKK)ش لەم بارەیەوە زۆر نازانن. پێم وابوو ئەوە دەزانن. جا بۆ تێگەیاندنیان ساڵی چوارجار شیكردنەوە دەكەین. بەڵام لە سەروبەندی شەڕی باشووردا بە بێسوودمان زانی. وە ئەگەر ئەوانەی كە لەگەڵتدان ئاوا بن، دەبێ ئەوانەی دەرەوە چۆن بن؟ چۆن دەتوانن ئەم ڕووداوە گەورەیە بەخۆبگرن.

پێشتر پێمگوتن هێشتا مشتومڕ بەردەوامە لەسەر ئەوەی كە: ئایا كورد هەیە یان نا؟ ئایا نەتەوەیە یا كەمایەتی یان گەل؟ مرۆڤایەتی لەوێ دووچاری مەرگەسات و پەرتەوازەكردنێكی گەورە بووە. من نالێم وەرە و لە شەڕەكەمدا پاڵپشتم بە. بەڵام دەڵێم ئەم بابەتە زانستییە بناسێنە و بیسەلمێنە. ئەگەر هەر

سەلماندنێکت بەردەست خست، ئایا دەبێ بە ئەندامی (PKK) یان دەبێ بە
کادیرێکی (PKK)؟ بێگومان دەبێ. پێویستە ئەم کارەت بە پێی یاسا گوناح
نەبێ. وەك گوتم من لەرێگای تێگەیشتنی بنچینەیی کێشەکەوە لام لە بزاڤی ئەم
گەڕانەوە مەزنە کردەوە و گەلێك گرانیم تووش هات و کۆششێکی لە وزەی خۆم
بەدەرم کرد و بۆ خستنە ڕووی ڕاستیش نەرم و نیانیم پیشانداو لە دڵی خۆمدا
گوتم: ئەوە پێویستی‌یەکی ناچاری وەك نوستن و حەوانەوە و ژیانی ئازادە، هەموو
ئەمانە بوەستێنە و گراوە و خۆڕاگرنە و پەیبەستەی گرۆکی کارەکە بەو، مەترسی
بینە و هەر لە سیاسەتی دارایی و ڕێکخستنەوە تا تەرزی کادیران و شێوەی شەڕ
بە پێی ئەوە خۆت ڕێکبخە. هەموویانم کرد و پەیدام کردن، چونکە بە چاوی خۆم
مەترسیم بینی. ئێوە ئەو دۆخی مەترسی‌یە دەزانن کە بە دۆخی سوپا دیاری
دەکرێت. دۆخی سوپاش پەیبەستەی ئاستی ئامادەیییە و ئەمەش دۆخی سەربازی
ڕوونی دەکاتەوە. هەموو ئەمانە لە پێناوی گەڕانەوەی ئارە و ڕاگرتنی پەرتەوازەییدا
بوون. ئەمە ڕوویدا. واتە ئێمە دەرکمان بە بایەخی ڕاگرتنی کرد، لە کاتێکدا
زۆر کەس بەو پەرتەوازەییە نازانن کە تێیدا دەژین. دەکرێت لەسەر ئەم
پەرتەوازەییە بڵێین: بزاڤی مرۆڤ خستنە نێو زەوی، واتە گۆڕ کردنێتی. لەو
هاوارم تێبگەن کە شەو و ڕۆژ نابڕێتەوە ، وە لە بانگەواز و کردەوە و شەڕیشم
بگەن.... هەستم پێبکەن،شتێکتان بەسەردا دێت. ئەمە ڕاستی‌یەکە هەوڵی
تێگەیشتنی دەدەن و هەموو ئەمانەش لە پێناوی ئێوەدان.

## پێویستە تورك زانی دانیشتنی لە دەوری مێزی دانوستاندندا هەبێ.

ی.ك: بەڵێ وایە.

س.پ: بە تەمامەتی من خۆگرێدان بە ئاپۆوە هاوشانی چوونە بەرەو پێری ئەم
بانگەوازەو، ئەمەش گرێبەرانێکی باش و گەورەیە. پێم وایە من وام لێ کردوون
هەست بکەن و تێبگەن. چونکە ئێستا هەست بە گەورەیی و تەواری مەترسیەکە
دەکرێت.

ی.ك: خۆگرێدان بە ئاپۆوە پاش هەڵگەڕانەوە لە کوردستان سەری هەڵدا،
وانی‌یە؟

س.پ: بێگومان. پێش ئەوە یەکێك پێی نەدەگوتم «مەرحەبا». مەبەستم ئەوەیە
ئاپۆی یەکەم بەت پچڕێنی خۆی بوو و خەڵکی بە لاڕێدا دەبرد. بەڵام کە وام
لێکردن هەست بە مەترسیەکە بکەن، ئەوسا وایان لێهات بڵێن: ئای ئاپۆ
پێویستیمان بە تۆ بوو و توند پەیبەستەت بووین و ئێمە کادیری تۆین و زۆرمان
خۆش دەوێی. دیارە هەموو ئەمانە بەلای منەوە کێشە نین. بەڵام کێشەی گرنگ
ئەوەیە وایان لێبکەی هەست بە مەترسی بکەن و بیانکەی بە هێزێکی
بەرپەرچدەرەوە بۆ بەرەنگاری ئەم مەترسی‌یە. ئێستا ڕووی لە بیستمان کردووە و

گەرانەوەش کارێکی باشە و بە سەرگەرمی‌یەوە دەکرێت. زۆریان گوێ بە مردن نادەن و پێیم وایە گەورە دەبن. جارێکی دیکەش بە گەنجەکانی کورد دەڵێم: ئێوە ناتوانن ئەم گەلەکومەی گەڕانەوەیە ڕابگرن. من میکانیزمی ئیش و کارییم دامەزراند و گرێ کوێرەکەیم کردەوە. ئەمە شەڕێکی ڕزگاری ئاسایی نی‌یە و ناکرێت بە شێوازە سەربازی‌یەکان تێی‌بگەین و ناشکرێت لە ڕوویدا ڕابوەستین. ئەوە ڕووداوێکی گیانی و مرۆڤانەیە، ئەوە شۆڕشە و جووڵانەوەی ڕۆحە. لەم بزاڤە لە دەماخدا دەست پێدەکات و دوایی دێت و، ناکرێت بە شمشێر یا چەك ڕابگیرێت. وەرن لە ڕاستی تێ‌بگەن. ئەوان هەوڵدەدەن بڵێن: حالی بووین و پەسندمان کرد. بەلام نا، مەسەلەکە ئەوەندە سادە نی‌یە. هەوڵبدەن تاسەر لە ڕاستی تێ‌بگەن. ئەگەر دەتانەوێ شتێکی کەمی بەشی خۆتان لەو شێوە بنچینەیە وەربگرن، من دەتوانم بە یەك ڕۆژ شەڕ ڕابگرم، ئەگەر چی ئەوان هەموو ڕۆژێك ڕایدەگەیەنن ئێمە دڕندە و تیرۆرکارین. ئێوە بیوەستێنن و منیش دەیوەستێنم. ئێوە بدوێن و منیش دەدوێم، بەلام تا کۆتایی لێمان مەدەن...ئەمە بەسە. ئەگەر

ویستتان با جیهان لە نێوانماندا حوکم بدات. لە کۆتایی مشتومڕەکەماندا بڕیارەکەیان هەر چۆنێك بێ من پێی ڕازیم. با هەمووان بخەینە جێی حوکمدان و با بڕیاری خۆیان بدەن، ئەوەم بەسە بە ئازادای داکۆکی لە خۆم بکەم.

پێویستە تورك لەمە دانەچڵەکێن. بەم پێیە پێویستە زاتی ئەوە بکەن لە دەوری مێزی دان وستاندندا دابنیشن. بۆچی بەردەوام لەمە هەڵدێن؟ لەبەر ئەم هۆیە نامەوێ بڵێن تیرۆرکارە و لە هیچ حالی نابێ. بە دەوڵەت و گەورەترین سەری دەڵێم: لەگەڵ گەردێك جەربەزەیی شك دەبەن و هێندەی سەرە دەرزی‌یەك لە مرۆڤایەتی تێدەگەن، وەرن با بەرانبەر بە یەکدی دابنیشین و قسە بکەین. بەلام تورکیا لەم جۆرە کەسەی تێدا نی‌یە.

ی.ك: بەڵێ زۆر جوانە.

س.پ: بێ‌زمان بە جێ‌یان هێشتین، بەلام من کەوتمە قسەکردن. مادامێکی زمانیان درێژە، با بێن قسەبکەین.

ی.ك: بەڵێ ئەم قسەیەتان بالا دەکات. لەو کاتە ئەو پیاوە پەیدادەبێ کە دەتوانێ قسە بکات. ئێستا ئاهێری بەرام پرسیارەکانم بەم ڕوونکردنەوانەتان تەواو دەبن و سبەی بە ئامادە بوونی هەڤالان دێینە سەر دوا بەشی گفتوگۆکەمان. ئەوی ڕاستی بێ گفتوگۆکەمان زۆر جوان بوو، من ئەو پەڕی مەمنوونم.

# بەشی سێیەم

## پرۆسەی شۆڕشگێڕانە خۆی بوو ئێمەی ڕووبەڕووی ڕۆمان کردەوە.

ی.ك: ئەمڕۆ کۆتایی بەم گفتوگۆیەمان دەهێنین. بۆیە مۆڵەتت لێوەردەگرم تا هەڤاڵانی لاویش بێنەپاڵمان. لە گفتوگۆکانی پێشوومانداا باسی مرۆڤی تازە و نهێنی و کارەکانی و شەڕمان کرد. بیرمە، لامان لە بابەتێکی زۆر گرنگ کردەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئێوە باسی ئەوەتان کرد کەوا ئەدەب و هونەر و ڕۆمان نەبوونایە، لە خولقاندنی مرۆڤی تازەدا ڕووبەڕووی گەلێك دژواری دەبوونەوە و، تەنانەت ئەگەر بشتانهێنایەتە بوون ئەوا هەمیشەیی نەدەبوو. ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە. ئەگەر حەز بکەن باسەکەمان بە ڕۆمان دەست پێبکەین، چونکە ئێمە وایدەبینین ئەگەر سەرکەوتنێك هەبێ، دەبێ ئەم کارە ڕۆمانێکی هەبێ. مرۆڤی فەرەنسی سەرلەنوێ لە دایك دەبێتەوە و ئەمجا ڕۆمانەکەی دەردەچێ. ڕۆمانی ڕووسی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە دەست پێدەکات و مرۆڤی تازە سەرهەڵدەدات و ڕژێمی کۆن هەرەس دەهێنێ و خامەی تازەی وەك دستۆڤیسکی و تورجینیف و ڕۆمانەکەی «باوکان و کوڕان» دەکەونە ڕوو تا دەگەینە یەکێتی سۆڤێت کە ڕۆمانی ڕزگاری و ڕۆمانی بەلشەفی پەیدابوون. بە ڕای من باشترین ڕۆمانی سۆڤێتی بە ڕۆمانی دووەم شەڕی جیهانی دوایی پێدێنێت. دوای ئەوە (پاسترناك)مان وەك باشترین ڕۆماننووس پێشکەش دەکەن. ئەم نووسەرە (دکتۆر زیڤاگۆ)ی بۆ نووسین کە بە نهێنی ڕەخنە لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەگرێ. پاشان (سۆلجنستین)ی قوربانی جیهانی خۆرئاوا پەیدا دەبێ کە بەرەیەکی ئاشکرای بەرهەڵگاری کردەوە.

بە کورتی ئەگەر بڕوانینە مێژووی ڕۆمان، بۆمان دەردەکەوێ کە ڕژێمی سۆڤێتی لە سەرەتای ساڵانی پەنجا و ساڵانی شەستدا ڕاوەستاوە. بەڵام ئەگەر ڕوانیمانە تورکیا دەبینین ئەمڕۆ ڕۆماننووسێك نییە، نە لە کورد و نە لە تورك، یەشار کەمال لوتکەیەك بوو و بڕایەوە و پاش ئەو کەس دەرنەکەوت. ئەگەر تەماشای شیعری تورکی بکەی، دەبینی باشترین شیعر لە بارەی شەڕی ڕزگاریەوەیە و نایابترین شیعری «نازم حیکمەت»یش لەسەر ئەڤین و مرۆڤایەتییە. لەوە بترازێ، لە شیعری شەڕی ڕزگاری تورکیا بەدەر شیعرێکی باش نییە. ترۆپکی شیعری تورکی لە شیعری (نازم حیکمەت)دا بەرجەستەدەبێ و هیچی دیکەنا. ئێوە بە باشی ڕەخنەتان لە شیعری ئەحمەد عارف گرت. ئایا شاعیرێکی تورکە یا کورد؟ ئایا شاعیرێکی ئەزەلییە یان نا؟ هەموو ئەمانە ڕۆشن نین. قەڵەمبازێکی باش بوو و ئیتر بڕایەوە. شیعری تورکی بە مردنی جەمال سورەیا کۆتایی دێت. ئەگەر لەم گۆشەنیگایەوە بڕوانین، دەبینین ئەم ڕۆژانە

ڕۆمانێکی کوردی لە ئارادانیيە و ڕۆمانی تورکیش ڕوو لە بەرانەوەیە و هیچ ڕۆمانێکی تازە نییە.

ئەیلولییەکان (پاڵەوانانی ١٢ی ئەیلول) هێندێك کەسی خۆیانیان خستەڕوو. دەمەوێ لەم پێشەکییە درێژەدا بێمە سەر تێبینییەکی پربەهای پێوەندی هەیە بە یەکێتی سۆڤێتەوە کە ئێوە سەرنجتان بۆ ڕاکێشاین. بەڵام بەلای ئێمەشانانەوە کە بەدووودا چووی ڕووداوە کوردی و تورکییەکانین کتوپڕییەکی گەورەیە. ئەویش ئەوەیە کە بەرنامەکان و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لە بنەڕەتدا بۆ پارچە پارچەکردنی یەکێتی سۆڤێت قوت کرانەوە. من لەم تێبینییەدا بەشداری ڕایەکەت دەکەم. کەچی پاشتر ئەم چەکە ڕووی کرایە هەڵگرەکەی، ئیتر تا چ رادەیەك؟ من نازانم. ڕۆمانی ڕووسی بە ڕۆمانی سیمینۆف لەسەر ئەو مرۆڤە ڕووسییەی کە لە دووەم شەڕی جیهانیدا بەرخودان بەرانبەر فاشیزم دەکات، کۆتایی پێدێت. ئەو ڕۆمانانەش دەرکەوتن کە لە ناوەوە تووشی داکرۆشتن بوون.

لێرەدا دەمەوێ بەو خەڵکانە بڵێم کە لە ئاستی تورکیا و کوردستاندا بەدووی هەواڵەکاندا دەچن: تێڕوانینتان بۆ مرۆڤ هەمە لایەنە بێ و تا چ ئەندازەیەکیش هەمە لایەنە بێ چڕوپڕ دەبێ. لە دەسپێکی ئەم گۆشەنیگایەوە ئایا دەتوانین بڵێین: هۆی هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤێت ئەوەبوو پێی نەکرا مرۆڤی سۆشیالیستی ڕاستەقینە بخولقێنێ؟ ئایا خولقاندنی مرۆڤی سۆشیالیستی بەرەبەرە پاش دووەم شەڕی جیهانی وەستا؟

س.پ: پێش ئەوەی بێمە سەرباسی بێدەسەڵاتی یەکێتی سۆڤێت لە خولقاندنی مرۆڤی سۆشیالیستیدا، بەسوودی دەبینم هەڵوێستە لەلای ڕاستی ڕۆمان و پێوەندی ئەوە بەو مرۆڤەوە بکەم کە دەمانەوێ لە ڕۆمانەوە بیهێنینە بوون، ڕۆشنکردنەوەی ئەم پێوەندییە بە کەڵك دەبێ، بە تایبەتی لە مەسەلەی کورددا کە هەموو شتێکی تێدا ئاوەژووە و لەگەڵ هەموو شتێکی سەربەرەو خواردا دەژین. لەمە پاڵمان پێوە دەنێ باش لە ڕۆمان بگەین.

من خۆم ئەسەدەزالی ڕۆمانە نووسراوەکان تا چ مەودایەك بەهێزن. تەنانەت بۆ زانینی ئەوەی کە ڕۆمان چییە و چۆن دەنووسرێت و چۆن گەشە دەکات، دژواریم بەدی دەکرد. بەڵام پرۆسەی شۆڕشگێڕانە خۆی ئێمەی ڕووبەڕووی ڕۆمان کردەوە. ئێستا هەڵسەنگاندنم بۆ ڕۆمان لەوەدا ئەتیە کە ڕۆمان چیرۆکی شیبوونەوەی سیستەمێکی پێشووە بە لایەنە ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانیەوە و هاوشانی پێداویستی سەرهەڵدان و سەرکەوتنی سیستەمی تازەیە بە گشت لایەنە سەرنجڕاکێشەکانیەوە و، تۆمارکردنێکی ئەدەبی ئەم قۆناخی گۆڕانکارییە. مەبەست لەم ڕووداوە تەنیا حیزب نییە، بەڵکو چەمکێکی بەربڵاوە. بۆ نموونە لە مەسەلەی سەرهەڵدانی ئیسلامدا شتی وا هەیە لە ڕۆمان دەچێ. بەسوودە دەبێ ئەگەر باسێك بە ناونیشانی (ڕۆمان لە ئیسلامدا)وە هەبێ، چونکە لە ڕۆمان دەدوێین بەکەم شت کە بە خەیاڵماندا دێت خۆرئاوا و ڕۆماننووسە خۆرئاواییەکانە.

بایەخ لەوەدایە بگەڕێینەوە بۆ ڕاستی مێژوویمان و بە دوای کتێبی هاوشێوەی ڕۆماندا بگەڕێین و بزانین دانەرانیان کێن و کەینێ هاتنە بوون. ئەگەر ویستمان بچینە نێو دنیای ڕەگەز و شوێنی سەرهەڵدانی ئەم ڕۆمانانە، دەبێ ڕۆمانە خۆرئاواییەکان نەکەینە پێشەنگی خۆمان، بەڵکو پشت بە خەسڵەتە خۆرهەڵاتییەکانمان ببەستین و هەتا ئەم ڕۆمانانە بشگێڕینەوە بۆ قۆناخەکانی مێژووی دێرینمان. هەروەها پێویستە بڕوانینە لەفسانە و حیکایەتە کۆنەکان. بە باوەڕی من سەرجەمی سەربردە و داستانە مێژووییەکان لە ڕۆمان دەچن. گێڕانەوەی ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلامی و عوسمانی لە ڕۆمان دەچن. بۆ نموونە گێڕانەوەی گەشتە پڕ دۆزینەوە تازەکانی (ئەولیا چەلەبی) لە زنجیرەیەک ڕۆمان دەچن. من پێم سەیرە زۆربەی ڕۆماننووسانی تورک ئەم شاکارانەیان فەرامۆش کردووە و ڕوویانکردووەتە ڕۆمانی خۆرئاوایی و شێوازی خۆرئاوایی لە هەڵپێچکاندنی ڕۆماندا، وەک بڵێی هیچ سەروساختێکیان لەگەڵ ئەم هەموو شاکارانەدا نییە. گەلێک نموونە هەن دەتوانین بیانگێڕینەوە، وەک چیرۆکەکانی هەزار و یەک شەوە و چیرۆکی کەرەم و ئەسڵی و چیرۆکی لەیلا و مەجنوون، ئەمانە تێکڕا ڕۆمانی گرانبەهای داستانەن. بەڵام یەکێک بەم پێیە بە تۆزینەوە و پەردە لەسەرلادان لای لەم شاکارانە نەکردووەتەوە. گەلێک سەربردە لەسەر هێرشە ئیسلامییەکان هەن لە شێوەی ڕۆماندا دەگێڕدرێنەوە.

ی.ک ئایا ڕۆژانی منداڵیتان زۆرتان لەمانە خوێندەوە؟

س.پ بەڵێ، ئەوەم بۆ باس کردن. مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە وەختێک سەرانی سەرچاوەی ڕۆمانەکانمان دەکەین دەبێ بگەڕێینەوە لای بەها مێژووییەکانمان. پێدەچێ نەکرێت ڕۆمانە نوێیەکان بەبێ ڕەخنە گرتن لەم نموونە و شاکارە مێژووییانە پەرەبستێنن. لەبەر ئەوەش کە ڕۆشنبیری تورک لە قۆناخی خۆرئاوایی بوونێکی گەورەدا دەژی، ئەمانە و دەسەڵاتی ئەوەی نییە ئەم ڕاستییانە ببینێ. با جارێکی دیکە بێینەوە سەر مەسەلەی کورد. ئەو چەرخەی کە ئێستا مرۆڤی کوردی پێدا تێدەپەڕێ، چنینێکی مەزنی هەر ڕۆمانێکی ڕەسەنی خۆماڵییە. ئەمە چەرخی وێرانکاری یا تراژیدیای وێرانکاری کۆنە - یا چی ناوەڕۆکی بێنن - و قۆناخی هەڵکشانێکی مایەی سەرسامی و قۆناخی ڕووخانی خود و بنیاتنانی خودێکی تازە و دارزانی پێوەندییە کۆنەکان و بنیاتنانی پێوەندی تازەیە، یان تێکشکانی کەسایەتی کۆن و بنیاتنانی کەسایەتی تازەیە. هەروەها دنیای هەرەس هێنانی هەستە کۆنەکان و گەشەکردنی هەستە تازەکانە بە جۆر و شێوازی پێوەندییەکانیشەوە. بە گشتی چۆنایەتی ژیانیەتی.

ڕۆمانیش بەش بە خۆی دەست بۆ ئەم لایەنانە دەبات. ئەمە لایەنێکی ئەدەبی کەم وێنەیە و ئەو نموونانەی کە باسم کردن ئەزموونی ڕۆماننوس لەو قۆناخەدا دەگێڕێتەوە کە تێیدا دەنووسێ بۆیە ڕۆمانی فەرەنسی ڕاستەوخۆ پێبەستەی شۆڕشی فەرەنسییە و لا لە ماوەکانی پێشوو و داهاتووی ئەم شۆڕشە دەکاتەوە.

پێویست ناکات لەم لایەنەدا قووڵ ببینەوە، چونکە پێوەندیەکە بەکجار تووندوتۆڵە. ئەم مەسەلەیە سەبارەت بەو هەموو دەوڵەتانەی ئەورووپا کە لە قۆناغی شۆرشی بورژوازیەکاندا ژیان، حاشا هەڵنەگرە. هەروەها پێوەندی ڕۆمانی ڕووسی بە شۆڕشی بەڵشەوی و قۆناغی پێش و پاش ئەم شۆڕشەوە راستی‌یەکی بێ‌ئەملاوئەولایە.

ی.ك: ڕۆمانی (باوکان و کوڕان)ی تورجینیف نموونەیەکی هاوجووتی ئەکەتانە، کەسایەتی ون لە باوکدا دەنوێنرێ و کەسایەتی پاشەڕۆژیش کوڕ دەینوێنێ. ڕۆمانەکە ناودارترین ڕۆمانی جیهانە لەسەر بناغەی ملمڵانێی نێوان ئەم دوو کەسایەتیە دامەزرابێ. لینین ڕۆمانی (باوکان و کوڕان)ی زۆر خۆشدەویست.

س.پ: بەڵێ. ئەمخوێندووەتەوە. بێ‌گومان مەزنی ڕۆمانی ڕووسی لەو هەلومەرج و پێوەندیە هۆزایەتیە تورسانەوە دێت کە کۆمەڵگایان هەڵدەسووڕاند. هەڵوەشانەوەی ئەم پێوەندیانە و لەو شۆڕشە ریشەییەش کە قەوما کێشایانەوە بۆ گەلێك زەبری کاریگەر و، پێوەندیەکانیان ناکۆك و تێکچڕژاو کرد و بوونە هۆی لە دایك بوونی سیستەمێکی تازە. جا کاتێکیش دێینە سەر ڕۆمانی تورکی، تۆ باسی باروودۆخێکی جێی واق ورمان و دڵگوشین دەکەی.

ی.ك: دەتوانم بڵێم دەگاتە لوتکەو ئەمجا دەبڕێتەوە وەك رومانووسیی یەشار کەمال کە لوتکەیە، بەڵام دەبڕێتەوە و پاش ئەوە هیچ.

س.پ: ڕوونترین نموونە لەسەر ڕومانووسیی یەشار کەمال ڕۆمانی (حەمەدۆك)ەکەیەتی کە لەم ڕۆمانەدا لا لە ڕووداوێکی سەربەخۆ دەکاتەوە. بە رای من لاکردنەوە لە کەسایەتی ڕێگر (چەتە) بە شیکردنەوە، زانیاری زۆرمان لەسەر کۆمەڵگا و راستی پێوەندیە تێدا دامەزراوەکانی ناداتێ. لەوانەیە چیرۆکێك یا حیکایەتێك بێ، بەڵام ناتوانێ ببێتە ڕۆمانێکی کۆمەڵایەتی راستگۆ. ڕۆمانی کۆمەڵایەتی راستەقینە دەبێ پشت ببەستێت بە هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی‌یە چنراوە کۆنەکان و چنینێکی تازەی ڕێکخراو لە پەیوەندیەکان دروست بکات، ئەوسا دەتوانین حوکم بدەین کە ڕۆمانە. خۆ ئەگەر لای لە دۆخی نیوەچڵ کردەوە و سەرلەبەری کۆمەڵگای نەگرتەوە، ئەوا لە چوارچێوەی حیکایەت یا چیرۆکدا دەمێنێتەوە.

ی.ك: لەوانەیە تێبینی‌یەك هەبێ پشتگیری لەم خاڵە بکات کە باسی دەکەن، ئەویش ئەوەیە گەلێك ڕەخنە نارەاستەی ڕۆمانی (حەمەدۆك)ی یەشار کەمال کران چونکە ستایشی پێوەندیە هۆزایەتیە بەسەرچووەکان دەکات، ستایشی بەگەکانی (ئەدەنە) دەکات.

س.پ: دیارە ئەمە راستە. تەنانەت ئەم ڕۆمانەشم باش نەخوێندووەتەوە. بەڵام بە تێگەیشتنی من لا لە نیشتەجێکردنی تورکمانە چیاییەکان لە ناوچە دەشتاییەکاندا دەکاتەوە. ئەو گوندە کە پاڵەوانی ڕۆمانەکە ڕووی تێدەکات، گوندێکە ئەوەی کە لێی دەچێتە دەرێ بۆ چیا دەبێتە ڕێگر و کە لێیەوە دادەمەزێتە دەشتایی دەبێتە

بەگ. بۆیە نووسەر ناچار دەبێ پێکەوە ستایشی هەردووکیان بکات. بێگومان ئەمە لەوەوە دوورە وێنەیەکی هەمەلایەنە و ڕاستگۆیانە لە بارەی واقیعی دامەزراوی ئەو قۆناغەوە بەردەست بخات. ئەم ستایش و گەورەکردنەی بەگ و ڕێگر - بە قەناعەتی من - دوورن لەوەی کە ببنە بابەتێکی کۆمەڵایەتی فراوان، بەڵکو لەوەوە نزیکە ببێتە جۆرە حیکایەتێك یا داستانێك لە داستانە کۆنەکان.

ی.ك: ڕاستە. شێواز شێوازی داستانە و زمانی زیندەڕۆیی تێدایە.

س.پ: لە داستانە کۆنەکان دەچێ. تەنانەت من دەتوانم بڵێم ئەم ڕۆمانە لە ڕاستییە مێژووییەکانی قۆناغی عوسمانییەکان و تا ڕادەیەك مێژووی کۆماری تورکیاشەوە دوورە. ئەوی ڕاستی بێ یەشار کەمال حەزناکات بچێتە نێو ئەم ڕاستیانە، بەڵکو لێیان هەڵدێت. لەمە تێناگەم. ئەمە هەڵوێستیەتی دەرهەق بە مەسەلەی کوردیش. ڕاستیەکەی یەشار کەمال لە کوردە کۆچ پێکراوەکانە بۆ ناوچەی (چوقوور ئۆفە). ئیدی بۆچی لا لەم واقیعە ناکاتەوە؟ بۆچی دەترسێ؟ هەتا دەتوانین ڕەخنە ئاراستەی ئەدیبانی دیکەش بکەین. ئەوانە قوربانی دەستی کەمالیزمن، چونکە لەو ڕۆشنبیرانەن کە لە کەمالیزمدا توێندرانەوە و هەرگیز ناتوانن باسی ڕاستیەکان بکەن و بێپێچ وپەنا پێشانیان بدەن. بە قەناعەتی من ئەمە ئەو ڕەخنە سەرەکیەیە کە دەکرێت ئاراستەی یەشار کەمالی بکەین. چونکە بایەخ بە لق و پۆپ دەدات نەك ڕەگ و ڕیشە.

ی.ك: ئەمە چنینێکی گونجاوە. دەکرێت هەڵکشانی کورد بە نموونە وەربگیرێت.

س.پ: هەرگیز نەیدیوە و نایبینێ. بگرە لەوەش خراپتر، حەزناکات ئەو ڕەشەکوژی و قڕکردنەی ئەزادی مرۆڤ ببینێ کە دەرهەق بە کوردان دەکرێن. چیرۆکی یەکێك لەو کەسانە دەگێڕێتەوە کە لە خێڵەکەی دوور کەوتووەتەوە، بەبێ ئەوەی بێتە سەر دووراییە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی ئەم ڕووداوە و بەبێ لەوەی ڕاستییە کۆمەڵایەتییە بنچینەییەکان پێکەوە گرێ بدات. دەست بۆ ئەم چیرۆکە دەبات وەك بڵێی ڕووداوێکی تا ئەوپەڕی تاکە کەسییە و لە دەوروبەرەکەی داماڵراوە. ئەمە کارێکی گومان لێکراوە و پێویستە لێی بپرسین: چۆن زاتی ئەم جۆرە کارەت کرد؟ ڕۆمانێکی وا دەبێتە هۆی چ شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی؟ پێم خۆشە ئەمە بپرسم. ناکرێت ئەم جۆرە ڕۆماننووسە خزمەتی هیچ شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بکات و، هیچ کاریگەرییەکی نییە. لەم ڕووەوە دەتوانین باسی (ئورهان کەمال)یش بکەین. ئەمە کەمێك باسی ئاڵوگۆڕی پڕۆلیتاریایانە دەکات.

ی.ك: باسی خۆشەویستی مەزنی گەل دەکات.

س.پ: کەمێك. ئەویش چارەسەری پێ نییە. هەر چاودێری پێیەسە. ئەمە نابێتە هۆی چارەسەر. (خۆل) شاکارێکیەتی، خوێندمەوە و کاری تێ کردم. هێشتا دیمەنی (زەینەل)ی کوردم لەم ڕۆمانەدا لەبیرە کە لە (چوقوور ئۆفە) لە ناوەندی

ئارەق و خوێندا کاری دەکرد. ئەو هەر چاودێریکردنی ڕووداوەکانی پێ بەسە.

ی.ك: ئۆرهان کەمال لە هەموو نووسەرانی تورك زیاتر لە خولیای مرۆڤایەتییەوە نزیکە بە ڕاستگۆیی.

س.پ: ڕێزی ئەم لایەنەیم تێدا گرتووە و زۆر نرخاندوومە. بەڵام ئەمە چارەسەر نییە، بەڵکو تەنها چاودێرییە، ئەگەر چی چاودێرییەکی بەمانادار و زۆر ڕاستگۆیانەیە. یەشار کەمال ئەمەی نەکردووە. هەوڵدەدات شیبکاتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی داماڵراو و لە بری ڕەگ و ڕیشەش بایەخ بە لق و پۆپ دەدات و ئەمجا هیچ دەروویەك لەو ناوەدا نییە. تەنانەت ڕوونی ناکاتەوە چ بەرەسەندنێکی کۆمەڵایەتی گەرەکە. جا لەبەرئەوەی کە ڕۆمانەکەی گەلێك ڕاستی دەشارێتەوە، بۆیە چەندین دوورایی ترسناکی هەن.

ی.ك: لەم بارەیاندا ئەحمەد عارف دەبێتە شاعیری یەشار کەمال.

س.پ: بێ گومان. هەمان نموونەیە. ئەویش لە دیاربەکر ڕیشەکێش کراو لە (جان قایا) دادەنیشن. ئەمە ڕیشەکێش کرانێکی خراپ و نیشتەجێ بوونێکی خراپترە. یەشار کەمال لە (وان) هەڵکەندراوە و هاتووەتە (چووقوور ئۆڤە). ئەمجا لەوێش هەڵکەندرا و لە (ئاتاکۆی) دانیشت و وەك سرێشی چەسپ کردن لەوێ نابێتەوە، یان کەسانێك هەن بەم جۆرە بەوێنەی نووساندوون. ئەحمەد عارف پێش ئەوەی بمرێت گوتی: «ئەمە چی لە من دەوێ؟»، لە کاتێکدا کەمێك ڕەخنەم لێ گرتبوو. کوڕەکەی ناونا (فیلینتا) و پاشتر دەرکەوت فیلینتای کوڕی بە کردەوە لەو بڕوکە باغانەی فیلینتا بەدەرنییە کە لە دووکانەکان دەفرۆشرێن. زۆر خەفەتم بۆ ئەمە خوارد. لەوەتا کوڕی شاعیری شۆڕشی فیلینتایەکی باغەیە. ئەمە لە جان قایا ڕوویدا.

ی.ك: مخابن کە ئاوا بوو.

## نازم حیکمەت لە دەستی کەمالیزمدا دیلە و ستایشکەریتی ئەمەش باروودۆخێکی درامییە.

س.پ: بێ گومان. دیارە باسی (جەمال سورەیا)تان کرد. پێم وایە ئەویش ڕۆڵەیەکی دیرسیمە. وا ناوی دێنن کە شاعیرێکی باشە. پێویستە کەمێك لە شاعیریی جەمال سوورەیا تێبگەین کە بەشێکی لە شاعیریی ڕۆڵەکانی دیرسیم پێشان داوە، بەڵام شاعیرییەکی نامۆیە. ئەوی ڕاستی بێ ڕۆڵەکانی دیرسیم بارێکی گیانی تایبەتیان هەیە. لەم بارە گیانییەش لەو کوشتارانەوە دێت کە کەمالیەکان دەرهەق بەوان کردیان و کێشایەوە بۆ نامۆیی گیانییان لە واقیعەکەیان. بۆیە بە خوایشتی خۆیان بەم واقیعە و بە تواندنەوەی نەتەوەیی لە چوارچێوەی تورکیادا قایل بوون. لەوانەیە ئەمە بەرهەمی خەمی مێژوویی یا خەفەت و شتی لەم بابەتە بێ. لەم بارە گیانییە دەبێ بە شیعر و لە زاریان دێتە

دەری، بەڵام شیعرێکی نامۆیە نە بە مێژووی، خۆیەوە و نە بە فۆرماخەکانی دروست بوونیەوە گرێ نەدراوە و ئامانجەکانی نادیارن ، نازانین چ مەبەستێکی هەیە. پێم ناکرێت چۆنیەتی دروستبوونی شیعر و رەخنەلێگرتنی شیبکەمەوە، بەڵام زەحمەت نییە هەرلە یەکەم روانینەوە ئەوە ببینین کە پێشتر لێیدووام. شیعرەکانی هیچ مانایەکی نیشتمانییان تێدانییە و ئەم لایەنەش زۆر گرنگە. ئامانجی شیعریشی تەواو ئاڕۆشنە و، تەنانەت هاندەرەکانی شیعریش لەلای ئەو نادیارن، ئەم هەموو خاڵانە ڕاستی ناکۆکی دیترسیم و لەو بەهایانە دەردەبڕن کە تورکەکان لەوێ تەوو چێنیان کردن، یان ئەو شێوانەی کە تورکەکان بەسەر ئەو ناوچەیەیاندا سەپاند، جەمال سورەیا لەم واقیعەوە دێت کە باسمان کرد.

ی.ك: بەڵێ. تەمەنیشی کورت بوو.

س.پ: با یەك یا دوو وشەش لەسەر نازم حیکمەت بدوێین، چونکە زۆر کەس لێیدواون، بەڵام من تا ئێستا باسم نەکردووە. ئەم شاعیرە کە تووشی جۆرەها ئازار بوو بە دەستی کەمالیزم و دانی بەوە دانا، کەمالیزم بە خۆی گرت. من ناچارم ئەمە بڵێم، چونکە بە خۆگرتن بەشێکە لە کەلەپووری تورکی. ئێوە لە کتێبەکەتاندا (سولتان محمد الفاتح) باسی ئەو میرە (سربی)یە دەکەن کە سولتان بە خۆی گرت و لە خۆی نزیك کردەوە و کردی بە نۆکەرێکی کۆشکی سولتانی. ئەم چیرۆکەی خوارەوەم لەبارەی مستەفا کەمالەوە بیستووە.

جارێکیان لە شوێنێك لە دەوری خوانێکی خواردنەوە دانیشتبوو و (نازم)یش لەسەر خوانێکی دیکەی دوور لەو دانیشتبوو. مستەفا کەمال یەکێك بەدوای (نازم)دا دەنێری بێتە سەر خوانەکەی، (نازم)یش دەڵێت: برۆ پێی بڵێ من بوکی زەریا (ئەفنالیا) نیم. ئەم قسەیە بەڵگەی ئەوەیە کە نازم ئارەزووی کردووە ببێ بە بوکی زەریا، ئەری وانییە؟ لەمە حاشا هەڵنەگرە. بە باوەری من ئەو تا ڕادەیەك بوو بە بووکی زەریا. بەم پێیە پێوەندی نێوان نازم و کەمالیزم ساغ دەبێتەوە. لەوانە بوو لە بەندیخانە هەڵبێت و دەرباز ببێ، بەڵام بارودۆخی لە هی ئەو میرە سربییە دەچوو کە پەنای لە سولتان (محمد الفاتح) گرت و تێکشکا و هەڵگەرایەوە. پەلپگرتنی نازم لە کەمالیزم ئەوکاتە سەری هەڵدا کە لە بەندیخانە «بەندیخانەی کۆماری»دا بوو، وانییە؟ ئەوی جێی مردن و تێکشکانی هیواکان بوو. سەرنج بدەن ئەو کتێبەکەی «داستانی هێزە نەتەوەییەکان» دەنوسێت و پاشتریش ستایشی دەکات.

ی.ك: بەڵێ، لە سازشکاری دەچێ.

س.پ: بەڵێ، هەوڵبدەن باش لە نازم حاڵی ببن، ئەو دیلی دەستی کەمالیزم و ستایشکەریەتی. ئەمە بارودۆخێکی دراماییە. لە بەندیخانە هەڵاتنی پاش ئەم بارودۆخە دراماییە بوو. هەڵاتنی زۆر گرنگە. پێم وایە نازم بە هەڵاتنی بۆ یەکێتی سۆڤێت دۆڕاندوویەتی. هێندێك کەس دەڵێن بوو بە شاعیرێکی گەورە، بەڵام من وای بۆ دەچم کە ئەوە ڕاست نییە. ئەو ساڵانە نەریت وابوو کەسانی

هاوچەشنی ئەو بەشە زۆرنازیی پڕوپاگەندەی سۆڤێت. ئەوی ڕاستی بێ ئەمە
بارودۆخی ڕاستەقینەی ئەو بوو. دیارە من لایەنەکانی دیکەی ژیانی فەرامۆش
ناکەم. گەلێك شیعری جوان و سەرنجڕاکێشی نووسیون، بەڵام بەلای منەوە پەیوەندی
بە خاکی تورکیاوە و هەوڵی هەڵەکەندرانی لەم خاکە گرنگن، چونکە هەموو
کۆچکردنێك دەکێشێتەوە بۆ ڕیشەکێش بوون. ئەگەر ئەم ڕیشەکێش بوونە
بەرخودانێکی بەرانبەر نەبێ، سوودی چییە؟ بۆ نموونە دەچێتە باکۆ و باتووم و
گۆرانی بۆ نیشتمان دەڵێت و بەسەریدا دەگری، بەڵام نە هیچ کردەوەیەکی
لێدەوەشێتەوە و نە کەس دەیناسێ. منیش چواردە ساڵە لە نیشتمانم
دوورکەوتوومەتەوە باش لە مانای لە خاك هەڵکێشران و لە گەل دوورکەوتنەوە
تێدەگەم، بەڵام کەس ناتوانێ بە خیانەتکاری نیشتمان تاوانبارم بکات و کەس
نییە وەك من نیشتمانی خۆی خۆش بوێ و هەستە نیشتمانەکانی گەشەیان
کردبێ و لە ڕووی پێبەست بوونیەوە بە گەل و نیشتمانەکەیەوە شان لە شانم بدات.
من ئامۆژی ئۆرمەتی کەسەرخەمی و پەنابەری بەخەمیال هەریەکێك لە نیشتمانەکەی
دوور دەکەوێتەوە. چەندەها کەس هەن لەسەر خاکی نیشتمانیان و لە ڕاستی
خۆیانەوە دوورن و لە ئامۆژیدا دەژین بگرە دەرهەق بە نیشتمانیان خیانەتکارن،
هەرچی (ئازم)ە دەڵێن لوتکەیە، بەڵام دەبێ بە شێوەیەکی واقیعیانە ئەم لوتکەیە
هەڵبسەنگێنین. گەلێك نووسەر و وێنەکێش لە تورکیا هەن هەمان ڕێچکەیان
گرتووەتەبەر و دەبنە هۆی خۆلقاندنی قەیرانی فیکری لە بری ئاسانکردن و
ڕوونکردنەوەیان. من هەرگیز بەرهەمیان ناخوێنمەوە، چونکە بەر ڕووانیم
پێنابەخشن و ئەگەر خوێندمەوە بەروڕاکانم تێکەڵ و پێکەڵ دەبن.

ی.ك: منیش هەوڵی خوێندنەوەیان دەدەم بەڵام ناتوانم. هیچ شتێکیان نابێتە
مایەی بایەخ پێدانم.

س.پ: بۆچی؟

ی.ك: سەرلەبەریان باسی بەزین و مردن دەکەن.

س.پ: نەك هەر ئەمە، بەڵکو لە ئەمڕۆلیش. زۆریان ئازانن پێیان لەسەر چ
بناغەیەك قایم کردووە، ئەوان خۆ لە بناغە دەدزنەوە. ئەمە واتە دوورکەوتنەوە لە
ڕاستییەکان، ئەوان بە تایبەتی زۆر لە ڕاستییە سیاسییەکان دووردەکەونەوە و تەنانەت
بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بەکار دەهێنرێن. بێگومان ناتوانی ئەم جۆرە
بەرهەمانە بخوێنیتەوە. زۆریان بەم شێوەیەن، وەك (ئەتێللا ئیلهان) و هی دیکەش.
ئێوە ئەم جۆرە بەرهەمانەتان خوێندووەتەوە و ڕاشبەرانتان شی کردووەتەوە. من
حەزدەکەم کەڵك لەم شیکردنەوەیەتان وەربگرم. ئەو ئەنجامە دیارە چی بوو کە بە
دەستتان هێنا؟

ی.ك: وەرزی و بەروالەت لە دەوڵەت دوورکەوتنەوە و یەکەم دەرفەتی ڕەخساو
قۆستنەوە بۆ دووبارە گەڕانەوە نێو باوەشی دەوڵەت. سەرجەمی ڕۆماننووسانی لاوی
کوردو تورك کە لە گەڵ (١٢)ی ئەیلوولدا سەریان هەڵدا، بە نووسینی،

ڕۆمانووسانیان حوکمی لەنێوبردنی شۆڕشگێڕانیان داوە.

س.پ: تۆ مەبەستت ئەوەیە ئەوانە ئاسۆی دەوڵەتیان تێنەپەڕاندووە وانییە؟ ئەگەر ویستت ئاسۆی دەوڵەت تێپەڕێنی و لە بەروڕاندا سەرپەڕگری، دەبێ لەك هەر گوێ بە چۆنیەتی تێپەڕاندنی ئەم ئاسۆیە نەدەی، بەڵکو پێویستە بنچینەکانی بەرخۆدانیش دابنێی. ئەمە لە تورکیادا نییە.

ی.ك: بەڵێ... تەنیا کۆتایی هاتن هەیە.

س.پ: بێگومان. دەزانم مرۆڤی تورك خاوەنی چەندین بەهرەن و کۆ لەوە ناکەنەوە هەوڵێکی زۆر بدەن. بەلام شێواز و پایەکانیان لە واقیعەوە دوورن بە شێوەیەك ناتوانن خۆ لە هەڵوەشان دەرباز بکەن. بە باوەڕی من دەبێ چاو بە بنچینەکانی ئەو نەتەوە پەرستی‌یە تورکی‌یەدا بخشێننەوە کە لێیەوە دەست‌پێ‌دەکەن. ئەگەر سەرلەنوێ کەمالیزم یا عوسمانی‌چێتی هەڵنەسەنگێننەوە، ئەوا خاکی ئەنادۆڵ مرۆڤی باشی لێ لە دایك نابێ. لە ساڵان و هەتا ئەم سەدالەی دواییشدا ئەمە ڕووی نەداوە. بەلام ئەم خاکە پێش ئەوە لە سەدەکانی سەرەتا و ناوەڕاستدا مرۆڤی مەزنی خستەوە. خەڵکانێکی خستەوە خاوەنی گەلێك بەهای مەزن بوون بۆ سەرپاکی مرۆڤایەتی، وانی‌یە؟ هەرکاتێك ئاسۆی نەتەوەپەرستی بەرتەسك بووبێتەوە و کەمالیزم نەشئەی کردبێ و مرۆڤی تورك چووبێتە نێو قاوغی خۆی و سوڵتان لەسەر حسێبی لات و پووت بوونی دەست و پێوەندەکانی گەورە بووبێ، ئەو کاتانە نووسەری گەورە دەرنەکەوتوون.

ی.ك: دەرنەکەوتوون. بەلام نموونەکانی نازم و یەشار و ئەحمەد عارف لانی کەم شتێکیان دەنواند. لایەنی سەرنجڕاکێشیش ئەوەیە تەنانەت نموونەی وەك ئەوانەش لەم قۆناخەدا دەرناکەون.

س.پ: بێگومان مەبەستتان قۆناخی پاش (١٢)ی ئەیلوولە.

ی.ك: بگرە مەبەستم ساڵانی حەفتاو هەشتایە.

س.پ: ئەمە پێوەندی‌یەکی لە پەسان نەهاتووی بە ڕاستی‌یە بەرچاوەکانەوە هەیە. دەتوانم بوتانی لێك بدەمەوە بۆچی لە سەدەکانی ڕابردوودا بەهای گەورە گەورە هەبوون؟ چونکە دەوڵەت و کۆمەڵگا تا ئەم ڕادەیە بێ‌داروبار نەبوو بوون، یان پێوەندی دەوڵەت بە کۆمەڵگا و هی کۆمەڵگاش بە دەوڵەتەوە تا ئەم ڕادەیە گەندەڵ نەبوو بوون. بەلام ئێستا دەوڵەت کۆمەڵگا بەکاردەهێنێ و تا ئەو پلەیە کاری تێ‌کردووە کە ئیدی کۆمەڵگا ناتوانێ مرۆڤی مەزن یا هەلکەوتوو بخاتەوە.

ی.ك: کێشەی قۆرخکردن لە گۆڕێدایە.

س.پ: بێگومان. قۆرخکاری تەوەر و ناوەندی ئەم کارەیە.

ی.ك: واتە لە ساڵانی هەشتاوە و بە تایبەتی لە پاش (١٢)ی ئەیلوولەوە مرۆڤی تورکیان کردووە بە سپەرکێك. دیارە سپەرك نە شیعری هەیە ڕێك بخرێت و نە ڕۆمانیش بنووسرێت.

س.پ: ئەمە ڕای زۆر کەسە. ئەوان دەڵێن کەرتی لاوانی ڕووشنبیر بە یەکجارەکی

لە خوێندنەوە و لەوونەی باڵا و تەنانەت لە زیتەلەبیش دابڕاوە. ئەگەر دەتەوێ ئەوە ناوبنێی زیانی سیسرکان یا ژیانی هەر مێرووبەکی دیکە. ڕاستییەکەی زیانێکی مێروو ئاسا لە ئارادایە.

ی.ك: ئەمە تێکشکانێکە باوەڕی پێناکرێت. خۆ پڕوپاگەندەی جنسی لە چلەپۆپەدایە، جا هەر چۆنێك ناوی مێروو یا هەر شتێکی دیکە بێ. بەڵام ئەمە تەرزی ژیانیانە .

س.پ: ئەم هەڵدێرە ڕوو لە زیانێکی ئاژەڵانەیە. ئەمە دۆزینەوە نییە. با ناوی تێکشکان یا هەر شتێکی دیکە بێ. بەڵام لە گەوهەریدا ژیانی سەرەتایی تێدایە و دەزگاکانی ڕاگەیاندن برەو بۆ ئەم ژیانە پەیدا دەکەن. وەك بڵێی دۆزینەوەی تازەی جیهانی ئیمپریالی بێ. ئەخێرا هەتا ئەگەر ئێمەش پێملی پرنسیپەکانمان نەبین. بەم پڕوپاگەندە و چاوبەستانە دەخەڵەتێنرێین. بەڵام ئەمانە دەم لە چ دۆزینەوەیەك دەژەن؟ خۆ کاتێك ساکارترین شێوەی بەرهەمهێنان بە پڕوپاگەندە دەبێتە شتێکی گەورە، ئەمە گەڕانەوە و چوونەپاڵ ژیانی سەرەتایی دەگەیەنێ.

ی.ك: ئەوە دوایی بە مرۆڤ دەهێنێ.

## موسا عەنتەر درەوشانەوەیەکی لای ئێمە بینی، بۆیە لێمان نێزیك بووەوە و سەرلەنوێ ژیانی بە بەردا کرایەوە و بوو بە لاوێکی جوانخاس.

س.پ: بێگومان. ئەمە لە بازاڕی ڕۆژانەدا زاڵە. ئەگەر ڕۆمانێك لەسەر ئەم بابەتە بنووسم، لەوانەیە ناوی بنێم هەڵوەشانەوە یا هەرەس هێنان یان ڕەنگە ڕۆمانی بستەباڵا بوون بێ. دەکرێت شیکردنەوەی درێژ درێژ لەسەر ئەم بابەتە بکەین. بەڵام ئێستا کێشەکەمان ئەوە نییە. ئێوە دەچنەپاڵ ئەوەی کە دەڵێت باروودۆخەکە لە کوردستان تەواو پێچەوانەیە. من ئارەزوومە ئەم لایەنە کەمێك ڕۆشن بکەمەوە چونکە ئەم قسەیە ڕاستە.

ی.ك: باڵا کردنێك هەیە.

س.پ: درەوشانەوەیەکی کوردانە هەیە، بە تایبەتی ئەگەر ئەم درەوشانەوەیە لە لای خاوەنەکانی نەبینراو و بەخۆوە نەگیراو بێ. جۆرە درەوشانەوەیەکی دیکەش هەیە، ئەم بارەیان بە ژیانەوە ناودێر دەکرێت. دەتوانم ئەم لایەنە ڕوون بکەمەوە. پێویستە ئەم ژیانەوەیە جوێنکەرەوەی خۆی هەبێ.

ئێوە دەزانن بنچینەکانی درەوشانەوە یان ژیانەوە لای فەرەنسییەکان لە سەرەتاکانی سەدەی شازدەیەمەوە دەستیان پێکرد. سەرەتا هێندێك ڕێبازی فەلسەفی دەرکەوتن، پاشان چەند ڕێچکە یا تەوژمێکی ئەدەبییان بە دوودا هات و، ئەمجا هێندێك ڕێبازی فیکری گەشەیان کرد و دۆزینەوەی زانستی دەستی پێکرد و

هەنگاوی شۆڕشگێڕانە گورج بوونەوە و بە بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسە تەقینەوە. باسی سەردەمێکی مێژوویی دەکەین کە خۆ لە دووسەد ساڵ لەمەوبەر دەدات.

شۆڕشی ڕووسیاش لە ساڵی ١٨٢٥ بەدواوە دەستی پێکرد و چەرخی ئەدەبی لە ساڵانی پەنجای سەدەی نۆزدەوە دەستی پێکرد و لە ساڵانی حەفتای هەمان سەدەدا جوڵانەوەی (نارۆدنیك) و لە ساڵانی نەوەدەکانیشدا جوڵانەوەی مارکسی پەرەیان سەند. هەر لەسەرەتای سەدەی بیستیشەوە ئاڵوگۆڕی شۆڕشگێڕانە دەستیان پێکرد. واتە کۆی ئاڵوگۆڕەکە کاتێکی پێدەچێ لە نێوان (١٠٠-١٥٠) ساڵدایە.

بەڵام بەسەرهاتی کوردی ئاوا نییە. ئەگەر سەرکەوتبێ یا نەمابێ، ناچاری ئاڵوگۆڕ یا پەرەسەندن بووە لە ماوەیەکی یەکجار کورت خایاندا، چونکە جۆر و قەبارەی ئەو گوشارانەی کە خراونە سەر زمان و ژیانی کۆمەڵایەتی و هەموولایەنەکانی دیکە وایان لێکردووە دەست بەستە و توند کۆنترۆڵ و چاودێریکراو بێ و لەژێر ئەم گوشارانەدا بناڵێنێ. (ئیسماعیل بێشکچی)ی مامۆستای گەورە و پایە بەرزمان لا لەم خاڵەش دەکاتەوە و دەڵێت: باروودۆخی کوردستان لە هی کۆلۆنی زیاتر بە قوڕدا چووە و پڕ مەترسییە. بە ڕای من ئەم باروودۆخە دەرئەنجامی ڕەشەکوژی و قڕکردنی نەژادە. جۆرەها زەبروزەنگ هەن وەك یەك یا دوو زللە تێسرەواندن و ئەمجا مرۆڤ دەبێتە ئامرازێکی ملکەچ و بە ئاسانی بەکاردێت. جۆرەها زەبروزەنگ هەن مرۆڤ تا دوا هەناسە لەنێو دەبەن. یەکەمیان پشت بە دووزللە دەبەستێ تا مرۆڤ بکاتە ئامێرێکی ملکەچ و بە ژیان بیهێڵێتەوە. هەرچی دووەمە بەردەوام ستەم و زۆری لێدەکرێت، مادامێکی مرۆڤی کورد لە ژیاندا ماوە و پێویستە هەناسە نەدات و لە چوغزی زەبروزەنگ نەبێتە دەرێ و تەنانەت بواری نەبێت بڵێت: «ئای ... من دەمرم» و نەتوانێ مشتی بەرزبکاتەوە و کولمشتەیەك بگرێتە لایەکەی دی. لە کاتێکدا لایەکەی دیکە ماوەی مرۆڤی کورد نادات بڵێت: «دەیمە کرپلەی ئەلقە لە گوێت، بەڵام ڕێم بدە کەمێك بحەوێمەوە». ئەگەر لە سەردەمی عوسمانی و سەردەمی کۆماریش بە تایبەتی ورد ببینەوە، مەسەلەکان باشتر ڕوون دەبنەوە، لەوەتا لە ڕووی فیزیاییەوە بەرخۆدانەکان لەنێو دەبات ونۆرەی زمان لێزەوتکردنی دێت و ئەمجا ڕوودەکاتە ناوی گوندەکان و نایانهێڵێ. لەم هەموو کردەوانە ئەو مەودایە ڕوون دەکەینەوە کە کوشتاری بە کۆمەڵ پێی گەیشتووە. ئەمە ئەو باروودۆخەیە کە باسی دەکەم، باروودۆخێکە پرزەت لێدەبڕێ.

ناکرێت لە باروودۆخ و پەرەسەندنێکی مێژوویی لەم جۆرەدا مرۆڤی کورد بەو قۆناخانەدا ڕەت ببێ کە لە شۆڕشەکانی دیکەدا باسمان کردن، وەك قۆناخی فەلسەفی و قۆناخی ئەدەبی و قۆناخی نارۆدنی و مارکسی.

ی.ك: ئەم هەموو قۆناخانە تێکهەڕیو دەبن.

س.پ: ئەگەر هاتنەوەی... ئەوە بە یەك کەرەت دەبێ. بەڵگەیەکی دیکە بۆ قسەکەی پێشوومان ئەوەیە: هەر کورتە چیرۆکێکی کوردی یا هەر شیعرێك بە

زمانی کوردی بنووسرێت، حوکمی لە سێدارەدانی لەسەر دەدرێت. ڕاست ئەمە ڕوودەدات. واتە مرۆڤی کورد ناتوانێ لە ڕووی یاساییەوە دیوانێکی شیعری جوان بنووسێ، هەتا ئەگەر بیشینووسێ نە خوێنەرێك و نە چاپکەرێك و نە فرۆشیارێکی چنگ دەکەوێ. ئیدی چۆن بتوانین باسی ئەزموونێکی ئەدەبی بکەین خزمەتی شۆڕش بکات؟ لەبەر ئەوەی ئەم ئەزموونە گەورەترین گوناهی سیاسییە، لێخۆشبوونی بۆ نییە، وانییە؟ نموونەی ئەوە (مووسا عەنتەر)ە کە ساڵانێکی درێژخایەن شیعر و ڕۆمان و شانۆنامەی نووسی، بەڵام سەرپاکی قەدەغەکران و ئەو هەموو شاکارانە ڕووناکییان نەبینی. دواجار دەرەوشانەوەیەکی لەلای ئێمە دی، بۆیە تووخسمان کەوت، چونکە دەبزانی ئەو جەماوەر و سەرکردایەتییەی دۆزیونەوە کە خەونیان پێوە دەبینێ و سەرلەنوێ ژیانی بەبەردا کرایەوە و وەك لاوێکی جوانخاسی لێهات.

ی.ك: وەك منداڵ وابوو، سەرلەنوێ لەدایك بووەوە.

س.پ: بەڵێ. سەرلەنوێ گیانی بەبەردا کرایەوە و وەك منداڵی لێهات. ئەم حاڵە گەلێك مەسەلە ڕوون دەکاتەوە، بەڵگەیەکی دەرەوشاوەیە لەسەر ئەوەی کە پێشتر گوتم. ژیانەوەی سەرلەنوێ و تازەبوونەوە بەرەو لاوێتی و لە مەسەلەی پارتی کرێکارانی کوردستاندا هەن. کەسانێك هەن پەنجا ساڵیان لە ژیانیان بردووەتە سەر بەبێ ئاکام. ئەمە ئەو ئەنجامەیە کە حەزمان دەکرد پێگەین.

ی.ك: قسەیەکم هەیە (ئیسماعیل بێشکچی)ی مامۆستای گەورەمان بۆی ڕاگواستم. ئەگەر بیرم بە هەڵەیدا نەبردبێ ئەمەیە: ئێمە بەر لە سەرهەڵدانی پارتی کرێکارانی کوردستان هاوبەشیشمان لە تێکۆشانی کوردیدا هەبوو، بەڵام...

س.پ: «تێکۆشانی ژێر سفر بوو. تێکۆشانێك بوو لە ژێر سفرەوە دەستی پێکرد و کێشەکەی بە سفر گەیاند». وا دەڵێت. بەڵێ لەبەرئەوەی کە ئەو لە ڕاستی گەیشتووە و خۆی دەناسێ و دەڵێت: «بەڵێ تێکۆشان گەیەندرایە ژێر سفر». ئەمە ڕاستییە و بەڵگەیە بۆ قسەی پێشووم. من دەمەوێ ئەوەی کە دەیکەین ڕوونی بکەمەوە. ئەگەر هەوڵ بدەم باسی ئەو تێکۆشانە بکەم کە لە ڕێگای فەلسەفە و لەدەبەوە بە ناوی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە دەیکەین، پێمان دەکرێت بڵێین: ئەوەی کە دەتوانین لە ڕێگای فەلسەفەوە بە پەنجا ساڵ پێی بگەین ناچار کرام لە درێژایی ژیانمدا بیگەمێ. ئەمە لایەنی ئاینیش دەگرێتەوە. تا بتوانین لە جێوڕێی ئاین لەلای مرۆڤی کورد و چۆنیەتی کارتێکردنی تێبگەین، پێویستە باسی ساڵانێکی دوورودرێژ بکەین. لە کاتێکدا من ناچارمام بە ماوەیەکی کورت ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەم. لەو ئەزموونە ئەدەبییەی کە پەنجا یا شەست ساڵی گەرەکە تا خزمەتی شۆڕش بکات، من وای لێدەکەم لە کاتی شۆڕشدا گەشە بکات و ببێتە بەشێك لەو شۆڕشە. لایەنە سەربازی و سیاسی و مۆسیقاییەکانیش بەم شێوەیەن. ئەو بارودۆخەی کە ئێستا دەیبینین ئاوایە: ئەو توانایانەی کە بە درێژایی چەندین سەدە و بە چەند قۆناخێك لە شێوەی چەند خولیا و ئەزموونێکدا لای

هێندێك گەل پەرەیان سەند، ناچاربووین بە شێوەیەکی تێکهەڵپێچراو لەیەك کاتدا و لە وێنەی تەقینەوەدا بە جێیان بهێنین و پەرەیان پێبدەین. هۆی پشت ئەوە جۆری گوشار و زەبروزەنگ و کەڵەکەبوونی خراپییە مێژووییەکانی سەدان ساڵ بوو. هەموو ئەمانە هەلیان پێدابێ ئەم ڕێچکەیە بگرینە بەر. لەوانەیە کەسایەتی من دەربڕینێکی ڕاستی ئەو بارودۆخە بێ.

ی.ك: ئاپۆی خۆشەویستم، تەقینەوە لە کەسایەتی جوانی ئێوەوە بە چاو دەبینرێت. بەڵام مەودای ڕەنگدانەوەی ئەم تەقینەوەیە لەو مرۆڤە کوردەدا چەندە کە بە کردەوە بوونی خۆی سەلماندووە؟

## تەقاندنەوەی کەسێك کە ماوەی چوار هەزار ساڵە یەخەگیری ئازار و سەرکوتکردن بووە، ئەرکێکی زۆر گرانە.

س.پ: هەموو خەمێکم گەیشتنە بە شیکردنەوەی کۆمەڵگای کوردی. شیکردنەوەی من بۆ کەسایەتی، لە ڕاستیدا شیکردنەوەی کەسایەتی خۆمە، چونکە شیکردنەوەی کەسایەتی من کەسایەتی کوردی و پاشان شیکردنەوەی کۆمەڵگای کوردییە. بە واتایەکی دیکە دەڵێین: «بابەتی شیکردنەوەکە کەسێك نییە بەڵکو کۆمەڵگایەکە یا چینێکی کۆمەڵایەتییە و، بۆ ماوەیەکی دەست نیشانکراویش نییە بەڵکو بۆ سەرلەبەری مێژوویەکە». ئەمە ڕاستە. شیکردنەوە ئەمجا تەقینەوە. سەرنجی خێرایی جموجووڵەکانم نادەن؟ من تێدەکۆشم ئەم شێوازە وەك تەکتیك و ئەرزێك لە ژیان بهێنمە نێو حیزب و ئەندامەکانیەوە. بەڵام تا ئێستا سەرکەتوو نەبووم، چونکە جێبەجێکردنی قورسە و حاڵی حازر لێی تێناگەم. تەقاندنەوەی کەسێك کە بۆ ماوەی چوار هەزار ساڵە دووچاری ئازار و سەرکوتکردن بووبێ ئەرکێکی زۆر گرانە. بە واتایەکی دیکە، من لەو کاتەوە کە تەمەنم حەوت ساڵان بوو بە ئاووتاوێکی زۆرەوە بایەخ بە تەقینەوە دەدەم. بەڵام جێبەجێکردنی ئەوە لە هەڤاڵانماندا بە ماوەیەکی کورت خایان ئەرکێکی زۆر گرانە. لەوە بەدەر هیچ ڕێگاو چارەسەرێکی دیکە نییە. شەڕی بەردەوام و ئەو زەبروزەنگە مێژووییەی کە هەیە دەستەبەری لەنێوبردنی هەر شێوەیەکی دیکەی بەرخۆدان دەکەن. بڕوانە شۆڕش و بەرخۆدانە کوردیەکان، بە قەناعەتی من ئەم بەرخۆدانانە خۆیان خۆیانیان لەنێوبرد. بڕوانە شێخ سەعید و سەید ڕەزا. بەڵێ ئەوانە داماون. (بارزانی)ش نەیتوانی بۆ ماوەی (٢٤) سەعات دەربهات و بەرخۆدان بکات و بوو بە نۆکەری نۆکەران و ئەمەش هیچ بەهایەکی نیشتمانی ناهێڵێ، چونکە ئەم جۆرە هەڵگەڕانەوانە لە هەلومەرج و ڕاستیەکانی کوردستاندا هەر بەزین پەرەپێدەدەن و لە دەردەسەری و ئازار بەولاوە خێریان بە نێوچاوانەوە نییە. من مرۆڤێکم توانیومە بە باشی دەرس و پەند لەم ڕووداوانەوە هەڵبهێنجم، هەتاکو تایبەتمەندییەکانی خۆشم لە ژیاندا وەك گوزەرانی هەنووکەم و هێزی قسە سواریم و توانایی باڵام لە چارەسەر

و جێبەجێ کردنی پراکتیکی بەشێوەیەکی راستەوخۆ. دیارە من هەموو ئەمانەم دانەهێناوە. بۆم باس کردن کە من وەختێك لە دایك بووم بێهێزترین منداڵ بووم. نالێم ئەوە بەخششی خوایە، بەڵام پێکهاتنی لەوە بەدوای خۆم و هەوڵەکانم بۆ خۆچاککردن کەسایەتیمی وا لێ کرد لە ڕێڕەوێکی سەرنجڕاکێشدا گەشە بکات. ململانێیەکی هەمیشەییم لەگەڵ خێزان و گوند و ڕۆشنبیری کەمالی و چینە کرێگرتەکاندا هەبوو. سەرەنجامەکەشی ئەم پێکهاتەیەم بوو کە بەرهەمی ئەم هەموو ململانێیانەیە. من تێدەکۆشم پارێزگاری لە خۆم بکەم و بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێشیش داکۆکی لە خۆم بکەم.

ی.ك: ئایا ئەمە بە غەریزەی داکۆکی لە خۆکردنە؟

س.پ: بەڵێ بە غەریزەی داکۆکی لە خۆکردنە و هێز و پێز لە بەرخۆدان وەردەگری. ئەگەر بەرخۆدان بەبێ سەربکەوێ و تێك نەشکێ، دەبێ زیرەك و پلان دارێژ بێ. ئێستا با بێینە سەر ئەوەی کە ئەم کەسایەتیە چی دەگەیەنێ و چۆن دروست دەبێ. سەرنجی واقیعی نەتەوەیی کوردستان بدەن کە قۆناخەکانی دروست بوونی شۆڕشی بە ئایدیۆلۆژی و ئەدەب و سیاسەت و سازدانی ڕێکخستنەوە تێدا تێکەڵ و پێکەڵ بوون و ئێمەش بە یەك کەڕەت و بە شێوەیەکی بە تێو یەکداچوو لە هەموویاندا دەژین. هەموو ئەمانە چارەسەری گری کوێرەی کوردی دادەنێن و یارمەتی دروست بوونی بەندیواری و پەیوەندی کوردی تازە دەدەن و جۆر و خەسڵەتی پێکهاتە تازەکە و خاسیەتە بنچینەییەکانی کۆمەڵگا دیاری دەکەن. ئەگەر ڕۆمان و ئەدەب ئەبێ، زەحمەتە ڕاستی و گری کوێرەی کوردی و چۆنیەتی کردنەوەی ئەم گری کوێرەیە و چارەسەر و تەقاندنەوەی کێشەکە ئەزم بکرێن. دەنا هیچ هاوبەشییەکی لە گۆڕەپانی خەباتدا نابێ.

ی.ك: ئاپۆی ئازیزم. پێش ئاوێك گوتتان: «شۆڕشەکانی شێخ سەعید و سەیدا ڕەزا خۆیان خۆیانیان تێکشکاند». هەروەها باسی (شەکردنەوە)تان کرد و من گوتم (ئەفینەوە). با لە ڕووی سیاسییەوە بڕوانینە بابەتەکە، ئایا دەتوانین بڵێین ئادگارەکانی ساڵی ١٩٩٢ بەم شێوەیەی خوارەوە بوون: پارتی کرێکارانی کوردستان و ئاپۆ تەفینەوەیەکیان بەدی هێنا و تورکیا ڕاهاتووە (سەعید و ڕەزا) سەرکوت بکات، بەڵام ئێستا ناتوانێ ئەوە بکات. ئایا ئەوە تورکیایە کە سنوورێك بۆ ئەم تەفینەوەیە دادەنێت؟ مەبەستم لەوەیە تورکیا دەڵێت: لە ئەورووپا بەهێزم و دەتوانم شۆڕشی کوردستان لەوێ هەڵبوەشێنمەوە یا سنووردااری بکەم و دیوارێك لەبەردەمیدا دابنێم. ئەمجا ڕووداوەکانە باشوور و لەوێ دیوارێك بنیات دەنێ بۆ ڕێگرتن لە درێژبوونەوەی کاریگەری ئەم شۆڕشە. لەوانەیە کاریگەری ئەم شۆڕشە پەل بۆ تورکیا بهاوێژێ، بۆیە هەوڵدەدات بە دانانی دیوارێك لەوێ تەگەرە بخاتە بەر ئەوە. ئایا ئەمە بیرکردنەوەیەتی؟ یا بەو چەشنە کە گێڕاتانەوە «پێکەوەنانی ڕۆشنبیرپارێزان و سەندیکایی پارێزان... هتد» لەسەر پەیوەندیی بنگەکانی پاراستنی وەك گوندپارێزان و فراوانکردنی چوارچێوەی ئەم بنگەیە تا

باشووریش بگرینەوە تا بگەیەنرێتە تورکیا. ئایا تورکیا لەم ڕێگایەدا هەوڵدەدات؟ یا بە واتایەکی سەربازی: تورکیایەك کە پێدەچێتە ساڵی ١٩٩٣ و نەیتوانیوە ئاگری ئەو شۆڕشە کوردییە خەفە بکات کە بە سەرکردایەتی ئێوە بەرپابووە، هەوڵدەدا تە سنوور بۆ تەنینەوەی دابنێ. ئایا لەسەر ئەم بنچینەیە تەکتیك و ستراتیژی خۆی دادەنێ و دیاریبان دەکات؟ بۆ ئەوەی شۆڕش ڕوو بە باشور و تورکیا نەتەنێتەوە، هەوڵدەدات چەند بنکەیەك بۆ ئەم مەبەستە دابمەزرێنێ؟ نموونەیەکم لە ڕاگەیاندنەکانتان بە ئەنجام هێنا لەوەدەچێ کە باسم کرد. ئایا تێدەکۆشێ لە سێ خاڵدا دیاریتان بکات؟

س.پ: تورکیا لە ئاستی ڕەسمیدا لە وجودی مندا یا لە حیزبەکاندا لووتی بووە بە لووتی شتێکەوە کە چاوەڕوانی نەدەکرد. ئەمەش لایەنێکی زۆر گرنگە. لووتی بووە بە لووتی شتێکەوە نە حسێبی بۆ کردبوو و نە چاوەڕێی دەکرد و نە تەنانەت دەشتوانێ ڕیسوای بکات. ئەگەر لە سەرهاتی چل ساڵەی کورد ورد ببینەوە، چاوەڕوانی پەیدابوونی شۆڕشگێڕێکی وەك من ناکەی و هیچ نموونەیەکی وەك منت لە هیچ کتێبێکدا بە تووشەوە نابێ و پێم وانییە تا ئێستا ئەم ڕاستییەیان بۆ ئەزم کرابێ. بەڵام ئەوەی کەفەوما قەوما و ئێستا لە تێنگەیشتنی ئەم ڕووداوەدا هەست بە زەحمەتی دەکەن و کردەوکۆششیانە بەو شێوەیە ڕێکوشوێن دابنێن کە لێی حاڵی بوون. ئەو ڕێ و شوێنانەش کە بیری لێدەکەنەوە بەم پێیەی خوارەوەن: ئەگەر ئەمە کورد بێ، جاران چیمان بە کورد کردووە دەیکەین و ئەم هەڵگەڕانەوەیە سەرکوت دەکەین وەك چۆن هەڵگەڕانەوەکانی پێشووشمان سەرکوت کرد. ئەوەیان تاقیکردەوە و بۆیان نەچووەسەر. بۆیە پەنایان بردە بەر حوکمی عورفی و ڕەوشی ئاوارتە و هێزی حەمیدیان پێکەوەنا و سەرنەکەوتن. ئەو شێوازانەی دیکەش کە پەنایان بردنە بەر هەمان چارەنووسیان بە نسیب بوو. گوتیان با بە تیرۆر بەرەنگاریان ببینەوە. تیرۆرەکەیان بە هۆی مشوورخۆری خۆمانەوە بە سەرکەوتن نەگەیشت. ئێستاش دەوڵەتی تورکیا لەگەڵ ساڵی ١٩٩٢ دا کەوتووەتە نێو گێژاوی کۆمەڵێك قەیرانی عاسییەوە. دەکرێت لە باروودۆخێکی وا ئاڵۆزدا پەتای کوردستان بە ئاسانی بۆ خۆرئاوا بگوازرێتەوە. کەوتنە بیرکردنەوە بۆ دانانی ڕێ و شوێنی قەدەغەکردنی ئەم تەشەنەکردنە، بە تایبەتی لە ڕێگای ئەو هەستە شۆڤێنیانەوە کە بڵاوەدەکرێنەوە لە ناوەندەکانی هەم توێژە ڕۆشنبیرە بەدەستکراوە و گەمارۆدراوەکان و هەم تاقمە سەندیکاییەکان و ئەو کۆمەڵە حیزبییانەدا کە پێکدەهێنرێن. سەرجەم هەوڵی گرنگن بۆ سنووردارکردنی کاریگەری شۆڕش دەدرێن. هەوڵدەدەن سەرانی پارێزگاران لە سەراوردی ئەو هەموو پێکهاتانە دابنێن کە کۆمەڵگای تورکییان لێپێکدێت. واتە دەکرێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە «پارێزگارانی ئێوە کێن؟». پێویستە ئەوە ڕوونبکرێتەوە: ئایا ئەم ڕژێمە لە ئەورووپادا نییە؟ دیارە لەوێش هەمان ڕێکوشوێن هەن. ئەوان بەر لە تورکیا مشووری خۆیانیان خواردووە. هەندێك

گیروگرفت و بەدحالی بوون لە نێوان دەوڵەتانی ئەورووپا و تورکیادا هەبوون، لە کاتێکدا تورکیا کەمێك ڕاڕابوو و ئەمجا کەوتە ئەهێشتنی ئەم گیروگرفتانە بەوەی کە هەرچی‌یەکیان دەوێ بیانداتێ. دانیمارك و سوید و سویسرە و فەرەنسە و ئینگلتەرە و ئەڵمانیا چی‌یان لە تورکیا ویست بردیان، وردتر بڵێین ئەوانن خاوەنی تورکیان و بۆ خۆیانە.

ی.ك: بەڵێ، دەرگاکانی کردوونەوە.

س.پ: خستوونیە سەر پشت، بە تایبەتی لە ڕووی گەشت و گوزار و وەبەرهێنانەوە بەڵام لە ڕووی سیاسی‌یەوە تورکیا بووەتە بەندەی فرمان بەردار بەبێ پرینسگانەوە هەر داوایەکیان هەبێ جێ‌بەجێی‌دەکات. بەرانبەر بە هەموو ئەمانە، ئەورووپا ئەوەی پەسندکرد لە بەرەنگاری پارتی کرێکارانی کوردستاندا دەوری پارێزگاری تورکیا ببینێ. بۆیە بەوە پەیماننامە و ڕێککەوتنەکانی خۆی سەبارەت بە مافی مرۆڤ و ئەو دیموکراسی‌یەی کە ئامانجێکی خۆی بوو ژێرپێی‌نان و ئەم هەموو پەیماننامانەی شکاند و بەرانبەر بەو دەسکەوتانەی کە تورکیا بەخشینی. ئەوەی کە ڕوویدا یەککەوتنێکی نێو دەوڵەتی کۆنەپەرستانەی زۆرخراپە. ئەم نموونەیە دەقاودەق یەکێتی سۆڤێتی هەڵوەشاوە و ئەمریکا و دەوڵەتانی دیکەی خۆرهەڵاتیش دەگرێتەوە. تورکیا بەم شێوەیە ڕێ و شوێنی بۆ ڕێگرتن لە تەنینەوەی شۆڕشی کوردستان لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا دانا و هەموو ئەوانەش بە کۆششی سلێمان دیمریل و عیسمەت ئینۆنۆ و حیکمەت چەتین و هەروەها بە کۆششی ئەو نۆکەرانەی کورد کران کە بەرەویان بەم گوتەیەدا: ئەگەر کوردیتان دەوێ، نموونەی خۆرناوایمان لەلا هەیە و ئێمە لەگەڵ تورکیا و لەگەڵ (حیکمەت چەتین)دا ئێك گەیشتووین. ئەم کۆششانە لە (ڤییەننا) لەگەڵ جەلال تالەبانیدا و لە (بۆن) لەگەڵ مەسعوود بارزانیدا و لە (پاریس)یش ڕەنگیان دایەوە، تەنانەت ئێمە باش دەزانین ئەوانە بۆ ئەمریکاش چوون. ئەم هاوجووتی‌یەیان بەهۆ و بە یارمەتی نۆکەرانی کوردەوە بەدەست هێنا. ئەم هاوجووتی‌یە نێودەوڵەتیە ئاراستەی پارتی کرێکارانی کوردستان کراوە.

هەرچی بارودۆخی ناوخۆی تورکیاشە تا ڕادەیەك جیاوازە. گوتیان ئەم کارانەی کە کردوومانن «یەك کەوتنی نەتەوەیی»یە لە پەرلەمانی تورکیادا. لە ئاستی کۆمەڵایەتیشدا ئەم شەپۆلە شۆڤێنی‌یەی ئەم دوایییەیان ناونا «یەکگرتنی کۆمەڵگا و ڕاوەستانی لە ڕووی تیرۆردا». ئەم قسەوقسەڵۆکانە دەستکردی ئەوانن. بە باوەڕی من ئەمە بەڵگەی ڕادەی ترسیانە لە شۆڕش. لەبەر ئەمە هەوڵدەدەن کۆمەڵگا بەرەو دواوە ببەن تا بەرەنگاری شۆڕش ببنەوە. بەڵام شۆڕش هێشتا کە بە تورکیادا بڵاوتەبووەتەوە. ئێوە دەزانن چۆن چەپی تورك ماوەیەکی کەم پاش (١٢)ی ئەیلوول کوێربووەوە و لەوە دەرچوو مەترسی ببێ بۆ ڕژێمی تورکیا. بۆیە باش دەزانین ئەم ڕێ و شوێنانە ڕووبەڕووی چەپی تورك نەکراونەوە، چونکە تورکیا لەو پێکهاتانەی کە لە ساڵانی حەفتا و هەشتادا کەوتنە ڕوو و هەتا لە پێکهاتەکانی ئەم

دوایەیەش ناترسن. رەنگە تورکیا لە بەرەنگاربوونەوەیاندا سەرکەوتوو بێ، بەڵام وێڕای ئەوە دەترسن. هۆی سەرەکی ترسانی لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە شۆڕشەکەمان لە گۆڕەپانی تورکیادا رەنگ بداتەوە و لەویش لەوە نیگەرانە. تەنانەت سەرۆکی ئەرکان و سەرۆوەزیران و وەزیری ناوخۆش باوەڕ بەوە ناکەن کە شۆڕشێکی کوردی و کێشەیەکی کوردی هەبێ و بەم پێیە رێکوشوێنی ئەم دوایەیان پەرە پێدەدەن. هێشتانە گۆڕینی سەرانی پارێزگاران لە تورکیا سوودیان پێدەگەیەنێ، پێم وایە هەتا لە زانکۆکانیشدا لەوانەیان داناوە. خۆ بنگەی خوێندنی باڵا رێکخستنێکی ئەو پارێزگارانەیە و بارودۆخی سەندیکاکانیش هاوشێوەیە. سەرباری ئەوەی کە زۆر لە سەرۆکەکانی سەندیکاکان، سەرانی پارێزگارانن. لای ئێمە تاهیر نادیمان ئاغا هەیە و لای ئێوەش فلان ئاغا و هەردوکیشمان بۆ بەرەنگاری شۆڕش یەکدەگرن و بەڵگە بنیاتیمان هەیە. رۆژنامەنووسی تورکیاش هەمان شێوەی هەیە، ئەوەی پێ بەس نییە لە رێزی دەوڵەتدا بێ یا شوێنکەوتەی بێ، بەڵکو ئەرکی پاراستن و بگرە سەرۆکی پارێزگارانیش لە ئەستۆ دەگرێ.

ی.ك: لەم بارەدا ئەگەر توانیان لە مرۆڤایەتی خۆیان دابماڵرێن و خۆ لە مێژوویان بدزنەوە، دەتوانین بڵێین پارتی کرێکارانی کوردستان سوودێکی گەورەی بۆ سەندیکایەکان و رۆژنامەنووسی هەیە.

س.پ: «توانیان پارە پەیدا بکەن» مەبەستتان ئەمەیە. بەڵێ ئەمە بارودۆخەکەیە.

ی.ك: ئەمە بۆ هونەرمەندان و رۆشنبیران و مامۆستایانی زانکۆکان و گەلێکی دیکەش بوو بە خێر.

## هەموران گوتیان:
## مووچە زیاد کردن لە پڕۆژەی گاپ(GAP)دا بەخششێکی ئاپۆیە!

س.پ: رۆشنبیرانیش سەرانی پارێزگارانن. وا ئەوەتان بۆ باس دەکەم. لەوانەیە من لە ئێوە پتر ئاگام لەم بابەتە بێ چونکە ئەزموونمان بەربڵاوە. کاتێك گەنمان ئیفرین ئاوبەستی ئەتاتورکی کردەوە گوتی: «ئێمە ئاوبەستێکی مەزنتان بۆ بنیات دەنێین، ئاپۆ چی پێدان؟». هەموران دووپاتیان کردەوە کە پڕۆژەی باشووری ئەنادۆڵ (گاپ) بەرتیل یا بەخششێکی ئاپۆیە. پاش ئەوە مووچە زۆر زیادی کرد و ئەمەش بەخششی ئاپۆ بوو. هەتا مووچەی پارێزگارانیش بەخششی ئاپۆیە! ئای لە کاری خوا! دەوڵەتێکی دەوڵەمەندتان هەیە بە رادەیەك بێئەندازە دیاری و بەخششی ئاپۆ دەبەخشێتەوە، یا بەخششی ئاپۆ خێرتان پێ‌بکات. لێرەدا دەتوانین لە هەڵوێستی گەلێك مامۆستای زانکۆ تێبگەین. وا پێویستە ئەوانە پیاوی زانست بن و زۆر ئیش بکەن، بەڵام لە هۆی بێدەنگیان حاڵی دەبین.

هەروەها تێدەگەین بۆچی شتێك دەرناکرێت، تەنانەت فلیمێکی کورتی سینەمایی یا هەر بەرهەمێکی ڕۆشنبیرێك لەسەر ڕاستی لەم وڵاتەدا، چونکە هەموو ئەوانە پێوەندییان بە بەخشش یا پاداشتەکانی ئاپۆوە هەیە و هەمووان لە بارودۆخەکە ئاسودەن. وەك چۆن دەوڵەتی تورکیا داخوازییەکانی ئەوروپا و دەوڵەتانی دیکەی بەجێ‌هێنا کە بەرژەوەندی لەگەڵیاندا هەیە، ئاواش دەوڵەت گشت داخوازییەکی بنگەکان و ڕێکخراوەکانی ناوخۆی بەجێ‌هێنا و بێدەنگی‌یانی کرد. من مەبەستم حیزبەکان و پەرلەمانییەکان نییە، ئەوانن کە «یەك کەوتنی نەتەوەیی»یان بۆ بەدەست هێناون، بەڵکو مەبەستم کەرتە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکانە بە سنووقەکانی بنگەکانی هەرەوەزی و پاداشتی بۆ ئەم مەبەستە بەخشراو بە گەلێك هەژار و داماو، باش دەزانم ئەو هەموو کارانە دژ بە ئێمە قوت کرانەوە و بەهەزی ئێمەوە دەکرێن و لەبەر ئەوەیە گەنجینە و گیرفانەکانی خۆیانیان کردووەتەوە.

ی.ك: لەم بارەدا ئەگەر چاوپۆشیتان لە شۆڕشی کورد کرد و هەڵوێستێکی پێچەوانەتان دیاری کرد هەموو شتێکتان چنگ دەکەوێ. جاران شانۆسازان داد و بێدادیان بوو بە دەست گەلێك دژوارییەوە، بەڵام ئێستاکە لە ڕووی تین و توان و پارەوە لە ناز و نیعمەتدا دەژین.

س.پ: بەڵێ. سەرپاکیان بەشە پاداشتی خۆیانیان وەرگرتووە و لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەردەکەون و بوونەتە نووسەر لە ڕۆژنامەکاندا و مووچەکانیان لێشیان سەروزیادە. «هێندە بەسە گوێی خۆیان لە پارتی کرێکارانی کوردستان بخەوێنن و کێشەی کوردستان فەرامۆش بکەن، تا چییان دەوێ پەیدای بکەن!». ئەمەیان جێبەجێ کرد و تا ڕادەیەك تێیدا سەرکەوتن.

ی.ك: لێرەوە دەتوانین ئەم شیکردنەوە ئابوورییەی خوارەوە بکەین: خەرجی شەڕ لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستاندا هەر بریتی نییە لە مووچەی گوند پارێزان و هێزە تایبەتەکان و خەرجی سەربازی.

س.پ: بێ‌گومان نا.

ی.ك: خەرجی دەوڵەت بە کڕینی کەسانێکی زۆر زیادی کردووە.

س.پ: تۆ کابرایەکی ئابووریناسی و پێت دەکرێ لەسەر ئەوە هەڵبدەیتێ و ڕوونتر شی بکەیتەوە.

ی.ك: نەخێر. من ئەوە دەزانم. بەڵام ئەو ئەنجامانە کورت دەکەمەوە کە لەم مشتومڕەمان دەکەونەوە. ڕاستییەکەی چەند ئەنجامێکی باش بەدەست هێنراون.

س.پ: ئەمە زۆر گرنگە. گرانی گوزەران گرێدراوی ئەم پاداشتانەیە. شایانی تێبینی کردنە قەرزەکانی ناوخۆ خۆ لە (٥٠) ملیار دۆلار دەدەن.

ی.ك: جاران دەوڵەت ئەوە دوودڵ بوو چەند قرۆشێك بە هەر هونەرمەندێك بدات. بەڵام ئێستا ئەگەر ملیارێك لیرە لە هەقی شانۆنامەیەك یا فلیمێکی سینەماییدا بدات بە کەمی دەزانێ.

س.پ: نموونەیەکی مێژووییتان بۆ دەهێنمەوە. ئێوە دەزانن (تەها ئاکیوول)

ڕۆژنامەنووس و نووسەرێکی باشی دەوڵەتە. ڕۆژێکیان چاوم بە نووسینێکی کەوت تێیدا لای لە ئێمە کردووەتەوە و لە گوتارەکەیدا دەڵێت: «جەمال پاشای سەفاح کاتێك چوو بۆ شەڕکردنی هۆزانی عەرەبی هەڵگەڕاوە لە حوکمی عوسمانییەکان لە ڕاپۆرتێکدا نووسیویەتی: ئینگلیز بە دڵفراوانییەوە زێڕی درەوشاوە دەبەخشنەوە و هۆزە عەرەبەکانیش پارەیان خۆش دەوێ. بۆیە لایەنی ئینگلیز دەگرن. دەتوانین چیبکەین؟ وەڵامی بابی عالی پێدەگاتەوە کە دەست قووچاو نەبێ و، وا چەندین جانتا پارەی بۆ ڕەوانە دەکرێن. دەڵێت: لە ئینگلیز پتر پارە دەدەم». ئەم نموونەیە دەخاتە بەرچاو، بەڵکو ڕێنمایی دەوڵەت دەکات بۆ گرتنە بەری ئەو شێوازەی کە پێویستە بۆ بەربەرەکانی کردنی پارتی کرێکارانی کوردستان بیگرێتە بەر. لەمە وا تێدەگەین کە دەوڵەت دەست لە پارە ناگرێتەوە بەڵکو بە زێڕ و جانتای پڕ لە پارە بەسەر سەرانی هۆزەکانو سەرانی پارێزگاراندا دەیبەخشێتەوە لەعەر کوێیەك بن.

ی.ك: ئاپۆی برام، لە ڕۆژنامەی (یەنی ئوولکە)دا گوتبووتان «بوونی ئالەبانی گرێدراوی بوونی پارتی کرێکارانی کوردستانە». ئەمە وا دەگەیەنێ کە ئێوە پشتگیری ئالەباتی دابین دەکەن و یارمەتی دەدەن.

س.پ: بەڵێ. ئەمە ڕاستە. ئالەباتی خۆشی ئەمە دەڵێت: «من بە سایەی ئاپۆوە دەچمە عێراق و تورکیا و سیاسەتی ئەم ساڵانەی دوایی سەرتاسەر لە سایەی پارتی کرێکارانی کوردستاندا بەڕێوەدەچن». ئەمەی گوتووە و تا ئێستاش بەم باوەڕەوە دەژی.

ی.ك: ئەگەر هەر شتێك بەسەر پارتی کرێکارانی کوردستاندا هات، ڕۆشنبیری تورك دەچێتەوە دۆخی جارانی. ئایا ئەمە ڕاستە؟

س.پ: حالیم...حالیم. ئەگەر هەر ناخۆشییەك بەسەر مندا یا پارتی کرێکارانی کوردستاندا هات، دەوڵەت مووچە و پاداشتەکان یەکسەر دەبڕێ!

ی.ك: واتە ئەگەر ئاپۆ ڕۆیشت، پاداشتی ئاپۆش دەڕوات.

س.پ: بێئەملاوئەولا وایە. ئەگەر بە تەنگ بەرژەوەندییەکانیانەوە دێن، پێویستە کەمێك ئێمە بپارێزن.

ی.ك: ئەمە ڕاستە.

س.پ: تاقمەکەمان ئەمە باش دەزانن. لەم ماوەی دواییدا مووچەیان بە دۆلار بە نزیکەی (٧٥٠٠) پێشمەرگەدا، لە کاتێکدا تاقمەکەی ئێوە بە لیرە کە ڕۆژانە بەهاکەی لە دەست دەدات، دەیاندەنێ. هەمان کات بە دۆلار بە تاقمی ئێمەی دەدەن.

ی.ك: پێشمەرگە عاقڵیشن، تەنانەت لە تورکیاش کەسیان ڕازی نابن مامەڵە بە لیرەی تورکی بکەن، بەڵکو دۆلار یا مارك بەکاردەهێنن.

س.پ: بە پێی دوا هەواڵ کە بڵاوکراوەتەوە ئەو (٧٥٠٠) پێشمەرگەیە،یەکی (٢٠٠) دۆلاریان پێداون بەرانبەر بەوەی کە بچنە ڕیزی گوندپارێزان. بێگومان دەوڵەتەکەتان دەوڵەمەندە و ڕاستییەکەی خەڵك باسی هاتوچۆی (ئیبراهیم خەلیل) دەکات. من لە لایەکەوە نوێنەرایەتی ئەم هاتوچۆیە دەکەم، وانییە؟

ی.ك: دەوڵەمەندی دەوڵەتی ئێمە لە گەشت و گوزار و لەو کرێکارە کورد و تورکانەوە دێت کە لە ئەڵمانیا کاردەکەن. ئەگەر هەر ناخۆشییەك بەسەر ئەو ناوچانەدا هات، ئەوا چاوگەکانی دەوڵەمەندی وشك دەبن و دەوڵەت ژێرەوژوور دەبێ.

س.پ: ئێمە لەمساڵ تەگەرە دەنێینە بەر ئەو سەرچاوانە و وشکیان دەکەین. گوێ بەوە مەدەن. دەوڵەت ئەم پارە زۆر و زەبەندە لە کوێوە دەهێنێ تا بەدەست و دڵ خەرجی بکات. ئەوی ڕاستی بێ من لەوە سەرسامم و لێی تێ ناگەم. بەڵام لەوەش گرنگتر ئێمە خەڵك دەوڵەمەند دەکەین. ئەو ڕێگایەی کە لەم مەسەلەیەدایە بەو شێوەیەیە کە ئێستا ڕوونی دەکەمەوە: شۆڕش بە کردەوە بەرهەمهێنە و زۆر دەبێتە مایەی دەوڵەمەندی. ئێمە و دوژمنان و ئەوانیشی دەوڵەمەند کردووە کە تا نیوەی ڕێگا بەری کەوتن. هەموو ئەمانە پێوەندییەکی توند و تۆڵیان بەو گوتەیەوە هەیە کە دەڵێت شۆڕش مرۆڤ مەزن دەکات.

ی.ك: بەڵێ ئاپۆی برا و خۆشەویستم. ئێستا گەیشتینە خاڵێکی یەکجار گرنگ. ئەگەر ڕێم بدەن لە تێڕوانینی ئێوە دەپرسم؟

س.پ: دریژە بە پرسیاری خۆتان بدەن.

ی.ك: پرسیارەکانی دیکەم لەسەر کردەوە و چالاکییەکانە و پێوەندی بە شیکردنەوەی ئێوەوە هەیە هەم لەسەر سۆشیالیزمی بنیات نراو لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە و هەم ڕادەی کاریگەرییەکەی؟

س.پ: بەڵێ. من دێمە سەر وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، هەر وەڵامەکەی بە ناتەواوی ماوەتەوە. ئێوەش کتێبێکی بەهادارتان لەسەر هەرەس هێنانی سۆشیالیزمی سۆڤێتی نووسیوە و گەلێك هەڵسەنگاندنی جۆراوجۆری لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی دیکە پیشان داوە. زۆر جار لە بارەی ئەم بابەتەوە لێیان پرسیوین. سەبارەت بە ئێمە، تا ئێستا توێژینەوەیەکی قووڵم لەسەر مەودا و هۆیەکانی هەرەس هێنانەکە نییە. بەڵام وەك دەزانن ئەزموونی شۆڕشگێڕی شیکردنەوەیەکی پڕ بەهای سەربەخۆی ڕووداوەکانە.

ی.ك: بێ گومان. هیچ گومانێکم لەو بارەیەوە نییە.

## کە گۆرباچۆف دەسەڵاتی گرتە دەست گوتم: ەئیدی ئەم ڕژێمە ڕووبەڕووی دۆخی داخرانێکی لە کرانەوە نەهاتوو دەبێ و دەکرێت ئەم دۆخە بە یەکێك لەم دوو ڕێگایە نەهێڵرێت: یا لە سەرەوە بە هۆی سەرکردایەتی ئەوبەری دوژمنی ئیمپریالیزمەوە یان لە خوارەوە بە ئەنجامدانی ڕیفۆرمی پێویست.

س.پ: من لە ڕوونکردنەوەی مەسەلەکاندا پشت بە شارەزایی شۆڕشگێڕانەم دەبەستم. ئێمە چاودێری هەندێك لایەنمان کردووە. باسی ئەو تەنگژەیەم کردووە

کە ڕژێمی سۆڤیەتی تێکەوت. ساڵی ١٩٨٥ وەختێك گورباچۆف جڵەوی دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت، مانگی ئاداری ئەو ساڵە بارودۆخەکەم هەڵسەنگاند. لەم هەڵسەنگاندنە هێشتا ماوە و تێیدا گوتم: «ئیدی ڕژێم ڕووبەڕووی دۆخی داخرانێکی لە کرانەوە نەهاتوو دەبێ و دەکرێت ئەم دۆخە بە یەکێك لەم دوو ڕێگایە نەهێلرێت: یا لە سەرەوە بەهۆی سەرکردایەتی‌یەکی ئەویەڕی دوژمنی ئیمپریالیزمەوە، یان لە خوارەوە بە ئەنجامدانی ڕیفۆرمی پێویست». گورباچۆف هەولیدا بە ریفۆرم کردن بە دووی بارودۆخەکەدا بچێ، بەڵام ئەمە کێشایەوە بۆ قەڵەمبازێکی زۆر گەورەی ڕووە و بە ڕاست و، لەگەڵ (یەلتسن)یشدا بارودۆخەکە بە قوڕداچوو. مەبەستم ئەوەیە ئێمە گرێ کوێرە و تەنگژەکەمان دەبینی و چاودێری چۆنیەتی چارەسەرکردنیمان دەکرد. هەرچی ئەوەشە کە «چۆن ڕژێمەکە بزر بوو؟ ئەو خاڵانەی بێ‌هێزی ڕژێم چی بوون. کە بێ بەستیان لێکەوتەوە؟».

ئەوەیان من بە جۆرێکی جیاواز لە کەسانی دی دەڕوانی‌یە بابەتەکە. جاران خاوەنانی تیزی سێ جیهانی لایەنگرانی تەوژمی «سۆشیال ئیمپریال» و ترۆتسکیەکان و لایەنگرانیان هەبوون. من هەرگیز بیرم لەوە نەکردووەتەوە لایەنگری‌یان بکەم. چی‌یان بنووسیبایە دەمخوێندەوە. ڕەنگە لە هێندێك ڕووەوە هاوڕەنگی بۆچوونەکانیان بم. بەڵام سەرجەمی نووسینەکانیان بەس نەبوون بۆ وەڵامدانەوەی ئەوەی کە بە خەیاڵمدا دەهات. وێڕای ئەوە پێم وابوو ڕێبازی سۆڤیەتی هاوجووتی سۆشیالیزم نەبوو. بە تێپەڕینی ڕۆژگاریش ئەم بیرۆکەیەم لەلا کوڵەپێنج دەبوو. بە تایبەتی بۆم ساغ بووەوە کە حیزبی کۆمۆنیستی تورکیا بڕوای ببڕ سۆشیالیستی نەبوو و قەناعەتم بەوە پەیدا کرد. لەبەرئەوەی کە ئەم حیزبە بەرهەمی ڕژێمی سۆڤیەتی بوو، ئەمە وا دەگەیەنێ کە ئەو ڕژێمە سۆشیالیستیە گەندەکاری تێدایە. باوەڕم ئاوابوو. لە ساڵانی حەفتادا کاتێك بێ‌ئەملاوئەولا لەوە دڵنیابووم مەحاڵ بوو هەلومەرج هەرچۆنێك بێ پارتی کرێکارانی کوردستان بکەم بە حیزبێکی لە وێنەی حزبی کۆمۆنیستی تورکیا،چونکە ناکرێت ئەو مرۆڤەی کە حزبی کۆمۆنیستی تورکیا کاری تێدەکات هەرگیز ئاسایی بێ. من ئەو خەڵکانە بە بچووك ناگرم، بەڵام لە ڕێبازی ئایدیۆلۆژی ئەو حیزبە دەدوێم. (حەیدەر کۆتلوو)یش دانی بەوەدا نا کە لەم ماوەیەی دواییدا مرۆڤ خنکێن و خۆشی خنکێندراو بوو. نامەوێ کەس ئەمە بە سووکایەتی کردن دابنێ. من ئەوەم بەوپەڕی مایەی خنکان هاتە بەرچاو. سەرباری پێداگری توندم لەسەر دوورنەکەوتنەوە لە سۆشیالیزم، بەڵام من بە یەکجارەکی ڕازی نەبووم بچمە نێو ئەو کەشە مرۆڤ خنکێنە. بە ڕاشکاوی جەختم دەکەم پێش ساڵی ١٩٨٥ ـ واتە لە ساڵانی حەفتاوە و سەرەتای هەشتاکاندا ـ دەمگوت: «نەدەبوو سۆشیالیزم ئەو هەنگاوە بنێت یا ئەو ڕێبازە بگرێتەبەر». لەناخەوە هەستم بەوە دەکرد و بە پێی ئەوەش دەجوولامەوە.

بەڵام ئێستا ئێمە دەتوانین ئەو ڕووداوە لە هەموولایەکەوە شی‌بکەینەوە. یا

بەروانینە مارکس و ئەنگلز. بە بڕوای من ئەو جووتە گەورەترین شیکەرەوەی زانستی ئەو کاتەن، بە تایبەتی هێندەی پەیوەندی بە ڕەگەزی مرۆڤ و پەرەسەندنە کانی مرۆڤایەتی‌یەوە هەبێ. لە هەموو ڕوویەکەوە و بە شێوەیەکی زانستی بنۆڕینە دەستیان بۆ بابەتەکان دەبرد. هێشتا باوەڕم بەوە و بە ڕاست و دروستی شیکردنەوەکانیان لەسەر کارتێکردنی ئاین لە کۆمەڵگا و بیروڕا فەلسەفەیەکانی دیکەیان و شیکردنەوەکانی پێشوویان لە بارەی گەلێك بابەتەوە هەیە کە بە شیکردنەوەی زانستی‌یان لەسەر سۆشیالیزمی زانستی ڕوون دەبنەوە. من هێشتا باوەڕم بەو توێژینەوانە هەیە و پێبەستەییم دەپارێزم. هەرچی هاوبەشی لینینە بریتی‌یە لە «مارکسیزمی قۆناغی ئیمپریالیزم» و «هاوبەشی‌یەکی ئیرادەگەری دەست تێوەردانە». وایان گوت و ئەم گوتەیە چەردەیەك ڕاستی لە دووتوێیدا هەڵدەگرێ. لەوەبوو حیزبی شۆڕشگێڕی پێکهێنا و قۆناغی ئیمپریالیزمی شی‌کردەوە و توانی چارەسەری ڕاستەقینە بۆ ئەو قۆناغە بدۆزێتەوە. بەڵام دەبێ باشتر لینین ئەزم بکەین. لەوەش گرنگتر تەمەنی لینین لەوە کورتتر بوو کە ئاکامی هاوبەشیەکانی خۆی ببینێ و لەنجامە دەرکەوتەکانی شۆڕش هەڵبسەنگێنێ و پەرەیان پێبدات. لەبەر ئەم هۆیە پێویستە بە دووی ئەوەدا بگەڕێین و باش ئەوە ئەزم بکەین کە لینین تا چ ڕادەیەك پەیوەندی بەم شۆڕشەوە هەبوو و پاشتر چی لێ‌بەسەرهات.

لینین ماوەیەکی کەم پێش مردنی چەندەها ڕەخنەی هەبوو، هێندێکیان ڕوو لە تروتسکی بوون و هێندێکی دیکەیان ڕوو لە ستالین. یەکێك لەو ڕەخنانە لەسەر کەللەڕەقی لادێییانەی ستالین و هی دووەمیش لەسەر شوڤێنیزمی ڕووسی بوو و لەسەر ئەم بیروڕایانەی دوایی لەبارەی ئەم بابەتانەوە سووربوو. ڕەخنەکانی لە تروتسکی زانراون. ئەمانە گشتیان ئەندامی دەسڕۆی مەکتەبی سیاسی بوون. ئەگەر ئەوانە بەم شێوەیە بووبن، ئیدی دەبێ ئەوانی دیکە چۆن بووبن. هەرچی خودی لینینە ڕوناکبیرێکی ئەوزی یەکەم و توند گرێدراوی ئازادی بوو. بەڵام لەدوا ڕۆژەکانیدا ماروبارێکی وای نەبوو پارەمەتی چارەسەرکردنی ئەم مەسەلانەی بدەن. واتە کردارەکانی بە ناتەواوی مانەوە. هێندە بەسە کە شۆڕش لە شاکارە ئەیکری و زانستیەکانی ئەون، بەڵام کاتەکەی بەشی تەواوکردنی ئەم شاکارەی نەکرد. پاشتر وا ڕاهاتن مۆری لینینیزم و سۆشیالیزم بە تەوژلی هەموو شتێکەوە بنێن. دژواریەکان هەر لە سالی ١٩٢٠ بەدوا دەست پێدەکەن. دەکرێت لە هێندێك کەم و کوڕی لینین بدوێین، بەڵام پێویستە کاتێك باسی کەم و کوڕیەکانی ئەو ماوەیەی لینین دەکەین تەواو وریا بین، چونکە ئێمە ئەمڕۆ بە تەواوکەری دوێنێ دادەنێین. من کەناعەتێکی تەواوم هەیە کە ئەگەر لینین بمابایە، گۆڕانکاریەکان بە شێوەیەکی جیاواز دەبوون و پێم وانی‌یە کارەکەی بەم تەرزە باوە پەرەی بسەندبایە.

ستالین هێندێك لەو هێڵانەی پاراست کە لە لینینەوە بە میرات بۆی مابوونەوە. لەمانەت دەتوانین بڵێین هێندێك دەسکەوتی لە لینین بۆمابوەوە بەبێ ئەوەی

هاوبەشی تێدا کردبێ یا تازەی کردبێتەوە، بە پێداگرییەوە چاوی لە هەموو گۆڕانکارییەکی پێویست پۆشی. هەتا هێندێك تایبەتمەندی لینینی وەلانا و وەك پەناوی دەوڵەت ڕەفتاری کرد و بە تێپەڕینی ڕۆژگاریش داکۆکی لە سۆشیالیزم لە تاکە وڵاتێکدا کرد و هەموو شتێکی خستە خزمەتی دەوڵەتی سۆڤیێتی. ئینتەرناسیونالیزمیش لەلای ئەو یەکسان بوو بە یەکێتی سۆڤیێت. بۆیە دەبوو داکۆکی لە دەوڵەتی سۆڤیێتی بکات. بەم پێیە گرانترین شۆڕشی جیهانی کرد بە قوربانی یەکێتی سۆڤیێت بە سیاسەتی دەرەوەشەوە. ئیدی سۆشیالیزم بوو بە خزمەتکاری دەوڵەتی سۆڤیێتی بە بێئەوەی سۆشیالیزم و ئینتەرناسیونالیزم لەبەرچاو بگیرێن.

ی.ك: واتە مەبەستتان ئەوەیە گەلێك تەنازولی گەورەی لە سۆشیالیزم کرد لە پێناوی درێژە پێدانی حوکمی سۆڤیێتی.

س.پ: بەڵێ. لە ئینتەرناسیونالیزم و دیکتاتۆری پرۆلیتاریا و لە دیموکراسی و ئازادی. واتە بە کورتی تەنازوولی گەورەی لە هەموو شتێکدا کرد. دەتوانین زۆربیان بگێڕینەوە بەر لەسەردەمی لینین چەندین نیشانە هەبوون، بەڵام پاش ساڵی ١٩٢٠ ـ واتە لە سەردەمی ستالیندا ـ کەوتنە ڕوو.

ی.ك: دەڵێن ئەگەر بژیبایە باروودۆخەکەی ڕاست دەکردەوە. من ئەوەم پێقبووڵە. ئایا مەبەستتان ئەوەیە هەڵی ڕاست کردنەوە هەبوو، بەڵام ستالین ئەم هەلەی بەرتەسك کردەوە؟

س.پ: بێگومان. لەگەڵ پێداگری ئیمپریالیزمدا لە سەروبەندی دووەم شەڕی جیهانیدا گەلێك پرنسیپ بە ناوی تەکتیکەوە و لە شێوەی تەنازولدا بۆ ئیمپریالیزم بە قوربانی کران.

ی.ك: ئەوە چەمکێکی خۆپەرستانەیە لەشۆڕشدا تەنیا بیر لە خۆی دەکاتەوە. وانییە؟

س.پ: زۆر خۆپەرستانەیە. من بەم شێوەیە ئەو خۆپەرستییە لێکدەدەمەوە. بەرژەوەندی شۆڕشی ئینتەرناسیونالی واتە بەرژەوەندی سۆڤیێتی و بەرژەوەندی سۆڤیێتیش واتە بەرژەوەندی ڕووسی و بەرژەوەندی ڕووسیش واتە بەرژەوەندی حیزبی سۆڤیێتی و بەرژەوەندی حیزبی سۆڤیێتیش واتە بەرژەوەندی سەرکردایەتی ناوەندی و بەرژەوەندی سەرکردایەتی ناوەندیش واتە بەرژەوەندی سکرتێر و لە دواهەمین شیکردنەوەدا هەموو شتێك دەخرێتە خزمەتی سکرتێری گشتی. ئاوا کۆتایی پێهاتنی سکرتێری گشتی بوو بە کۆتایی هێنانی سۆشیالیزم. ئەم ڕاستییە کەوتە بەرچاو. هەڵسەنگاندنی باروودۆخەکە لە فراوانترینەوە بۆ بەرتەسکترین کێشرایەوە بۆ دوایی پێهاتنی ڕژێم و ئەمەش بەش بەخۆی لادانێکە و دەکرێت ناوی بنێین لادانی بیرۆکراتی یا لادانی نەتەوەیی، چونکە ئەم لادانە خزمەتی میللەتی ڕووسی کرد. سەرەنجام ئەم چەمکە هەڵەیە بە شێوەیەکی بێئەملاوئەولا گرێدراوی نەتەوایەتی بەو، تەنانەت من پێم وایە ئەو

نەتەوەپەرستییەی کە لە سایەی سۆشیالیزمی بنیات نراودا پەرەی سەند، لەو نەتەوەپەرستییە ترسناکتر بوو کە لە ئەڵمانیادا گەشەی کرد و گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییەش بەڵگەی ئەوەن.

ی.ك: منیش نووسیومە: خاڵی لاوازی لە مارکسیزمی سۆڤێتیدا کێشەی نەتەوەکانە. مادامێکی ئەم نەتەوانە بە کردەوە و لە ڕووی تیۆرییەوە هەن، ئەمە هەبوونی کێشەی نەتەوایەتیش دەگەیەنێ.

س.پ: بەڵێ، کێشەی نەتەوایەتی لە دەوڵەتێکدا یا لە بیرۆکراسیدا دەژی و بیرۆکراسیش پەیوەندی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگا و لەگەڵ بەرهەمەکانی شۆڕشدا پچڕاند و لە شێوەی چینێکدا ـ لەوانەیە لەم چینە لە حیزب پێکهاتبێ ـ مشەخۆری بەسەر ئەم بەرهەمانەوە کرد بە رادەیەك وای لێهات بوو بە بارێکی قورسی وا دەبێتە هۆی خنکاندنی مرۆڤ. ئەمە بەدی هات. بێ‌گومان ستالین نەیتوانی ڕێ و شوێنی شێلگیرانە دابنێ. هەر لەوەی لە دەست هات هەوڵ بدات ڕژێمەی لینینی بپارێزێ. بەڵام لەبەر بیر تەسکی خۆی نەیتوانی. یەکەم ئامانجی پاراستنی یەکێتی سۆڤێت بوو. بۆ ئەوەش هەر شتێك بەری پێ‌گرت تەفروتوونای کرد. تەنانەت ئەم شێوازەی چەوت بوو، چونکە هەر وێرانی دەکرد و نەیدەزانی لە بری ئەوە بنیات بنێ.

ی.ك: بەڵێ ئەم تێبینییە زۆر گرنگە.

س.پ: بێ‌گومان. دەنا چۆن دروست بوونی (خروچوف) لێکدەدەینەوە. هەتا ئەوانەش کە دەیانتوانی قسە بکەن لە ساڵانی چلدا دوورخرانەوە. ئەوە بووە هۆی لە دایك بوونی کەسانێکی دووڕوو.

ی.ك: گەلێك پیاوی خاوەن دوو ئایین پەیدا بوون، یان یەکێك کە کەسایەتییەکی دیکە لە خودی خۆیدا دەشارێتەوە.

س.پ: لەوانەیە دەربڕینی کەسێکی خاوەن دوو ئایین ڕاست بێ. کەسایەتی ئەو گوێڕایەڵە کەوتەڕوو کە سەری دادەنەوێنێ و خۆی لە نێو دەبات. ئەم تەرزە، ئەو کەسایەتییانە لێکدەداتەوە کە لە (خروچوف)ەوە تا (یەلتسن) دەرکەوتن. ئەمە وا دەگەیەنێ ئەو گۆڕانکارییانە کە ئەمڕۆ ڕوودەدەن بەرهەمی دەستی ستالینن و پێمان ناکرێت چاوپۆشی لە پێوەندی ستالین بەم گۆڕانکارییانەوە بکەین. ڕەنگە ستالین خۆشی بەمە قایل نەبوو بێ و حەزی نەکردبێ شتێکی لەم چەشنە بکات، بەڵام ڕێ و شوێنەکانی خۆی کێشایانەوە بۆ ئەم ئەنجامە. من لە ڕێگای ئەزموونمەوە لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)دا دەزانم ئەگەر کەمێك بکەوتنایە نێو هەمان هەڵەوە، گەورەترین فێڵباز و پیلانگێڕی دووڕوو لەنێوماندا پەیدا دەبوون. بەڵام من خۆم بەم سیاسەتە ناخەڵەتێنم و ناوبەناو بە ڕێ و شوێنەکانمدا دەچمەوە.

ی.ك: لێرەدا دەمەوێ بڵێم: بەوەی کە تۆ ئەوەت دی و دەترسی هەمان هەڵە بکەی، بۆیە بە سیاسەتەکانتدا دەچیتەوە و لێیان دڵنیا دەبی.

س.پ: نەخێر، کەسێکی وەك من نییە دەرفەت بە بەرهەڵستان بدات تا خۆ

دەربخەن. لەبەر ئەم هۆیە هەموو کەسێك لای لەوە لێدەدات کە ئاپۆیە و هەر یەکێکیش لە من زیاتر توند و تیژی لە فەرمانەکانیدا دەنوێنێ.

ی.ك: خۆزگە هەموو یەکێك ببوایە بە ئاپۆ. هەمووان دەبنە ئاپۆی چکۆلە. چیاو داروبەرد گشتیان ئاپۆن.

س.پ: ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە من زۆر واقیعبینم و دەرفەت بە کەسانی دیکە دەدەم تا خۆ دەربخەن و گەورە ببن و ئەمەش ترسناك نییە. هەمووان ئێستاکە لە من پتر خۆ بە کاریگەر و بە بەدەسەڵات دادەنێن. من پێیان دەڵێم ئێوە ئاوا ئین. لە کاتێکدا ئەوان لافی ئەوە لێدەدەن کە ئاوان. ئەم کرانەوەیە پرنسیپی دیمۆکراسی و جێ بەجێکردنی تەواویەتی و بووە هۆی گەلێك گۆڕانکاری گرنگ.

ی.ك: ئاپۆی ئازیزم لەوە دەچێ تورکیا لەم بارودۆخە تێنەگات، بۆیە بەردەوام هاشەوهەوڕەشەی ئەوەیەتی کە ئاپۆ و فلانەکەس جیاوازی و لێك هەڵبڕانیان لە نێوانیدا هەیە.

س.پ: منم لەوانە بۆ پێشەوە پاڵ پێوە دەنێم و لەوانە دەستکردی منن، چونکە بە کەمی لەگەڵ کەسانی دیکەدا یەك دەکەوم و کەس نییە وەك من تێکۆشا بێ لەگەڵمدا یەك بگری و کەس نییە وەك من کەڵکی لە هەڵەکان وەرگرتبێ و بۆ یەکنەکەوتن لاساری نەکردبێ. ئەو شێوازەی کە بەکاری دێنم دوو ڕووی هەیە ڕووی یەکەم ڕاکێشانی خەڵك بۆ ئەو یەکگرتنە گەورەیە و ڕووەکەی دیکە پەردە هەڵدەماڵێنە لە ڕووی ڕاستی ئەو خەڵکانە. مادامێکی پەیوەستەبوون بەم شێوازە هەیە پێم وانییە ئێمە دەکەوینە هەڵەکەی ستالینەوە.

ی.ك: بەڵێ، بەردەوام بن. من بەو پەڕی وردییەوە شیکردنەوەکانتان دەخوێنمەوە و گفتوگۆکردنی ڕووبەڕوو لەگەڵتاندا تام و بۆیەکی تایبەتی هەیە. ئێوە بە سەرگەری زۆر بەرتان لە شێوازی خۆتان و هی پارتی کرێکارانی کوردستان کردووەتەوە.

س.پ: دیارە ئێوە سەرنجی ئەوەتان داوە. ئەوانە لە تورکیا دەڵێن ئاپۆ دەکوژێ و لە سێدارە دەدات و سەردەبڕێ، بەڵام ڕاستی تەواو پێچەوانەیە.

ی.ك: من ئەوە دەزانم. قەناعەتی من وەك هی ئەوان نییە.

س.پ: ئەگەر زۆر کەس لە تێگەیشتنماندا قورسی بەدی دەکەن. ئەمە گوناحی ئێمە نییە. شیکردنەوەکان بخوێننەوە و بڕوانن چۆن لا لە هەموو بابەتێك کراوەتەوە.

ی.ك: لەوانەیە لێ‌تێگەیشتنتان قورس بێ.

س.پ: ئەگەر لێ‌تێگەیشتنم قورس بێ، من چی بکەم؟ من ئیش بۆ ئەوە دەکەم کێشەیەك نەهێڵم و مافی ژیان بە دەست بێنم. پێویستە خوێنەر یا بەدوودادچوو بەرێزەوە وەڵامی ئەم کۆششە بداتەوە و هەوڵی تێگەیشتنی بدات نەك بیقۆزێتەوە. تورکیا لەم مەسەلەیەدا زیاتر لە وڵاتانی دیکە ئیحتیاجی هەیە. ئەی ڕۆشنبیر و لاوی تورك بفەرموو کەمێك بەخوومانا بچۆ. من متمانەیەکی تەواوم بە ڕێ و

شوێنی خۆم هەیە، چونکە (٤٠) جار پێیدا دەچمەوە و شێوەی گونجاوی دەدەمێ، ئەمجا تاپی دەکەمەوە و پاش ئەوە دەست بە جێبەجێکردنی دەکەم. هێندێك کەس پێیان وایە بزێوم و بە بێ‌حسێب هەنگاو دەنێم. ئەخێر لەوانەیە هەمووان ئەوە بکەن، بەڵام من بەبڕای ببڕ نایکەم. هێندێکیان دەبنە سەرخۆش لە سیاسەتدا و پێیان وایە خۆیان هەنگاو دەنێن. بەڵام من لەوە دادەچڵەکێم و قووڵ بیردەکەمەوە و دەڵێم: ڕەنگە ئەمە جادووگەر بێ لەوانەیە بە جادووی خۆی دەستم لێ‌بوەشێنێ. بە تین و توانی خۆمدا دەچمەوە. دیارە ناکرێت بەسەر سەرگەرمی سیاسەت یا ناوبانگدا زاڵ ببی. بەڵام خەڵکانی دیکە دەیکەن. تەنانەت ئەوانەی وا ڕۆژانە دەبوومە لەسەریانە و لەسەر دەستی من گەورە دەبن، دەبنە سەرخۆش. بەڵام من زۆر بێ‌ڤیزم و ئەمە لەسەر بنچینەیەکی فەلسەفی و ئەخلاقی هەڵدەسەنگێنم و تا ئەوپەڕی پێبەستەی ئەم بەهایانەم. من بەبێ ئەم بەهایانە ژیانم نابێ.

ڕەنگە خاڵێکی دیکەش هەبێ، ئەویش ئەوەیە کە یەکێتی سۆڤێت ماتریالیزمی پەتی لە بری مارکسیزم جێبەجێ کرد. دەکرێت سەرنجی ئەوە بدەین کە مارکسیزم دژ بە ماتریالیزمی پەتی‌یە و خەبات لە دژی دەکات. بە ڕای من سۆشیالیستەکان و دیموکراتەکان کت و مت ماتریالیستین. سۆشیال دیموکراتەکانی ئەڵمانیاش ڕوونترین نموونەی ماتریالیزمی پەتین و ماتریالیزمی پەتیش مرۆڤ بەرەو کۆمەڵگای بەرخۆر دەبات کە ئەمڕۆ دەیبینین. ئەم کۆمەڵگایانە ماتریالیستی پەتین جا پێڕەوی سۆشیالیزمی بنیات نراو بکەن یان کۆمەڵگای سەرمایەداری خۆرئاوا. کۆمەڵگا ماتریالیستی‌یە پەلیەکانی لە ڕووی فەلسەفییەوە جیهان هەڵدەسووڕێنن. فراوانکردنی ئەلقەکە زەحمەت نی‌یە تا هەموو وڵاتان بگرێتەوە. بە کورتی ئەوەی تاکو ئێستا سەرکەوتوو بوو ماتریالیزمی پەتی‌یە.

ی.ك: ئێوە دەڵێن ماتریالیزمی پەتی، نەك سەرمایەداری.

م.پ: بەڵێ، ماتریالیزمی پەتی، نەك سەرمایەداری. هەردوو شەریکەیشن لە تاواندا. مارکسیزم لەم بابەتەدا مەترسی ماتریالیزمی پەتی بینی و ویستی خەبات لە دژی بکات، بەڵام پێم وایە سەرنەکەوت، بە تایبەتی کە گرنگترین لایەنی ماتریالیزمی پەتی جێ بەجێکردنی ئابووری‌یە بە شێوەیەکی سەرپەرگرانە و بایەخدانێکی زۆرە بە ئابووری. لێکدانەوەی هەموو شتێك لەسەر چەند بنچینەیەکی ئابووری ناوەکەی دیکەی ماتریالیزمی پەتی‌یە. ئەوە کارێکی کرد زۆر لە بەها مرۆڤایەتیەکان بایەخێکی پلە دوو یا سێیان پێبدرێت و تەنانەت بە تەواویش فەرامۆش بکرێن.

با هەوڵ بدەین لە شۆڕشی ئێران حاڵی ببین کە بووە هۆی سەرکوتی کۆمۆنیستەکان بە شێوەیەکی یەکجار دڕێو. دەبینین ماتریالیزمی پەتی بابەتەکەی بە شێوەیەکی ئایدیالیستی وەرگرت، واتە لەگەڵ ئایدیالیزمدا یەك کەوت. پێم وایە مارکسیزم و لینینیزم شایانی ئەوە نەبوون.

ی.ك: دەڵێن چەند ناکۆکی‌یەکی خوڵقاند.

**دەست بردن بۆ بابەتەکە لەسەر بنچینەی ئابووری پەتی کاردەکاتە سەر سەرخان، بە تایبەتی سەر لایەنی مەعنەوی و ئەخلاقی و، ئەوەش دەبێتە هۆی دوایی پێهێنانی بەها مەعنەویەکانی ژیان و ئەمیش پێ بە پێ دەکێشێتەوە بۆ کۆمەڵگای بەرخۆری ڕوو لە هەڵدێری ئاژەڵایەتــی.**

س.پ: بێگومان. ئەم کۆمۆنیزمە یا ئەم سۆشیال دیموکراتە هێز بە ئایدیالیزم دەبەخشێ. دەتوانین ئەوە بە درێژی لێکبدەینەوە، بەڵام ئەمە ڕاستییەکەیە و ئێمە نامانەوێ لەم هەڵەیە بکەین. گەلێك شت هەن پێویستە بگوترێن. بەڵام لایەنی مەعنەوی بابەخێکی زۆر پەیدا دەکات و دەست بردن بۆ بابەتەکەش لەسەر بنچینەی ئابووری پەتی کاردەکاتە سەر سەرخان، بە تایبەتی سەر لایەنی مەعنەوی و ئەخلاقی و، ئەوەش دەبێتە هۆی دوایی پێهێنانی بەها مەعنەویەکانی ژیان و، ئەمیش پێبەپێ دەکێشێتەوە بۆ ئەو کۆمەڵگا بەرخۆرەی کە باسمان کرد و ڕوو لە هەڵدێری ئاژەڵایەتی دەکات. بوونی مرۆڤ بە شێوەیەکی بنچینەیی پەیوەستەی ئابوورییە. لەوە بێئاگانین کە ژیانی مرۆڤ بە جادوو و ئاین دەستی پێکرد و پاشتر فەلسەفە و زانست سەریان هەڵدا. بەڵام ئەگەر لافی ئەوەمان لێدا کە کۆمەڵگا تەنیا بە زانست ڕێبەری دەکرێت، ئەوە تۆخمێکی خەسڵەتەکانی مرۆڤایەتیمان فەرامۆش کردووە. خۆ زانست دەچێتەوە سەر تەنیا میکانیکی بوون. ئێمە کە ئەوە دەڵێین نکوولی لە زانست ناکەین و ناساندنی زانستیش بە ماتریالیزمی پەتی دووپاتکردنەوەی هەمان هەڵەیە. حالی حازر زانست لە تورکیا جێبەجێ دەکرێت و جێبەجێکردنی زانستیش لە کێشەی کورددا دەبێتە هۆی نکوولی لێکردنێکی مرۆڤ توقێن و بەکارهێنانی زانستیش لە ئاستی جیهاندا دەبێتە هۆی کۆتایی پێهاتنی کۆمەڵگاکان. بە باوەڕی من ئەگەر ڕەخنەیەك هەبێ ئاراستەی سۆشیالیزم بکرێت، پێویستە دەست بۆ لایەنی مەعنەوی ببات و بیخاتە نێو فەلسەفەی سۆشیالیستییەوە. ئەم لایەنە لە ڕژێمی سۆڤێتیدا نەبوو، بۆیە بووە هۆی هەرەس هێنانی. ئەممان لە چاوی ئەو خەڵکانەدا دی کە شاڵاویان بۆ خواردن و دووکانەکان دەبرد. سەرەتا پێم وابوو گاڵتەکردنە. بەڵام پاشتر بۆم ساغ بووەوە کە ڕاستییە. هەرچی بکەوتبایە بەردەستیان کراسەکانی خۆیانیان لێپڕ دەکرد، وەك بڵێی باوەڕیان بەشی ئەوە ناکات. ئەم بارودۆخە دەرئەنجامی ئەو فەلسەفەیەیە کە لێی دوایین. کێشەکە لەوەدا نییە کە داخۆ ئەوانە برسی بوون یان نا، بەڵکو بارودۆخیان لە برسێتیش تێدەپەڕێنێ و پێوەندی بە فەلسەفە و ئەخلاق و هەڵدێرانیانەوە هەیە. ئەمە بەڵگەی بێئەملاوئەولایە. ئەمە دەڵێم لەبەر ئەوەی ئێمە لە نێزیکەوە بینیمان. وەختێك باسی بەهای مەعنەوی دەکەین، مەبەستمان تەنیا ئاین نییە چونکە چەمکی مەعنەوی زۆر لەوەش بەربڵاوترە، دەچێتە نێو ئەم چوارچێوە مرۆڤایەتی و ئەخلاقییەوە.

لەو مرۆڤەی کە بە چاوێکی چلێسانەوە دەڕوانێتە هەموو شتێك، شوێنی غەریزەی خۆی دەکەوێ، واتە غەریزەی بەرسێتی یا غەریزەی جنسی. دەشبێتە بار و مرۆڤایەتی هەرەس دێنێ و لێدی ڕوو بە چ هەڵدێرێك دەڕوات؟ ئەمەیان ناتوانین سەرەنجامەکەی دیاری بکەین. جا لەم دەستپێکەوە نکوولی کردن لە ئایین چارەسەر نییە و بچووککردنەوەی سەرخان ڕاست نییە. ئەگەر سەرنجتان دابێ من ناڵێم کۆمەڵگا وەك چۆن هەیە قبووڵی بکەین. ئەم بابەتانە نامۆیی‌یەکی گەورەیان تێدا هەیە. ئەگەر بڕوانینە کۆمەڵگاکان کاتێك بە قۆناخی پێش هەرەس هێنان و وێران بوون و هەڵوەشانەوەدا ڕەت دەبن، دەبینین کۆمەڵگاکانی سۆشیالیزمی بنیات نراو بە هەمان قۆناخدا تێدەپەڕن و ئیمپریالیزمیش بە گشتی بەم قۆناخەدا تێدەپەڕێ.

ی.ك: باشە، سەرکردەی پایەبەرز، ئەم هەموو فەلسەفەیە لە شێوەی پرسیارێکدا دەخەمە بەردەمتان. گوتتان ماتریالیزمی پەتی بوو کە لە ڕژێمی سۆڤیێتیدا هەرەسی هێنا منیش ئەو باوەڕەم هەیە. بەڵام وەختێك باسی ئەو مرۆڤە دەکەین کە بیر لە خۆی دەکاتەوە، ئایا دەتوانین بڵێین ئەو باروودۆخەی کە ڕژێمی سۆڤیێتی تێکەوت دەرەنجامی ئەوەیە کە هەڵوێستێکی بەرگریکەرانەی دیاری کرد؟

س.پ: بێ گومان. ئەو قۆناخەی کە ڕژێم تێیدا پێویستی بە دیاریکردنی هەڵوێستێکی بەرگریکەرانە هەبوو ساڵانی شۆڕش بوو ـ واتە ساڵانی بیست. ئەمجا دووەم شەڕی جیهانی بە دووهات. هەرچی قۆناخی هەرەس هێنانیشە، ئەوە ڕژێمەکە لەوپەڕی هێزیدا و لە دۆخی هاوسەنگی‌یەکی جیهانیدا بوو.

ی.ك: بەڵام لە ساڵانی شۆڕشدا بیرۆکەی بڵاوبوونەوەی شۆڕش لە ئارادا بوو. لە ساڵانی بیستدا هێشتا دەست بەرداری بیرۆکەی شۆڕشی جیهانی نەبوو بوون وەك پرنسیپ. بەڵام لە ساڵانی پەنجا و شەستدا هەموو خەمێکیان لە پاراستنی کۆمەڵگای سۆڤیێتدا قەتیس بوو. کاتێك دەڵێم هەڵوێستی بەرگریکەرانە، من لەو هەڵوێستە دەدوێم کە گشت تەنازولێکیان کرد لە پێناوی زیان نەگەیاندندا بە کۆمارەکەیان.

س.پ: ئەمە ڕاستە. پێویستە پێمان قبووڵ بێ کە ئەم هەڵوێستە بووە هۆی لادانێکی گەورە. بەڵام گرێدانی هەموو شتێك بەم هەڵوێستەوە بە ناتەواوی دەمێنێتەوە. لەوانەیە ئەم لادانە کاریگەری ناڕاستەوخۆشی هەبووبێ کێشابێتیانەوە بۆ دەست هەڵگرتن لە خاسیەتی سۆشیالیزمی شۆڕشگێڕی و ئینتەرناسیونالیزم، لەوانەشە ئەمە هەڵوێستێکی بەرگریکەرانەی تەکتیکی بووبێ و ناکرێت بەم لادانەوە گرێی بدەین. دەنا چۆن دەم لە سۆشیالیزمێك و لە شۆڕشگێڕی‌یەك دەژەنین خۆدەخاتە نێو ئەم هەڵوێستە بەرگریکەرانەیە؟ دەتوانین ڕەخنە لەم لایەنەش بگرین. دەکرێت ئەوە هەر بە خۆپەرستی نەتەوایەتی لێکبدەینەوە، چونکە تەنیا ڕەنگی ڕووسی بەسەر شۆڕشدا زاڵ بوو.

ی.ك: حالیم. پاشان ڕژێمی سۆڤیێتی بوو بە کۆنەپارێز و ڕازی نەبوو هیچ شتێك تەنانەت لە ڕووی شۆڕشگێڕی‌یەوە بگۆڕێ. ئایا ئەمە ڕاستە؟

س.پ: لینین ئالای ئینتەرناسیونالیزمی لەبەر ئەم مەترسی‌یە بلند بەرز دەکردەوە. لایەنی ئینتەرناسیونالیزم لە ئەزموونی ڕووسیادا جۆرە تاقیکردنەوەیەك بوو هەوڵی‌دەدا نەتەوایەتی تێپەڕێنێ. گەلێك زیدەڕۆیی و هەڕاج کردن (مزایدە) لە ڕووی ئینتەرناسیونالی‌یەوە هەبوون. ئەزموونی سۆڤێتی بەڵگەی ئەمە بوو. بە ئەمانەتی من پێچەوانەی ئەمە ڕاستە. زیادەکاری و زیدەڕۆیی هەوڵێك بوون بۆ پووش بەسەر کردنی هەڵچوونی نەتەوایەتی.

ی.ك: بەڵێ. هێندێك تێز لەو بەڵگەنامانەی ئەمەریکا لە بارەی کوردەوە بڵاوکرانەوە کە ساڵی ۱۹۷۹ لە باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە تاراندا پەرابوون و هێندێکیانم بەدەست گەیشت و هەڵسەنگاندن. لەم بەڵگەنامانەدا شیکردنەوەیەکی ئەمەریکاییانە بۆ ساڵی ۱۹۷۵ بەدی دەکەین و ئاشکرا لەو شیکردنەوەوە دەردەکەوێ کە ئەمەریکایەکان بایەخ بە کێشەی کورد نادەن و سۆڤێت لێیەوە دوورن و لەوانەیە قسە بکەن بەلام هیچ ناکەن. جا لەبەر سیاسەتی کۆنەپارێزانەی سۆڤێت، ئەوان کێشەی کورد تەنیا بۆ هەڕەشەکردن لە ڕژێمی عێراق و تورکیا دەخەنە گەڕ، بەلام لە گەوهەری کێشەکەوە دوورن.

س.پ: ئەم ڕەفتارە تایبەت نی‌یە بە ساڵی ۱۹۷۵، بەڵکو ـ وەك دەزانن ـ بۆ ساڵانی بیست درێژ دەبێتەوە. زۆر ڕوونە ئەوان وەك لایەنێکی مەبدەئی ناڕواننە کێشەکان بەڵکو وەك تەکتیکێك و لە ڕووی بەرگری‌یەوە. جا بۆ حاڵی بوون لە ڕاستی هەڵوێستی سۆڤێت بەو ئەنجامە دەگەین کە سۆشیالیزمیش بەشێك بوو لە تەکتیك.

ی.ك: ئەمە زۆر سەیرە!

س.پ: من تەنیا ئاگادارتان دەکەمەوە. ئەو بەڵگانەی کە ئەمڕۆ لە بەردەستدان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەوا سۆشیالیزم تەکتیکێکی سەرمایەداری پاشکەوتووی ڕووسیا و نەتەوەپەرستی ڕووسی بوو. ئەمە زۆر جێی‌داخە، بەلام لەوانەیە ڕاستی پێك بهێنێ. دەکرێت کێشەی کورد گەلێ گرێ کوێرە بکاتەوە. ئەگەر سۆڤێت هەر پێبەستە بوونێکیان بە پرنسیپەکانەوە هەبووایە، نەیاندەتوانی هەتا لە سەردەمی ستالینیشدا بەم شێوە ئاشکرایە پێشێلیان بکەن. ئەوەتا بۆ بەدەست هێنانی پشتیوانی کەمالیزم، چاوپۆشی لە گەورەترین شێوازی دڕندانە دەکەن و ئەمەش پێشێلکردنی پرنسیپەکانە. خۆ پەیوەندی‌یان بە کەمالیزمەوە کێشەیەکی تەکتیکی‌یە و لە پێناوی تەکتیکیشدا پرنسیپەکان و سۆشیالیزمیش پێشێل دەکەن.

ی.ك: بەرانبەر بەوە پشتیوانی (مەحموود بەرزنجی) دەکەن لە سلێمانی چونکە لە ئینگلیز بەقینن و کاتێك لەگەڵ ئینگلیزدا دەگەنە لێك حاڵی بوون لە پشتیوانی پاشگەزدەبنەوە.

س.پ: ئەمە بێ مەبدەئی‌یەتە.

ی.ك: بگرە بە کردەوە جێ‌بەجێ کردنیەتی.

س.پ: به کردەوە جێبەجێکردن یا بێ مەبدەئی‌یە. لەو نموونانە کە هێنامانەوە مەودای ئەو لادانە دەبینین کە ستالین و سۆشیالیزمی سۆڤێتی تێی‌کەوتن. تەنانەت لە ئینتەرناسیونالیزمی ئیسلامیشدا ئەم ئەندازە نەتەوایەتیە نی‌یە. با بروانینە لایەنی ئینتەرناسیونالی لە ئیسلامدا، بۆمان دەردەکەوێ لە سۆشیالیزم پتر هەمەلایەنەیە.

ی.ك: ئەگەر دەست بۆ نموونەی ئێران ببەین، سەیر دەکەین شیعە یا ئیسلام لە پێناوی پەلهاویشتندا ئایدیۆلۆژی ئەوان پێکدەهێنێ.

س.پ: بێ‌گومان. ئامرازێکە بۆ پەلهاویشتنی نەتەوەیی‌یان. ئێستا ئەوە روون دەبێتەوە کە سۆشیالیزم وەك ئایدیۆلۆژی هێشتا بەها زانستی‌یە کۆمەڵایەتیەکەی پاراستووە و نابێ سۆشیالیزم بۆ مارکس و ئەنگلس و لینین بگێڕدرێتەوە، چونکە ئەوانە لوتکەی چەند قۆناخێکن. لەوانەیە لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەدا کە روو دەدەن لوتکەی تازە پەیدا ببن. لەم چەمکەوە ئەوەی کە پاشەکشەی کرد سۆشیالیزم نی‌یە بەڵکو لادانە لە سۆشیالیزم. یەکێتی سۆڤێت هەرەسی هێنا، چونکە لە سۆشیالیزم دوورکەوتەوە و سۆشیالیزمیش بە هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤێت هەرەسی نەهێناوە.

ی.ك: بەڵێ، ئەمە سەرنجێکی بەهادارە و لە جێی خۆیدایە.

س.پ: بەم بۆنەیەوە دەمەوێ لە یەك یا دوو بڕگەدا لا لەو چارەسەرە بکەمەوە کە ئێمە لە جەنگەی ئەزموونی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)دا پێی گەیشتین. دەکرێت وا بروانرێتە پارتی کرێکارانی کوردستان کە رەخنەیە لە سۆشیالیزمی سۆڤێتی. وەك سەرنجتاندا باسی داخرانی حیزبی کۆمۆنیستی تورکیایان کرد کە پاشتر کێشایەوە بۆ تێداچوون و بڕانەوەی لەسەر دەستی (حەیدەر کوتلو). ئەمە دەڵێم لەبەرخاتری ئەوانەی وا چوونەتە نێو حیزبی کۆمۆنیستی تورکیا. وەك دەزانی ئێمە سۆشیالیزممان لە کێشەی کورددا جێبەجێ کرد و لەو هەڵوێستانەی سۆشیالیزمی بنیات نراویشەوە کە مەبدەئی نەبوون زانیمان لاف و گەزافیان بۆ سۆشیالیزم تەکتیکی بوو. لەم هەڵوێستەوە چەندەها رەخنە لە پارتی کرێکارانی کوردستانەوە دەرچوون و ئاراستەی ئەزموونی سۆڤێتی کران. لەو رەخنانە: «ئاماجی ئەوەتان نی‌یە سۆشیالیزم وەك تەکتیك بەکار بهێنن، چونکە سۆشیالیزم کۆمەڵێك پرنسیپە و ئێمەش گرێدراوی ئەم پرنسیپانەین». ئەم هەڵوێستە گەشەکردنێکی لە پارتی کرێکارانی کوردستاندا پەیدا هێنا. حیزبی کۆمۆنیستی تورکیاش هاتە سەر تەکتیکێك کە بووە هۆی کۆتایی پێهاتنی. ئەگەر حەزبکەن دەتوانم لەم بنچینەیەوە مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستانتان بۆ هەڵبسەنگێنم. بە کورتی لەوەم لێك داوەتەوە کە: من حەزم نەکردووە و بە پێویستم نەزانیوە رێکخستنی پارتی کرێکارانی کوردستان لەسەر تەرزی حیزبە کۆمۆنیستە حازریەکان بێ. ئێستا پێویستی‌یەکی زۆر بەوە هەیە پارتی کرێکارانی کوردستان درێژبکرێتەوە. هیچ بنگەیەکی ئۆرگانیکی لە

ئارادا نییە بە سکرتاریەتی حیزبیشەوە. هێندێکیان باسی سەرۆك و هێندێکی دیکەیان باسی سکرتێری گشتی دەکەن. وەك دەزانن ناساندنێکی جێگیر نییە. ئەم کارە ناوەندیش دەگرێتەوە. ناوەندی حیزب سنووری پێنەزانراوە، نازانین لە کوێوە دەست پێدەکات و تا کوێ درێژەی دێت. هەروەها نازانرێت ئەندامێتی حیزبیش لە کوێوە دەست پێدەکات و لە کوێ کۆتایی دێت. من ئەم بارودۆخە بە دوازدە نێردراوە مژدە دەرەکەی عیسای سەردارمان (خوای لێ رازی بێ) دەچوێنم. ئەوانە وەك ناوەندی رێکخستن وابوون. هەروەهاش سەبارەت بە محەمەدی سەردارمان (درودی خوای لێ بێ) و خەلیفەکانی کە کۆمیتەیەکی ناوەندی بوون. هەر بۆ نموونە: ئایا شۆرشی فەرەنسە کۆمیتەیەکی ناوەندی هەبوو؟ تەنانەت کۆمیتەیەکی شۆرشی ئۆکتۆبەریش رادەی شێلگیربوونی چەند بوو؟ من بزانم دەزگایەکی شێلگیر نەبوو.

ی.ك: بەڵێ شێلگیر نەبوو.

س.پ: بیرۆکراسی لەسەر تەرزی دەزگای سکرتاریەت و مەکتەبی سیاسی رەگی لە نێو سۆشیالیزمی سۆڤێتیدا داکوتا. هەموو ئەمانە لەریان بەسەر کردەوەی سۆشیالیستی‌یەوە نەبوو. وەك پێشتر روونمان کردەوە حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤێتی هەڵوەشاوە پاش دامەزرانی یەکێتی سۆڤێت لە تەرزی سۆشیالیستی دوور کەوتەوە. لەبەر ئەم هۆیە پێویستە لەسەرمان پارتی کرێکارانی کوردستان دژی ئەم نەخۆشی‌یە قایم رابگرین. ئەمە خواستێکی راستەقینەی پێویستە، چونکە خەباتی راستەقینە راستگۆترین شایەتی گۆرانکاریە راستەقینەکانە. من ئەو ناوەندەم نەدۆزیەوە و کەس ئەوەندەی من کردوومە خەباتی بۆ دامەزراندنی کۆمیتەیەکی ناوەندی نەکردووە. بەڵام بۆم دەرکەوت ئەوە ناکرێت و ئەوسا گوتم پێویستە تەنگ بە راستی هەڵەچنین و بەرەو رواڵەتبازی دزە نەکەین.

ی.ك: ئەمە زۆر خراپە.

س.پ: ئەوی راستی بێ زۆر خراپ نییە و هێشتا لە قۆناغی دروست بووندایە. ئاوا بوو و ئاوای لێ‌دێت. پەندێکی تێدایە.

ی.ك: لە کتێبێکی ئەم دوایەتاندا دەڵێن: «من ویستم سەرکردایەتیەکی بە کۆمەڵمان هەبێ، بەڵام ئێوە داواکەمتان بەجێ نەهێنا».

س.پ: بەڵێ؛ ئەمە راستە. لەمە نابێتە بەربەست لەبەردەم پەرەسەندنی پارتی کرێکارانی کوردستاندا، بەڵکو بە پێچەوانەوە حیزب گەلێك گۆرانکاری گەورە بەخۆوە دەبینێ. لەم بارەیاندا پێوەندی‌یەك لەنێوان ئەم پەرەسەندنە و ئەم تەرزە دروست بوونەدا هەیە: مەبەستم ئەوەیە ئەگەر ناوەندێتی‌یەکی رواڵەتی رەق هەبوایە، ئەم پەرەسەندنانەی پارتی کرێکارانی کوردستانمان نەدەبینی. یا بە واتایەکی دیکە، ئەگەر رێکخستنی پارتی کرێکارانی کوردستان هاوشێوەی حیزبە کۆمۆنیستە باوەکان بووایە گەشەی نەدەکرد. ئەو تەرزەی کە لێی دەدوێم گرێدراوی واقیعە. بۆیە ئێمە پشت بەو ناوەندێتی‌یە تەقلیدی‌یە نابەستین کە

باسمان کرد. پێویست ناکات بەست کەس لەوانەی کە هەڵدەستن و دادەنیشن هەموو شتێك هەڵبسوڕێنن، چونکە ناتوانن بەدووی هەموو شتێکدا بچن و دەبنە کۆسپ لەبەردەم پەرەسەندندا. هێزی گەورەی ڕەخنەگرتنمان پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەم واقیعەوە هەیە. بۆ ئەوەی ڕاستییەکان بە ژێر لێوەوە نەکەین، من بەرهەڵستی پێکهێنانی کۆمیتەیەکی ناوەندی شەل دەکەم. چەند لەنجامێکی پڕ بەرهەممان لەم کردارانە دەست کەوت. ئەمە کردەوەیەکی توند و تیژە دژی ڕەگازۆ بوونی بیرۆکراسی، پارتی کرێکارانی کوردستان مانای ڕاستەقینەی بنگەی سەرکردایەتی بە دەستەوەدا و لە بارترین چارەسەری بۆ مەسەلەی سەرکردایەتی دانا. ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەوانی دیکە چاوی لێبکەن.

ی.ك: باشە. ئایا دەتوانین بڵێین: ناکرێت وێنەی دروست بوونی پارتی کرێکارانی کوردستان لەسەر کاغەز بکێشین وەك چۆن بۆ حیزبە کۆمۆنیستەکانی دەکەین؟ تەنانەت حیزبی بەلشەویش هارجووتی شێوە وێنە کێشراوەکەی خۆی نەبوو لەسەر کاغەز. من پشتگیری ئەم کردەوەیە دەکەم. حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیێتی هەتا ماوەیەکی کەم پێش هەرەس هێنانیشی بەو تەرزە بوو کە باسم کرد. گەرباچۆف لە یەکەم ڕەخنەکانیدا سکاڵای لە دەست کارانەبوونی کۆمیتەی ناوەندی کرد. بە ڕای من کادێران باش خرابوونەکار و، بۆ ئەوەش کە تاکڕەوی بالادەست نەبێ گۆڕین لە کەسەکاندا دەکرا. ئەوانەی کە بەهۆی خراپییانەوە لە وەزیفەکانیان دوورخرانەوە، جارێکی دیکە دەرگایان لەبەردەمدا کرایەوە تا بەرپرسی خۆیان بگرنەوە ئەستۆ. من ئەمە وا دەبینم زۆر گرنگە. باشە سەرکردەی گەورەم. ئەم هەموو ڕێکوپێکییە پشت بە خودی ئێوە دەبەستێ و تۆش یەك عەقڵ و یەك دەزگای دەماری. ئەگەر حیزب فراوان ببێ، چی ڕوودەدات؟ ئایا ماندوو نابن؟ ئایا ئەمە نابێتە هۆی خنکان؟ کاتێك لە ساڵی ١٩٨٩ دا سەرەتێدان لەمە دەترسام. لە کاتێکدا ئێستا لەم ڕۆژانەدا دەتبینم زیاتر چوست و چالاکی و کەسایەتیتان خۆشەویستە، بەڵام سەرباری ئەوە دەلەرزم، چونکە ئێوە زۆر خەریکی وردەکاری مەسەلەکان دەبن. واتە دەزگای دەمارتان بەردەوام ئێش دەکات. ئایا ئەمە ماندووتان ناکات؟ یەکەم ڕۆژ گوتت: «ئەگەر ١٠ ساڵی دیکە مامەوە ـ خوایار بێ دەمێننەوە ـ چارەسەرێك بۆ ئەم هەموو مەسەلانە دادەنێم بە مەسەلەی شۆڕشیشەوە». لە کاتێکدا من لەبەر ئەم بارە قورسە دڵم لە لاتانە، چی دەڵێن؟

س.پ: هەقتە نیگەران بی. من لەوە بە ئاگام و لە دڵی خۆمدا چاودێری گۆڕانکارییەکان دەکەم. ئەم تەرزەی کار و ئەم خێراییە دەگمەنن. واتە ئەوپەڕی خێراییە کە کەسێك ئیشی پێدەکات. ئەگەر سەرنجی ڕێ و شوێنە بنچینەییەکانی ژیان بدەی، گەلێك غافڵگیری چاوەڕوان نەکراو لە گۆڕێدان. هەتا ئەگەر ڕوانینمانە یاساکانی سروشت، کارەکە بەم پێیە بەردەوام نابێ.

ی.ك: کەس باوەڕ بەوە ناکات. ژیانتان ئاسایی و زۆر سادەیە. هیچ خۆشگوزەرانییەك لە ژیانتاندا نییە.

س.پ: من زۆر بیر لەم مەسەلانە دەکەمەوە و دەروانمە مێژوو و هەوڵی شیکردنەوەی دەدەم. هێندێك شیکردنەوەم نووسیون، چونکە ئێمە کوردستانێکی بەدەم و زمانمان گەرەکە و لەمەش پەرەسەندن و شیکردنەوەی خۆی دەخوازێ. بێگومان تێکدانێکی دەست لەنقەست و چەندەها زەبری گورچکبڕ هەن. ئەگەر هەموو شتێکم پێ بکرایە، ئەم تێکدانە و لەم زەبرە گورچکبڕانە نەدەبوون. بەڵام سەرباری ئەوە، پەرەسەندنە بنچینەییەکان شێوازەکان پێشان دەدەن. وەك فەرمووتان سەرەڕای ژیانی یەکجار سادەم، هێزێکی گەورەی هەڵسوڕاندن هەیە. من لە کەسانی دیکە پتر بەرخوودان دژی کەلەگایی دەکەم و بە تێپەڕینی ڕۆژگار دەمەم بە دەسەڵات. من سەرنجی ئەوە دەدەم و هەوڵدەدەم ڕێ و شوێنی پێویست دابنێم و کاری هەرموەزی سەقامگیر بکەم. باسی خۆمم بۆ کردن وەختێك تەمەنم حەوت ساڵان بوو و بۆم باس کردن چەند شەیدای کاری هەرموەزی بووم و هێشتاش وەهام. بەڵام وێڕای ئەوە (من)ێك هەیە گەورە دەبێ. من لافی ئەوە لێنادەم بەهۆی منەوە کوردستان کەوتە ڕوو و گەلەکەی گەورە بوو و پارتی کرێکارانی کوردستانیش پەلی هاویشت. ئەگەر لە خۆم بەدەر لام لەم گۆڕانکاریانە کردەوە، تووشی هەڵەیەکی گەورە دەبم، چونکە پێوەندیان بە شێواز و خەباتمەوە هەیە وەك پێوەندی نینۆك بە گۆشتەوە. بەم بۆنەیەوە من پێش ساوێك گوتم: «کەمالیزم پەلی هاویشتووە بەڵام مرۆڤی تورك بەستەباڵا بووە». ئەم ڕەخنەیە ئاراستەی کەمالیزم کرابوو، لە کاتێکدا بۆ من پێچەوانەکەی ڕاستە، «ئاپۆ گەورە بووە و پارتی کرێکارانی کوردستان لەگەڵیدا گەورە بووە و کوردیش لەگەڵیدا گەورە بووە».

ی.ك: پێم وایە ئەمە هەڵوێستی (دۆغان گۆریش)ی سەرۆکی دەستەی ئەرکان و (ئەحمەد تورك)ی سەرۆکی حیزبی کاری میللی و تێڕوانینی هەمووانە. دەوڵەتی تورکیا باوەڕی وابوو دەتوانێ پارتی کرێکارانی کوردستان و ئاپۆ لەیەك بکات، بەڵام بە قەناعەتی من بۆیان نەچووەسەر.

س.پ: دیارە لە یەك کردن گرانە، چونکە من هەموو کۆششێکم بۆ ئەوە کردووە ئەم جۆرە سەرکردایەتیە پەرە پێبدەم. ئەگەر ئەم سەرکردەیەش بە گەل پشت ئەستوورە و بیر لە گەل دەکاتەوە، بە گەلەکەیەوە گەورە دەبێ و لەگەل دەوروپشتەکەیدا تەبا دەبێ. پێملی ئەم خاڵانە بووین و نیشانەکانی بە بەرچاوەوەن. پێش ساوێك باسی پاداشتی ئاپۆمان کرد. هەر کەسێك دۆستایەتیمان بکات مەزن دەبێ. ئەمەش گرنگە. بۆ نموونە دۆغان گۆریش کە زۆر کەش وفش دەکات، هێزی خۆی لەو گەلەکۆمانەوە وەردەگرێ کە دژی ئێمە دەیانکات. وانییە؟ تەنانەت لووت بەرزی (ئۆزال)یش بە ئێمەوە بەستراوە. پێشتر ئەممان هەڵسەنگاندووە و پاشتر ڕاستی ساخ بووەوە. ئۆزال بوو بە هەڵوێیەك دژ بە پارتی کرێکارانی کوردستان و ماوەی مانەوەشی پەیوەستەی ئەوەیە کە هەڵویە.

ی.ك: بەڵام هێندێك هەڵوی دیکەش دەردەکەون.

س.پ: ئەمە کێشەیەکی دیکەیە. من وەك نموونە دەڵێم. بەڵام سەرباری ئەوەی

ئەو مەترسی‌یە لە ئارادایە کە باستان کرد. خۆ بنگەی خەلیفەکانی محەممەد (درووودی خوای لێ بێ) و بنگەی نێردراوە مژدەدەرەکانی عیسا (سڵاوی خوای لێ بێ) بوون کە بوونە هۆی دامەزراندنی مەکتەبی سیاسی بۆ لینین. وێڕای ئەوەی کە من بیر لە هەموو ئەمانە دەکەمەوە و «لاپەڕەکانیان هەڵدەدەمەوە» وای دەبینم کە هیچ یەکێکیان لەگەڵ باروودۆخی ئێمەدا جووت نایەتەوە.

ی.ك: بەڵام ڕژێمێکی دەست نیشانکراوتان لێ‌پەیدا دەبێ.

س.پ: کێشەی پیاوی دووەم زۆر جار لای ئاپۆ سەری هەڵداوە. وا باستان بۆ دەکەم: ئەو هەڵەشانە هەن کە لە هەموو شتێکدا پشت بەستن بە ئێمە و تا پلەیەکی لەخۆبایی بوون گەشە دەکەن و پێیان وایە بوونەتە پیاوی دووەم پاش ئاپۆ. ئەمە نەخۆشی‌یەکی بڵاوە، بەڵام هێشتا پیاوی یەکەمیان لەبەردەمدا ماوە و تەگەرەیان بەردەمێ و بیر لە چۆنیەتی تێپەڕاندنی دەکەنەوە و بەم پێیە پیلان دەگێڕن. ئەوە باروودۆخێکی بە ڕاستی جێی داخە. بە پلەی پیاوی دووەم گەیشتن ئاسان نی‌یە. ئەگەر پیاوی یەکەم بڕۆیشتبایە، پیاوی دووەم نەدەما. ئەمەیان پێ‌دەڵێم و بگرە تکایان لێ‌دەکەم. ئەو پێی وایە ئەگەر پێوەندی لەگەڵ ئاپۆدا بەست و دەسەڵاتی لێوەرگرت، دەرگایەك لە دنیادا نامێنێ بە ڕوویدا نەکرێتەوە و گرێ کوێرەیەك نامێنێ بە دەستی ئەو نەکرێتەوە. لەبەرئەم هۆیە لەسەر هەڵوێستی خۆی سوور دەبێ. ئەمە فێڵێکی گەورەیە و بێ‌ئاگایی‌یەکی گەورە لە مەسەلەی سەرکردایەتیدا دەردەبڕێ. من بەو شێوەیەی کە ئەو بۆی دەچێ دەسڕۆیی و دەسەڵاتەکانی خۆمم بەدەست نەهێناوە. ئەوە بەرهەمی ژیانێکی سامناکە. ئەو بەوە نازانێ و تەنیا هەوڵدەدات ئەنجامەکان زەوت بکات. کاتێك دەگەن، بە کورسی بەردەمیانم دادەنێن و نازانن لادانی ئەم کورسیە با بە زیندوویش بمێننەوە دەیانبڕێنێتەوە. ئەمە خاڵە گرنگەکەیە. گرنگ نی‌یە لەوانەم پاکتاو کردبێ یان نەمکردبێ. بەڵام ئەگەر پیاوی دووەم و سێیەم بەم شێوەیە بن و ئەگەر کەمێك دوورکەوتنەوە، چ بنگەیەك دەمێنێتەوە؟ لەم خاڵەدا وریای ئەوە بن کە دەیڵێم. بۆ نموونە: سەرنج بدەن سێ خەلیفەی محەممەد (د.خ) کوژران و ئەو مەکتەبی سیاسی‌یەش کە چووە جێی لینین هەر ژمارەیەکی کەمی لێ‌مایەوە. ئەگەر لەم دوو نموونەیە وردبیتەوە، بۆت دەردەکەوێ ئەوە چارەسەرێکی تەواوەتی نی‌یە و پێویست بەجێ‌بەجێکردنی دەقاودەقی ئەم نموونەیە ناکات. ئەوسا دەبینین پیاوی دووەم بە بەرچاومانەوە چی بەسەر دادێت. پێشکەوتن پێویستە یەکجار سادە نەبین و چیمان پێ‌دەکرێت بیکەین. من خۆم ناکەم بە ناوەند و ئەوەم ڕەچاو کردووە کە لەوانەیە ئەم ناوەندێتی‌یە لابدات. پێویستە لەوە نەخەمە مەترسی‌یەوە. ئەگەر دەڵێن پارتی کرێکارانی کوردستان بە تۆ دەستی پێ‌کرد و ڕەنگە بە کۆتایی هاتنی تۆ ئەویش کۆتایی پێ‌بێت. منیش دەڵێم: ئەگەر پارتی کرێکارانی کوردستان دەبێتە بەڵا بە بان سەری خەڵکەوە، با ئەمڕۆ بەر لە سبەی دوایی پێ‌بێت.

ی.ك: ئەمە هەڵوێستێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە.

س.پ: بێ‌گومان ئەمە پرنسیپێکی ئەخلاقی‌یە و هەڵوێستی ئێمە لەم پرنسیپەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەگەر بڕوانینە ساڵی ١٩٩٢، دەتوانین چاوەڕوانی ئەوە بکەین کە ساڵی ١٩٩٣ چۆن دەبێ. جا لە باتی ئەوەی کە پارتی کرێکارانی کوردستان بێ بە بەلاّ بەسەر سەری گەلەوە، دوایی پێهاتنی لەگەڵ مندا باشترە، چونکە ئەو زیانانەی کە لێی دەکەونەوە زیانم پێدەگەیەنن. بۆیە باشتر وایە لەگەڵ مندا لە گۆڕ بنرێت. لەبەرئەوە من قایمکاری لەم هەڵوێستە دەکەم کە بەجێ‌هێنانی پرنسیپێکی ئەخلاقی‌یە. کەمێك لەمەوبەر باسی ئەوەتان کرد کە ئەگەر ئەم کۆشش و ئەم دەزگای دەمار و توانایە فیکری‌یانە نەمان، چی ڕوودەدات؟ وەك بڵێی بیر لە مەترسی‌یەك دەکەنەوە هەڕەشەمان لێ‌دەکات. ئەگەر لایەنێکی باشم هەبێ و ئەگەر حیزبیش پاش من بەسوود وەرگرتن لە نموونە و دەرسە مێژوویی‌یەکان ئەم لایەنە باشە پەرە پێ‌دەدات، با چەند پێی دەکرێت پەرەی پێبدات. بەلاّم ئەگەر بە خراپی پەرەدەستێنێ و ڕۆشنبیریم بۆ دەست گرتن بەسەر گەلدا دەقۆزێتەوە و دەسەلاّتەکانم یا هێزی ناوەندیم بەکاردەهێنێ تا ببێتە کارەساتێك بەسەر خەڵکەوە، ئەوە لە گۆڕنانی لەگەڵمدا باشترە. لینین کاتێك قایمکاری بۆ ئەمە نەکرد، بە هەڵەدا چوو. بەلاّم من ڕێ و شوێنی قایمکاری خۆم دادەنێم و لەسەر ڕێگای ڕاستم ئەوەی کە پێویست بێ بژی دەژی و ئەوەی کە پێویست بێ نەژی دەڕوات. بە قەناعەتی من ئەوە جێ‌بەجێکردنێکی جوانە.

ی.ك: من دان بەوەدا دەنێم کەوا ئەم بیرو باوەڕانەت فەلسەفین.

س.پ: من لەم بابەتەدا قایمکارم.

ی.ك: ئێستا سەرکردەی گەورەم پاش ئەم خاڵە فەلسەفیانە پرسیاری لەوە بەدوام پێوەندی بە جێ‌بەجێکردنی ڕاستەقینەوە دەبێ. ئایا باروودۆخ لە ساڵی ١٩٩٣دا سەبارەت بە هاوپەیمانەتی و حیزبی کاری میللی و کێشەی ئەکادیمیەکان و چەپڕەوەکانی دیکە چۆن دەبێ؟ چۆن ئەم هەموو پرسیارانە تێ‌دەپەڕێنن و چۆن باروودۆخی هەڵدەسەنگێنن؟

س.پ: بەڵێ. گشت پرسیارەکانت کۆدەکەمەوە و بە یەك کەڕەت وەلاّمیان دەدەمەوە.

ی.ك: بەڵێ. جارێکیان باسی سۆڤێتمان کرد. پاشان باسی بێ بەشکردنی تەندروستی یان ئەو پشتێنەی ئاسایشمان کرد کە ئیمپریالیزم بەسەر یەکێتی سۆڤێتیدا سەپاند تا ڤایرۆسی سۆشیالیزم نەیێتە دەرێ بۆ ناوچەکانی دراوسێ، ئەمە شیکردنەوەی ئێوەیە. وەك ڕووداوێکی هاوچەشنیش وای دەبینن کە تورکیا پارێزگارانی تازە لە باشوردا و پارێزگارانی ڕۆشنبیران و پارێزگارانی سەندیکایەکان لە تورکیا دادەمەزرێنێ و تەنازولی گەورەشی خستووەتە بەردەم ئەورووپا تا بۆ ئابلوقە سەپاندن بەسەر پارتی کرێکارانی کوردستان و ئاپۆدا و هێشتنەوەی لە نێو کوردستانی تورکیادا پشتیوانی بەدەست بێنێ. بە واتایەکی دیکە تا ڤایرۆسی پارتی کرێکارانی کوردستان و ئاپۆ لە بڕی بلاّوبوونەوەی بە

هەموو شوێنێکدا هەر لە نێو ئەم ناوچەیەدا بمێنێتەوە. ئایا ئەمە ڕاستە؟ مادامێکی زۆر بیردەکەنەوە، ئایا هەوڵدەدەن ئەم ڕێ و شوێنانە لە ساڵی (١٩٩٣)دا تێک و پێک بدەن. یەکێتی سۆڤێت ملی بۆ ئەم پشێنەیە کەچ کرد و بە گەمارۆدراوی لە نێویدا مایەوە.

س.پ: بەڵێ، بەڵام ئێمە ئەممان پێ قبوول نەبوو.

ی.ك: قبوولی ناکەن. بەڵام ئامرازەکانتان چین؟ بۆ نموونە. هێندێك هاوڕێ وا دەروانە حیزبی کاری میللی (HEP) کە ئامێرێکە بۆ نوێنەر گەیاندن بە پەرلەمانی تورکیا. دەوڵەت پێیوابوو کە ئاپۆ زۆر بایەخی بەم بابەتە داوە. من گوتم ئەوە بە لای پارتی کرێکارانی کوردستانەوە گرنگ نییە. ئەومم نووسی بوو بە خانلەگیری. بەڵام ئێستا حیزبی کاری میللی لە ساڵی ١٩٩٣ دا چی لێبەسەردێت و چەپی تورك چی لێ‌ڕوودەدات؟ باسی یەکێتیتان کرد، ئایا ئەم یەکێتی‌یە بە پێی تەرزی عیسایە (سڵاوی خوای لێ بێ). واتە هەمیشە پشتت پێ‌دەبەستن؟ جاران لەساڵی ١٩٨٧ ـ ١٩٨٨ دا پارتی کرێکارانی کوردستان شەڕی پێ‌دەفرۆشتن و لەسەر لەوەمان دەنووسی. ئێستا حیزب گەورە بووە و ئەوان پەلامارتان دەدەن، لە کاتێکدا ئێوە ـ مەبەستم پارتی کرێکارانی کوردستانە ـ پەلپ لەوە ناگرن و بەشێك لە چەپی تورك سەرقاڵ بووە. من لە شیکردنەوەکەتاندا بۆ ستالین دێمە پاڵ ڕایەکەتان. شیکردنەوەکەتان گەلێك لایەنی ڕوون کردەوە. بەڵام سەرباری ئەوە من ستالین بە سەرکردەیەکی مەزن لە قەڵەم دەدەم و هەموو ئەو نەخۆشیانەی تێدا هەن کە باست کردن و بینایەکی بنیات نا بەڵام....

س.پ: کە بیناکە گەیشتە قۆناغی خەڵك تێدا نیشتەجێکردن دوایی پێ‌هات.

ی.ك: بەڵێ. من بە هەمووان دەڵێم ئەگەر حیزبی کاری میللی(HEP) داخرا، چۆن پێویست بکات ئاوا حیزبێکی تازە دادەمەزرێنرێت. دەتوانین جگە لەمە چی بڵێین؟ دەمان لە گەلێك بابەتی فەلسەفی و گوتەی تیۆری زەند و چەندین بیروڕای تازەتان هێنایەوە، بەڵام خەباتی یاسایی لە کوردستانی تورکیادا وەستا و گوندەکان لە دانیشتوانیان چۆڵ کران. جەماوەر قسەکانتان دەخوێنێتەوە، چونکە وتەکانتان بایەخی ڕاپۆرتی سیاسی‌یان هەیە و پرسیارەکانیشم سەرلەبەر عەمەلی دەبن. یەکێك لەم پرسیارانە ئەمەیە: لە کاتی داخرانی حیزبی کاری میللیدا، ئایا پێکهاتەیەکی تازە دێتە گۆڕێ؟ ئەو دەروشانەوەیەی کە باسی دەکەن لە سایەی چالاکیە سەربازیەکاندا بەردەوام دەبێ. ئەوەتان لە گفتوگۆکانماندا ڕوون کردەوە. وە ئەگەر شیعر و زانست و ڕۆمان لە ئارادا نەبوون ئەوا ئەم دەروشانەوەیە بەرە ناستێنێ و بەڵام کێ بەرە پێدانی ئەم لایەنانە لە ئەستۆ دەگرێ؟ چەند هەنگاوێکت ناوە و هەمووان چاوەڕێی بیروڕای ئێوە دەکەن. بەم بۆنەیەوە ئەو چوارچێوەیە چی‌یە کە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە عەمەلیەکانم پێتان باشە؟ ڕوونت کردەوە کە هەڵچوونی کوردی دەبێتە نموونەیەکی مرۆڤایەتی. منیش پشتگیریت دەکەم و ئەوەشی لێ زیاد دەکەم کە ئەمە ڕاستە و بۆ کورد و تورکیش وەك یەك وایە. لە

شاری (بۆخن)ی ئەڵمانیا گوتم: «ئەمڕۆکە ئاڵای مرۆڤایەتی لە دەستی کورددا
دەشەکێتەوە». هێندێکیان گوتیان: تۆ زێدەڕۆیی دەکەی و بە نەتەوەپەرستی
کوردی تاوانباریان کردم. بەو قسەیەی ئێوەش قەناعەتم پەیداکرد کە ئەو گوتەیە
ڕاست بوو. من دەمەوێ بزانم ساڵی ١٩٩٣ لە ڕووی ڕۆشنبیری و حیزبی یاسایی و
گشت مەسەلەکانی دیکەوە چۆن دەبێ و پێم خۆشە تێڕوانینتان لەو بارەیەوە بزانم.

س.پ: بەر لە هەموو شتێک دەمەوێ شتێک لەسەر تیۆری پشتێنە بڵێم کە باستان
کرد. قسەکەتان ڕاستە. پشتێنەی سۆڤیەتی بووە هۆی خۆبەدەستەوەدانی سۆڤیەت و
قایل بوو لە نێو ئەم پشتێنەیەدا بمێنێتەوە و لەمجا بەیەک کەوتن گەیشت. وا
دەردەکەوێ ئەوان هەوڵدەدەن پشتێنەیەکی لەو چەشنەمان بەسەردا بسەپێنن.
ئینگلیز بە ڕاشکاوی باسی ئەم خاڵەی کردووە. پێم وایە ئینگلیز لەم جۆرە
بابەتانەدا پسپۆڕن، چونکە لەم ڕووەوە خاوەنی گەورەترین ئەزموونن. پێش چەند
ڕۆژێک وەزیرێکیان بە ئاشکرا ئاخاوت و پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)ی
پتر لە تورک بە تیرۆرکاری تاوانبار کرد. نوێنەری یۆنان لەم هەڵوێستە سەرسام
بوو. لەوانەیە لەبەرئەوە بوو بێ کە وەزیری ئینگلیزی لە تورک زیاتر مەترسی
سۆشیالیزم لە پارتی کرێکارانی کوردستان دەبینێ و پێویستی بە مشووری
پێویست خواردنە و بە توندی پشتگیری بەرەی کوردستانی لە باشوور و ئۆزال لە
تورکیا دەکات و لە ئەورووپاش لە ڕێگای پەرلەمانی ئەورووپاوە ڕێ و شوێن دادەنێ.
پێویستە هیچ شۆڕشێک بە ژمارەی ئەو خەڵکانە کە لایەنگری دەکەن و بە ژمارەی
بەرهەڵستانی هەڵنەسەنگێنین، چونکە ئەمە بیرکردنەوەیەکی بەر تەسکە. وەک
گوتم پێشتر هیچ نەبووم.

ی.ک: خوایە بمانبەخشن.

س.پ: ئەخێر! لە کۆمەڵگایەکی ڕوو لە بڕانەوەوە دەستم پێکرد. هیچ پلەیەک
نییە خوار هەڵوەشانەوەی ئێمە کەوتبێ، چونکە دوا پلە کۆتاییە. لەو خاڵەوە
تێهەڵچووم و بەرێ کەوتم. ئەمە دەڵێم تا مەسەلەی پارتی کرێکارانی کوردستان
ڕوون بکەمەوە. ئەو قۆناغەی کە ئێستا پێی گەیشتووین، گەلێک گۆڕانکاری زۆر
گرنگی لە دووتوێی خۆیدا شاردووەتەوە. ئەمە هەڵسەنگاندنی ئێمەیە. پێکهاتەی
ناوەوەی (PKK) تا ساڵی ١٩٩٢ زۆر گرنگە. ویستیان ناوی لە کوولەکەی تەڕیشدا
نەهێڵن و لەوەیان پێ بەس نەبوو لە نێو پشتێنەدا دایبنێن. کۆنەپەرستی جیهانی و
ناوخۆ بە کردەوە بۆ ئەم مەبەستە و بۆ لەنێو بردنمان یەکیانگرت. بەڵام سەرباری
ئەوە وای دەبینم ئێمە لەگەڵ کۆتایی هاتنی ساڵی ١٩٩٢ دا بەهێزین و ئێوەش
ئەمە بەدی دەکەن.

ی.ک: ساڵی ١٩٩٢ بوو بە ساڵی پارتی کرێکارانی کوردستان.

س.پ: بەڵێ. ساڵی ١٩٩٣ش وا دەبێ. ڕەنگە بپرسن کاردانەوەتان چی دەبێ؟
ئەگەر بڕوانینە ساڵی ١٩٩٢ دەتوانین چاوەڕوانی ئەوە بکەین کە لە ساڵی ١٩٩٣
چی دەبێ. ئەگەر توانیمان خۆمان لە ڕووی شارەزایی و تەکتیک و کارسازی

دیکەوە پەرە پێبدەین، پێمان دەکرێت گەریلا و راپەڕینە میللییەکان پەرە پێبدەین و ئەو هەڵە تەکتیکیانە تێبپەڕێنین کە لە ڕێکخستندا ووژدەدەن. ئەوسا هیچ بەربەستێکمان لە ڕێگادا نامێنێ بۆ سەرکەوتن. لەم بابەتانەدا هیچ لادانێکی گرنگ لە ڕووی ئایدیۆلۆژی یا سیاسییەوە نابینم. ئەگەر هەڵەی سادەش هەبووبێ، لێڕەت بوونیان ئاسانە. هەرچی کەم و کورتیشمانە لە گیروگرفتی ڕۆژانە و ڕەوشی چالاکیەکاندا بەتێبین. واتە گیروگرفتی سەرکردایەتی تەکتیکین و ئەم سەرکردایەتیە گەلێك کەرەستە و بنیاتی قوربانیدەری بە ئاسۆیی و ئەستوونی و لە ڕووی چەقبەستن و گەل و پەل و شارەزایی شەڕکردنەوە لە دەستدا هەن. واتە دەکرێت کەم و کورتیەکانی سەرکردایەتی تەکتیکی بە خێرایی نەهێڵین. ڕەنگە هێندێك گیروگرفتمان لە ئاستی ناوەندیتی سەرکردایەتی تەکتیکیدا هەبن و پێویستیان بە هەژانێك هەبێ. ڕەنگە ژێرخان لە ئاستی گەل و دیتنیشیانیشدا هەژانێکی گەورەك بێ. بەوە لە ڕێگای ئەو تواناییانەوە کە باسمان کردن بە سەرکردایەتی تەکتیکی گونجاو دەگەین. ئەگەر کاروبارەکان بەو جۆرە بەڕێوە چوون کە ئێمە ڕەنگمان بۆ ڕشتن، ئەو کاتە ساڵی ١٩٩٣ دەبێتە ساڵی گەردەلوول. خۆ ئەو پەلامارانەی کە پارتی کرێکارانی کوردستان لە هەموو شوێن و لایەکەوە تووشیان دەبێ، لە ناوەوە و دەرەوە بەرپەرچیان دەدەینەوە و هێرشەکانمان خێراییەکی بەرچاویان دەبێ. دەتوانم لە بارەی ئەم بابەتەوە هێندێك خاڵ ڕوون بکەمەوە. دیارە من لێرەدا نە نەخشەیەك بۆ چالاکی و نە بەرنامەیەك بۆ ئامانجەکان دادەنێم و پێویستیش بەوانە ناکات. ئێمە ئەو پارێزگارانە سەرانیان بە نیشانە دەنێینەوە. نموونەیەکمان لەسەر ئەم ئاراستەیە لە سەروبەندی شەڕی باشووری کوردستاندا بەرچاوخست. لە دەرەوەڕا ڕوومان تێکرد و ئەمجارە ڕاوەستاین. لەمە وا دەگەیەنێ کە ئەم خەباتە لە ناوەوە دەکرێت، بگرە لە ناوەوە و دەرەوەشدا درێژەی دەبێ و بەم پێیە ساڵی ١٩٩٣ دەبێتە ساڵێکی یەکجار گەرم و گوڕ. باشوور نۆکەرایەتی تێدایە. ئێمە ناتوانین وازیان لێبێنین و ئەوانیش ناتوانن وازمان لێبێنن. پێوەندی نێوانیشمان لە شێوەی شەڕێکی قورسدا تێپەڕ دەبێ و تێدەکۆشین بە خەباتێکی هەمەلایەنە ناچاریان بکەین بکشێنەوە و ناویان دەربێنین و لە کۆمەڵگایان دادەبڕین و ئەو پشتێنە سیاسییەی کە لە خۆرئاوادا بەسەرمانیا سەپێندراوە دادڕ دادڕی دەکەین و پێوەندی لەگەڵ ڕۆشنبیری ئەوروپایی و خەڵکە باشەکانی ناویان بەتین دەکەین. پێویستە لەم ڕووەوە چاوەڕوانی قەڵەمبازێك بین. لە هەموو ئەوانەش گرنگتر چۆنیەتی مامەڵەکردنمانە لەگەڵ سەرانی پارێزگاراندا لە تورکیا. وەك ئامادەمان بۆ کرد گەشت و گوزار سەرچاوەی گوزەرانیانە، یەکێك دەبێ لە نیشانەکانمان. جارێکی دیکە ئەمە دووپات دەکەمەوە و دەڵێم: ئەوانەی کە تورکیا بە بەهەشتێکی گەشت و گوزار دادەنێن، پێویستە لەسەریان ساڵی ١٩٩٣ بە تەنگ خۆیانەوە بێن.

ی.ك: ئایا دەبێتە دۆزەخ؟

س.پ: ئەگەر گەشت و گوزار پاڵپشتێکی شەڕی نامرۆڤانەی دژ بە ئێمە بێ، ئەوا ئەمە ئامرازێکە لە ئامرازەکانی شەڕ و ئێمە پەنا بۆ هێندێك تەکتیك دەبەین بۆ ئەهێشتنی ئەم ئامرازی شەڕە. هەروەها زانکۆکانیش هەن، ئەم زانکۆیانە خیانەت لە زانست دەکەن و دژ بە ئێمە بەکاری دێنن. ئەم شێوە بەکارهێنانەی زانست شیاو نییە و دەچێتە خانەی پارێزگارانەوە. دەوڵەت لە ژێر پەردەی زانکۆکاندا داکۆکی لەخۆی دەکات و لەوانەیە ئێمەش دژی ڕاوەستین. لە هەموو ئەمانەش گرنگتر بابەتی ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەیە کە بۆ بەنج کردنی گەل و پەرەپێدانی کردنی ڕاستییە کوردی و تورکییەکان بەکاردەهێنرێن و هەمان دەور دەبینن کە کڵێسە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دەیبینی. تەنانەت دەوریان لەوەش مەترسیدارترە و ئامرازێکی مێشك شۆرین و چەواشەکردنی بیرکردنەوەی ڕاست و دروستە. لەم شەڕەی دواییدا زۆرجار لە شاشەی نووسەرانی گۆشە نەگۆڕەکان و هەواڵە هەڵبەستراوەکاندا بە نیشانە نایانینەوە، تەنانەت (دۆغان گوریش) گوتی ئەوانە (محەممەد جیك *)ن.

ی.ك: (محەممەد جیك)ی ڕۆژنامەنووس؟

## خۆ لە قەرەی چارەسەری سیاسی نەدانی دەوڵەت کە باڵاترین جۆری مرۆڤدۆستانەی چارەسەرە، پاڵمان پێوەدەنێت و بگرە ناچاریشمان دەکات پەنا بە بەر ئەم ڕێگایە ببەین.

س.پ: بێگومان. محەممەد جیکی ڕۆژنامەنووس چیدەگەیەنێ؟ مەبەستم ئەوەیە ئەم ناونانە لە کاتی پەلاماردانماندا بەکارهێنرا. ئەگەر ئەو هەموو محەممەد جیکانە پەلامار بدەن، ئێمەش دەزانین چۆن بەرگری لە خۆمان دەکەین.

ی.ك: کاتێك دۆغان گوریش ڕۆژنامەنووسان و نووسەران بە محەممەد جیك ناودەبات، بەوە دەیانکاتە نیشانە بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK).

س.پ: بەڵێ ئەمە پێویستی بە قسە لەسەرکردن نییە، ئەوانە محەممەد جیکی ڕۆژنامەنووسن. سەرباری ئەوەی کە زۆر لە دۆستە ڕۆژنامەنووسەکانمان بە دەستی دەوڵەت غافلگیرکران و ڕێگا بە بڵاوکردنەوەی هێندێك ڕۆژنامەی دۆستی ئێمە لە کوردستان نادرێت، بەرانبەر بەم زۆرداریە بێوێنەیە، پێمان ناکرێت ئەم بەرەی شەڕە ببینین و قەر و قەپی لێبکەین. جا بۆ ئەم مەسەلەیە یا ڕۆژنامەنووسی و ڕۆژنامەنووسان بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ بەرژەوەندی گەلدا کۆدەکرێنەوە و دەبێ هێندێك نووسەر بەداد بێن، یا ئەو ئەنجامانە دەکەونە سەر شانیان کە لە کردەوەکانیان دەکەونەوە، چونکە دەبێ لانی کەم بیر لە بەرژەوەندییەکانی گەلی تورك بکەنەوە و مافی ئەوەیان نییە گرانی گوزەران و ڕاستیەکانی دیکە بشارنەوە

---

(*) تورك بە سەربازی خۆبان دەڵێن محمد جیك

و لەم ڕاستیانە بشێوێنن و هێرش بکەنە سەر پارتی کرێکارانی کوردستان. یا لە بری ئەوە هیچ نەبێ بیر لە بەرژەوەندی گەلەکەیان بکەنەوە و یا لەو گوشارانە بدوێن کە ئامانجیان گەلە و یا کۆلۆنیالیزم بیبینن، چونکە ئەوان بەم کردەوانەیان گوناحەکانیان زیاد دەکەن. ئێمە داوایان لێدەکەین ئەم باروودۆخە تێبپەڕێنن. سەندیکاکانیش هەن، ئەو سەندیکایانەی لەمپەرێکیان لە نێوان چینی «زەحمەتکێش و کرێکار» و شۆڕشدا داناوە تا بیری شۆڕشگێڕانە بەم چینانە نەگات. زێدەڕۆیی ناکەین ئەگەر بڵێین کەرتی کرێکاران هەرە پاشکەوتووترین کەرت پێکدەهێنن و ئاغا سەندیکاییەکانی بەرپرسی ئەم باروودۆخەن. ئەوانە پاداشتیان دەرهەق بەوە وەرگرتووە ئەم چینە لاڵ و کوێر بکەن و نەتوانێ هیچ بکات. ڕق و شوێنی ئەو ئاغایانە لە هی گوندپارێزان جیاواز نییە و ئەوانە سەرانی پارێزگارانی چینی کرێکار دەتوێنن. لەوانەیە هێندێك چالاکیمان دژ بەوان بێ. سەرەڕای ئەوە هێزەکانی شەڕی تایبەت هەن کە ئەوانیش نیشانەیەکی ئێمەن و لەو حیزبە تورکیانە پێکدێت کە لە بواری پەك کەوتنی نەتەوایەتیدا پێشڕکێ دەکەن، سەرانی پارێزگارانی لای ئەوانیش نیشانەیەکی بەرانبەری ئێمەن، چونکە ئەوان لە سەردەمی تورکیادا بە کردەوە یەکیان نەگرتبوو بەو جۆرەی کە ئەوان ئێستا لە دژی ئێمە یەکگرتوون. ئەوانە ڕایدەگەیەنن کە ئەوان لە بەردەم مەترسی جوێبوونەوە و پەلاماردانی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)دا هاودەنگن. ئەوانەش نیشانەیەکی ئێمەن. ماوە نادەین ئەم حیزبە سیاسیانە سەرجەمیان لە لایەك بن کە ئەویش لای دوژمن بە ئێمەیە. وێڕای ئەوەی کە ئەوان لافی بەرهەڵستی حکوومەت لێدەدەن، بەڵام ڕەفتارەکانیان بەڵگەی ئەوەن کە لە حکوومەت ترسناکترن. لە پاڵ ئەمەدا چەندین هێزی ناڕاستەوخۆی سەر بە شەڕی تایبەتی وەك (حزب الله) هەن. پێشتر کەمێك باسمان کردن. ئەوانە بوونەتە مەترسی و بە شێوەیەکی زیاتر سەرتاسەری ڕوویان تێدەکەین. گەلێك بنگەی ئاینی هاوشێوە هەن ژێربەژێر کاردەکەن و دەوڵەت کۆمەکیان دەکات. هەرگیز ناشێت و ڕێ نادەین ئاین بەم شێوەیە بەکاربهێنرێت و لەوانەیە بیکەین بە نیشانەیەکی خۆمان. لە پاڵ هەموو ئەوانەدا، پۆلیس لە تورکیا هەموو شتێك هەڵدەسووڕێنن. ڕەنگە دژیان ڕابوەستین، چونکە گرێدراوی مۆنۆپۆلەکانن. وەك دەزانن لە سەرەتادا سەرمایەداری مۆنۆپۆلی هەموو شتێك هەڵدەسووڕێنێ و نوێنەرایەتی ئابووری دەکات. خاوەنانی ئەم بنگانە کەلە سەرمایەدار و گوناحباری گەورەن و کەس تا ئێستا تۆخنیان نەکەوتوون. ئەوانە و بنگە ئابوورییەکانیشیان دەچنە نێو پلانەکانمانەوە سەرەڕای ئەوەی کە وەرزش و سینەما و تەنانەت هونەریش سەرپاکیان دژمان بەکار دەهێنرێن. ناوی هێندێك هونەرمەند و چۆنیەتی بەکارهێنانیانم لە لایەن ڕژێمی شەڕی تایبەتەوە بۆ هێناونەوە وەك (ئیبرای دیاربەکرلی و ئیبۆی ئوورفەلی)و فلان ئەکتەر و فلان نووسەر. پێویستە لەسەریان وریای باروودۆخی خۆیان بن. ئەوانەش کەرەستەیەکی شەڕی تایبەتن کە خۆمانمان بۆ ناوەتەوە. سا یا

دەست لە هێرش کردنە سەرمان هەڵدەگرن و دەگەڕێنەوە لای گوتەی «هونەر لە خزمەتی گەلدایە» بە پێی ئەوە دەجووڵێنەوە. دەنا بواری ئەو کارانەیان نادەین. هێزە دەست وەشێنەکانی سەر بە دەوڵەتیش هەن کە سوپایە. ئیدارە خۆجێییەکانیش ـ واتە شارەوانییەکان ـ هێزی تایبەتی دەوڵەتن و پارێزگارانن و ئێمە دەست دەخەینە بینیان. وەك دەبینین ساڵی ١٩٩٣ لە هەموو لایەکی کوردستاندا ساڵی شەڕی سەرتاسەری دەبێ.

ئەوی ڕاستی بێ ئێمە حەز بەوە ناکەین، بەڵام قەیرەی چارەسەری سیاسی نەکەوتنی دەوڵەت کە باڵاترین جۆری مرۆڤدۆستانەی چارەسەرە، پاڵمان پێوەدەنێت و بگرە ناچاریشمان دەکات پەنا بەرینە ئەم ڕێگایە ببەین. ئەوان وەڵامی پێشنیارەکانمان نادەنەوە، لەوانەیە لەبەرئەوە بێ کە بە کەممان دەگرن. جاران کەس نەبوو باوەڕم پێ بکات، هەتا ڕۆڵەکانی گوندەکەشم گاڵتەیان پێدەکردم و ئاتورەیەکیان لێنابووم. باپچنە گوند و لە بارەی منەوە لە خەڵکەکەی بپرسن. ڕەنگە سبەینێ بمرم. بەڵام ئەم ئیش و کارانە بە مردنی من دوایییان پێنایێت. بە ئاواتەوەم سەرۆکایەتی بەم بابەتە نەکەن و بەو قسەیەی خۆیان کە من تیرۆرکارم و جیاییخوازم نەیشێوێنن. گەلێك ڕاستی گرنگم بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە لەم گفتوگۆیەدا بەرچاوخست. ئەگەر ئەم ڕاستی و بابەتانەیان پێگووت بچێ، بەلای گەلان و ڕژێمەکانەوە مانایەکی گەورەیان دەبێ. با تێمان بگەن و بمانناسن و ئەگەر هەنگاوێکیش بەرەو لامان بێن. ئەمە بانگهێشتنی منە بۆ ئەوان. من لە سفرەوە و بگرە لە ژێر سفرەوە لێنیشتم و بەم قۆناخە گەیشتم و دەتوانم زۆر شت بکەم. ئەگەر پێویست بکات دەتوانین مرۆڤ بکەینە بۆمبێکی ناوکدار. ئەمە دروشمی منە. تکام وایە خۆیان بە قسەی بۆش نەخەڵەتێنن وەك: ئەمەریکا پشتگیریمان دەکات و ئەورووپا لەگەڵ ئێمەدایە و دەرگاکانی باشوورمان بەڕوویاندا داخستووە و پارتی کرێکارانی کوردستان حەشارگەیەکی نەماوە و ئێمە لەم ماوەیەی دوایییدا تەنگەتاوەمان کردوون. ئەم هەموو قسانە بێسوودن و کێشەکە تا ئەم ڕادەیە سادە نییە. ئێمە ڕاستە و ڕاست حەز بە چارەسەری شارستانیانەی باڵا دەکەین. لەوانەیە دەوڵەتەکەیان گەورە بێ و کەللە سەری قەوی پڕ لە مێشکیان زۆر بێ. هەرچەندە من دێنشینێکی سادەو هەژار بم، بەڵام چەند لایەنێکی گرنگ هەن جێی بایەخی مرۆڤن. من پێیان لەسەر دادەگرم. با لەوە حاڵی بن. ئەگەر برایەتی کوردییان پێخۆشە، با برایەتییەکی بێوێنە دابمەزرێنین. ئەگەر پێیان خۆشە تورکەکان بەهێز بکەن، با پێکەوە بە ڕێگایەکی ڕاست ئەوە بکەین. سنگمان بۆ ئەم هەموو مەسەلانە کراوەتەوە.

بەڵام ئەگەر بە لاساری خۆیان سووربوون و قسەی لەم چەشنەیان کاوێژکردەوە: «ئێمە چەندین سەدەیە وا ڕاهاتووین و وا دەستمان وەشاندووە و وا تاڵانی و خراپەمان کردووە و وا پاسامان داناوە و پشت گوێمان خستووە و بەم شێوازە ئەنجامەکانمان بە دەست هێناوە و بەهەمان شێوازیش ئاپۆ و پارتی کرێکارانی

کوردستان لە نێو دەبەین». ئەگەر ئەم هەموو قسانە بچوونەوە، وەڵامی من بۆ ئەوان ئاو هەزار با دەبێ و ڕەفتارم بە پێی ئازناوەکەم (شۆجەلان) «تولەسێن» دەبێ. ئەگبیری حاز بەدەستم بۆ ئەم بابەتانە هەیە و بەرخودانم وەك ئەوانەی پێشوو بێ ڕێکخستن و ئامادەکاری نابێ. من مرۆڤێکی لەم جۆرە نیم. بە ڕاشکاوی دەیڵێم: من شێوازێکی دیکە و جۆرێکی تازەی بەرخودان دەنوێنم. ئەوەی کە تا ئێستا کردوومە تەنها ئاماژەیە بۆ ئەو زیانەی کە لە دەستم دەقەومێ یا ئەو بەرەسەندنەی کە دەکرێت بەدی بێت. ئەمە هەموو ئەوە نییە کە دەتوانم بیکەم.

من بۆ شانازی پێوەکردنم ئەوە ناڵێم، بەڵکو تا قەوارەی کێشەکەیان پێ بناسێنم.

بەلای منەوە گرنگ ئەوەیە یەکێکیان تێم بگات. هەمیشە ئەوە بە لایەنگرانم دەڵێم: «پێویستە تێبگەن. ئەگەر تێنەگەن خۆم دەزانم چۆن تێتان دەگەیەنم». ئەمە بانگهێشتە بۆ لێك حاڵی بوون بۆ دواجار، هەمیشە دەیڵێم من ڕقم لە زەبر و زەنگە بە شێوەیەك کەس وەك من نایبوغزێنێ و هێشتاش ئاوام. بەڵام ئەگەر چارەسەرەکە لە زەبروزەنگدا پەنهان بێ. من لێزان و فەیلەسووفی زەبروزەنگم و گەورەترین کەسم زەبروزەنگ بزانێ. هەموو ئەمانە لەسەر ساڵی ۱۹۹۳ دەڵێم و بانگی هەموو ئەوانە دەکەم کە نوێنەرایەتی کۆمەڵگا و گشت کەرتەکانی گەل دەکەن، بە شوێن بیروڕای پەرەسەندوودا بگەڕێن و چەند هەنگاوێك بۆ پێشەوە بنێن. ئەگەر ئەوەیان نەکرد، ئەوا زیان بەوان دەگات نەك بە ئێمە. ئێمە زیاد لە پێویست زەرەرمەندین. ئەمە لە من زیاتر بەرژەوەندی ئەوان دەگرێتەوە. ئەمە بە هەموو نیازپاکییەکەوە دەڵێم. وەك چۆن قسەمان لەگەڵتاندا کرد و چەند ئەنجامێکی باشمان دەستگیر بوو، پێم دەکرێت قسە لەگەڵ هەمووواندا بکەم بۆ هەڵسەنگاندنی باروودۆخەکە و گەیشتن بە چەند ئەنجامێکی باش. بەڵام ئەگەر ئەم قسەیەیان دووپات بکەنەوە: «ئێمە تەنگمان پێ هەڵچنی و ناتوانێ هەناسە بدات»، واتە ئەگەر تەنگەتاویان کردم و نەمتوانی هەناسە بدەم و بەم قسەیە بێزار کرام، ئەوا تەرمەکەم لەوە زیاتری پێ دەکرێت کە من ئێستا دەیکەم. من قابیکاریم بۆ ئەوە کردووە. ئاواتەخوازم هەڵنەهێنچن پەنا بەر شێوازی دیکەی خەبات ببەم. شێوازی وامان هەیە واق وڕماویان دەکات. ئاواتم ئەوەیە ناچار نەبین پەنای بەر ببەین. لەم بارەیەوە بانگەوازێکم ئاڕاستەی گەل کردووە، تکام وایە گەل و ڕۆشنبیران و لاوان بە ڕاستی لێی تێبگەن. ئێمە لە بیرەوەری شۆڕشگێڕە شەهیدە تورکەکانی وەك (ماهیرو دەنیزو ئیبراهیم)دا خەباتمان سەرخست. ئەوانە لە بەرخۆدانیاندا ڕەسەن بوون. بیرەوەرییان هەر لەسەر زەوی نامێنێتەوە و خەباتمان لە پێناوی ئەوانیشدا سەردەخەین. خۆم لەو قۆناغەدا ژیاوم. هاوڕێیان بووم و خۆمم بە یەکێك لەوان دادەنا. توانیم بەم ڕۆژە بگەم و پێویستە لەسەر لاوانی شۆڕشگێڕ لە بیریان نەکەن و بۆ بیرەوەرییان بە ئەمەك بن و ئەرکی خۆیان بەرانبەریان جێبەجێ بکەن. ئەوانە لەو کەسانە نین کە خێرا بیرمان دەچنەوە یا دەست بەرداری بیرەوەرییان دەبین. ئێستا هەزاران پاڵەوانی بەرخۆدانی وەك ئەوان هەن لە بەندیخانەدا ژیاون و جۆرەها

شێوەی ئەشکەنجەیان چێشتووە. ئەوانیش لەوانە نین کە بکرێت بیریچنەوە یا تووڕ بدرێن یا خێرا لە گۆڕ بنرێن. ئەم گۆڕانکاریانە زۆر قووڵن. ئەی ڕۆشنبیران، ئەی لاوان، ئەی ئەو خەڵکانەی کە بە عەقڵی خۆتان بیردەکەنەوە، چی لە گۆڕەپانەکەدا ڕوودەدات لە بیری مەکەن. فێر بن چۆن لە خاوەنی مەسەلەکان بپێچنەوە. خۆ سووك مەکەن و وزەی خۆتان لە بەرخۆداندا بخەنە کار و داکۆکی لە مافەکانتان بکەن و لە نێو خۆتاندا خۆ ڕێکخەن و پێکهاتەی تازە لە نێو خۆتان دابمەزرێنن و لەگەڵ ڕێکخستنە شۆڕشگێڕەکاندا کراوە بن و هەنگاو بۆ پێشەوە بنێن. ئێوە لە هەموو خەڵکێك پتر تاڵاوی ئەوانەتان بە قوڕگدا چووە کە بەسەرتاندا زاڵن. بێدەنگ بوون لەو کارانەیان لە بەرژەوەندیتاندا نی‌یە. تەنانەت لە ئەفریقا و بەنگلادیش و پاکستانیش کۆلۆنیالیزمی لەم چەشنە نی‌یە، کەچی هەر لە تورکیا بەم شێوە هیچ و پووچە گەشەی کردووە. ئەگەر حەزدەکەن کۆتایی بەم جۆرە دڕندایەتیە بهێنن، ئەوسا هەموو پشتیوانی‌یەکی ئێمە بە خۆتانەوە دەبینن. لەم ڕووەوە شۆڕشی کوردستان بە ڕێبەری پارتی کرێکارانی کوردستان شۆڕشێکی تورکیایی‌یە و گەورەترین پاڵپشتتانە و ئەگەر خەباتی گەورەی مرۆڤ دۆستانە بکەن ئێمە لە پاڵتاندا دەبین و بێ‌گومان دەبینە هاوپەیمانی براتان و ئەمەش هەڵوێستە ڕاستەکەیە.

هەوڵمدا جارێکی دیکە مەسەلەکان ڕوون بکەمەوە و هەر بۆ پڕوپاگەندە ئەمە ناڵێم، بەڵکو لەبەرئەوە دەیڵێم کە ڕێزێکی زۆر لەم دوو گەلە دەگرین و بایەخێکی بێ‌ئەندازەیان پێ‌دەدەین. هێندێك ڕاستیمان خستووەتە بەرچاو. ئومێدم وایە ئەم ڕاستیانە بۆ خەباتی گەلان و ئازادی و برایەتی ڕاستەقینە بە کەڵك بن. من ئامادەم لە هەموو هەلومەرج و شوێنێکدا ئەرکی سەرشانم بەجێ بهێنم. با گەلی تورك چی دەوێ لە منی داوا بکات. ئەگەر ئەرکی خۆمم بەرانبەری بەجێ نەهێنا، لەو کاتە با بڵێت ئاپۆ خراپە. بەڵام تکام وایە تێم بگات و پاش ئەوە چی دەوێ لێمی داوا بکات. لەوە زیاتر دەتوانم چی بکەم؟ بەڵام ئەگەر سەرمڕای ئەوە نکوولی لە بوونی کورد و هەموو مافێکی مرۆڤانەی کرد. ئەوە مرۆڤایەتیم بەرز ناکاتەوە و لەوانە نی‌یە گەلی تورك تا ئەم ڕادەیە بێ ویژدان بێ. بۆیە پێویستە لە ئێمە و لەو کەسانە بپرسێتەوە کە بەسەریدا زاڵن. من لە ڕەفتاری خۆم بەرپرسم و بەرپرسیم دەردەبەم و تا دوا هەناسە ئەرکەکانم ڕادەپەڕێنم.

ی.ك: سەرکردەی گەورەم زۆر سوپاست دەکەم. ئێوە ئەرکی خۆتانتان بەجێ هێنا. هەوڵدەدەین قسەکانتان بگەیەنین. قسەکانتان بەئاگاهێن و ڕۆشنکەرەوەن. پرسیارەکانم تەواو بوون. ئەوەی ڕاستی بێ کرانەوەیەکی جوان و لە هەموو ڕوویەکەوە پاراو بوو. جارێکی دیکە سوپاستان دەکەم.

س.پ: منیش سوپاستان دەکەم. تەنانەت پێش ئەوەش کە بتانبینم ڕێز و نرخێکی گەورەتان لای من هەبوو. شیکردنەوەکانتان بەجەرگیم پێ‌دەبەخشن، بە تایبەتی شیکردنەوەتان لەسەر هێندێك پێوەندی گلاو. ئەم شیکردنەوانەتان

بەهایەکی گەورەی هەیە وەکو بەهای کاری شۆڕشگێڕی. ئەمەمان لای ئێوە بەدی کرد کە زۆر بایەخدارە.

ی.ك: لە هەلومەرجی ئەم ئیشە چڕوپڕەتاندا، بە شانازی و خۆشەویستییەوە بە دووی ئەوەدا چووم چۆن ئەنجام لە کار و کردەوەکانتان هەڵبهێنجم. ڕاستییەکەی پەیدابوونی کەسێکی وەك عەبدوڵلا ئوجەلان لەم ناوچەیەدا، بەلای منەوە شانازییەکی گەورە و چلەپۆپەی بەختیارییە.

س.پ: بە یەلدگەیشتنی زەحمەتکێشان بەهۆی یەکێتی هەوڵ و کۆششەوە سوودێکی زۆری دەبێ و شایانی هەموو ڕێزێکە.

ی.ك: سوپاس.

# بەشی چوارەم

س.پ: ئایا هەڤالانی لاو دەتوانن هێندێك پرسیار بكەن؟
ی.ك: لە من نایپرسن بەڵكو لە تۆ دەپرسن، چونكە من ناوبژیوانم و ئەمەش دەكەوێتە سەر هەڤالان و هەڤالانی شارەزاش چی دەبینێت باسی دەكەن.

## ئەوانە نوێنەرایەتی لاوان دەكەن.
## نەك هەر هی كورد بەڵكو هی عەرەب و توركیش.

س.پ: سەبارەت بەم گفتوگۆیەمان، ئەمە سوودی بۆ جێبەجێكردنی دیموكراتیانە دەبێ، بە تایبەتی كە ئەوانە نوێنەرایەتی لاوان دەكەن، نەك هەر هی كورد بەڵكو هی عەرەب و توركیش. یا بە واتایەكی دیكە لەوانە نوێنەرایەتی بنكەیەكی بەرفراوانی لاوان دەكەن. من لەبەردەستاندا هەم. ئەگەر هەر خاڵێك هەبێ شایانی رەخنە بێ یا پێویستی بە لێكدانەوە هەبێ، دەتوانن لێی‌بدوێن.
ی.ك: با بە هەرە لاوەكەیان دەست پێ‌بكەین.
س.پ: لە سەرەتاوە تا كۆتایی گوێ بیستی ئەم گفتوگۆیە بوون. راتان لەسەر ئەم بابەتە چی‌یە و ئایا پرسیاری دیكە هەن حەز بە ئاراستەكردنی بكەن؟
س.ت: هیچ پرسیارێك نی‌یە سەرۆكم. هەموو ئەو مەسەلانەی كە باستان كردن بەكجار روون و بەسوودن و دەكرێت دەرسیان لێ‌وەربگیرێن و كاریگەری و دەنگدانەوەیەكی گەورەیان دەبێ، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە ئەدەب و هونەرەوە هەبێ. ئێوەش هێندێك لەو تایبەتمەندیانەی خۆتان خستەروو كە ناسراو نەبوون و كاریگەری‌یەكی زۆریان لە ناوەندی قوتابیان و لاواندا دەبێ و كەڵكێكی گەورە دەدەنەوە. هەرچی ئێمەشین گەلێك سوودمان بینی.
ی.ك: كاریگەری شێوازی سەركردە چی بوو كە برایەتی و دۆستایەتیەكی بێ‌ئەندازە لە لێكدانەوەی كێشە قورسەكاندا بەدیار دەخات؟
س.ت: پێشتر ئەوەمان لەو شیكردنەوانەوە دەزانی كە سەركردە دەیكردن و دەمانزانی كێشەكە هەر كێشەی كورد نی‌یە، بەڵكو رستێك كێشەی جێی بابەخی سەرلەبەری مرۆڤایەتی‌یە.
ی.ك: تەمەنت چەندە؟
س.ت: من ١٧ ساڵانم.
ی.ك: باشە. وەك كچە كوردێك، ئایا باوەرت بەوە هەیە كە تۆ هەموو كێشە مرۆڤایەتیەكانت بەدەستەوە گرتووە؟
س.ت: بەڵێ باوەر دەكەم.
ی.ك: لەو رستە رازێندراوانە كە لە زارت دێنەدەر لە تەمەنت گەورەترن. ئایا

پێش ئەوەی کە بێیتە ئێرە ئاوا بووی؟

س.ت: نەخێر، وا نەبووم. ئێمە ئێرە زانیاریەکانمان چڕ دەکەینەوە و پێم وایە کاریگەری ئەوەیە.

ی.ك: وەختێك شەڕ لە دژی دەوڵەتی تورکیا دەکەی، ئایا بیر لەوە دەکەیەوە کە تۆ ئاڵای مرۆڤایەتی بە دەستی خۆت هەڵدەگری؟

س.ت: بەڵێ.

ی.ك: زۆر جوانە.

س.پ:(ڕۆژ) لایەنەکانی شایستەی تێبینی کردن کامانەن؟ بە تایبەتی ئەوانەیان کە مایەی خافڵگیرین. ئایا هیچ مەسەلەیەك هەیە پێت خۆش بێ لێکی بدەیتەوە؟

ڕۆژ «ئیـبل مالکوج، پاشتر لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩١ دا لەلایەن هێزەکانی ئاسایشی تورکیاوە دەستگیرکرا و هێشتا بێسەروشوێنە»: لەلای ئێمەوە گەلێك خافڵگیری لە ئارادا نەبوون، چونکە سەرکردە زۆر بایەخمان پێدەدات. ڕەنگە زۆر خافڵگیری بۆ ڕای گشتی تورکیا هەبووبن. ئێمە لەگەڵ ئەم مەسەلانەدا پێکەوە دەژین و دەیانبیستین و دەیانبینین. تێڕوانینی سەرکردەش بۆ بابەتی پێوەندیەکان و نەتەوایەتی تورك و نەتەوایەتی کورد و ئینتەرناسیۆنالیزم و ئەدەب و هونەر و خۆشەویستی و شەڕ تێڕوانینێکی واقیعیانە و تەواوە. جا لەبەرئەوەی کە لە تەواوی نێزیك دەبینمەوە من هیچ ڕەخنەیەکم لێی نیە. پێم وانیە یەکێك هەبێ بتوانێ ڕەخنەی لێبگرێ، چونکە بە ڕاستگۆیی و ڕاشکاوییەوە مەسەلەکان بەرچاو دەخات و ئێستاش هیچ پرسیارێکم نییە.

س.پ: ئێمە بە شێوەیەکی تایبەتی باسی مەسەلەی ئافرەتمان کرد، ئایا ئەم شیکردنەوەیە لە جێی خۆیدایە؟ ئایا دەبێتە هۆی هیچ لێگۆڕینێك بۆ ئێمە؟

ڕۆژ: ئایا سەرکردە مەبەستی لە ئێمەیە؟

س.پ: نەخێر، دەڵێم ئایا لە لایەنی جەماوەرەوە بۆ من دەبێتە مایەی لێگۆڕین؟ ئایا قسەکانم تەواو بوون؟

ڕۆژ: بێگومان هێندێك لێگۆڕین دەبێ. بەڵام من باوەڕم وایە کە سەرکردە پێی دەکرێت بەرەنگاری هەموو دژواری و لێگۆڕینەکان ببێتەوە. جا وەك سەرکردە ڕوونی کردەوە، خەڵکێکی زۆر دێنە نێو ڕیزەکانمان. ئێر و من بە هەموو ڕابردوو و خەسڵەتێکیانەوە دێن ەوە گۆڕینی ئەوانە واتە کەسایەتییەکی تازە بۆ پەیداکردنیان لە باتی کۆنەکەوەئەمەش کۆششێکی یەکجار زۆری گەرەکە.

س.پ: لە بابەتی ئافرەتدا، ئایا وەك دەڵێی هەنگاوێکی سەرکەوتوو هەبوو؟

ڕۆژ: بێگومان. هەنگاوێکی زۆر گرنگ بوو.

س.پ: بەم قسەیەشەوە؟

ڕۆژ: بەڵێ.

ی.ك: باشە. بەو دیتنەیە ئاسایەی کە پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) ئاناسێ، چی لە بارەی شیکردنەوەی ئاپۆی برامەوە دەڵێت سەبارەت بە ئافرەت؟

چۆن ڕووبەڕووی ئەم مەسەلەیەش دەبینەوە؟ ئایا دەبێتە خافڵگیرییەکی گەورە بۆی؟ ئایا دەڵێت ئەمە چۆن ڕوویدا و ئایا ئەمە قسەیەکە ئاشکرا بگوترێت؟

ڕۆژ: هەموو کەسێك ئاستێکی دەست نیشانکراوی حاڵی بوونی هەیە.

س.پ: بەڵێ. ناوت چی بوو؟

ڕوو «یاسەمین شەشەك کچێکی بە بنەچە عەرەبی خەڵکی لیوای ئەسکەندەروونەیە. لە مانگی ئابی ۱۹۹۳دا لەلایەن هێزەکانی ئاسایشی تورکیاوە گیرا و هێشتا بێ سەروشوێنە»: سەروکم ... ڕوو.

س.پ: بەڵێ. ڕوو. بەوپێیە کە هەڤاڵێکی سەر بە کەمەنەتەوەی عەرەبی چی دەڵێی؟ ئەمە یەکەمجارە ئامادەی ئەم جۆرە گفتوگۆیەی تێدا ببی. چۆنی بۆ دەچی و ئایا هیچ ڕەخنەیەك هەیە ئاراستەی بکەی یا مەسەلەیەك ئارەزووی باسکردنی بکەی؟ دەتوانی چیت دەوێ بپرسی؟

ڕوو: گەلێك بابەتی بەلای کەمە نەتەوەی عەرەب و ڕای گشتی تورکیاوە سەرنجڕاکێش و گرنگت بەرچاوخست. ئەمەش یارمەتی نەهێشتنی بۆچوونی پێشووی لای هێندێك کەس دەرهەق بە ئاپۆ دەدات و تێڕوانینێکی تازە جێی دەگرێتەوە. وەك لێکتان دایەوە هێندێك وشەی قووڵ و هێندێك مەسەلەی کە لاتان لێ کردنەوە دەکێشنەوە بۆ لێکدانەوەی جیاجیا. هاتنە سەر چەند بابەتێك کە ناکرێت بە ئاسانی لێیان تێبگەین و وەریانبگرین، چونکە تێپەڕاندنی ئەم مەسەلانە بە خەباتی بەردەوام و درێژ خایەن دەبێ.

س.پ: پێم وایە ئێمە تیشکمان خستەسەر لایەنە دیموکراتیەکانی کەمە نەتەوەکانیش.

ڕوو: بەڵێ. ڕاستیەکەی ئەوانە چەند خاڵێکن ئەگەر بە وردی بەدوویاندا چووی چارەنووسی گەلان دەخاتە دەست خۆیان. پارتی کرێکارانی کوردستانیش بەم پێکهاتەیەوە دەوری سەرەکی دەبینێ تا گەلان چاوی لێ بکەن.

س.پ: ئایا بەم هەڵوێستانەمان کە لامان لێ کردنەوە دان بە بایەخی ئەم بەها دیموکراتیانەدا دەنێی؟

ڕوو: بەڵێ.

س.پ: لە گفتوگۆکانماندا داکۆکیمان لە ڕۆشنبیری ئەنادۆڵ کرد. ئایا ئەمە بەلای تۆوە ڕوون و ئاشکرا بوو؟

ڕوو: بەڵێ. زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو.

س.پ: ئەمە لە خاسیەتی ئێمەیە. ئێمە تەنیا داکۆکی لە سەربەخۆیی کوردستان ناکەین، بەڵکو کۆمەڵە کەسێکی بەهێزین داکۆکی لە گەلێك ڕۆشنبیری دەکەین و ڕای ئێمە سەبارەت بە کێشەکانی ئافرەت زانراو و ڕاشکاوە، وەك چۆن لە کێشەکانی ئازادیشدا وەهایە. ئایا دەکرێت ئەم ڕایانە چەواشە بکرێن؟

ڕوو: وەك کەمێك لەمەوبەر پێشانتاندا، لەوانەیە هێندێك مەسەلە چەواشە بکرێن یان ئەزم نەکرێن و لەوانەشە هێندێك خاڵ ناڕۆشن بن.

س.پ: هەر ئەو مەسەلانە نا. گوێ بیستی گەلێك مشتومڕی دیکەش بوویت. مشتومڕی بەجەرگانە کردن لە تەك ئافرەتدا ئەرکێکی ئازادی‌یە و بە متمانەیەکی تەواوەوە دەست بردن بۆ هەموو بابەتێك پێوەندی‌یەکی ڕاستەوخۆی بە ئازادی ئافرەتەوە هەیە و کاریگەری‌یەکی زۆر دەکاتە سەر بەجەرگی و هێزی بیرکردنەوە. لەم ساتەدا تۆ متمانەیەکی تەواوت بەخۆت هەیە و بە توانایەکی لە ڕادەبەدەرەوە دەست بۆ بابەتەکان دەبەی، بە تایبەتی کە تۆ زانیوتە تیۆروانینی هۆزایەتی و قالبە نەگۆڕەکانی پێوەندی جنسی هەرزانبەها هیچ نرخێکیان نی‌یە.

ڕوو: بەڵێ سەرکردەم.

س.پ: تۆ ئەی «ڕ» وەك خانمێکی بە بنەچە تورکمان و بەتایبەتە تورك، ئەم گفتوگۆیە چۆن کاری تێ کردی؟

کە هاتمە پاڵ پارتی کرێکارانی کوردستان و بەرلەوەش بە زەحمەت تورکم بۆ ناس دەکرا و تا ئێستاش لەوەدا زەحمەتی دەبینم. جا بۆ ئەوەی ناسنامە بناسێنین پێویستە بنچینەیەکمان هەبێ لەسەری ڕابوەستین. بەڵام وای دەبینم کە باڵادەستەکان نەیانهێشت تورك و تورکمان بناسێنرێن و ئێوەش ئەم مەسەلانەتان خستەوە سەر ڕاستەڕێی خۆیان و بە ڕوونی و ڕاشکاوی بەدیارتان خستن. سەرکردایەتی بە ڕاشکاوی لای لە باروودۆخی ئەو کەمە نەتەوە و گەلانە کردەوە کە لە تورکیادا دەژین و ڕوونی کردەوە. ئەو هەڵسەنگاندنەی کە بینیمانن بایەخدارترین و هەمە لایەنەترین هەڵسانگاندنە تا ئێستا دیبێتمان. خۆ ڕەنگە شۆڕشگێڕانی تورك و کەمنەتەوەکان لەلا لێ‌کردنەوە و دۆزینەوەی چارەسەردا بۆ لەو گیروگرفتانەی کە بەرەو ڕوویان دەبنەوە سوودی لێوەربگرن و چاوی لێ‌بکەن. دیارە سوودێکی زۆری تێدایە. پێویستە لەسەریان ئەم مەسەلانە ببینن، چونکە پارتی کرێکارانی کوردستان گەلێك گیروگرفتی خستووەتە سەر ڕێگای چارەسەرو حیزبێکی ـ وەك وای دەبینم ـ ئینتەرناسیۆنالیستی‌یە.

س.پ: تۆ لەو باوەڕەدای کە ئەو شیکردنەوانەی وا پارتی کرێکارانی کوردستان دەیانکات کەڵکی بۆ تورکیش دەبێ؟

ڕ: بەڵێ، بەڵام وەك سەرکردە ڕوونی کردەوە تورك لە کورد پتر پێویستی‌یان بە شیکردنەوەیە.

س.پ: ئێوە تێبینی ئەوە دەکەن، وانی‌یە؟

ڕ: بە تایبەتی من خۆم گرانی لەوەدا دەبینم و بەرپرسی لەمەش بە درێژایی مێژوو چینی حوکمدارە. پێم وایە کاتی لێپرسینەوەی ئەوانە نزیك بووەتەوە. هەرچی چۆنیەتی و شێواز و ئامرازی لێپرسینەوەکەشن پاش دیاریکردنی کێشەکە لۆرەیان دێت.

س.پ: مەبەستت ئەوەیە پێویستی بە پێکهاتەیەکی شۆڕشگێڕی تازە هەیە. وانی‌یە؟

ڕ: بەڵێ، ئەوە پێویستە. لەوە بوو پارتی کرێکارانی کوردستان ئاشکرای کرد

کە بە ئەزموونی خۆی خزمەتێکی خوراپی گەلی تورکی کرد. بەلام ئەو کۆششانەی کە لەم رێگایە دەکرێن، دەکرێت بەهۆی ئەوەشەوە بن کە حالی حازر هاتوونە پاڵ پارتی کرێکارانی کوردستان، یا بەهۆی ئەو هێزە شۆرشگێرانەوە کە لای گەل هەن، پاش ئەوەی لەوە حالی دەبن کە چیمان دەوێ، لەوانەیە ئەوە ببێتە کەرانەوەیەکی بەربلاو بۆ شۆرش.

س.پ: مەبەستت ئەوەیە پارتی کرێکارانی کوردستان بەلای گەلی تورکەوە زۆر دەگەیەنێ. ئێستا ئەمە رۆشنە.

ر: بەڵێ و بەتایبەتی بەو شیکردنەوانەی کە دوێنێ سەرکردە کردنی. ئەگەر بزووتنەوەیەکی بەرخۆدان لەسەر تەرزی پارتی کرێکارانی کوردستان لە تورکیا پەیدا ببێ، ئەوسا زۆر ئاسان دەبێ بە شۆرشێك بگەین خزمەتی ئازادی و برایەتی گەلان بکات و زۆر خێراتر و بە ئازار و دژواریەکی کەمتر بە ئامانجەکانی بگات. ئەمە نەك هەر ئەرکی ئەم دوو گەلەیە، بەڵکو ئەرکی مرۆڤایەتیشە. ئەگەر بروانینە شیکردنەوەکانی سەرکردە، دەبینین راشکاو و راستگۆن. لام وایە ئەوانەی کە دەیانەوێ بە چەوتی تێی بگەن ئەوەیان پێدەکرێت. بە تایبەتی حەزدەکەم ئاماژە بۆ ئەو زمانە بکەم کە چەپی تورك پێی دەدوێت. ئەم زمانە بەوە جوێ دەکرێتەوە کە تەم و مژاوی و پڕ پێچ و پەناو لێوان لێوی وشەی نارۆشنە کە تەنانەت بۆ لایەنگرانیشی زەحمەتە لێی حالی ببن. بەرانبەر بەوە ئەو زمانەی کە سەرکردە بەکاری دەهێنێ راستگۆ و راشکاوە و هەمووان تێی دەگەن.

س.پ: با چەپرەوەکان وریای ئەم لایەنە بن.

ر: پێم وایە ئەو زمانەی کە سەرکردە بەکاری دەهێنێ زۆر رەوان و قووڵ و هەمەلایەنەیە و چارەسەر بۆ گەلێك کێشەی ئالۆز دادەنێت. پێویستە سەرنجی ئەوە بدەن، بۆ چەواشەکاری و تێکدان و پێکدان کردن نا، بەڵکو بۆ چارەسەری کێشەکان.

س.پ: مەبەستت ئەوەیە بۆ چەواشە کردنی بیروڕا نەبێ.

ر: بەڵێ، سەرکردەم.

س.پ: ئەوی راستی بێ من لە رێگای پەیوەندی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە بە رەگەزی مێی تورکیاوە وای دەبینم کە هێزێکی شاراوەیان بۆ شۆرش هەیە. بەلام چەپی تورك بیروڕایانی چەواشەکردووە بە رادەیەك وایان لێهاتووە لە شۆرش هەڵدێن، وە ئەگەر توانیمان شێوەیەکی گونجاو بدەین بەم هێزە ئەوا گۆرانکاریەکی کادیرانەی گەورە دروست دەبێت کە لەوانەیە لە هی لای ئێمە گەورەتر بێ، ئەوان ئەوەیان گەرەکە. راستیەکەی تورکیا زۆر پێویستی بە پێکهاتەیەك هەیە لەسەر تەرزی پارتی کرێکارانی کوردستان بێ.

ی.ك: بێگومان. دەمەوێ دڵسۆزی خۆم بەو شێوازە پیشان بدەم کە هەڤالانی لاو کێشە گرنگەکانی پێ بەرچاو دەخەن. دانیش بەوەدا دەنێم کە من لە نێو هێندێك قوتابی زانکۆکانماندا تووشی ئەم شێوازە دەبم.

س.پ: دەست بردنیان بۆ بابەتەکان بەهێزە و ئاستێکی بەرزی هەیە.

ی.ك: گەورەم، لە ئاست گرنگتر گەوهەری بابەتەکەیە کە بەرچاوی دەخەن و ئەو شێوەیەیە کە پێی بەرچاو دەخەن. ئێمە لە تورکیای ئەمڕۆدا ئەو لاوانەمان گەرەکە کە دەتوانن بە ڕستەی ڕازێندراوە خۆیان دەربڕن.

س.پ: پێم وایە هۆی ئەوە شێوازی سەرەتایی پێخوێندنە کە دەبێتە هۆی چەواشەکردنی زەین و گیان.

ی.ك: ئەوانە ناتوانن یەك ڕستە ڕێکبخەن.

س.پ: ئێمەش سەرنجی ئەوە دەدەین. بەکەم شتێك بیکەین ئەوەیە فێری شێوازی قسەکردن و هێزی گەیشتن بەم کێشانەیان بکەین.

ی.ك: ئەوانە بەخێرایی فێردەبن. تۆ لە کەیەوە لێرەی؟

ڕ: دوو مانگە.

ی.ك: دوو مانگە، پەنا بەخوا. ئەمە وا دەگەیەنێ کە تورکمان توانای پەرەسەندنیان هەیە.

س.پ: بەڵێ، ئێمە بڕوا بەخۆکردنیان پێدەبەخشین. ئەوە بوو هات و پارتی کرێکارانی کوردستانی بینی، ئەویش دەزانن لە تورکیا چۆن ئێمەیان پێناساندوون. لێرەشدا هاوژیانی تەواوەتی دیموکراسی و مرۆڤایەتی کردووە. ئەمە ڕاستە، وا نییە؟

ڕ: بەڵێ، سەرکردم.

س.پ: بە تایبەتی هەڵوێستە ڕاستەکانی حیزب بەرانبەر بە ئافرەت. وانییە؟

ڕ: ئەمە گرنگترین لایەنی پارتی کرێکارانی کوردستانە. ئەوەتان لە شیکردنەوەکانتاندا دەرخستووە. پێم وایە پلەی ئازادی ئافرەت لە هەر کۆمەڵگایەکدا بەڵگەی ئازادی ئەو کۆمەڵگایەیە.

س.پ: هەتا ئازادی پێوەندییەکانیش لە کۆمەڵگادا پەیبەستەی ڕادەی ئازادی ئافرەتە. پێوەندی کارێکی شیاوە و ڕادەی ئازادی ئەویش بەڵگەی ئازادی کۆمەڵگا و ئازادی حیزبە. ئەمە زۆر گرنگە، چونکە پێوەندی ئازاد لە گەڵتاندا نیشانەی جێبەجێکردنی هاوسانییە لەلای بزووتنەوەکە و لە لای کۆمەڵگاش. لام وایە ئێوە سەرنجی ئەوە دەدەن.

ڕ: بەڵێ، سەرکردم.

س.پ: تۆ (هـ) لە کیژانی دیرسیمی، چی دەڵێی؟

هـ: پێش هەموو شتێك سەرکردەی گەورەم دەمەوێ ڕوونی بکەمەوە کە ئەو گفتوگۆیەی وا لەگەڵ کاك (یالچین کوچووك)ی مامۆستاماندا دەیکەن پڕ بەها و بایەخێکی زۆری هەیە. باوەڕم وایە سەرکردایەتی حیزب گەلێك مەسەلەی وەك هونەر و شعر و پێوەندییەکانی بە شێوازێکی قووڵ و گرێدراوی فەلسەفەی ژیانی سۆشیالیستی ڕوون کردەوە. ئەمە بەلای ڕای گشتی تورکیاوە گرنگە، چونکە ئێمە ئەو شتانە دەخوێنینەوە کە ڕۆژنامەکانی تورکیا بڵاویان دەکەنەوە و چەواشەکاری و شێواندن و هێرشکردنە سەر سەرکردایەتی حیزب بەرچاوی ڕای گشتی دەخەن،

ئەوان وا حزب پیشان دەدەن کە هەر خەریکی سەربڕین و لە سێدارەدانە. لەم گفتوگۆیە هەموو شتێك بەپێی فەلسەفەی ژیانی سۆشیالیستی ڕووندەکاتەوە. پێمەوایە ئەم گفتوگۆیە بە شێوەی زنجیرە بەرچاوی خوێنەر دەخرێت و بەدوواداچوونیش ئەوەیان لەسەرە چۆن ئەنجامی لێبەدەست بێنن. جگە لەوە حەزدەکەم بێمە سەر بابەتی ئافرەت. خەباتی ڕێگای سۆشیالیزم کە لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستاندا لە چوارچێوەی ڕزگارکردنی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەستی پێکردووە ئەم خەباتەش بەکەم هەنگاوە و یەکەم هەنگاوی خەباتی ئافرەتانی کوردستان پێکدەهێنن. ئەمە پەیبەستەی هەلومەرجی مێژوویی جیهانە بەگشتی و کوردستانیشە بە تایبەتی و، پەیبەستەی ئەم ستەم و زۆرەشە کە ئافرەت بە دەستیەوە دەناڵێنێ، ئێمە دەزانین کۆمەڵگای سەرمایەداری چۆن دەڕوانێتە ئافرەت و بە یەکێك لە کاڵاکانی دادەنێت. ئەمەش مەسەلەکە ئاڵۆز دەکات. پارتی کرێکارانی کوردستان یەکەم هەنگاوی ناوە و ئەوەشی کە ماوە دەکەوێتە سەر ئافرەت خۆی. جا لەبەرئەوەی کە پارتی کرێکارانی کوردستان خۆی دەستی بەم بابەتە کردووە، بۆیە بارێکی قورس دەکەوێتە سەرشانی. یەکەم هەنگاو نراو شێوەیەکی لەباری بەدەستەوەدا. بەڵام قورتاربوون لە کۆیلەتی سەدان ساڵ و گەیشتن بە کەسایەتی ئافرەت ئەرکێکی قورس و گەورەن و قوربانیدانێکی زۆر و تێکۆشانێکی سەختی مرۆڤیان پێدەوێ، لەم پێناوەدا وایدەبینم کە پێویستە لەسەر حیزب سەرکردایەتی بەهێز لە ئافرەت دەربچوێنێ بۆ سەقامگیرکردنی سیستەمێکی دەست نیشانکراو. هەموو هیوایەکم ئەوەیە ئافرەتی تورك بایەخ بەم بابەتانە بدات و ئەنجامی گەورە دەستگیر بکات تا بتوانین پێکەوە بە ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکان بگەین.

س.پ: تۆ سەرنجی ئەو ئازادیەت داوە کە بۆ ئافرەتی داوادەکەین. وانییە؟

هـ: بەڵێ، بە ڕوونی سەرنجم داوە. بە تایبەتی من ماوەیەکی درێژخایانە لە نزیك سەرکردایەتیم و ئەوەش یارمەتی داین هەڵوێستی سەرکردایەتی دەرهەق بە ئافرەت و قووڵی و ناسکی ئەم بابەتە فەزم بکەین. هەروەها ئەمە زۆر یاریدەی داین پەرە بە خۆمان بدەین.

س.پ: بێگومان. ئێمە بایەخمان پێداوە. لەسەر ئەم مەسەلەیە گوتتان چۆن لەگەڵ کچان و لەگەڵ ئافرەتدا دەژی؟ چۆن لەگەڵ ئافرەتدا شەڕ دەکات؟ باوەڕم وایە واقیع و ئەوەی کە فێری بوون تەواو لەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیانە جیاوازن کە لە کۆمەڵگادا پێیان ڕاهاتبوون. ئەمە دەڵێم چونکە بەلای منەوە بابەتێکی تێکچڕاوە. بە قەناعەتی من ئەو پیاوەی کە بۆ خۆی پەیوەندی لەگەڵ ئافرەتدا بنیات دەنێت و بە پێی ئازادی و هاوسانی ئەم پەیوەندیانە دەپارێزێ، پیاوێکی یەکجار بەهێزە و شایانی هەموو ڕێزێکە. ئەگەر توانیشی خۆشەویستی و ئەوینی خۆی بپارێزێ و ئەوە بنوێنێ، نیشانەی مەزنی ئەم پیاوەیە. پێم وایە ئێوە خۆتان ئەوە بە چاو دەبینن. لە هەمان کاتدا ئەمە یارمەتی مەزن کردنی ئافرەتیش دەدات،

ئافرەت بە تەنها گەورە نییە و لە هاوسانی بەرخوردار نییە و نە بەهایەکی گەورەی هەیە و نە هەرزانیەهاشە. بەلام دەکرێت هەمرو ئەوانە بە پەیوەندی دیاری بکرێن. باشترین شتێك کە بتوانین بە هەر مرۆڤێکی بدەین ئەوەیە بە شێوەیەکی ڕاست پەیوەندی لەگەڵدا ببەستین و ئەم پەیوەندیانە لەسەر بنچینەیەکی دروست پەرە پێبدەین. ئەمەش دەچێتە نێو خانەی ئەرکی ڕۆمان. من لێرەدا هەولدەدەم ئەو چەند پەیوەندیە وردە دابمەزرێنم کە دەکەونە نێو چنینی ڕۆمان. زۆریش بایەخ بە کچان دەدەم، لە ترسی ئەوە نا کە ڕەنگە خیالی بێهێزیم هەبێ، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە کچان بە هەڵە لێمان تێنەگەن و بە تایبەتی کە پڕوپاگەندەی سەر ئەم بابەتە لە تورکیادا گەیشتووەتە چلەپۆپە.

ی.ك: ئەوان هەمیشە ئەوە دەڵێن.

س.پ: بە تێڕوانینی من دوورخستنەوەی ئافرەت لە کێشەکان خیانەتە لە ئازادی. ئافرەت ئاوێنەی ئازادییە، چەند بایەخی پێبدەین ڕوون دەبێتەوە. ئەمە وا ناگەیەنێ کە چاوپۆشی لە لایەنەکانی پاشکەوتن و کۆنەپەرستی ئافرەت بکەین، ڕووبەڕوو بوونەوەی سۆزی نێو پەیوەندیە کۆنەپەرستەکان و تەنانەت کاردانەوەی لای ئافرەتیش هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕانەی گەورەیە. لەلایەکی دیکەوە ئافرەت گەلێك خاسیەتی زۆر گرنگی هەن، خاسیەتی جوراوەتی و هی دیکەی پەیوەند بە ئازادی و پەیوەندی هەڤالانە. بگرە ئافرەت کانگای نیشتمانپەروەرییە و لەم ڕووەوە بەهایەکی زۆری هەیە. دیارە ئەم گشت لایەنانە پەیوەندییان بە حیزب و گەلەوە هەیە. ئەمەش هەڵوێستێکی هەمەلایەنەیە، پێم وایە شایانی تێبینی کردنە، وانییە؟

هـ: بەڵێ، سەرکردەم شایانی تێبینی کردنە.

س.پ: پێم وایە ئێوە لە تێگەیشتنی ئەمەدا دژواریتان تووش نایێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئاسۆی بیرکردنەوەتان پەرەدەستێنێ.

هـ: سەرکردەم گوڕ و تینمان زیاد دەکات.

س.پ: ئایا ئەمە بێئەملاوئەولایە؟ کەشێکی خۆشویستن لە ئارادایە بەس بێت بۆ وەلاتانی هەموو دژوارییەکان. مەبەستم لەوەیە ئەم کەشە وامان لێدەکات لەم کاروانە پیرۆزەماندا بەنێو سەختترین هەلومەرجدا بڕۆین. پێم وایە ئەمە پەرەسەندنێکی گرنگە. ئێوە ئەمەتان لێرە بینی، وانییە؟

ی.ك: بەڵێ. خاڵێك هەیە دەمەوێ ڕوونی بکەمەوە. ئەو گفتوگۆیەی کە لەگەڵ سەرکردەدا دەیکەین کاتێکی درێژخایەنی پێدەچێ. درێژکردنەوەی سوودی تێدایە، چونکە دەتوانین بیکەین بە کتێب و گفتوگۆکەش بە کردەوە هەمەلایەنە بوو و چەندین بابەتی تیۆری و فەلسەفی قووڵی لەسەر کێشە بەرچاوخراوەکان گرتەوە بۆیە ڕەنگە ئەوەمان پێ بەس نەبێ مانگی داهاتوو هەر لە ڕۆژنامەی «ئوزگوور گوندەکەم»دا بلاوی بکەینەوە، بەڵکو ئەم مشتومڕە شایستەی ئەوەیە بە درێژایی ساڵانی ١٩٩٣-١٩٩٤ بیێتە جێی بایەخ پێدان.

## قسەی من تەنیا ڕووی لە کاڵفامە سادەکان نییە،
## بەڵکو ڕووی لەوانەیە کە قووڵ دەبنەوە.

س.پ: بەڵێ، وایە. باشە (ئاف) بە ڕای تۆ ئەو خاڵانە چین کە شایانی تێبینی کردنن؟

ئاف: بابەخ و قەوارەی دیدارەکە ڕوون و ئاشکران. جیاوازی نێوان ئەم دیدارە و ئەوانی دیکە ئەوەیە، ئەمیان گشتییە وتێڕوانینی حیزب لەسەر گشت کێشەکان ڕوون دەکاتەوە. بۆیە مامۆستای پایەبەرز (پالچین) بەختی هەیە، چونکە ئەم دیدارە هەمەلایەنەیەی کردووە و، هەمانکات ئەمە دەرفەتێکی گەورەیە بۆ گەلەکەمان و گەلی تورك و بۆ خوێنەران و گوێگران تا لەم بابەتانە ئاگادار بن کە ئەدەب و هونەر و ئافرەت و شەڕ و گەلێك بابەتی دیکە دەگرێتەوە. هەروەها مامۆستامان دەربخست کە ئەم دیدارە وەك ڕاپۆرتی سیاسی وایە.

ی.ك: باشە، سەرکردەی بەرامبەرتان بینی چۆن باسی پارتی کرێکارانی کوردستان دەکات و گوێتان لێبوو دەڵێت: «ئەگەر ئەم حیزبە ببێتە بەلا بەبان سەری گەلی کورد و تورکەوە، با لەگەڵ منیدا لە گۆڕ بنرێ». ئایا ئەم قسەیەتان بەلاوە ناخاڵی نەبوو؟ هەست بەچی دەکەن بەرانبەری؟ ئەم قسەیە مەبەستی حیزبێکە بەهۆیەوە ساڵانێکی دوور و درێژە چوونە نێو بەندیخانە و لە پێناویدا ژیان و خەباتتان بۆ کرد. لەسەر ئەمە چی دەڵێن؟ چونکە من باوەڕم وایە کە ئەم وشانەی لە زار هاتنەدەر، بە دڵ کردنی و هەر بۆ قسەی نەبوون.

ئاف: لەم بابەتەدا دەچمە پاڵ قسەکانی سەرکردە.

ی.ك: بیستنیان، بەڵام عەقڵتان چی دەڵێت؟

ئاف: ئەوەتی هاتوومە پاڵ حیزب تا ئەمڕۆ سەرچاوەی ئومێدمان متمانەکردنمانە بە خەباتمان. ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کە خەباتمان لە ژێر هیچ بارودۆخێك و لە هیچ کاتێکیشدا ڕاناوەستێ و، سەرچاوەی ئەم باوەڕەش سەرکردایەتی حیزبمانە، لەبەر ئەم هۆیە لە تاریکترین هەلومەرجی نێو زیندانەکاندا باوەڕی خۆمانمان لە دەست نەدا.

لەوانەیە هێندێکیان باوەڕیان لە دەست دابێ، بەڵام من بە حوکمی ئەوەی کە خودی سەرکردە دەناسم و پێوەندیم پێوە هەیە ئەوە باوەڕ و وورەی زیاتر کردم و بەلای منەوە بوو بە کانگای هیوا و هێزێکی گەورەی پێبەخشیم و قەناعەتی زیاد کردم بەوەی کە خەباتمان پەرەدەستێنێ و ئەوەش بەرخۆدانمانی بەتین کرد.

ی.ك: ئەو ساڵانە چییان پێکرد؟ دەبینم زیاتر جوان بووە. تۆ چۆنی دەبینی؟

ئاف: مامۆستا باسی جوانی دەکەن. وەك سەرکردە گوتی، جوانی بە تێکۆشان دەبێ.

ی.ك: بە کردەوە دەبێ.

ئاف: بە کردەوە دەبێ. ئەمڕۆش تێکۆشان بە کار و کردەوە لە بەرزترین ئاستێدا بەردەوام دەبێ و گەل ڕاپەڕیوە. ئەوەی کە جوانی و ورە و باوەڕ و جۆش و خرۆشی لە دڵدا پێت دەتوانێ بە بەرزترین پلە بگات.

س.پ: هەموو ڕۆژێك چەندین شەهیدمان هەن و زۆر هەن خەریکی مل شکاندنمانن. ڕاستی ئەمەیە. ئایا شەرم لە سەرکردایەتی دەکەن؟ ئایا تۆ ئەم قسەیە دەڵێی لەبەرئەوەی کە ناچارکراوی یا لەبەرئەوەی کە من پێشتر کردوومە و تۆش خۆش خولقی دەنوێنی؟

ی.ك: من پێم وایە پێچەوانەی ئەوەیە. هەر لە یەکەم جارەوە کە دیومە ئەمە باوەڕی من بووە. ڕۆژنامەنووسان لە لەندەن لێیان پرسیم. ڕاستییەکەی من پێش هەموو شتێك باسی کەسایەتی خۆشەویست و ئەوپەنداری ئێوەم کرد. من لەوە ڕازیم.

س.پ: ئینگلیزێکیش لێی پرسیم و گوێی خۆت پناسێنە. پێمگوت وزەی تۆ بە خۆیم ناگری. وەڵامەکە لە جێی خۆیدا بوو. لەم گفتوگۆیەدا چی شایەنەی تێبینی کردن بوو؟

ئاف: هەڵسەنگاندنی زیندانیانی تێدابوو. هەڵسەنگاندنی کۆنفرانسی زیندانیان بەلای هەڤاڵانمانەوە هەنگاوێکی گرنگی پێکهێنا، چونکە هەڤاڵانی نێو بەندیخانەمان دووچاری هێندێك هەڵە دەبن و دەخەڵەتێندرێن. شیکردنەوەی پەیوەند بە بەندیخانە و زیندانیان کارێکی زۆری کردە سەر نەهێشتنی کەم و کورییەکان. وای لێهات جیاوازی نێوان پێش و پاش شیکردنەوەکان گەورە بوو و ورەی هەڤاڵان پۆڵایین بوو. لەوانەیە ئەمە بۆ یەکەم جار بێ ورەی هەڤاڵان لەبەرچاوی دنیا و تورکیا و لە ڕووی گوشارەکانی تورکیا و سیاسەتی سەرپێنەوەدا کە دوژمن پەیڕەوی دەکات، هێندە پۆڵایین بوو بێ. جا هەموو زیندانییەك بەهۆی ئەم شیکردنەوانەوە توانی لە خۆی بپرسێتەوە. ئەگەر هەر یەکێك لە ئێمە ئەو شتانەی جێبەجێ بکردبایە، بێگومان ئەوە چەندین کەسایەتی مێژوویی گرنگی دەخستە ڕوو. ئەم هەڵسەنگاندنانە بەرای من و تێکڕای هەڤاڵانەوە گرنگن.

ی.ك: بەڵێ. ئەمە لەو کارە بەجەرگانەیە کە ئاپۆ باسیان دەکات. لە تورکیا بەوە تاوانبارم دەکەن کە من نەتەوەپەرستێکی کورد و سەر بە پارتی کرێکارانی کوردستانم. لەبەر ئەم هۆیە دەمگرن. من بە بەرزبوونەوەی گەلی کورد شادمانم، بەلام زۆر بیر لە شۆڕشی تورکیا دەکەمەوە. بە باوەڕی من کۆنفرانسی زیندانیان سوودێکی زۆر بە شۆڕشگێڕە تورکە گیراوەکان دەگەیەنێ.

س.پ: ئەوان بیر لەوە ناکەنەوە، بەلام ئێمە بیر دەکەینەوە. ئەمە وەك ئەوە وایە: «بووکێ لەگەڵ تۆمە، خەسوو گوێت لێ بێ». تکاکارم بەم پێیە لێی تێبگەن. ئەوی ڕاستی بێ ئەگەر بەڵگەنامەکانی کۆنفرانسی زیندانیان بڵاوبکەینەوە، سوودێکی زۆریان دەبێ.

ی.ك: منیش زۆر بە گرنگیان دەزانم. بەلام مخابن ئەو کێشە و مەسەلانەی کە

بیری سەرکردەیان جەنجاڵ کردووە گەلێك زۆرن. من بە ئاپۆی برامم گوت ئەو قسە ڕەقەی کە بەو هەڤاڵە زیندانیانەت گوت قورسە. هەیانبوو (١٠) ساڵ لە بەندیخانە مابوەوە و هەیانبوو (١٣) ساڵ مابوەوە و هەشیانبوو (١٥) ساڵ. ئەم قسەیەیان لەبەر دڵ گران دەبێ. بەڵام پێویستە بگوترێت ئەگەر من بوومایە نەمدەتوانی بیڵێم.

س.پ: ئەو هەڵوێستە لوتکەی ڕێزگرتنە. ئەگەر وا نەبووایە کەم ڕێزی دەبوو. دیارە قسەکەم ڕوو بە کاڵفامە سادەکان نییە، بەڵکو بۆ ئەوانەیە کە قووڵ بوونەتەوە.

ئاڤ: گەلێك هەڵسەنگاندنی سەرتاسەری لە بابەتەکاندا کران، بە تایبەتی لە ئەدەب و هونەردا. ئەدەب و ڕۆشنبیری و هونەر وەك لە کۆمەڵگاکانی دیکەشدا وا بووە ناو بە ناو نەشونما ناکات، بەڵکو لەگەڵ شەڕدا نەشونما و گەشە دەکات. هەر بە شەڕ پەرەدەستێنێ. پێم وایە هەمووان ئەوە دەزانن. ئەو شیکردنەوانەش کە حیزب کردوونی وەك ڕێ پیشاندەری نووسەران و بایەخدەرانی ئەدەب وایە. ئەگەر ئەدیبان چاویان لێ کرد، ئەدەبێکی باڵا بەرهەم دەهێنن. ئەوەی وا سەرکردەش لە بارەی ئافرەتەوە گوتنی زۆر گرنگە و بگرە وەك شۆڕش وایە. ڕادەی ئازادی لە هەر حیزبێکدا گرێدراوە بە ڕادەی پەیوەندی هەڤاڵانەی نێوان پیاو و ژن. ئەگەر پەیوەندییەکانیان ئازاد نەبێ، ئەو حیزبە ئازاد نابێ. هەر جووڵانەوەیەکیش بە ئازادی پەرە نەستێنێ، پێی ناکرێ ڕێگای ئازادی بکاتەوە. جا لەم ڕووەوە خولقاندنی پەیوەندی ئازاد، بنچینەی ئازادی حیزب و کۆمەڵگایە. بۆیە پێویستە لەسەر هەڤاڵانی نێر و مێ لەم شیکردنەوانە بکەن بە ڕێبەری خۆیان و چی هەڵەیان هەیە ڕاستیان بکەنەوە و لە پێناوی ئازادی حیزب و کۆمەڵگادا ڕێگا بگرنە بەر. ئەمە هێزێکی پاڵ پێوەنەریان دەداتێ و پەیوەندی بە ئازادییانەوە هەیە، وەك چۆن پەیوەندی بە ئازادی کۆمەڵگاوە هەیە. پێویستە لەسەر هەموو یەکێکمان ئەو بابەت و شیکردنەوانە بکەین بە ڕێبەرمان کە ئەمڕۆکە بەرچاوخراون تا لە ژیان و پەیوەندی ڕۆژانەماندا بەجێیان بهێنین و وریایان بین بە قەناعەتی من ئەم هەموو بابەتانە گرنگن.

س.پ: «ڕێ» تۆ چی دەڵێی؟ تۆ لەوانەی کە لە سەرەتاوە بە بایەخێکی زۆرەوە بەدوومانەدا دێن.

ڕێ: بەڕای من ئەم دیدارە دەوڵەمەند و هەمەلایەنە بووەوە بوو بە گێڕانەوەیەکی باشی مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان و سەرکردە. ئەگەر ئەو زانیارانە بەرچاوخراوانە بکەینە چرای ڕێمان، بێ گومان گەلێك ئەنجامی باشمان دەبێ. باوەڕم وایە چەندەها دەرس و پەند هەن، دەکرێت هەردوو گەلی تورك و کورد بە دەستیان بهێنن. ڕەوتی ئەم گفتوگۆیەش ڕەوان بوو. ئەو پرسیارانەی کە کران و ئەو وەڵامانەش کە درانەوە سەرتاسەری قووڵ بوون و پڕ بە پێستی ئامانجەکانیان بوون. تێڕوانینم هاوجۆری تێڕوانینی مامۆستای گەورەمانە کە بڵاوکردنەوەی ئەم

چاوپێکەوتنە لە یەك ڕۆژنامەدا بەس نی‌یە، بەڵکو پێویستە تێی بڕوانین و بەهای ڕاستەقینەیان پێ‌بدەین. ئەو وەڵامانەی کە سەرکردە داینەوە زەمینە بۆ نووسەران و سیاسەتمەداران و ئەدیبان و بابەتخەمرانی هونەر خۆش دەکات تا سوودیان لێوەربگرن. ڕۆماننووسانیش پێیان دەکرێ گوتەکانی سەرکردە لەسەر ڕۆمان بکەن بە ڕێبەریان تا جۆرەها ڕۆمان بەرهەم بهێنن. ماوەکەشی بۆ ئەوە بەسە و لە ۱۹۸۳ـ۱۹۸٤ بەدواوە درێژ دەبێتەوە.

س.پ: ساڵی (۱۹۸۳ ـ ۱۹۸٤) نا، بەڵکو (۱۹۸۳ ـ ۱۹۹٤).

ی.ك: گەورەم لێی مەگرە، سەدان ساڵە لە بەندیخانەدایە، بۆیە دەیان ساڵ دەبڕێ و هێشتا پێی وایە خۆی لە ساڵانی هەشتادایە. چەند ساڵ بە گیراوی مایەوە؟

ڕێ: ۱۳ ساڵ.

ی.ك: ۱۳ ساڵ. هێشتا پێی وایە لە ساڵی ۱۹۸۰ دایە و پێی وایە ڕۆژگار ڕانەبردووە، بۆیە دەڵێت ۱۹۸۳ـ۱۹۸٤. گەورەم ئێمە لە ساڵی ۱۹۹۳ داین، ساڵی ۱۹۹۳.

س.پ: ئەو تێڕوانینەکی بەهێز بۆ تەکانێکی گرنگ بەرچاو دەخات.

ڕێ: بەڵێ، بەرچاوخستنێکی گرنگە. نەریتێکی باش لە پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)دا هەیە، ئەویش ئەوەیە ناوبەناو زانیاری و ڕاستی لە شێوەی ڕاپۆرتدا بەرچاوی جەماوەر دەخات، کە زانیاری و شیکردنەوەی پڕ بەهایان تێدایە و خۆشەویستی و ڕێز و پەیوەستەیی سەرکردە بە جەماوەری خۆیەوە دەردەخات. حیزب لە پێناوی برایەتی هەردوو گەلی کورد و تورکدا فێری ئەم جۆرە دەست پێشخەرییە باشانە بووە. هەمیشە ئەم ئومێدەمان بە پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) هەیە.

س.پ: ئەمە ڕاپۆرتی ئێمە دەبێ بۆ گەلی تورك بە بۆنەی کۆتایی ساڵەوە.

ڕێ: بەڵێ، ڕاپۆرتی سەری ساڵ. پێم وایە دەست پێشخەرییەکی بەجێیە. لەلایەکی دیکەوە سەرنجیان بۆ کەلێنێك مەسەلە ڕاکێشام کە لێیان بێ ئاگابووم یا بە هەڵە تێیان گەیشتبووم یا هەر کەمێکم لە بارەیانەوە دەزانی. جا ئەم گفتوگۆیە هاتە سەر ئەوەی کە هەموو شتێك لە هونەرەوە تا ئەدەب و زۆر بابەتی دیکە ڕوون بکاتەوە.

ی.ك: بابەتی یەکێتی سۆڤیێت پڕ چێژ بوو.

ڕێ: وای دەبینم گفتوگۆکە لە بارەی هەموو مەسەلەیەکی وەك هونەر و ئەدەب و ئافرەتەوە بە ڕەخنەگرتن لە کردەوەکانی سۆڤێتیشەوە ڕوون و ڕاشکاو بوون. پێویستە بەوە نیگەران نەبین کە لە بارەی مەسەلەی ئافرەتەوە بەرچاو خرا. هەموو قسەکان لە چوارچێوەی تیزی سۆشیالیستانە دەرناچن و پێم وانی‌یە هەر کەسێك مانای پرۆلیتاریا و سۆشیالیزم بزانی بەرهەڵستی‌یان بکات. لەوانەیە هێزە باڵادەستەکان بیروراکان بشێوێنن و لە نێو کۆمەڵگادا بیانخەنە ڕوو. بەڵام پارتی کرێکارانی کوردستان کە توانیویەتی بەرانبەر دوژمن و ڕەفتارە دڕندانەکانی

ڕابوەستێ، پێی دەکرێ لە ڕووی ئەم جۆرە پڕوپاگەندە هەرزانبەهایانەدا ڕابوەستێ وەك ڕاوەستانی بۆ داکۆکی کردن لە بیر و ڕەفتاری شۆڕشگێڕانە. ئەو بابەتانەی کە بەرچاو خران بەلای من و حیزبەوە گرنگ بوون و چەندین مەسەلەی تازە لەدوو تونێیانەدا هەڵدەگرن. تەناتەت من دەتوانم بڵێم خەسڵەتی قۆناخێکی تازەن.

ی.ك: سەرکردەی برام ئەگەر ڕێم بدەن پرسیارێکتان لێدەکەم پەیوەندی بە خودی خۆتانەوە هەیە. مادامێکی فلیمێك دەردەکەن، دەکرێت ناوێك بۆ ئەم فلیمە دابنێم. تەنیا بە لاوانی دەڵێم. ئەو هەڤاڵانەتان لە دەرەوە وەك ئەفسانە وان لای خەڵك و لەنێو چەپی تورك و چەپی کورددا شوێنێکی بەرزیان هەیە. هاتنی منیش بۆ ئێرە و چاوکەوتنم پێیان شتێکە شانازی پێوە دەکەم. ئێستا دەمەوێ پرسیارێك لە (ڕێ) بکەم: زۆرت خوێندووەتەوە و لە ڕۆژنامەدا کارت کردووە و گەلێك چاوپێکەوتنت ئەنجام داوە. ئێستا لەگەڵ ئاپۆی برامدا قسەم دەکرد و لە کاتی قسەکردندا ناوی گەلێك ڕۆمانمان بەسەردا تێپەڕی. من کە لەگەڵ وەزیران و فلان و فلاندا قسەدەکەم، ئەگەر ناوی ڕۆمانێك بێتە پێشەوە کابرا سەری ڕادەوەشێنێ و وا خۆی دەردەخات کە ئەو ڕۆمانەی خوێندووەتەوە. بەلام (ئاپۆ) بە ڕاشکاوی دەڵێت من ئەو ڕۆمانەم نەخوێندووەتەوە. ئەگەر هیچی نەگوتبایە وام دادەنا خوێندوویەتیەوە. ئایا سەرکردەتان لە کۆنەوە ئاوا بووە؟ ئایا هەمیشە ڕاستگۆ و سەر ڕاست بووە؟

ڕێ: پێم وایە تۆ پرسیت و منیش حەزدەکەم هێندێك شت بخەمە سەر ئەوە.

ی.ك: پێش هەموو شتێك ئایا جاران ئاوا بوو؟

ڕێ: بەڵێ ئاوا بوو. بەلام پەرەسەندن زۆر لەوە گەورەترە. لە کۆنەوە بە ڕاشکاوی هەموو شتێك بەرچاو دەخات. بەلام پاش بەسەرچوونی ١٥ ساڵ دەتوانم بە هەموو ڕاشکاوییەکەوە ئەمە بڵێم: لە جاران زیاتر واقیعییانە دەست بۆ بابەتەکان دەبات و خەسڵەتی بابەت بەرچاوخستنی لە جاران پتر گەشەی کردووە. ئەگەر لەگەڵ ڕابردوودا بەراوردی بکەین، جاران کەمێك ڕاڕایی لە ئارادا بوو.

ی.ك: بڕوا بە خۆکردن وا لە مرۆڤ دەکات چی لە دڵیدایە بەوپەڕی ئاسانیەوە بیڵێت. وانییە؟

ڕێ: بە شێوەیەکی زۆر بەجەرگانە بابەت و کێشەکانی بەرچاوخستووە، دووەم جۆش و خرۆشی وەك خۆی وایە و نەگۆڕاوە. جارانیش جۆش و خرۆش و کاری وەك ئێستا پڕ بەهێز بوون، لە هەمووان بەهێزتر بوو. ئەو تێکۆشانەی کە بە (١٥) ساڵ لە هەموو ڕوویەکەوە و بە هەڵە و ڕاستییەکانیەوە پەرەی سەند، ورە و هیممەت و جۆش و خرۆشی بە کردەوە و لە ڕووی تیۆرییەوە زیاد کردووە و شێوازیشی لە بەرچاوخستنی کێشەکاندا زۆر پەرەی سەندووە. ئەو ڕاستەوخۆ بەبێ ئاوڕدانەوە لە ڕاست یا چەپ بەرچاویان دەخات و ڕاستەوخۆش دەچێتە نێو کرۆکی بابەتەکەوە. ئەمە پەرەسەندنێکی زۆر باشە و شایانی سەرنجدانە.

س.پ: پێم وایە ئەگەر بەراوردێکی لەم شێوەیە بکەن، کارێکی گونجاو دەبێ، ئێوە دەڵێن: «وزەی کەسێك ئەوەندە و ئەوەندەیە و ناتوانێ ڕێگا لەبەردەم ئەنجامی

سیاسیدا بکاتەوە». بڕوانە کۆمیتەی ناوەندی لە حیزبی کۆمونیستی سۆڤیەتیدا، ئەم کۆمیتەیە بە بنبەست گەیشت و نەیتوانی بڕیار دەربکات و بواری هیچ خەباتێکی سیاسی نەدەدا. هەمان قسە گەلێک سەرکردەی چەپی تورک دەگرێتەوە. ئەوانە هێزێکی وایان نییە بەس بێ بۆ زەمینە خۆشکردن بۆ گۆڕانکاری. گەلێک نموونەش هەن. هێندەی پێوەندی بە خۆشمەوە هەیە، من ڕێزی خەڵک دەگرم و پێم وایە پێویستە وورەی هەر کەسێک دوایی نەیێت. کاتێک مرۆڤێکی دەستە پاچە دەبینم، نائومێد دەبم. ئەمە ئەو لایەنە سۆزاوییەیە کە لە کەسایەتیمدا هەیە. باسی جۆش و خرۆش دەکەن. ئەمە وام لێدەکات ڕێزی خۆم بگرم. هێزی چارەسەر و چۆنیەتی بەرچاوخستنی کێشەکان لە بنەماکانی مرۆڤن و ڕاستیەکەی دەرئەنجامی پێبەستە بوونن. لەو دەرسانەدا کە دەیانڵێمەوە، بایەخ بە شێواز و جۆش و خرۆش دەدەم، هەر بۆ پتەوکردنی وورە نا بەڵکو لەبەرئەوەی کە بەشێکی بنچینەیی ژیانی سۆشیالیستی‌یە. وای دەبینم کە ئەم لایەنە زۆر گرنگە. لەوانەیە ئەم لایەنانە بە چەند ساڵێکی درێژخایان گەشەیان کردبێ. هەرچی چۆنییەتی کێشە بەرچاوخستنە، پشت بە خەیاڵی فراوانی لای ئەو دەبەستێ. وا هەست دەکەم من ئێستا کە لە هەر کاتێکی دیکە پتر بە توانا و بەهێزترم. سەرەتا هەر بەراگواستنی یەک یا دوو ووشە جۆش و خرۆش دەیهێنجامەوە و جێی قەناعەتی کەسانی دەوروبەرمان بووین. ئەو ڕۆژانە ڕۆژانێکی بێ‌بەزەیی بوون. دەمانگوت: «کوردستان کۆلۆنییە و تۆزێ فلان شت بکە». وانە وەکو فەرمان وابوو. مەبەستم ئەوەیە زۆر کاریگەر بوو. بەڵام ئێستا من گەورەترین و ئاڵۆزترین کێشەی تیوری بە هەمان خرۆش و بە هەمان شێواز بەرچاو دەخەم. وەک سەرنجتان دا، ئەمە واناگەیەنێ کە من پێکهاتەی ناوخۆ و سەرتاسەری و ئاڵۆزی کێشەکان فەرامۆش دەکەم. ئەگەر سەرنجتان دابێ من دەیانبینم. وانییە؟ من سەرنجی تێکچڕژان و ئاڵۆزی دەدەم، بەڵام دەتوانم زۆر سادەی بکەمەوە تا خەڵک بە ئاسانی وەریبگرن.

ی.ک: ڕەنگە بووبێتە قاڵبێک یا شێوازێک.

س.پ: ئاواش دەست بۆ مێژوو دەبەیی. زۆرم ئاڤی کردووەتەوە. تیۆروانینی جۆراو جۆر سەبارەت بە ئافرەت لە مێژووی کۆمەڵگاکاندا هەبوون. هەبووە لە پشت حەوت چیی پەردەوە دایناوە و هەبووە ڕووتی کردووەتەوە و هەبووە دژی تەنگە تیلکە بووە و هەبووە بەوپەڕی شاعیری‌بەوە تەرەی کەوتووە و هەشبووە درۆی لەگەڵدا کردووە. مەبەستم ئەوەیە خوێندن لە فەرەی بابەتی ئافرەت زۆر جیاواز بووە. وام لێهاتووە ئەم هەڵوێستانە لێک جوی دەکەمەوە و ئەمە بە ئەنجام دەهێنم: «چۆن دەتوانم هەڵوێستێکی بەجەرگانە و ڕاستەقینە دیاری بکەم». ئەمە ئەو هەڵوێستەیە کە ئێش بۆ پەرەپێدانی دەکەم. لەبەر ئەوەیە ئەم هەڤاڵانە لێرە دەهێڵینەوە. پێوەندیەکانی ئافرەت لە بنەڕەتدا بابەتێکن. ئافرەت خۆشی بابەتێکی دیکەیە. ئەم دوو بابەتە هێشتا چارەسەر نەکراون و پێویستیان بە چارەسەرێکی دەست نیشانکراو هەیە. من وا دەڕوانمە بابەتەکە کە چارەسەری ئەم

کێشەیە ڕێزێکی گەورەیە بۆ ئافرەت، چونکە بە درێژایی مێژوو زۆر لەبارەی ئافرەتەوە گوتراوە لەسەر ڕووی زەوی هیچ هیچ نەکراوە، وەك بڵێی پێکهاتەیەکی نایەخی زیانی کۆمەڵگا بێ. ئەمە هەڵەیە و پێویستە بە هەڵوێستی بەجەرگانە ڕاست بکرێتەوە و بخرێتە نێو لەتکەکانی شۆڕش. هەوڵمانداوە بابەتەکە لە دوو لایەنەوە دابسالێین، لایەنی یەکەم ئێوە لە ناوەندێکی قوتابیانەوە دێنەلامان زۆر کارتێکراوی بوون و پڕ لە بەیدەست بوون و سادەیی و دووڕوویی و خۆپەرستی‌یەکی ڕەهایە. هەوڵدەدەن بە ڕستەی هەرزانیەهاو ساکاری وەك «من خۆشم دەوێ» هەست و نەستتان دەربڕن. من کەم ئەدەبی و سادەیی و عەقڵ سووکی‌یان تێدا دەبینم. بەڵام کاتێك ئێمە باسی ئافرەت دەکەین، لە بابەتێکی گەورە دەدوێین و پێمان ناکرێت شتی سەرپێیی ناشایستە بە ئافرەت قبووڵ بکەین. هەرچی لایەنی دووەمە: پەیوەندی بە ناوەندی هۆزایەتی سەرەتایی پاشکەوتووەوە هەیە. ماوەیەکی درێژخایان لەو ناوەندانەدا ژیام. ئەوان مەسەلەکە سەرپێیی و داخراو و لە دووڕا وەردەگرن و کوت دەخەنە سەر قسەی ئافرەت و لە هەموو شتێکی دوور دەخەنەوە. ئەمە کەسایەتی ئافرەت سەرکوت دەکات و هەڵوێستی وا پەسند ناکرێت. سەرەتا داکۆکیکەر بووم. ئەمجا تێڕوانینی خۆمم خستەڕوو و پاشان ئەم پەیوەندیانەمان شی‌کردەوە و بڕیارماندا بە تەواوی بیانگێڕینەوە. دەمەوێت ئافرەت بەدیاربخەم، چونکە بەلای ئەوە سەدان ساڵ بوو کۆتایی پێهاتبوو. هەوڵم دەدا سیستەمێك بۆ پێشاندانی دابنێم. من ئافرەت بە بچووك ناگرم و لە خۆشەویستیانەدا ئەمە ناکەم. بەڵام ئەگەر ئەرکێکی شۆڕشگێڕانەمان لە بەردەمدا بێ دەسکەوتێك بۆ شۆڕش بەدی بێنێ، پێویستە بە ڕاستی دەست بۆ بابەتەکە ببەین و شەرم و داب‌ونەریت کارمان تێ‌نەکەن. ئەم لایەنە زۆر گرنگە. جا لەبەر ئەوەی کە ئەرکێکی شۆڕشگێڕانەیە، ناتوانین بە سادەیی و بەیدەست بوونێکی وەك «زۆر خۆشم دەوێی» لە بابەتەکە نێزیك ببینەوە. پێم وایە ئەم حاڵە لەو شتە باشانەیە کە لە کەسایەتی مندا گەشەی کردووە. من تووشی گەلێك دژواری دەبم، بەڵام بە شیکردنەوە ڕاست و گرنگەکان دەگەم. هێندێك گۆڕانکاری ڕوویاندا. من لەسەر هەڵوێستی خۆم سوورم و لە پاشەڕۆژدا چەندین گۆڕانکاری گرنگ دەردەکەون. من هەمیشە لەبارەی ئەم پەیوەندیە و ئاستەکەیەوە دەڵێم قووڵایی و یەکسان بوون و مەزنی شێوەیەکی جیاواز بە ژیان دەبەخشن. هێندێکیان زۆر ئافرەتیان خۆش دەوێ و هێندێك ژن و پیاویش پێیان وایە یەکدیان خۆش دەوێ. ئەمە ئەو هەڵوێستەیە کە گاڵتەم پێی‌دێت و سادە دەیبینم و بگرە پەلپیشی لێ‌دەگرم. بە خۆم دەڵێم ئایا من مرۆڤێکی دڵپیس یان زۆر دڵبەندی خۆمم. جاروبار دەڵێم ئایا من (نیتشە)م؟ و دەبینم وا نی‌یە. ئەمجا بیردەکەمەوە و دەڵێم: پێویستە ئەم پەیوەندیانە ئاستێکیان هەبێ.

کەس ناتوانێ کاتێك ئافرەتێك دەبینێ پێی بڵێت: «تینوو بووم و خۆ فڕێ بداتە سەر زەوی» ناتوانێ بیر لەوە بکاتەوە کە کاڵایەکی هەیە چۆنی بوێ وا بەکاری دێنێ. ئەم هەڵوێستانە هەرزانیەمان و ڕاست نین و نابێ کەس تووخنیان بکەوێ.

دەبێ ئاستێکی دیاری کراو بۆ پەیوەندی بە ڕۆشنبیری و ڕەوشتی بەرزەوە هەبێ و دەبێ ئەمە هەڵوێستی مرۆڤی شۆڕشگێڕی گەورە بێ. پێویستە هەموو شۆڕشگێڕێك پێملی ئەم ئاستە بێ. من قەناعەتم بەوە هەیە کە ئەم بابەتە بە کەڵکی ئەوە دێت ببێتە کەرەستەیەکی ئەدەب و ڕۆمان تا مەسەلەکان ڕوون ببنەوە و بچنەوە سەر ڕاستەڕێی خۆیان و کۆمەڵگا قبووڵیان بکات و ببنە کەرەستەی هونەرەکانی دیکەش. ئاواتەخوازم هیچ کەسێك وە بەتایبەتی ئافرەت بە شێوەیەکی دیکە لەم هەڵوێستەم تێنەگات و بە قورستنەوەی دانەنێت و لێمان دوور نەکەوێتەوە، چونکە ئامانج ڕوون کردنەوەی شێوە ژیانێکە بە درێژایی مێژوو بە لاڕێدا براوە و ڕاستی‌یەکی بەرز بووە. ئێستا دەمانەوێ بیخەینە ڕوو و بیکەینە شێوەیەکی گونجاو بۆ ژیان. پێویستە وریای ئەم خاڵە بین. تۆ (ك) چۆن کارت تێ کرا؟ ڕەخنە یا پرسیارێکت هەیە ئاراستەمانی بکەی؟

ك: سەرکردەم دەمەوێ لا لە گوتەکەتان بکەمەوە: «ئەگەر ئەم حیزبە بەرەنگاری گەل بووەوە، لەگەڵ خۆمدا لە گۆڕی دەنێم» کە مامۆستای گەورەمان پشتگیری تێدا کردن. بە قەناعەتی من هەر ئەو کەسە دەتوانێ ئەم قسەیە بکات کە بووە بە نوێنەری ئیرادەی گەل و کاتێك قەوارەی ئەم کەسە لەوە گەورەتر بێ کە لە حیزبێکدا بنوێنرێت، چونکە نوێنەرایەتی ئیرادەی سەرلەبەری گەلی کوردستان دەکات. سەرکردە ئەم قسەیە دەکات بۆ ئەوەی کە کەس لە ئێمە نەبێتە دیکتاتۆر بەسەر گەلەوە. ئەو لە ئێستاوە مشوور دەخوات.

ی.ك: مارکس دەڵێت: «سەرمایە کەسایەتی خۆی لە سەرمایەداری‌یەوە بەدەست هێنا». من لەمەوە دەستم پێکرد و لە بارەی (لینین)ەوە گوتم: «کەسایەتی خۆی لە پرۆلیتارایاوە بە دەست هێنا». تۆش دەڵێی گەلی کورد کەسایەتی خۆی لە (عەبدوڵلا ئۆجەلان)ەوە بە دەست هێنا. ئایا ئەمە ڕاستە؟

ك: بەڵێ، ئەوە بالاترین ئیرادەیە. مەبەستم ئەوەیە پێویستە هەر بە پارتی کرێکارانی کوردستان دیاری نەکرێت.

س.پ: بێ‌گومان. پێم وایە دیاریکردنێك لە ئارادا نی‌یە. جاروبار بیردەکەمەوە لەوانەیە پارتی کرێکارانی کوردستان بەلایەك بێ بەسەر خۆم و کەنەکەمەوە، بۆیە ناوبەناو بە حەسێب و حەسێبکاری خۆمدا دەچمەوە. مەبەستم لەمە ئەوەیە من حیزبێکی پیرۆز یا هەتا هەتاییم نی‌یە. ڕەنگە ئەمە لە میللی‌گەری سەرەتایی کوردەیدا هەبێ. وەك چۆن لە یەکێتی سۆڤێتدا هەبوو، من بیردەکەمەوە چۆن حیزبێکی ئاوا کۆتایی دێت. ئێستا ئاپۆ جێ دەستی دیارە و ئەمەش باشە. ئاپۆ دەتوانێ ناتەواوی و زیەمرۆییەکانی حیزب بەدی بکات و ڕاستیان بکاتەوە.

ی.ك: ئەگەر سەرۆکی دەستەی ئەرکانی تورکیا گوێی لێتان بێ ئەم قسەیە دەکەن، دەڵێت ئاپۆ حیزب هەڵدەوەشێنێتەوە و ڕزگارمان دەبێ لێی.

س.پ: پێویستە ئەوە لە بیر نەکەین ئەگەر پارتی کرێکارانی کوردستان ڕۆیشت. جێگرەوەیەکی لەو بەهێزتر پەیدا دەبێ و گەلێکی دەخەینە جێ بە قەدەر سەد حیزب بێ، ئەوسا چی دەڵێن؟ ئێمە لە بیرمان نەچووە کە حیزب تەنیا

ئامرازە. ئەگەر هێزی هەر گەلێك سەد ئەوەندەی خۆی لێ بێ، پێویست بە هیچ حیزبێك ناكات. ئەو كاتە دەتوانین باسی ڕێبازێك یا ئاینزایەك بكەین. ئیدی بۆچی پێبەندی حیزب ببین؟ چونكە لەوانەیە گەل حیزب تێ بپەڕێنێ و ئەو وەختە ئەگەر چووبێتە دڵ و مێشكی خەڵكەوە، ئاوم یا مردنم یا ماتەمم گرنگ نییە، چونكە ئەوسا من ئەركی خۆمم بەجێ هێناوە پێویستە لەسەر هەموو سەركردەیەك بەم پێیە خۆی هەڵبسەنگێنێ. ئەگەر گەیشتە دڵی خەڵك، پێویستە داوای زیاتر نەكات.

ی.ك: دیارە ئەمە قسەیەكی تازەیە.

ك: ئەمە قسەیەكی دیكەمان لە سەركردە بیست لەم قسەیە جیاوازە.

ی.ك: ئایا ئەمە ڕاستە؟

ك: بەڵێ، پێی دەگوتین: «ئاپۆچێتی بەش بەخۆی گیانە». گوێشمان لێبووە چەندین جار گوتوویەتی: «من كردە و كوشمە ببمە ئاپۆچییەكی باش». پێویستە وەك خۆی لەم قسەیە تێبگەین، ئەگەر بە شێوەیەكی ڕاست نەزم بكرێت، مانایەكی گەورەی هەیە.

ی.ك: منیش هێندێك شت لە نامەدا دەڵێم. ئەم قسەیە تێڕوانینی من دەرهەق بە سرا كوردەكانم پیشان دەدات و ئەمەیە: «ئەگەر گیانی ئاپۆچیتان لەوێ دەرخست، هیچ نامێنێتەوە». هەمان قسەیە كە باست كرد. من ئەمە بە مانایەكی خراپ نالێم، بەڵكو دەمەوێ گیانی ئاپۆچێتی چەند هێندەی خۆی لێ بێ.

س.پ: پێویستە وا بیربكەینەوە كە ئەم گیانە هەر گیانی كەسێكی دەست نیشانكراو دەگەیەنێ. من ئاوا ڕوونی دەكەمەوە: وەك كەسێك یا كۆمەڵە هێزێك ئێمە مەروانن و بەم پێیە تێمان مەگەن. من چاروبار بەم جۆرە قسەیە دادەچڵەكێم. بەڵێ بیر لە مرۆڤایەتی دەكەمەوە و هەوڵدەدەم بگەمە لوتكەی ئەم بیركردنەوەیە. باوەڕم وایە كە پێویستە هەموو خەڵك بەم شێوەیە بیر بكەنەوە. پێویستە هەر كورد یا (PKK) نا بەڵكو كۆی مرۆڤایەتی لەنێو ئامانجەكانی مندا بێ. مەبەستم ئەوەیە گیانی ئاپۆچێتی یان كەسایەتی ئاپۆچێتی وەك چەمكێك گەلێك شت دەگەیەنێ. منیش بەدوای ئەم گیان و كەسایەتییەدا وێڵم. ئەگەر سەرنجتان دابێ من ژیانم تا ئێستا لە سوراخكردنی ئەم گیانەدا بەسەر بردووە. ئەمە سوراخی ئێوەشە. بۆ نموونە دەڵێن لینینیزم و دەڵێن ماركسیزم، بەڵام من ناڵێم ئاپۆچێتی، چونكە لە بنەڕەتدا هیچ مانایەك بۆ ئەم ناونانە نابینم. تەنانەت ئەگەر بشگوترێت، پێویستە تێكەڵ بە كەس نەكرێت و دەبێ ئەو كەسانە لە هەقی خۆیان پێتریان نەدەبینی و هیچ لە مافەكانیشیان نەبڕین. هەروەها نابێ نكوڵی لە (ئاپۆ)ش بكرێت، چونكە خاوەنی زیانێكی گرنگە. پێویستە باش وریای ئەم حاڵە بین. هەتا بە درێژایی سەدان ساڵیش لەبەرئەوەی چەند لایەنێكی زانستی گرنگی هەن.

ی.ك: ئەگەر ڕێ بدەن پرسیارێك لە هاوڕێكەم دەكەم. تۆ بەم شێوە جوانە قسە دەكەی، لە كاتێكدا من لە توركیا بە خراپی دەدوێم. كە لێرەش دەبم بە باشی قسە دەكەم. ئەمە ئاشێت، ئەگەر ئاپۆ لەگەڵ گەلی كورددا ئاوابێ، هەڵوێستی كورد

چۆن دەبێ؟ ئایا ئەمە بواری مشەخۆری دەدات؟ مەبەستم ئەوەیە گەلی کورد بیر بکاتەوە کە ئاپۆ هەیە و بوونی ئەوانەی کە لەگەڵیدان ئەرکەکان رادەپەڕێنن وگیانی ئاپۆمان هەیە و بوونی ئاپۆمان بەسە و لەوە زیاتر هیچی دیکە ناکات. هەندێك خەڵك ئاوا ئیش دەکەن و رەنج دەدەن و ئەوانی دیکەش مشەخۆرن. ئایا شتی لەم چەشنە رووی داوە؟ من پێشبینی ئەوە دەکەم.

ك: ئەم قسەیە راستە و لای ئێمە هەیە. ئێمە هەموو بارەکە بەسەر سەرکردەدا دەدەین و ئەگەر هەوڵماندا بەشێکی بارەکە لەسەر شانی ئاپۆی سەرکردە بەرزبکەینەوە، مەسەلەکان لە چارەسەر زیاتر ئاڵۆز دەکەین. ئەم گرێیەمان لەلا هەیە.

ی.ك: ئەمە وا دەگەیەنێ کە گەلێك شت هەن و سەرجەمیان بە دەوری ئاپۆدا دەخولێنەوە «لەم ناوچەیەدا پەیدا بوو و رێکخستنێکی دامەزراند و ئێستا دەزانین بایەخ بە رێکخستن نادات و گرنگی گەلی کورد و مرۆڤایەتی‌یە». بەڵام پاشتر کێ لە دوای ئەو ئیش بکات؟ بۆیە با دابنیشین و بحەسێینەوە و سروود لە ئێمە و ترانەکانی وەربگرین. من هەست دەکەم ئەم جۆرە دەست لێ‌بەردانە هەیە.

ك: بەڵێ ئەممان لەلا هەیە.

ی.ك: بێ‌گومان تۆ و ئەو هاوچەشنانەت کە لە ئاپۆوە نیزیکن شەو و ڕۆژ کاردەکەن تا سنوورێك بۆ ئەم دیاردەیە دابنێن کە خۆ لە مشەخۆریدا دەنوێنێ وەك خانە شێرپەنجەیی‌یەکان و چاوەڕێی شتی زۆر لە سەرکردە ناکەن. وانی‌یە؟

ك: هەوڵێکی زۆر دەدرێت و من لەوە دڵنیام. جا لەبەر ئەوەی کە کاری گرێ نەدراون بە نیازەوە، هەوڵی شێلگیر و چڕوپڕ بە بەربڵاوی دەدرێت. دەتوانم ئەمە بڵێم. ئێمە لەنێوخۆماندا مەسەلەکان دەترخێنین. لەوانەیە ئەم کۆششانە لە داواکراو کەمتر بن، بەڵام لانی کەم هەوڵدەدەین شایستەی ئەو بەشەی بارەکە بین کە هەڵیدەگرین.

ی.ك: ئێوە لە دوایەوە دەڕۆن. بەڵام هەیشە بۆ دواوە دەڕوات. وەك جاروبار لە هەندێك فلیمی هەڵگەڕاوەدا دەیبینن. هیچ بێزارێنێك لەو جۆرە کەسانەدا بەدی ناکەم. من ئەم قسەیە دەکەم بۆ ئێوە نیوەدانت. مەبەستم ئەوەیە ئێوە سەرنج دەدەن هەندێك خراپی هەن. وانی‌یە؟

**ئەم رابۆرتە وەك بانگەوازێك وایە بۆ ئەوان بە حاکمەکانیشەوە، ئێمە چی بکەوێتە سەرشانمان رایدەپەڕێنین و بەو زمانە لەگەڵ هەموو یەکێکدا دەدوێین کە تێی دەگات و کارسازیمان بۆ ساڵی ١٩٩٣ ئامادەیە و ساڵی سەرکەوتنەکان و دەسکەوتەکان دەبێ.**

س.پ: من تێبینی ئەم مەترسی‌یە دەکەم و ئامۆژی بەسە چاوگەی ئەمەلی، من رێ و شوێنی پێویست بۆ ئەمە دادەنێم. سەرنج بدەن من هەوڵدەدەم سادەترین دێنشین بنێشەمپاڵ شەڕ. ئەمە رێ و شوێنێکە. هەر ئەمە نا، سەرنج بدەن دوژمن

ئەشکەنجەشی دەدات، ئەمجا دەچێتە شەڕ و خوێنی دەبەخشێ. پیاو و ژن بەرەو ئەم کارە دەنێرین. ئەمە جۆرە گوزەرانێکە پشت بە خود دەبەستێ. ئەمە لایەنێکی زۆر گرنگە. چەند ڕێ و شوێنێك هەن بۆ ئەوەی دێنشین نەبنە مشەخۆر، بە تایبەتی بۆ ئەو هێندەیان کە بە ئەمەلی دەژین یا هەوڵدەدەن زۆر ببەن و بگرە لەوش پتر کە پێیان دراوە. من لەو بارودۆخە قووتاریان دەکەم و فێریان دەکەم لە هەقی خۆیان زیاتر نەبەن. بەڵام سەرباری ئەوەی زۆری لەم جۆرە هەن، بە تایبەتی لەوانەی کە لە ئێمەوە دوورن یا ئەوانەی لێمان حاڵی نەبوون بۆیە بە ئاسانی دەبنە مشەخۆر و ئێمەش چاودێرییان دەکەین. با هەمووان بزانن ئێمە دەسکەوتی ئاسانمان نییە و ناکرێت کەس لەسەر ڕەنجی کەسانی دیکە دابنیشێ. ئەگەر ئەوە بکەن و ئەم سیفەتەیان پێڕەوکرد، ئێمە هیچ نەبێ شەڕیان دەکەین وەك چۆن شەڕی بەرەی دوژمن دەکەین. من زۆر سڵ لەو جۆرە کەسانە دەکەمەوە کە هەڵپەی دەسکەوتی ئاسانیانە و بەربەرەکانێی چەمکەکانیان دەکەم. ئەگەر ئەوانە کەمترین ڕێزی ئێمەیان هەبێ و پێبەستی ئێمە بن، پێویستە مشەخۆریمان بەسەرەوە نەکەن و هەوڵ نەدەن لەوە زیاتر ببەن کە پێیان داوین و نەبنە دز. خۆ ئەگەر لەسەر کاری خۆیان سوور بوون، بەرەبەکی شەڕ لە دژیان دەکەینەوە و سەرەنجامیشیان خراپ دەبێ.

ك: بە کورتی دەتوانم ڕای خۆم بەرانبەر بەم چاوپێکەوتنە پیشان بدەم. ئامادەی دیدار و چاوپێکەوتنەکانی سەرکردە بووم. بە ڕای من ئەم چاوپێکەوتنە دەنگدانەوەیەکی گەورە دەبێ، چونکە هەمەلایەنەیە و لە هەمان کاتدا شیکردنەوەیە و وەك ڕاپۆرتی سەرکردە وایە بۆ مێژوو و مرۆڤایەتی و گەلەکانمان. ئەو لە ڕێگای ئێوەوە قسەی بۆ گەلی تورك کرد تا پێیان بڵێت: ئەی ڕژێمی تورکیا، ئەی گەلی تورك، ئەی شۆڕشگێڕە تورکەکان، ئەگەر لە دەرەوەی مێژوو نازین و ئەگەر کەمێك ویژدانتان هەیە با وەڵامتان ڕاست بێ. پێم وایە وەڵامەکە ڕاست دەبێ.

س.پ: ئەمە وا دەگەیەنێ تۆ بانگی کار هەڵسووڕێنان و ئەوانی دیکە دەکەی وەڵامێکی بڕوا پێکراو بدەنەوە. ئەمە بانگەوازی (ك)ە. کەس هەیە پرسیار بکات؟ مامۆستا هیچ پرسیارێکت ماوە؟

ی.ك: هاتمە ئێرە بە ناوی (یەنی ئوولکەو ئوزگوور گوندەم)ەوە بەو پێیەی کە ڕۆژنامەنووسم. کارێکی پڕ بەرهەمان کرد. من سوپاسی ئەمەت دەکەم وەك کەسێك کوردی خۆشدەوێ و ئاواتی بەرزبوونەوەیان بۆ دەخوازێ. بە چاوپۆشین لەوەش کە ڕۆژنامەنووسم، من زۆر بەختیارم و زۆر سوپاستان دەکەم و خوا تەمەنتان درێژ بکات. من بە سایەی ئێوە ژ هەڤاڵانتانەوە حەفتەیەکی تێر و تەسەلم بەسەر برد.

س.پ: منیش سوپاستان دەکەم و سوپاسی کۆششە مەزنەکانتان دەکەم لە پێناوی کۆکردنەوەی ئەم زانیاریانەدا بۆ خوێنەر. و بەدوود چوونی ڕۆژنامەکەتان و بۆ هەر یەکێك حەز بکات لە نزیکەوە بمانناسێ. ئاواتم ئەوەیە تێبگەن و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەکانمان ئەزم بکەن چونکە شتێکی ئاسایی نین. بە بۆنەی سەری ساڵی تازەشەوە، ڕاپۆرتی مێیان پێ ڕادەگەیەنە. ئەوە بانگەوازە بۆ ئەوان بە

حوکمدارەکانیشیانەوە. ئێمە چی بکەوێتە سەرشانمان رایدەپەڕێنین و بەو زمانە لەگەڵ هەموو یەکێکدا قسە دەکەین کە تێی دەگات. ئەگەر بە زەبر و زەنگ تێ گەیشتبێ، بە زەبرووزەنگ لەگەڵیدا دواوین. ئەگەر بە شێوازی مرۆدۆستانەش تێ گەیشتبێ، بە ماشتربن زمانی مروڤانە قسەمان لەگەڵدا کردووە. من وا هەست دەکەم وەك بلێی ئەمڕۆ دەمرم. بۆیە مردنی من گرنگ نییە. بەم پێیە سالی (١٩٩٢)مان تەواوکرد. وەك بلێی سالی ١٩٩٣ هەر نایێت. هەموو ئامادەکاری یەکیشمان بۆ سالی ١٩٩٣ حازرن و سالی سەرکەوتن و دەستکەوتی مەزن دەبێ. داوا لە هەموان دەکەم چ کۆششێکی چڕوپڕیان هەیە لێمان نەگرنەوە، چونکە ئێمە دەمانەوێ ئەم سالەش ببەینەوە. سوپاسی خۆم بۆ هەموتان دووپات دەکەمەوە.

ی.ك: باشە، سوپاست دەکەم و هەر بمێنن.

## فەرهەنگۆک

---

هێمای سەرووکردنەوە : اشارة الفتح
سەیجوور: راشد
لەلە: مربية
سەرپەرگر: متطرف
گووران : نفاة
لێکهەڵبڕان : انشقاق
پاسگە : مخفر
لێوڕژان بوون : تملق
ڕووپێوان : المساحة
هەڵاوێردن : استثنا
ئاپەرۆ : رونق
ئاوبەست : سد
داڕشتە : صيغة
وێناکردن : تصور
تەوالە : سند
پەرجوو : معجزة
بەرخۆر : استهلاكي
گرنگ : لازم
سایەتە : سلف
پەلهاوێژ : توسعي
مەکرۆ : ماكر
پێش نوێژ : إمام

هەواڵ گەیێن : مخبر
ئاپنزا : ملعب
علەویگەرایی : العلوية
ڕەوشی ئاوارتە : حالة الطوارئ
شەقڵ : طابع
سەراست : سلركالُ(عرب)
پیرۆزی مەزنایەتی : لفظ الجلالة
گەرماڵێ: تنشيط
پاکتاوکەر : تصفوي
دەستەبەندی : تكتل
پیشەدار : محترف
هووڕا : هتاف
کەنیزەک : جارية
ئەتنۆگرافی : الاثنية
زەوی بوورە : الاراضي البور
بێداری: الصحوة
مۆنۆپۆلکردنە قۆرخ کردن :(احتكارات)
وەبەرهێنان : الاستعمار
پارێزگاران : حماة
خاڵگیری : معالجة
لێوە لێوماڵ : استنزاف
لێکگۆڕین : إشكال